# دووره دەراوی

# سووره چۆم

مەنسوور حامیدی





رۆمان




**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

- **دووره دەراوی سوورەچۆم**

- **نووسەر:** مەنسوور حامیدی
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جمال رواندزی
- **بەرگ:** مەنسوور حامیدی
- **پیتچنین:** پەروین پیرەبابی ـ مەهاباد ـ ۰۴۴۲ـ۲۲۲۱۷۱۵
- **نرخ:** ۵۰۰۰ دینار
- **چاپ:** یەکەم ۲۰۱۲
- **تیراژ:** ۱۰۰۰ دانە
- **چاپخانە:** چاپخانەی هێڤی (هەولێر)
- لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی (٦١) ساڵی (۲۰۱۱)ی پێی دراوە

زنجیرەی کتێب (٦٤٨)



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

**پێشکەش بەو خۆشەویستەی لەدەروونمدا**
**ئەم ڕۆمانەی نووسی و...**

## وەک پێشەکی:

بەنیاز بووم، پێشەکییەک بۆ ئەم ڕۆمانە بنووسم وەک ڕوونکردنەوەیەک لەسەر ژانری ڕۆمان بەتایبەت ڕۆمانی کەم تەمەن و شلک و ساوای کوردی. بەڵام بە هۆگەلێکی شەخسی وازم لێهێنا. دەجا ئەوەی بۆ من ماوەتەوە لێرە ئاماژەی پێبکەم ئەم دوو خاڵەی خوارەوەیە. یەکەم: لە ناخی دڵمەوە سپاس دەکەم لە برای هێژا و نووسەری بەڕێز کاک ناسر باباخانی و هەروەها شاعیر و نووسەری خۆشەویست کاک عەلی ئیسماعیلزادە و برای ئازیز شاعیر و نووسەری وردبین کاک عەزیز ئالی و کاک ئەمین گەردیگلانی کە دەقی ڕۆمانەکەیان بە وردی خوێندەوە و هەڵەبڕییان لێ کرد بە تایبەت کاک ناسر باباخانی کە ناچار بوو ئەو خەتە ناخۆشەی من کە زۆر جار بەخۆشم نەدەخوێندرایەوە بخوێنێتە و ساغی کاتەوە کە زۆر کات و زەمانی ئەوی بە فیرۆدا. هەر لێرە بە ڕاشکاوی دەڵێم، هەر کەموکوڕی و ڕەخنەیەک بەجێ یان نابەجێ کە پێی ڕۆمانەکە بگرێتەوە، من خۆم لە ئاستی بە بەرپرس دەزانم و لام وایە بێ هەڵەش نییە. دووهەم: ئەو مەبەستەیە کە خوێنەری بەڕێز دەبێ ئاگادار بێ تەواوی کەسایەتی ئەم ڕۆمانە و ناوی کەسەکان جیا لە یەک دوو کەسیان نەبێ هەموویان خەیاڵین و فڕی بە سەر کەسێکی واقعییەوە نییە، هەر لێرەدا دەڵێم ئەگەرکوو کەسێک هات و وەک ئاوێنەی چاو لە ڕۆمانەکە کرد و وێنەی دزێو یان جوانی خۆی یان کەسێکی ناسیاوی خۆی تێدا دۆزییەوە، پێی خۆی دەگرێتەوە چونکە تەواوی کەسایەتی ڕۆمانەکە خۆم سازم کردوون و لە هیچ جێگەیەک لێیان مەگەڕێن بەدەر لە ناو ڕۆمانەکەدا.

بە سپاسەوە

مەنسوور حامیدی

## ١

... نیگەرانی چی؟ بۆ حەجمینت لێ هەڵگیراوە؟ دەڵێی کێچت دە کەوڵی کەوتووە و ساتێ هەدادانت نییە. خۆ لە دەستت دێ وازی لێ بێنی، هەر وەک سەدان شتی تر کە هەرگیز ئاوڕت لێ نەداوە، بە هێندت نەگرتن، ئەننەهوو هەر نەبوون. خۆ ئەو دەم بە وتەی خۆت گەلێک کاری پێویستت هەبوو، دەیجا بەرخی بابم بۆ وەدووی کاری خۆت نەدەکەوتی؟ دەڵێی بریقە بریقەکەی لە چاوی دەدای؟ چاوت قووچاندبا. دەڵێی بە دەستی خۆم نەبوو وەک ئەوە دەچوو دەستێکی زۆر بەهێزی نهێنی ڕام بکێشێ. هەستێکی نامۆ داگیری کردبووم. بەدەس خۆم نەبوو. پێت وایە نابەدڵ کەوتمە شوێنی؟ ئەودەمیش منداڵ ببوومەوە. منداڵ منداڵ، تەژی لە هەراوهوریا و گەمە و کایە. هەر کە درگای حەوشەیماڵم لە پشتەسەرمەوە پێکدادەدا، بە کەفلەکوونێک ئەوەی بە ڕۆژ و مانگ و ساڵ دایک و بابم دەگوێیان داخنیم بۆ عاقڵ بوون و بەئەدەب بوون و پاکوخاوێن بوون و کوڕی چاک بوون تا خودا منی خۆش بوێ و خەڵکیش ئەوان، هەموویانم یەک جێ لە کۆڵ خۆم دەکردەوە و کاڵۆشە ترکەنە جیلەکانم لە پێ دادەکەند و بە داوەقەیتانێک بە ملی خۆمەوە هەڵداوەسین و بە پێی پەتی خۆم داویشتە ئامێزی گەرم و پڕ لە تۆزوخۆڵی کۆڵان. بە لاقان خۆڵە پۆتینی کۆڵانم دەکوتا، تا هەورێک لە تۆزوخوڵ، منی لە خۆیدا دەشاردەوە، تەنیا دەنگی تریقانەوەی سەرخۆشانەی من بوو کە وەدیاری دەخستم. حاجیژن هەموو جارێ لەوبەر هەیوانێڕا یەک بەخۆی دەیقیژاند.

"ڕەببی خودا دەوامی عەمرت نەدا. کوڕە ئەو تەپوتۆزەمان بۆ وەسەر دەگێڕی؟ عەولا! کوڕە عەولا! بگە سەری. ئەو هەتیوە بگرە. کوێری کردین."

لەو دەمەدا عەلیلە و قالەش وەدەر کەوتن. کە زستان نەبا، هەرگیز کەوش ڕەنگی پێی ئەوانی نەدەدیت و تامی عارەقەی بۆن پەنیری لاقیانی نەدەچێشت، وەنەبێ هەیانبێ و لە پێی نەکەن. نا وا بیر مەکەنەوە. هەتیو بوون، بۆ خۆیان دەیانکوت ئامۆزای یەکترین، بەڵام ڕاستیان نەدەکوت، تەنیا شتێکی ببوو بە هۆی خزم بوونیان، هەتیوی و هەژاری و بێکەسی لە ڕادەبەدەریان بوو. لە کونەگورگێکدا دەژیان، بەس ڕوونە گورگەش پێی ڕازی نەبووە، ئەگینا هەرگیز وەگیر ئەوان نەدەکەوت کە بەدبەختی خۆیانی تێدا بشارنەوە. دایکی عەلیلە کار و شیوی ماڵانی دەکرد و دایکی قالەش سواڵی دەکرد. هەر بە قەرا یەکیان وەگیر دەکەوت. هەر بۆیەش بەیەکەوە خەرجیان دەکرد. بە ڕۆژ دایکی عەلیلە لە بەر کاری ماڵان دەتکوت گیانی دە لەشدا نییە، بەڵام دایکی قالە دەچوو لە بن سێبەری دیواری مزگەوت بێهەستوخوست دادەنیشت و بە بزماری دوو چاوی خەریک دەبوو تا بەڵکوو بتوانێ کونێک لە ڕووحی خەواڵووی ڕێبواران بکا و دڵیان وەڕەحم بێنێ، بەڵام ئەو بزمارە کولەی نیگا و ئەو دوو چاوە سیس و پرووشە چیان پێ دەکرا لەگەڵ دڵی ڕەق و بێبەزەی ڕێبواران. شەو کە دادەهات، دایکەکان جێگۆرکێیان دەکرد. ئەوە دایکی قالە بوو کە یەکسەر لە سەر پێ، بە دەستی بەتاڵ و خەیاڵی نەکولاو ناچار بوو سکی سێزدە هەتیوی خۆی و خات فاتێ تێر بکا. دایکی عەلیلەش تا نەوتی چرا فتیلەکە دوایی دەهات و دڵی بۆی دەسووتا، بەستە و هەڵبەستی لە پێش هەڵبەستراوی بۆ پشتی هەمیشە هێشاو و ژانی لەبڕاننەهاتووی دەچڕی.

:"ئەی بابە! ئەی بابە! پشتم. بابە! بۆچی نەتکوشتم؟ ئەی دایە! وەختە بمرم، وەختە بە ژانان بدرم، ئەی بابە!ڕۆ! ئەی دایە گیان! ئەم سەربەندە دوای خواردنی شێو پسپس دەبوو.

:" ئەی خودایە گیان... ئەی بابەڕۆ... ئەی دایە گیان... ئەی مردم... ئەی پشتم... ئەی کەلەکەم... ئەی لە بەر لاقم... ئەی لەبەر دەستم... ئەی لە بەر

بەری پێم... وەی لە بەر قامکەکانم.... ئای... وای... های... ئۆف... ۆف... ئاخ... واخ... داخ...

دایکی قالە پێی دەڵێ: «کچێ فاتێ بەسە تاوێک هەدادانت بێ. وەرە بە قسەم بکە. سبەینێ بچۆ لای غەفوورەگێڕ. دوو پێلاقانت بە پشتیدا دەدا دەرد و عەلەمت لێ دەبڕێ.»

: «تۆ خودا بەسێ گیان! ئەتۆ سەروەسییەتم بە، ئەگەر هات و مردم هەر وەک منداڵەکانی خۆت ئاگات لە منداڵەکانی منیش بێ، خۆشی نەدیون.»

:«کچێ! ئەو قسە بێتامانە چییە؟ ئەو منداڵانە بۆ ئازار دەدەی، مردنی چی؟ شوکور جوان و جحێلی، مەگین نابینی ئێستاش چەندە چاویان لە دووتە، ئەگەر لەمن دەپرسی، بەو ژان و ئێشەی بە پشتی تۆوە نووساوە تازە بۆ کاری ماڵان کردن و شیووکوڵ شوشتن نابی. بەیانی مەچۆ بۆ کاری ماڵان بمانهەوێ و نەمانهەوێ خەڵکێک هەن کە خێر دەکەن، وەرە ئەتۆش لە پەنای من دانیشە، خودا ڕسقی تۆش دەگەیەنێ.»

: «ناتوانم بەسێ گیان! ئەو کارەم لە دەست نایە، بە خودای گەسک لە دەستمدا نەبێ دەڕزێم، کۆڵەوار دەبم. هەر بە یەک جاری دەمرم.»

عەلیلە و قالە مست مست خۆڵیان هەڵداویشت و خۆیان وەبەر خۆڵەکە دەدا. لەناو تارمایی خاکدا مووی سەریان سپی دەینواند تەواو پیر ببوون:

«دا دەستت بگرە بزانم. ها، هەتیوە توخمەکەرە! ئەوە چییە؟ ئەوە دەستت بۆ وا چڵکنن؟ ئەدی ئەو نینۆکانە بۆ وا درێژن، دەستت بگرە حەرامزادە!»

:«ئاغا[1] بە قوربانی بەری پێیەکەت بم، ئەو جار بمبەخشە، جارێکی دیکە ئەگەر دەستم پیس بوو بمکوژە، ئاغا گووم خوارد، دەیکەم، دەیشۆم.»

:«حەرامزادەی توتکی سەگی...»

:«ئاغا بە قوربانت بم. تۆ سەری خودای بمبەخشە. دەمرم، بەسم لێدە.»

:«دەڵێی چی؟ بەستە؟ توخمی نابیسمیلا.»

---

١- ئاغا: لێرەدا لەبری مامۆستا دەگوترێ.

:«ئاغا تۆخودا بەسە چیدی لێمەدە. غەڵەتم کرد. ئەگەر جارێکی دیکە وا بووم هەر لە سەر دەستی ئەو منداڵانە بمکوژە.»

:«دەتکوژم هەتیوە! لە بیرت نەچێ.»

:«نا. ئاغا گیان! قەت لە بیرم ناچێ.»

قالە لە پەناوە خەریک بوو نینۆکە پڕ لە چڵکوچەپەرەکەی بە ددان دەکرۆشتن و کورتی دەکردنەوە. قامکێکی لە خوێن هێنابوو، بە زار دەیمژی. بە دزی تفی لە پشتی دەستی دەدا و هەر وا کە بەپێوە ڕاوەستابوو لە پشتەوەڕا پشتی دەستی لە خشتی دیوارەکەی مەدرەسە دەسوو، تا ئەو چڵکەی لە سەر پشتی دەستی کەمرەی بەستبوو خاوێن بکاتەوە. یەک دوو جێگەی دەستی وەها داڕووشابوو خوێنی لێدەهات، بەڵام چڵکەکە بە جۆرێک لە پێستی دەستیدا مردبوو مەگین[٢] دەستیان بڕیباوە، ئەگینا عیلاجی نەدەهات. وردە وردە قالە دەستی بە گریانێکی کپ و خنکاو لە دەروونیدا کرد. دەیزانی لە دوای عەلیلە نۆرەی ئەوە کە بگری. عەلیلە تازە دەستەڵاتی دەستەکانی لە دەست خۆیدا نەمابوو. ئاغای «قاف» ئیختیاری دەستەکانی لە دەست خۆی گرتبوون. هەموو جارێ بە شووڵک دەستی لە خوارێڕا بۆ دەبردەوە سەر، ئینجا لە سەرێڕا بە تەواوی هێز و توانای خۆی بە شووڵک بۆی دادەگەڕاندەوە خوار. عەلیلە کەوتبووە سەر چۆک، گریانەکەی ببوو بە قرووسکەی سەگ، هووی لە دوو دەستە بێ ئیختیارەکەی خۆی دەکرد و هەر جۆرێک بوو وەبن هەنگڵی دان. شووڵکی ئاغای «قاف» مارێکی ڕەشی بێ ئامانی خستە گیانی سەرە تاشراوەکەی عەلیلە.

قالە و عەلیلە لە ژێر بارانی تۆز و خۆڵ، خۆیان هەڵداویشت و دەسووڕانەوە و بەدەم سووڕانەوە دەیانکوت:

:«دایکت دەگێم ئاغای «قاف»، بابت دەگێم ئاغای «قاف».»

:«کوڕە هەتیوە عەوڵا! ناڵێم بڕۆ بە دایکی ئەو تووتکەسەگەی بڵێ، وا دیارە جوابی ئێمە ناداتەوە.»

---

٢- مەگین: زاراوەیەکی ناوچەیی ((مەگەر)).

:«نا، نا. تۆخودا بە دایکم مەڵێن. دآیکم وەک مار پێوەم دەدا، پێشتر زۆری پێوەی داوم. زۆر جاران، دەزانن ئێشەکەی چۆنە؟ ئێش و ژانێکی یەکجار گەورە و لە ڕادە بەدەرە لە جێگایەکی ئیجگار بچووکدا کۆ دەبێتەوە. بچووک بە قەرا تاقڕانییەک[3]. ئینجا هەر لەوێ دەتەقێتەوە، دەتەنێتەوە. تا چاو دەکەیەوە ئازای لەشت دادەگرێ. بەر لە هەر شت زارت پێ دادەپچڕێ تا هاوارت بەرزتر بێ، بەڵام نابێ هاوار بکەی، نابێ دەنگ هەڵبڕی، ئەگینا تاقڕانی دووهەم بەڕێوەیە ناچاری خۆت لە گەرووتدا بدۆزییەوە و ئینجا ڕوو لە چاوانت بکەی و هێدی هێدی و تنۆک تنۆک بتکێیەوە سەر خۆڵە پۆتینی کۆڵان.

:«نا، نا، بە قوربانت دەبم حاجیژن بە عەوڵای بڵێ بە دایکم نەڵێ تۆزوخۆڵی ناکەمە حەوا، ئەوە دێمەوە ماڵ.»

:«عەوڵا! عەوڵا! وەرە ئەو جارەش پێی مەڵێ. ئەوە دێتەوە ژوور قەولی داوە کوڕێکی باش بێ. تازە تۆزوخۆڵ لە حەوا ناکا.»

عەلیلە دەڵێ: «کوڕینە! هیچ لە بیرتانە سبەینێ چاو لە دەست و نینۆکمان دەکەن، بە خودای ئاغای «قاف» دەستمان ئاوا ببینێ لەتوپەتمان دەکا. هەتیوە قالە، شەوێ جوانی بشۆ. نینۆکیشت بکە.

قالە کوتی: «عەلیلە چی لێ بکەم خۆ لێ نابێتەوە. بە بەردیش لە پشتی دەستم خشاند چڵکەکەی لێ نەبۆوە.»

عەلیلە پێی دەڵێ: «گێژە، خۆ بە بەردی نابێ. دەبێ بەردەپێی لێدەی.»

ئەمن کوتم: «دآیکم دەڵێ دەبێ شەوانە بە ڕۆن وازیلان جوان جوان چەوری بکەی تاکوو بەیانی دەستت نەرم دەبێ ئینجا بە ئاوی گەرم و سابوون و بەردەپێ لێ دەبێتەوە.»

قالە پرسی: «ڕۆن بازیلان چییە؟ ئێوە هەتانە؟»

:«ڕۆڵە ڕۆن بازیلان نا، ڕۆن وازیلان. بەڵێ هەمانە هەموو جارێ کە دایکم دەمانباتە حەمام شەوی پێشوو دەست و پێمان بەو ڕۆنە چەور دەکا

---

٣- تاقڕانی: تاق قڕانی/ تاقە قڕانی- یەك قڕانی- قڕان یەكەی دراو.

تاکوو نەرم بێ و چڵکەکەی زوو لێ بێتەوە تازە قەڵشی دەست و پێش چاک دەکاتەوە.»

:«دەتوانی نەختێک لەو ڕۆنەی بۆ من و عەلیلەی بێنی؟»

:«نا. ناوێرم دایکم پێ بزانێ دەمکوژێ.»

:«جا دایکت چوزانێ؟ نەختێکمان بۆ لە کوتەکاغەزێکی بکە و بە دزی لە پەنجەرەڕا بۆمان بهاوێ خوارێ.»

:«باشە با بزانم چۆن دەبێ.»

:«لە بیرت نەچێ ئەوە کوتت باشە»

کوتم باشە، بەڵام بۆم نەهاویشتن. قوتووەکە تەنیا نەختێکی تێدا مابۆوە. دایکم داینابوو بمانباتە حەمام و هەر ئەوەندەش مابوو کە لە دەست و پێی ئێمەی هەڵسوێ. دەستی منیش وەک دەستی قالە و عەلیلە کەمرەی بەستبوو و لە چەند جێگاوە قەڵشیبوو. ڕۆن وازیلان نەبێ دەست و پێ خاوێن کردنەوە گیان کێشانە، هەر چەند گیان کێشان گەلێک خۆشترە لەوەی تووشت بە تووشی ئاغای «قاف» بێ.

***

# ٢

... عەینی تەڵە وەنەوشە لە بیر کراوەکەی ژێر سێبەری تتوودڕکی مامۆستا گۆران بە تەنیا ماوی. خۆ ئەو تەڵە وەنەوشەیە، لانیکەم ئەم بەختیارییەی هەبوو کە سەرنجی ماموستا گۆران بۆ لای خۆی ڕابکێشێ، بەڵام تۆ چی؟ بە درێژایی تەمەنت بە شوێن چیدا عەودالّی؟ بەیانیان لەشی ئازاردراو بە خەوت لە نێو جێوبانی نەبان لە لەشت دەردەکێشی و بەرەڵڵای دەکەیە نێو کووچە و کۆڵان و شەقامی شار. هەتا هەتاو دەسووتێ و دەڕوا. تۆ هەر وا دەڕۆی و بە خۆڕایی دەسووتێی. ئەگەر لە دەستم هاتبایە بە تۆم دەکوت.

:«ئەرێ وێڵی چ سەودایەکی ئەی سەردوولکە بێژی ئاواتە شەهیدەکانی سەدەکان و هەزارەکان؟ ئەی بارستای خەست و خۆڵی تەنیایی. نا، نا، بەم جۆرە مەڕوانە من، ئەو بزە تەوساوییەت لێ نایەتەوە. ئەمجارەش خەریکی خۆت فریو دەدەی. تۆ دەتتوانی وەک ئەوەی کە هەرگیز چاوت پێ نەکەوتبێ وازی لێ بێنی. نەک لە بەر چاوی ئەو خەڵکە کە بە سەرسووڕماوی چاویان لە تۆ بڕیبوو کە چلۆن بە جلوبەرگێکی خاوێن و کۆکوپۆشتە و کەوشی بریقەدار وەنێو ئەو دڕکودالە بکەوی و شریتێکی ئاڵۆز و پسپس کراو بە وەسواسەوە لە دڕکودالّ بکەیەوە. تۆ لات وابوو پەیامێکی نهێنی و ئاسمانیان بۆ خستویە سەر ئەم شریتە ئاڵۆز و پسپسە؟ وەتدەزانی پێوەندی بە دڵ و گیان و ڕووحتەوە هەبوو؟ بۆچی وەک هەمیشە بە درۆ ناڵێی، خۆشم نەمدەزانی لە چی دەگەڕێم. بە دەس خۆت نەبوو؟

:«ڕاست ناکەی درۆ دەکەی»

:«تەنیا نەختێکت لەو ڕۆنەت بۆ دە پەڕەکاغەزێکی کردبایی. مەگین ئەودەم لە ئێمە جیا دەبوویەوە، نەتگوت باشە؟»

"«ئێوە ڕاست دەکەن من کوتم باشە. هەمیشە دەڵێم باشە، بە هەموو کەس دەڵێم باشە. «باشە» وشەیەکی ڕووحسووکی لەبەردڵانە، وشەیەکی گەلێ

خۆشەویستە، باشە وشەی بەڵێنیدەرە، باشە وشەی ڕزگار کەرە. نا وا نییە، من بە هەڵە چووم، باشە وشەی فریودەرە، وشەی درۆ و فێڵوتەڵەکەیە، وشەیەکی بە ڕواڵەت شەرمن و شیرینە، بەڵام ناوئاخن تفتوتاڵ، وشەی هەڵمساو لە هیچوپووچ، وشەی سواو و پواو. بۆ لە بری باشە نەتگوت نا. بەڵێ ئەوە ڕاستییەکە تۆ هەرگیز نەتوێراوە بڵێی نا. بۆ تاقەجارێکیش تۆ نەهاتی «باشە» و «نا» دە تای تەرازوویەک بنێی تا تێبگەی کامیان قورستر و بەنرخترە. لە ڕاستیدا «باشە» کلیلێ بوو بە نیاز بووی ئەوەی دەرگایە پێی بکەیەوە. بەرگێکی ڕازاوە بوو دەبەر خۆت کردبوو، دەیپاراستی، لە ترسەکانت، لە دڵە ڕاوکەکانت، لەو ئازارانەی دەم و سات دەبوونە ژەنگەسوورە و ژانئاژنیان دەکردی.

هەمیشە کە نەتدەکوت باشە وێت دەکەوت. دەیجا هەوەڵین وشە کە لە زارت دەهاتە دەر، بەر لە وەی هەستت هەست بە هیچ هەستێک بکا «باشە» بوو.

... تاقە حەمامی شار، قەڵایەکی پۆڵایین بوو کە دەبوو بەری بەیانی پێش مەلابانگدان بۆ داگیرکردنی هێرشت بردبایە سەری، دەنا کەڵەباب خوێندبای و نەگەیشتبایە ئەوێ، دەبوو لە بری ئەوەی نمرەیەکت وەگیر کەوێ دە چڵکوچەپەری لەشی هەمیشە چڵکنی ژنان و میزی منداڵان و چۆڕاوکی خەنەی بە گەڵامێو هەڵپچڕاوی سەری ژنان و و دەرمانی بن هەنگڵ و بەرزگیاندا بە تەواوی خووسا بای. ئینجا ئەگەر توانیبات بە شەربەی تەنەکە و گاڵۆن لە تیانەکە چووبایە پێشەوەو و ئینجا دوو شەربە ئاوی بەڕواڵەت خاوێنت بە خۆدا کردبا. ئەو دەم دەتتوانی شانازی بەخۆتەوە بکەی کە توانیوتە حەمام بکەی، دەنا چڵکنتر لە پێشوو هەر لە بەر ئەوەی دە هەڵم و هەوا و ئارەقەدا نەخنکێی، دەبوو ڕاکەیە دەرێ. تەواوەتی حەمام بریتی بوو لە چوار قەبری بەپێوە ڕاوەستاو بە نێوی نمرە و دیوێکی شەش و پێنج میتری و تیانێک کە ئاوی کوڵیوی تیا بوو، ئیتر ئاوێ بێنە و دەستان بشۆ. ئەگەر ڕۆژێک یەکێک پەیدا بێ و سوێند بخوا کە هەرگیز هیچ کەس، لەو بەناو حەمامە بە خاوێنی نەهاتۆتە دەر، بڕوا بکەن سوێندی لێ ناکەوێ. تازە ئەگەر هێندێک دەستڕۆیشتوو نەبوایە هەرگیز ئاوی پیسی ئەو چڵکاوخانەیەی لە سەر پشتی هەست پێ

نەدەکرد. هەر کەس نۆبە شوشتنی هاتبایە، دەبوو بەپێوە ڕابوەستێ تا دەیشۆن و ئەوانیتر دەبوو لە ژێر پێی ئەو کەسە دابنیشن تا بە چۆڕاوکی ئەو بخووسێن، بە چی؟ بە هەموو شتێک بەڵام بە ئاو نەبوایە. ماوەی حەمامکردنەکە پێوەندی هەبوو بە ڕادەی تاقەت و توانایی و لەخۆبوردوویی دایکەکان، کە دیارە کەمیش نەبوون لەو دایکە بەتاقەت و ئازا و کۆڵنەدەرانە. چونکە دایکێک نەبوو لە شەش، حەوت منداڵ کەمتر بێنێ بۆ حەمام. هەر منداڵەی تا بە مەیل و دڵی دایکی خاوێن دەبۆوە لانیکەم نیزیکەی ساعەتێکی دەخایاند، بۆ شوردنی خۆشیان کەمتر لە ساعەت و نیوێک دەنا عەیب و شوورەیی بوو. ئەڵبەت ڕوونە دوو سێ دەست کیسە کێشان، ئەو جۆرەی کە پڵیتەی چڵکەکەیان بە قەرا داوەقەیتانێکی لێ هاتبایە و هەروەها سێ چوار دەست لفکەلێدان و چەند جار سەر شوشتن و بە شانەی تەختەی دووسەر چەند جار سەرداهێنان و ئاوی کولێو پێداکردن، ماشاڵڵا خۆ قژیش قژ نەبوون، زۆربەیان دەیانتوانی بە پرچ و قژیان کاری گەلاهەنجیرەکەی دایە حەوا بکەن، تازە ئەودەم کە لەم کارانەوە دە بوونەوە نۆرەی بەردەپێ دەهات کە لە بەری پێ و دەستیان بدەن. ئەگەر واز لە زۆر مەبەستیتر بێنین کە زۆرتر پێوەندی بە نیازی مێردەکانیانەوە بوو بڕوام پێ بکەن ساعەت و نیوێک، کەمترین زەمانێک بوو کە ژنێکی گورجوگۆل پێویستی بوو، تەمبەڵەکان بۆخۆتان حیسابیان بۆ ڕابگرن، هەڵبەت ئەو زەمانە بۆ دایکەکان کە خەریکی شوشتن و خاوێنکردنەوە بوون هەر جۆرێک با تێدەپەڕی، بەڵام دە زەینی خەیاڵاوی و خولقێنەری منداڵی وەکوو ئێمەدا بە ڕادەی ئەبەدییەتێک لێک دەکشاوە و ئەگەر بەڵێنی لەتە کولێرەی دوو قڕانی نەبوایە هیچ منداڵێک تابشتی ئەم ئازارە لە ڕادە بەدەرەی نەدەهێنا[٤].

بەردەپێ بڕبەندی[٥] دەست و پێیە. چڵکی دەست و پێ بە پێستەوە لێدەکاتەوە. ئەو دایکەی شەش منداڵی سەروپێچکەی دەشوات دەبێ بە هەموو هێز و دەمای خۆی بڕبەندی لە دەست و پێیان بخشێنێ. قیژە و هاواری منداڵ کە بە ئاوی داغ

---

٤- تابشتی ... نەدەهێنا: خۆی ڕانەدەگرت. تاقەتی نەدێنا.

٥- بڕبەند: گیایەکە ڕەگەکەی وشك دەکەنەوەو دەیهاڕن بۆ سەر شوشتن.

و کوڵیو دەشۆران تا خاوێنتر ببنەوە. سەر و قژ کێشانی لە ناکاوی ژنان لە سەر نمرە و شەربە و بەرتیان وەبەرکەوتن و ئەو جنێوانەی کە ژێرکراسەکەیانی وەدەر دەخست و لێفەی لە سەر هەتیوی کاری شەرعیان هەڵدەداوە و ئەو خۆشییە و کەیفە مفت و خۆڕاییيانەی بە جنێودان بە یەکتری بە نەسیبی کاک و باب و مێردیان دەکردن، هەروەها بۆنی کارپێتئاسای دەرمان و گەردی خاوێنکەرەوە و گڵە سەری ژنان و خەنەی دەگەڵامێو هەڵسواوی ئەم لا و ئەو لا کەوتوو، مووی بە ئارەقە زەرد هەڵگەڕاوی بن هەنگڵ و کوێیتریان و کەفوکوڵ و میز و پیسایی منداڵ و قەوچەقەوچی ئەنگوتکە بنێشتی زاری ژنان. هەر بە ڕاستی کە حەمامی دوو حەوتوو جارێکیش چەرمەسەرییەکی هەرگیز لە بن نەهاتوو بوو.

من دەڵێم هەزار خۆزگە بە خۆت عەلیلە. هەزار خۆزگەم بە خۆت قالە. یەکڕاست دەچنە سەرچاوەی شار. دەستتان دەنێو ئاوەکە ڕۆ دەکەن، بە ئەسپۆن و وردەخیز ئەوەندەی دەشۆن تا خاوێن دەبێتەوە.

عەلیلە دەڵێ:

«سبەی چاو لە دەست و نینۆکمان دەکەن. بە خودای دەزانم دەستیشم خاوێن خاوێن بێ ئاغای «قاف» هەر لێم دەدا.»

قالە دەڵێ: «عەلیلە وەرە با دەس لە خوێندن هەڵگرین، وەرە نەچینەوە مەدرەسەی»

من دە دڵی خۆمدا دەڵێم: «ئەگەر ئەوان نەچنەوە مەدرەسە، ئەدی ئاغای «قاف» هەموو ڕۆژێ کە خودا دایناوە کێ وەکوو سەگ بکوتێ و ئازاری بدا و کەسێک نەوێرێ بڵێ بۆ ئەوەندە تۆ لە عەلیلەی دەدەی.»

:«حەرامزادەی توخمە کەر! وەرە بزانم بۆ مۆڕەت لە جەواد کردووە؟»

جەواد بە سەرسووڕماوی چاو لە ئاغای «قاف» دەکا. ناوێرێ بڵێ کە عەلیلە نەک شتی وای نەکردوە بەڵکوو زۆریش دەگەڵ یەک ئاواڵن.

:«ئاغا! ئەوەتا لە خۆشی بپرسە بە خودای من هیچ کارم پێی نەداوە. جەواد! مەگین ڕاست ناکەم؟»

:«بێدەنگ بە توخمەسەگ! دەستت بگرە بزانم.»

:«ئاغا! تۆ ئەو ئاسمانە شینە بەسە، خۆ من هیچ خەتایەکم نەکردووە تۆ بۆچی هەمیشە لە خۆڕا لە من دەدەی؟»
:«دەڵێی چی سەگی سەگباب! ئەوە گووی زیادی دەخۆی، بشتکووژم حەقتە، ئەوە دەنگت دەردێ؟»
:«نا ئاغا گیان! غەڵەتم کرد، دەنگم دەرنایە، بەسە، تۆ سەری ئەو خودا گەورەیە بەسە.»
:«قالە چاو دەرپەڕیو! بلێ بزانم بۆ وا ئەو چاوە زەقانەت دە من بڕیوە. وەرە تۆش دەستت بگرە بزانم.»

دەستم بگرە و بمبە دەگەڵ خۆت، بمبە بۆ باوەش ئەو هەورە سپیلکانە، دوو باڵم بۆ ساز کە، دوو باڵی هەورینە، دوو باڵی گەورە و لێککشاوە بە قەرا دووریی من و تۆ، دوو باڵی ئەم سەر و ئەو سەر نادیار، بە قەرا خۆشەویستی من و ئەو... بمبە بۆ سەر خلیسکێنی کۆلکەزێڕینە. لەو سەرڕا بەرم دەوە. با ڕەنگ بە ڕەنگ بم، با دە ڕەنگەکانیدا بتوێمەوە و لە هەناویدا جارێکیتر سەر هەڵدەمەوە و لەگەڵ وردەبارانی خەمشۆرەوەی داکەومە سەر هەر شۆرەکاتێکی کاکی بە کاکی. تا لە دەروونیدا بگووڕێ، چەکەرەی گوڵی هەزار ڕەنگی ئەرخەیانی. دەستم بگرە، بمبە و بمشارەوە لە دەس دێوەزمەی بێ بەزەی دوێنێ. بمشارەوە لە دەس پۆڵا زرێی شین و شەپۆڕم بۆ هاواری شەهید و خنکاوی خۆم کە بە بێدەنگی دە گەروومدا دەینێژم هەر بە جوانە وەختی.

غەفوورەگێڕ پشتی خات فاتێی بە پێڵلاقان شکاندبوو و بۆ هەتاهەتایە لە کاری ڕۆژانە و ژانی شەوانە ڕزگاری کردبوو. خات فاتێ ببوو بە چڵەگیایەک کە ڕۆژێ سێ جاران دەبوو ئاو بدرێ. نە ئاخێک، نە ئۆخێک، نە ئەی پشتم، نە ئەی وەختە بمرم لە تاوی سەرم، غەفوورەگێڕ دانیشتنی لە خات فاتێ دزیبوو لە بەرانبەردا فێری کردبوو کە چلۆن بۆ درێژایی عومری زەوی دە باوش بگرێ....

***

# ٣

...بێ‌واز نەبووی کە بێ‌وازی خۆی چەشنێک ئاگابوونە و تۆ نەبووی، وەنەبێ نەتزانیبێ لە کوێی و بەرەو کوێ بەڕێوەی. نەخێر هەرگیز وا نەبوو، تۆ باش دەتزانی هەر ئێستا لە دەرەوەی ماڵی. لە دەرەوەوە کە دەیتوانی هەر شوێنێک بێ و تۆش دەتتوانی ناونیشانی ئەو شوێنە یەک بە یەک بخەیە بەرچاوی هەر ئەو کەسەی کە وا چاوەڕوانێتی. وەک من کە چاوەڕوان بووم و دەشمزانی بڕیاری تۆ ئەوە بوو کە بەو شریتە ئاڵۆز و پس‌پسە بەرەو ماڵ ببیەوە و هەر وەک هەمیشەی هەمیشە بۆ هەڵاتن لە دەس تەنیایی‌یەکانت. یان خەیاڵە سەدان جار دووپات‌کراوە ناخۆشەکانت، یان لە دەس شێعرە نەگوتراوە ئەویندارییەکانت، لە دەس خۆ نەبوونی خۆت یان لە دەس ئەو کەسەی هەمیشە بە کووچەباغی زەینی ئەودا تێدەپەڕی هەر لەبەر ئەوەی بە گڵمەتێک، پلارێک، بەردێک هەڵتبەزێنێتەوە. هەر ئەو کەسەی کە بە یەکەوە سەرتان هەڵدا و بە یەکەوە گەورە بوون، بە یەکەوە دەژیان و دەتان‌خوارد و دەکەوتن و هەڵدەستانەوە. سەرەڕای ئەوە هەرگیزاوهەرگیز چاوی دیتنی یەکترتان نەبوو. قەت نەبوو جارێک ئاوڕێک لە یەک بدەنەوە. تەنانەت نەبوو کە بە هەڵکەوتیش چاک‌وچلۆنێک دەگەڵ یەکدا بکەن. ئەوە لە زاری کامەتان دەهاتە دەر.

:«ئاخ چەندە ناخۆشە هەمووی وجوودت بووبێتە حەز و مەیل و نیازێک بۆ ئەوەی تەنیا جارێک وەبەر چاو بکەوی و هەرگیز نەکەوی یان هەموو ئازاری لەشت ببێتە گوێیەک بۆ بیستنی تەنیا و تەنیا یەک جار "بیستنی ((من تۆم خۆش دەوی)) و هەرگیز وشەیەکی خۆشەویستی، وشەیەکی ئەویناوی، وشەیەکی دڵداری پەردەی گوێی تۆی نەلەراندبێتەوە" تۆ بە من بڵێ لە

جیهان‌دا چ لەوەی نەگونجاوترە کە شەو و ڕۆژت دەگەڵ کەسێک تێپەڕێ کە هەرگیز چاوی دیتنی تۆی نەبێ و تۆش توانای بەستنی چاوی دیتنی ئەو؟ من هەمیشە بەم کارەم گوتوە و دەڵێم کێشەی نێوماڵ یان هەر وەک لە کەسێک یان لە شوێنێ ببستبێتم «پێڵاوی تەنگ» بەڵام سەیر ئەوەیە سەرەڕای ئەمانە ناچارییەک وەک ناچاری بوونت، وەک ناچاری نەفەس‌کێشانت، وەک ناچاری دیتنی هەر ڕۆژەی ئەو کەسانەی کە بە ئاواتی بە مانگ و ساڵیش نەیانبینی. وەک ناچاری هەستان و دانیشتنت وەک ناچاری خواردن و خەوت، تەنیا لە بەر ئەو شتە ئاساییە کە ناوی زیندووبوونە، وەک ناچاری هەڵگرتنی ناوت، ناچارت دەکا ئەم پێڵاوە دە پێی بکەی کە ئاکام و بەرهەمی هەر جار دەپێ کردنەکەی وێ هەڵگەڕانی ڕەشەژانێکی سەرلێشیواو و لە قەوارەترازاو و لە بنە نەهاتوویە کە هێورهێور بەرەو تەنگژەیەکت دەبا کە لەوانەیە بڕوا نەکەی ئەوەی وا متمانەت پێ کردوون و لە سەریان ڕاوەستاوی دوو لاقی خۆتن تا چ بگا بەو زەوییەی کێشەی هەروا لە سەرە و تا ئێستا ئەگەرچی دەڵێن بە پێ، بەڵام بە دەست هێشتا نیۆتۆن نەیتوانیوە ببوورن ئەو کردارەی  دەکارم کرد هەڵەیە، دروست ئەوەیە کە نەیوێراوە بە ڕاشکاوی وەباڵی بۆ بکیشێ.

لە ڕاستی‌دا نیۆتۆن جیرانمان بوو. ماڵیان سێ دەرگا ئەولاتر کەوتبوو. تەنیشت ئەو کونە گورگەی عەلیلە و قالە تێی‌دا دەژیان، ماڵە نیۆتۆنی - ئێمە هەر بە شۆرت ناومان دەبرد لە خۆمان نەبوو - ڕاست دەیڕوانییە ڕەزی حەمە قالیل. ڕەزی حەمە قالیل ئەو دەم تەنیا ڕەزێک بوو کە دارەسێوی تێدابوو. ڕەزەکانی تر تەنیا ترێ ڕەشەیان هەبوو هەڵبەت هەبوو ڕەزی واش کە دارە هەرمێ و دارە گوێز و دارە هەناری تێدابوو. ئەوەی زۆربەی خەڵک دەربارەی نیۆتۆن دەیانزانی ئەوە بوو کە سێ مانگ بەر لەوەی نیۆتۆن لە دایک ببێ، بابی ئەمری خودای بەجێی هێنابوو. سێوەکانی ڕەزی حەمە قالیل سێوی هاوینی بوو، نە سێوی پاییزی کە ئەگەر وا نەبووبا هەرگیز نیۆتۆن ئەم کێشەیەی بۆ ساز نەدەبوو، کەچی وای نەمابوو گیانیشی لە سەر دانێ.

ئاخر ئەودەم پاییزان وەک ئێستا وەها لەچەر[٦] نەبوو کە سویێت بێتەوە بۆ نەختە بارانێک. وەها دەباری و باو بۆرانی دەکرد کە سەد جار بۆخۆم پێم کوتوە دەک سندانت لێدا بۆ ساتێک لێی ناکەیەوە کە ئێمە بتوانین پێیەک دە کۆڵان بنێین. دەمگێڕاوە ئەودەم پاییزان وڵات ئەوەندە قوڕوچڵپاو دەبوو کە کەس نەیدەتوانی لە ماڵ وەدەر بکەوێ. تا چ بگا بەوەی یەکی وەک نیۆتۆن هەستێ بەو قوڕوچڵپاوە بچێتە نێو ڕەزی حەمە قالیل و بۆی ڕاکشێ و هێندە چاو دە دارە سێوەکەی ببڕێ هەتاکوو لە نەکاو سێوێک بەربێتەوەو ئەویش بە لاقولەتەری تەڕ و قوڕاوی و تلیساو لە خۆشیان خۆی هەڵاوێ کە ئای وەرن، دۆزیمەوە. نا وا نەبوو ئەو شتە لە هاوینێدا ڕووی دا. ئەو ڕۆژە کە نیۆتۆن لە ماڵ وەدەر نەکەوتبوو. باران هەر وەک گۆزەی سەرەوژێر دەباری. هەڵبەت ئەودەم هەرگیز نەمدەزانی گۆزەی سەرەوژێر دەبێ چۆن بێ، تەنیا ئەوەم لە زاری خەڵکی بیستبوو، منیش هەر کات نیازم پێی دەبوو دووپاتم دەکردەوە. بەڵێ ڕاست وەک گۆزەی سەرەوژێر باران دەباری. ئەوەی لە سەر زەوی بوو، دار و بەرد و خانوو، پرد و گیاندار و بێگیان چنگیان دەلەشی زەوی ڕۆ کردبوو، توندتوند خۆیان گرتبوو تاکوو هەڵنەخلیسکێن. بەڵام من لەوە منداڵتر بووم کە بتوانم هەڵنەخلیسکێم. ئەودەم وەک لە بیرمە، هێشتا نازێم نەدیبوو، شەش پاییزم دیبوو. مەودای نێوان مەدرەسە و ماڵمان ئەوەندە باران پێخوستی کردبوو، لێک کشابۆوە، وێدەچوو قەت نەبڕێتەوە بەو هەنگاوە بچووک و لەرزۆکانەی من. هێندە کەوتبووم تا بە سەگمەرگی ناچار بە هەستانەوە بم، بڕستم لێ بڕابوو و گریان نێزیکترین کەسم بوو کە دە فریام هات و دەستی گرتم.

ئەی کەسی کەسەکەم، ئەی هانادەری ڕۆژانی پڕمەینەت و دڵتەنگیم، ئەی مەرهەمەڕەشەی برین و زامەکانی ڕووح و ڕەوانم، ئەی تنۆک تنۆک ڕەحمەتی نادیاری ئیلاهی، بمدۆزەوە. من کە سەردەمێکە ونبووی شارێکی نامۆ و نائاشنام، غەریب و تاساو ماومەتەوە. گڕم گرتووە بە ئاوری نادیاری

---

٦- لەچەر: قڕنیش- رژد، رەزیل.

تەنیایی. داکە سەرجەستەی خەستەی داگیراوم، بملاوێنەوە بە خوناوکە بارانت بە وردەبارانت، ئای چەندە دوورە لە من. ماڵی گەرم و گەرمتر لەوی باوەشی گەرمی دایک و خواردنی ئەو سێوە سوورەی بە دەست...

:«عەمرت نەمێنێ ئێسکگرانی تۆپیو! ئەوە بۆچ وا خۆت دە قوڕێ هەڵکێشاوە؟»

:«دایە! بە خودای بە دەس خۆم نەبوو. عەرزەکە ئەوەندە لووس و تەڕ بوو کەس خۆی بۆ ڕانەدەگیرا.»

:«دەک ڕەببی ئەستۆت شکێ. با بێیەوە ژوور بزانە هەروەک مار پێوەت دەدەم یان نا؟»

مار پێشتر پێوەی دابووم. مارەکە ئێستا لە دەروونمدا دەژیا، مار ببوونە بەشێک لە من، هەموو شت لە لەشی مندا زوو زوو دەبوو بە مار، بە دووپشک، سەرما دەبوو بە مار بە سەری قامکەکانمێوە دەدا. مار بە ڕوومەتم، بە گوێمەوە، بە لووتم، بە چاومیەوە دەدا. مار خوشک و براکەم بوون کە لە پشت پەنجەرەوە لە ژووری گەرمدا ڕاوەستابوون و هەر یەکەی سێوێکیان بە دەستەوە بوو و دەمەلاسکەی منیان دەکرد. من دەڵێم ڕەببی ڕەزەکەت بێبەر بێ حەمە قالیل. ڕەببی دارە سێوەکانی باغەکەت ئیشک[7] بن. چش لەوەی کە نیوتون پەی بە ڕازی جازیبەی[8] زەوی نابا، بەس نییە خوشک و براکەم لەبەر چاوی برسی و تەڕاوی و ماندووی من سێوی سوور ناخۆن، ئای چەندم سەرمایە، ئای چۆن دەلەرزم، ئای چەندە دەترسم.

عەلیلە دەڵێ: «تازە ئەمن چی دیکە دەرسێ ناخوێنم، دایکم تازە کاری ماڵانی پێ ناکرێ، دەچم کار دەکەم، پووڵی بۆ پەیدا دەکەم.»

قالە پێی دەڵێ:«هەتیوە عەلیلە خۆ تۆ منداڵی، کێ کار بە تۆ دەکا؟ کەس بە فەعلەشت ناگرێ.»

عەلیلە دەڵێ:«فەعلەیی ناکەم، قەرتاڵەی هەڵدەگرم حەمباڵی دەکەم»

---

٧- ئیشك: وشك

٨- حازیبە: هێزی راكێشانی زەوی.

:«عەلیلە! بێتوو ئەتۆ نەخوێنی منیش ناخوێنم. بە خودای دەزانم ئەوجار ئاغای «قاف» تۆی وەگیر نەکەوی لە باتی تۆش ئەمن دەکوتیٚ»
:«هیچ کەس لەو دونیایە گەورەیەدا بە قەرا ئاغای «قاف» بیٚ ڕەزا نییە هەتا چاوی پێم دەکەویٚ وەبەر تێهەڵدان و جنێوانم دەدا. با ئەمن گەورە بم بزانە چی لێدەکەم.»
:«عەلیلە! بۆ نازیٚتان نەدا بە ئاغای «قاف»؟ هیچ دەزانی ئەگەر مێردی پیٚ کردبایە هەرگیز ئەوەندەی تێهەڵنەدەدای؟ دەبوو بە مێردی خوشکت.»
:«ئەو قسە قۆڕانە چیە دەیکەی؟ نازیٚ ئێستا منداڵە، ئەو ساڵ دەبێتە سێزدە ساڵ، ئەگەر دایکم چاکی بۆ بژاردبیٚ. ئاغای «قاف» چل ساڵ پتر دەبیٚ. دەڵێن تا ئێستا چوار ژنی تەڵاق داوە. دایکم دەڵیٚ نازیٚ بەدبەخت دەبیٚ.»
حاجیژن سەیر دەلەنگیٚ، نەوەک زۆر کەسان کە بۆ پێش و پشتەوە دەلەنگن. حاجیژن بەم لا و بەو لادا دەلەنگیٚ. هەرجارەی بەلا تەنیشتێکی دا خواردەبۆوە بۆ، ڕاوەستانێکی یەک چرکەی دەتگوت دەیەویٚ سەتڵێک ئاویش لە عەرزی هەڵگریٚ. حاجیژن بەو هەموو ڕاست و چەپ بوونەوەی نەک زگ و ورگێکی لەباری نەبوو بەڵکوو تەنگەی سەیر لیٚ ئەستوور ببوو. زمان و دڵی حاجیژن هەتا خودا حەز بکا لێک دوور بوون، یانی ئەوەندەی دڵی باش بوو سەد ئەوەندەش زمانپیس بوو. لە حاجی محەممەدی مێردی بەدەر دڵی دەتۆقی کەسێکی دیتبایە و بە جۆرێک جنێوێکی پیٚ نەدابایە، «خودا غەزەبت لیٚ بگریٚ تووتکە سەگی عەمر نەماو! ئەو درگایەت بو گاڵە نەدا.»
:«ڕەببی ئاوری جەهەندەمت تێبەر بیٚ زارا ئەو ڕفێدەیەت[9] بو سووتاندوە؟»
:«هەی دڵت تۆقیٚ کەریم! بۆ مانگا داکردنت[10].»
:«حاجیژن! ئەوە دایکم دەڵیٚ دا بیٚ زەحمەت، قەندشکێنەکەم بۆ بنێرە.»

---

٩- ڕفێدە: ئەوەی نانەکەی لەسەر دادەنێن و پێی بەتەندوورەوە دەدەن.

١٠- مانگا داکردن: مانگا بردنە تەویلە.

:«سەرمازەڵەی دم گول! ئەوە بۆ سڵاو ناکەی. جارێکی دیکە بتبینم و سڵاوت لە بیر بچێ هەر لە حەوشەی دەگەڵ ئەو گوێدرێژە دەتبەستمەوە. حاڵی بووی؟»

:«بەڵێ بە چاوان حاجیژن.»

:«لە بیرت نەچێ بە دایکت بڵێ شەوێ سەرمان بدا.»

:«بە سەر چاوان پێی دەڵێم حاجیژن! خوداحافیز»

❊❊❊

# ٤

دوو کۆترم دی لە شێوەردان
هـەڵنیشـتبوون لـە سـەر بـەردان
ماچیان دەدا بـە نامـەردان
ئەی خودا لەم ئاگربارانە، بارانە، بارانە
یار بەبێ تۆ ماڵم وێرانە، وێرانە؛ وێرانە

هەرگیز نەمزانیوە ئەو کەسە کێیە؟ کە بە نهێنی دێ و دەستم دەگرێ و پەلکێشم دەکا بۆ شوێنێکی نامۆ و نائاشنا، ئینجا لە نەکاو منداڵە گرینۆک و گڕووگرە بێ دایک و بابەکەی تەنیایی دە باوەشم داوێ  و خۆی بۆی دەردەچێ. منی لێقەوماو و خۆشی‌نەدیو، دەبێ یەکپشوو ئەم لا و ئەو لای پێ بکەم و بیلاوێنمەوە و ژێری بکەمەوە تا بەڵکوو بۆ چاوتroووکانێکیش بێ ئۆقرە بگرێ. من دەبێ بە درۆ بە هەموو کەس بڵێم کە لە مەودای چاو تrووکانێک‌دا بوو کە ئەم شریتە ئاڵۆز و پس‌پسە سەرنجی ڕاکێشام، دەبێ بەدرۆ بڵێم کە هەستم دەکرد یەکێ پێم‌دەڵێ. هەڵبەت لە دوایی‌دا زانیم ئەو یەک کەسە هەر بۆخۆم بووم کە پێی دەکوتم، کەسێ وڵامی پرسیارە بێ وڵامەکانی تۆی خستۆتە سەر ئەم شریتە، ئاوڕ لە هیچ لایە مەدەوە، دەربەستی ئەوە مەبە کە کێ لێت دەڕوانێ ـ ئەڵبەت دوایی زانیم کە دەبوو بڕوانم لە دەوروبەرم تا بزانم کەسێک سەیرم دەکا یا نا- بکەوە شوێن ئەو شریتە پچڕپچڕ و پس‌پس بووە و کۆیان بکەوە. ئەو منداڵە بێ دایک و بابە لە لای من نەبێ لە لای هیچ کەسی تر گیر نابێتەوە، لە باوەشمی دەکەمەوە یان باشتر بڵێم لە کۆڵ خۆمی دەکەمەوە. نازانم بۆچی ئەوەندە پەشۆکاوم.

دەڵێم «بڵێی شریتێکی حەسەن زیرەک نەبووبێت کە زەبتەسەوتە[11] کە وەها جووبێتی کە خاوەنەکەی بۆی چاک نەبووبێتەوە، لە قەڵسبوونێکی کوتووپڕ پسپسی کردبێ؟ یان با حەسەن زیرەک نەبێ محەممەدی ماملێ بێ، یانە مەلا حوسێن عەبدوڵڵازادە و یاکوو تاهیر توفیق، عەلی مەردان، جا چ فەرق دەکا؟ هەر کەس بووبێت ئێستاکە لە دەنگ کەوتووە و کوتکوت و پسپس لە نێو ئەم دڕکوداڵە بەم شنەبایە دەبریقێتەوە.» ئا خۆ من خەریکم خۆم فریو دەدەم؟ بە خۆم دەڵێم: «جێی ئەوەیە بکەومە شوێنی و لەو دڕکودالانەی بکەمەوە، لەتەکانی تێک بکەمەوە، بە یەکیانەوە بنووسێنمەوە، خۆ هەر هیچ نەبێ ئەم منداڵە بەدگووز و گرینۆکەم بۆ ماوەیەکی کورتیش بێ بۆ ژێر دەکاتەوە و لە سەر کۆڵمی لا دەبا.

: «دا پێم بڵێ ئەوە لەبەر خۆتەوە دەڵێی چی؟» ئەوەی دەیبینی ئەم شتە نییە کە زۆر لەمێژە بە شوێنیدا عەودالی. تۆ کە وا کۆکو پۆشتە دەگەڕێی، کەوشی بریقەدار دەپێ دەکەی، خۆشترین بۆن هەڵدەبژێری و لە خۆتی دەدەی، لە خۆشترین شوێن ڕایدەبوێری، بۆ جارێک لە خۆت ناپرسی ئێتر چیت دەوێ.

فاتێ دەنکی هەناربوو. هەنار زۆرە و ڕەنگیشیان زۆرتر، بەڵام فاتێ دەنکی هەناری بوو سوور سوور سوور، شیرین، شیرین، شیرین، گەش، گەش، گەش، بە دوای حەوت برایانیدا هاتبوو. ڤێنووس کە بیدیبایە بە خۆیدا دەشکاوە و هەستی بە کەمایەسی[12] دەکرد. زووتر لەوەی کە دەبوو ببێ بۆ سەر هەڵدەکشا. کەس نەبوو ببینێ و بۆ هەمیشە وێنەیەکی ئەو دە زێنیدا ڕانەگرێ، لە هەموو کەس پتر، ئەوە کاوەیس کوڕی خات زڵەخا بوو کە پەیتاپەیتا وێنەی لێ هەڵدەگرت و دە نەهانخانەی زەینی[13]دا لە سەر یەک کەڵەکەی دەکردن.

---

١١- زەبتەسەوت: دەنگ هەڵگر. تەسجیل.

١٢- کەمایەسی: کەموکورتی. کەموکوڕی مامۆستا هەژار دەڵێ: ئێمەش کەنەهاتبووین وەکو خۆی وابوو لێشی دەردەچین کەمایەسی ناهێنێ.

١٣- نەهانخانەی زەین: نەست، شوێنی شت شاردنەوە لەمێشکدا.

نیوەشەوانە لە سەر ئەو کانییەی کە هەوەڵ جار ئەویندارانە فاتێی دواندبوو و لە دواییدا هەر لەوێ کەوتە بەر پەلاماری دڕندانەی براکانی فاتێ، دەنگی هەڵدەبڕی و بە سۆز حەیرانی دەچڕی. لە ڕاستیدا کاوەیس ئاکار و ڕەوشتی زۆر وەک ئەویندارن نەدەچوو زۆرتر شێتانە بوو. خەڵک دەیانکوت: «هەر ئەوەمان کەم بوو کە شێتێکی تریش لە شێتەکانی دێیەکەمان زیاد بێ.»

دەیانگوت: «تێکەڵی کردووە، قوڕ بە سەر زڵەخای دایکی. ئەوە لە مێردەکەی کە ئاوا ڕۆیی و ئەوەش لە تاقەکوڕەکەی کە خەریکە ئاوا بڕوا».

دەیانگوت: «بێونەبێ کاری شەیاتین و ئەجنە بوو.»

یەکێک شایەتی دابوو کە بە چاوی خۆی دیتوویەتی کە شەوێکی درەنگانێ کە کاوەیس بە تەنیایی لە دەرەوەی دێ دەگەڕاوە چەند جندۆکە کەوتبوونە سەری و زەفەریان پێ بردووە. سەیرە لەو مەجلیسەدا هیچ کەس پرسیاری لە کابرای گۆڕین نەکردبوو کە بۆچی ڕاوەستاوە و سەیری ئەو کارەساتەی کردووە و نەچۆتە یارمەتیدانی کاوەیس، هەڵبەت دەزانم پرسیاریشیان کردبا، دەیکوت ئەی بابم چما شێت بووم خۆم بە گژ جندۆکەدا بکەم.

هەڵبەت ئەودەم لە فاتێ بەدەر کەس نەیدەزانی لەو ڕۆژەوە جوابی ئەوینی کاوەیسی داوەتەوە، دەستوپێی تێکەڵ بووە و عەقڵ و ئاوەزی وەلا ناوە و دەستی ناوەتە ناو دەستی دڵی لە دەستدراوی و دڵیشی کە تازە فڕی بە ئەوەوە نەمابوو. چی نەما کە پێی نەکا و چی نەما کە بە سەری نەهێنێ، هەڵبەت پێویستە بڵێم ئەم ڕووداوانە زۆر پێشتر ڕووی دابوو لەوەی کە ئامینە شەل پێی گوتبوو کە بە درێژایی ئەو ماوەیەی کاوەیس نێوانی دەگەڵ فاتێ هەبوو. فاتێ هەر گەپی پێداوە[١٤]. هەرگیز خۆشی نەویستوە. لە قەرارێکی ئامینە شەل پێی کوتوە، فاتێ لە لایەن هەمزاغا خوازبێنی لێ کراوە بۆ خوشکەزایەکی کە لە دەرەوەی وڵات خەریکی خوێندنە و هەربینا بیستت

---

١٤- گەپی پێداوە: گاڵتەی پێ کردووە.

که فاتیٚ ئەرێی بۆ کوت. لەو کاتەدا بوو کە کاوەیس لە وەرچەرخانێکی کوتوپڕدا دەستی دڵی بەردا و دەستی دایە دەستی جندۆکەکان و شێتایەتی.

کاوەیس کوڕێکی خوێنشیرین و قۆڵ و مەچەک ئەستوور و بەکار بوو. ژنان ئەو دەم بە مرۆڤی وایان دەکوت: «دەرهاتبوو[15]» لە کارکردندا کەس لەگەڵی دەرنەدەچوو. گۆڕی بابی دایکی بوو، کە دەیکوت: «بە قوربانت بم کاوەیس گیان» ئەو خۆشەویستییە لە کاوەیس دەترازا و داروبەرد و گیاندا و بیٚگیان و هەرچی لە نیزیک کاوەیس بوایە هەمووی دەگرتەوە.

«هەی دە بەر ئەو دیوارە مرم پاڵت وێداوە.»

«کاوەیس! هەی بە قوربانی کەڵەباب و مریشکەکانت بم.»

هەر چەندە فاتیٚ کاوەیسی لە ڕادە بە دەر خۆش دەویست، بەڵام لە ترسی براکانی لە چەند جارێک پتر نەیدواندبوو و ئەوەش شتێکی زۆر سەیروسەمەرە بوو چوونکو لە دێهات بە هۆی تێکەڵاو بوونی زۆر و زۆر دیتنی یەکتر، خەڵکەکە وەک خزمیان لێدیٚ. هەموو کەس بۆ یەکتری ناسیاو و ئاشنا دەبن. یەکیٚ لە هۆیەکانی باوەڕهێنان بە درۆکانی ئامینە شەل هەر ئەم کەم یەکتردواندنی فاتیٚ و کاوەیس بوو. کاوەیس لای خۆی وای بیر کردبۆوە ئەگەر فاتیٚ بە دڵ و گیان ئەوی ویستبایە ڕێگەیەکی بۆ ژوان و قسەکردن دەدۆزییەوە. لە حاڵێکدا فاتیٚ هەر لە بەر ئەوەی کاوەیس تووشی لێدان و شەڕ و کێشە نەبیٚ وەک نەناسیاوێک لێی دەڕوانی. ئامینە شەل ئەوەی زانیبوو و قامکی لە سەر دانا.

: «کەرە گیان! ئەوە چ جۆر خۆشەویستییەکە یەکتر نەبینن و قسە نەکەن، لەگەڵت ڕاست نییە، درۆت دەگەڵ دەکا دەیهەویٚ مێرد بە خوشکەزای هەمزاغا بکا. بەقام پیٚ ناکەی، ڕۆژێک پیٚشانت دەدەم تا بە چاوی خۆت بیبینی.»

---

١٥- لەکلٚ دەرهاتوو- خاراو. پوختە – پیٚگەیو جوختی.

لەو لاشەوە ئامین بە درۆ قسەی خۆش و بەڵێنی فاتێی بۆ هەمزاغا دەبردەوە. ئامین بە هەموو ئەزموونی تاڵ و نالەباری ژیانی خۆی، باری ڕووحی هەمزاغای نەدەکەوتە دەستی، هەمزاغا لەپێش‌دا هیچی دەرنەدەبڕی.

نە دەیکوت: «کچێ ئامین! دەست هەڵگرە، واز لەو کارانە بێنە، شەرمێ بکە. وەرە وەدەر کەوە بۆ بوویە کوندەبوو. هەر خەریکی وێرانە ساز دەکەی» و نە ئەوەی کە پێی بڵێ: «ئامین! هەی لە منت کەوێ، نازانی چ چاکەیەکت دەرحەق بە من کردووە. نازانم چۆنت بۆ قەرەبوو بکەمەوە، بە زێڕ و زەمبەر و پووڵ چاکەتم بۆ نادرێتەوە.»

ئامین بەبێ ئەوەی کەس داوای لێکردبێ بە ئەرکی سەرشانی خۆی دەزانی کە بە هەر جۆرێک بۆی بلوێ دوو دڵی ئەویندار لەیەک بکا و دوو نابەدڵی نائەویندار نادیار پێک بێنێ. لە ڕواڵەت‌دا ئامینە شەل هیچ بیانوویەکی بۆ ئەو شۆفارییە بەدەستەوە نەبوو. وێدەچوو لەو تاقمانە بێ کە درۆ و دەلەسە و شەیتانی لە خوێنیان‌دا بێ. ئەگینا لاوێکی عاشقی سووتاو و هەتا خودا حەز بکا باش و لە سەر دڵان لە لایەک و لە لایەکی ترەوە هەمزاغایەکی کەنەفتی پەڕپووتی پەککەوتوو کە ئەودەم کە دەستی بە ئامینیش ڕاگەیشت چی وای لە دەست نەدەهات تا چ بگا بە ئێستا، ڕەنگە ئامینە شەل و هەمیش هەمزاغا هەرتک یەکتریان فریو دابێ. ئەوەی ئامین لە زاری هەمزاغای گوێی لێببوو و هەروەک ڕاستییەک پەسەندی کردبوو ئەو وتووویژە بوو کە هەمزاغا لەگەڵ هەباس‌ئاغا کردبووی. هەمزاغا بۆ ئەوەی بە هەباس‌ئاغا بسەلمێنێ کە ئێستاش ئاشی هەر دەگەڕێ باسی فاتێ و جوانییە بێ وێنەکەی و ئەوەی کە بە تەمایە بیرێکی بۆ لێ بکاتەوە. بیستنی ئەوەندە بۆ ئامین بەس بوو کە وەڕێ بکەوێ. ڕەنگە دە ڕاستی‌دا هەمزاغاش پێی ناخۆش نەبووبێت کە ناوی لەگەڵ فاتێ بکەوێتە سەر زاران، وێدەچێ مەبەستی لە خوشکەزایەکەی کە لە وڵاتی دەرەوە دەیخوێند هەر بۆ خاوکردنی فاتێ بووبێ کە بە ئامینی کوتبوو قسەیەکی بۆ لە فاتێ ببیسێ.

ئامین کە وێدەچوو لە لایەن چارەنووسێکی بەدکارەوە ئەم ئەرکەی پێی ئەسپێردراوە جارێ زۆری مابوو بگاتە شاری پەشیمانی، پەشیمانی، ئەی دنیای

پان‌وپۆڕ و بێ کۆتایی پەشیمانی، ئەی نیشتمان و زێدی بەناچاری تاوانبارانی لێ قەوماو، ئەی پەنادەری ساویلکەعەقڵ و هەرزەکاران، تۆ، تەنیا تۆ دەزانی چەندەی وەکوو من کەوتوونە داوێنی بلاوێنی تۆ. ئەمجارەش هەر خۆت بەسەرم کەوە، ئەمجارەش تۆزی نیشتوو لە جەستەی خەتابارم بسڕەوە و لە دەریای تەنیایی و بێکەسی بمپەڕێنەوە، بمپەڕێنەوە بۆ شاری وریایی و ئاسوودەیی.

هەمزاغا نەیدەزانی چ سێحرێک دە کەلامی ئامین‌دابوو کە هەموو جارێ خاوی دەکردەوە.

: «ئامین! بەراستیتە، شتی وا قەوماوە؟»

: «ئاغا! بە سەرت نەبووە قەت درۆت عەرز بکەم.»

هەمزاغا کە بە هۆی پیری ئەوەی ئێستا دەیبیست چەند چرکە دواتر لە بیری دەچۆوە.

: «ئامین! بەڕاستیتە؟ شتی وا قەوماوە؟»

: «ئاغا بە سەرت نەبووە قەت درۆت عەرز بکەم.»

: «جا خۆ کوڕەکانی کاک وسێن هەر دەیکوژن.»

: «با بیکوژن، حەقیانە، بێتوو نەیکوژن دەبێ خۆیان بە سەرشۆڕی لێرە بار کەن»

: «ئاغا! تۆ دەبێ تکا بۆ فاتێ بکەی. ڕەنگە لە دوایی‌دا بۆخۆت...

هەمزاغا قسەکەی ئامینە شەلی دەبڕێ و دەڵێ: «ئامین! هەرگیز ئەمن شەیتانم بە چاو نەدیوە، بەڵام ئێستا لێم سوور و عەیانە کە شەیتان دەبێ حەتمەن شەل بێ و ئەگەر ناسنامەی هەبێ تێیدا نووسراوە ناو: ئامین.»

ئامین نەیزانی ئەو قسەیەی هەمزاغا وەک تاریف چاو لێبکا یان وەک زەم و بێ حورمەتی، ئەگەرچی دەیزانی هەمزاغا بە هۆی پیری دەمێ عاقڵە و دەمێ فەرامۆشکار و لە خۆ بێ خەبەر. هەر چەندە هەر جۆرێکی چاوی لە قسەکەی کردبا نەیدەتوانی دە ڕووی‌دا هیچ بڵێ، دە جا هەر وەک جاری جاران ئەوەی بۆ دەماوە دە دڵی خۆی‌دا دە دەمی بابی بڕی[١٦]. هەڵبەت ئامین

١٦- تێ ڕیان: گووتێکردن- لەدەمی بابی بڕی: گوولەدەمی بابی بکا.

بەر لەوەی دە دەمی بابی هەمزاغا بڕی دە دەمی بابە مردووەکەی کاوەیس ڕیا بوو. بە حەوت برایان کەوتبوونە گیانی کاوەیس، چلۆن گیانی ڕزگار بوو. ڕەنگە خوا ویسبێتی ڕزگاری بێ. ئەوەی ئەودەم کەوتبووە دەست خەڵکی ئەوە بوو کە کاوەیسیان بە نیوەگیانی لە دەس براکانی فاتێ دەرکێشابوو. زڵەخا زۆری پێ نەچوو لە تاو کاوەیس گیانی دەرچوو. فاتێی بەستەزمان لە ترسی براکانی کە ئەو بەڵایەیان بە سەر کاوەیسی لە فاتێ بێخەبەر هێنابوو چی وای نەمابوو لە ژێر شەپ و مست و پێلاقەی برایان باوەڕ بێنێ کە کاوەیس بێ سیرەتی کردووە. براکانی فاتێ و کاوسێن بە قسەی هەمزاغا و مەلای دێ فاتێیان نەکوشت بەڵام ئەوەی بە سەریان هێنا چەند جار لە مردن ناخۆشتر بوو. هەڵبەت بۆ فاتێ. چونکە بەدوای ئەوەی هەر ڕۆژی جارێکیان دەکوتا دوو سێ ساڵ دواتر لە حەمە قاچاقچیان مارە کرد کە ئەگەر فاتە بۆرەکەی کە ماری نێو چاڵاوەکە لە دەستی وەگیان هاتبوو، دابایان بە حەمە قاچاقچی دەبوو بە مارەکە و لە دەستی ڕای دەکرد. بەڵام فاتێ فاتەبۆر نەبوو و ڕای نەکرد. حەمە قاچاقچی پیاوێکی ئەوەندە ناحەز و ڕەزاگران بوو کە ژاندرەمەکان بۆ ئەوەی چاویان وە ڕوخساری ناحەزی نەکەوێ تا لە خواردن و خەو نەکەون هەرگیز نەیاندەگرت و ئەگەر بە هەڵکەوت بەو ڕێگایەیدا کەوتبان کە حەمەی پێدا دەڕۆیی، تا حەمەیان ناسیبا ڕێی خۆیان دەگۆڕی تەنانەت ئەگەر زۆریش دوور ببانەوە.

عەلیلە دەڵێ: «دایە! بابم کێ بوو؟»

فاتێ لە پێش‌دا ویستی ڕوخسار و شێوەی کاوەیسی بۆ بەیان بکا و بڵێ کە بابت ئەو کەسە بوو، بەڵام دڵی نەهات بیرەوەرییەکانی تێکەڵاو بکا، ئاخێکی کێشا و کوتی: «جا چووزانم چ گۆڕبەگۆڕ بابێک بوو؟ لە چ جەهەندەمێکی‌ڕا هەڵاتبوو، بەس‌نەبوو ئێوە چتان لەو سەگسارەی پێ نەگەیی.»

: «دایە ئەدی بۆ بابمان مرد؟»

: «کوشتیان، ژاندرمە کوشتیان. تەنیا لەبەر ئەوەی چی دیکە چاویان بە دیمەنی ناحەزی نەکەوێ. هەر لە دوورەوە ئەنگاوتبوویان. مەرجیان لە سەر

دانابوو. دەگێڕنەوە ئوستوارێک بە گرووبانە[١٧] ژێردەستەکەی دەڵێ«بێتوو هەر لێرەڕا ئەو بەرازە بنگێوی دوو تمەنەت دەدەمێ.»

گرووبان دەڵێ «قوربان کوا ئەوە بەرازە، حازرم سوێندت بۆ بخۆم کە ئەوە کەمتیارە.»

بەڵام هەرتکیان بە هەڵە چووبوون. خۆیان دە تەرمەکەی نەگەیاندبوو. چەند پیاوچاک و خێرخوا هەر لەو شوێنە ناشتبوویان.

: «دایە! دایە!»

: «ئەرێ بۆ لە کۆڵم نابییەوە چت لە من دەوێ، دەڵێی چی؟»

هیچ دایە دەڵێم: «کە خۆشت نەدەویست بۆچ مێردت پێدەکرد؟»

: «ڕۆڵە گیان! خۆ لەم وڵاتە مێردکردن پێویستی بە خۆشەویستی نییە. زۆرتر پێویستی بە هەڵەی مرۆڤ و چاوی مرۆڤ هەیە. چاویان لە بەر ئەوە بە مرۆڤ نەداوە کە هەمیشە پێی ببینێ بەڵکوو جاروبارە لە بەر ئەوە داویانەتێ کە جێ پێی خۆی پێ نەبینێ. ئەو مەلانەی بە داوی تەپکەوە دەبن، چاویان هەیە بەڵام دیتنیان نییە. چاو یەعنی ئەوە کە تۆ دانەکەی ببینی بەڵام دیتن یانی بینینی هاوکاتی دانە و داوەکە. کە واتە هەر کە هەڵخلیسکای ئیتر هەرگیز ناگەڕێیەوە سەر جێگەی خۆت.»

فاتێ شتێکی لە دەروون دەرئاویشت، وەئاخ نەبێ وەک هیچ شتێکی تر نەدەچوو.

حاجیژن کوتی: «بۆیە لە دوام ناردی کوتم با لە یەکتر کۆ ببینەوە و جل و بەرگەکانمان بدۆزین.»

کۆزیلکەیان بەست و چرایەکی گڕسۆزیان لە ناوەندی خۆیان دانا. هەموویان خەریک بوون. حاجیژن و بووکهەنار و دایکی کە ئەوێ شەوێ میوانیان بوو، زارا و تووبا و تەنانەت میناش کە هەر دە تەمەنی مندا دەبوو و دایکم و پووریشم کە لە مێردەکەی زیز ببوو هاتبوە سەردانمان.

---

١٧- ئوستووار و گرووبان: دوو دەرەجەی سەربازیین.

بەدەس خۆم نەبوو کە چاوم نەبەست ئەو دەم کە هەموویان دەرپێکانیان دەرهێنا و خەریکی دۆزینی پزووی دەرپێکانیان بوون. زارا هەوەڵ کەس بوو کە ئەسپێیەکی دۆزییەوە. ڕەنگە خۆشیی کەشفی ئەرەشمیدۆسی یۆنانی لە حەمام دا ئەوەندە نەبووبێ کە قیژاندنەکەی دایە گیان! ئەسپییەکەم دۆزییەوەی زارا. حاجیژن کوتی: «زارا زووبە دەنێو چراکەی باوێ با بە گەرماکەی بتەقێ.»

حاجیژن دەڵێ: «کچێ وریا بن ڕشکتان لەبیر نەچێ بە دوو نینۆکی قامکە گەورەکانتان بیانتەقێنن دەنا لە دواییدا دەبن بە ئەسپێ.»

قرچەقرچی تۆقینی ئەسپێ بەرز بۆوە. من دوو چاوم لە سەر گۆشەیەکی سمتی مینا، کچە چکۆڵەکەی حاجیژن گیرسابووە. ژنەکان و کچەکان خەریکی کوشتنی ئەسپێ بوون. من وەبیر قسەکەی قالەی کەوتمەوە.

:«هەتیوە! ئەگەر چووینە مزگەوتێ لە بیرتان نەچێ سەرمان زۆرتر لەنێو حەوزی مزگەوتێ ڕاگرین با ئەسپێکانی سەرمان بخنکێن. ئاخر ئەسپێ دەچن دە مووی سەرمانەوە. ئەسپێکان، ئاغای «قاف» ئازار دەدەن. ئاغای «قاف»یش لە جیات ئەسپێکانمان ئێمە ئازار دەدا.

دە جا ئێمە دەبێ هەر چی ئەسپێیە بیانکوژین تاکوو ئاغای «قاف» ئێمە نەکوژێ. کە وا بوو ئێمە هەموو شەوێ تا بەیانی ئەسپێ لە ناو دەبەین. شەو تا بەیان، شەو هەتا ڕووناکاییەکی تر...

***

## ٥

بۆچی وا مات و کز و داماوی؟ لە چی وا پشتت لە خۆت کردووە؟ مەگین هەر تۆ نەبووی وا تامەزرۆ، نە دڕک و داڵت لە بەرچاو بوو، نە تۆز و گڵ و خۆڵ؟ هەر تۆ نەبووی دەستت لەچەند جێگەوە بە چقڵ زامدار بوو؟ بەڵام هەر لە لات گرینگ نەبوو. دەتگوت دەستت گەیشتۆتە کامە ئاواتی لەمێژینەت! تۆ بە شارەزایی ئەڵماس‌تاشێکی ئیتالیایی یان نێویۆرکی زۆر کارامە و بەئەزموون دەستت بە هێمنی و لە سەرەخۆ دەبردە نێو چقڵ و دڕو و وشترخۆرکەکان و زۆر بە وردی و بە ئاسپایی وەک ئەوەی ئاگاداری لە بەندی دڵت بکەی بەبێ ئەوەی ئیزن بدەی شریتەکە لەوەی کە هەیە زۆرتر پس‌پس بێ و لە کەڵک بکەوێ لە دڕک و داڵت دەکردەوە و لە لوێچی دەستت دەهاڵاند. کە واتا ئەی بۆچی ئێستا خەم دایگرتووی؟ دەی هەستە. دەست ببزێوە. شریتەکە لە ئەنباری خوارێ کە شاردووتەتەوە بیهێنە و خەریکی زیندوو کردنەوەیان بە. بیانخەوە سەر قەدی خۆیان؛ بە قامکی دەست شەقیان کەوە، چین و گنجیان تێدا مەهڵێە. ئەو جێگایانەی پساون بە چەسپ وێکیان بێنە. خۆ تۆ لەو کارەدا شارەزای. زۆر شریتی ئەم جۆرە کە زەبتەسەوتەکەت هەڵیپێچابوو  وەک خۆیت لێکردەوە. دەی هەستە تا درەنگ نەبووە. بەس ئەژنۆی خەم دە باوەش بگرە، لەو قالبە کۆنانەی بۆ ڕۆژی تەنگانە هەڵتگرتووە یەکیان بێنە، ئیمڕۆش بۆخۆی ڕۆژێکی مەبادایە. دەی چاوەکەم، هەستە دەی، بەس  بە فیکر و خەیاڵی خۆڕایی خۆت ئازار بدە، ئەوەی تا ئیمڕۆ ڕووی داوە و تۆ بینیوتە تەواوی هەر ئەو شتەیە کە دەبوو تا ئیمڕۆ ڕوو بدا و تۆش بیبینی، چ دەنێو ئەو دڵەتدا دەگوزەرێ؟ بیرت

بەڕێ کردووە تا کامە کەڵێن و کاژێڕ و قوژبنێکت بۆ بپشکنێ؟ بۆ نایەی کایەیەکی بە یەکەوە دەس پێبکەین. ئەگەر دەخوازی دەتوانین مەرجیشی لە سەر ببەستین. لە سەر چی؟ هەر چی کە ئەتۆ پێتخۆشە. دەی زووبە پێم بڵێ لە گەڵمی؟

من دەڵێم: «بێ شک ئەو شریتە بەیتی سەیدەوان بووە و عەلی کەردار کوتوویەتی، دەی تۆ دەڵێی چی؟ چی؟ دەی درەنگ بوو دەنگ هەڵێنێ. کێ؟ تۆ بێوازی. مەیلت لە کایەکردن نییە. بەڵام بە قسەی من بکە. ڕابە، لە خۆت زیز مەبە. ئیمڕۆ وەک ڕۆژانی تر ناچی. ئەوڕۆ تۆ دەتوانی دەخۆتدا نەمێنییەوە. ئەوڕۆ بۆ تۆ ڕۆژێکی نوێیە. کارێکت بە خۆت ئەسپاردووە. دەی بەرخی بابم هەستە، ئەوەندە خۆت مەگنخێنە.»

بەڵام وا وێدەچوو من دار و بەرد و دیوار دەدوێنم. ئەو چۆلەکە دەدوێنم کە خەریکە مێیەکەی خۆی بە دەنکە گەنمێک فریو دەدا. تۆ دوور ڕۆیشتبووی، ئەوەندە دوور کە وەبەر چاوان نەدەهاتی. وەک ئەوان دەمان کە وەبەر چاو نەدەکەوتی کەم تەمەن و شلک و خاو و ترسەنۆک و نەوسن و برسی، گرینۆک و لە هەموو شت زیز و تەنیا. تەنیا تەنیا دەنێو ئەو شتانە و ئەو کەسانەی دەورەیان دابووی. نە هی تۆ بوون و نە هەرگیز کەست. کەسی خەیاڵی خاو و نەکوڵاوی هەمیشە دوورەدەستت بوو، بەڵام هەر ڕاستیەک تەنیا لەبەر ئەوە پێوەندی دەگەڵ ساز بکەی دەبوو بە برینێکی دەروونی و ڕەوانی. هەوەڵێن پرسیارێ کە بۆت ساز بووە و هاتۆتە ئاراوە و لە بیرت ماوە، لێت بۆتە چەپۆکێک کە وەتەپڵی سەرت کەوتووە. لە دوای ئەو چەپۆکە کە وێت کەوت ئیتر نە لە دایکت، نە لە هاوەڵەکانت، نە لە مامۆستاکانت هەرگیز هیچت نەپرسی و ناپرسی کە ئەم گایە بۆچی سواری ئەو مانگایە بووە؟

تۆ هەمیشە ئەو پرسیارە لە خۆت دەکەی: «ئەی ئەوانەی لە دەرفەتی یەک سات بێخەبەری بۆ خۆشییەکی بێخەبەرانە تۆیان فڕێ داوەتە سەر ئەم گەپچاڕەزارە بۆچ دەتوانن ئەوەندە بێ ڕەزا بن؟»

چاوەکەم! ئاخر تاقەدیوێک و حەوت منداڵی زگ زلی برسی و نەوسن. ئەگەر چەپۆک و ڕەبادان و شەق نەبوایە، چۆن دەو بستە جێیەدا دەحەجمین؟

تۆ دەڵێی: «نا. من بەو لایەدا تێنەپەڕیوم.»

من دەڵێم: «گوێت بۆ قسەکانم ڕادێرە. ئەگەر بە مەیلت نەبوون لۆکە دە دوو کونی گوێت باخنە. من دەڵێم ئەگەر ناوی منیان ناوە یۆسف بۆ لێم هەڵدەشێلن و لێم دەکەنە وسوو، دەی باشە وسووش هەر ناوە ئەی بۆ کە گازم دەکەن؟ دەڵێن سەرزل دا وەرە.»

: «وا دیارە دڵت زۆر پڕە. زۆری تێدایە. لە کێ ئەوەندە تووڕەی. ئەوەی بە تۆ دەڵێ سەرزل زۆریان بە خۆی کوتوە، کەللەکەر. ئەوەی پێت دەڵێ دەڵێی بۆقی، هەزار جار پێی گوتراوە مشکەتۆپیو.»

تۆ دەڵێی: «ناوی من لە ماڵێ سەرزل بوو هەر چەند سەریشم زل نەبوو. برایەکم ناوی بابی سەگان بوو، یەکی تریان بۆری بن گوێنیان بانگ دەکرد. ئەوەی هەرە چکۆڵەیان ڕزیو بوو. خوشکەکانیشم لە گەورە بۆ چکۆلەیان، مەڕە لالێو، کەپۆ پنە و ورچە قوڵە بوو.»

من دەڵێم: «نا من ڕەش‌بین نیم بەڵام دایک و بابەکانمان بەو ئاڵوگۆڕەی بە سەر ناوەکانمانیان دەهێنا کارێکی وایان دەکرد بە درێژایی تەمەنمان نەتوانین خۆمان بناسینەوە. ئەم کێشەمان قەت کۆتایی پێ نایە.»

عەلیلە دەڵێ: «وەرن کوڕینە! با بچینە سەر شێخ مەولانا دۆعایە بۆ دایکم دەکەم.»

قالە گوتی: با بچین دایکی منیش پێی گوتم تۆزێکی تۆز و خۆڵی بەر پێی شێخ مەولانای بۆ بەرمەوە.»

من لێی دەپرسم: «دایکت خۆڵی شێخ مەولانای بۆ چییە؟»

: «دەڵێ زۆر باشە. هەر ئاوات و ئارەزوویەکت هەبێ ئەگەر تۆزێکی لە سەر زارت دانێی دەستبەجێ وەدی دێ.»

: «من پێم خۆش نییە چی دیکە بە سەرزل بانگم  بکەن. پێم خۆش نییە دایم‌ودەرهەم لە هەر لایەکەوە وێم بکەوێ.» لە بەر درگای شێخ مەولانا

ڕادەکشێم و بە زمان گڵی بەر درگاکە دەخۆم. عەلیلە و قالەش هەر وا دەکەن.

: «ئەتۆ چ دۆعایەکی دەکەی؟»

: «دەڵێم بە قوربانت بم یا شێخ مەولانا! ئەمشەو ئاغای «قاف» بتۆپێ هەر وەک سەگی.»

قالە دەڵێ: «یا شێخ مەولانا گیان! یاخودا ئەمڕۆ پێنج قڕان پووڵی ببینمەوە.»

: «قالە! پێنج قڕانی ببینییەوە چەندەمان بەش دەدەی؟»

: «یەکی پەناتێکوو دەدەمێ، نا بە عەلیلەی قڕانێک دەدەم.»

: «هەتیوە! جا چۆن ئەتۆ لە پێنج قڕانان تەنیا پەناتێکی دەدەی بە من؟»

: «بە تۆ چی پووڵی خۆمە ئەوەندەت دەدەمێ تازە زۆریشم داوێی ئەمن ماندوو بووم، دۆعام کردووە دیتوومەتەوە بۆ بیدەم بە تۆ؟»

من و قالە لە سەر شێخ مەولانای پێک هەڵدەپڕژێن. عەلیلە لێکمان دەکاتەوە.

: «بە خودای ئێوەش کەرن. کوڕە خۆ ئێستا قالە ترێکی نەدیوەتەوە، ئێوە لە سەری بە شەڕ دێن. بابە قالە ئەمن نامهەوێ قڕانەکەی منیشی بدەیە.»

قسەکەی عەلیلەم لە دڵ گران هات.

: «شۆخیم دەکرد دەنا ئەمن پووڵی قالەم بۆ چییە. بۆخۆم ڕۆژانە قڕانێکم دەدەنێ.

عەلیلە ئەوجار ڕوو دە قالەی دەکا.

: «هەموو خەتای تۆیە قالە! ئاخر ئەوە دۆعایە ئەتۆ دەیکەی؟»

: «جا بە تۆ چی عەلیلە! پێمخۆشە شێخ مەولانا پووڵم بۆ ببینێتەوە.»

: «عەلیلە لە من دەپرسێ ئەتۆ! چ دۆعایەکی دەکەی؟»

: «ئەمن. ئەمن دەڵێم یا شێخ مەولانا پێمخۆشە تازە هیچ کەس بە من نەڵێ سەرزل و...» سمایلی... ئەو دەم ئێستا ڕوخساری سمایلی... نەدیبوو خزمی بابم بوو، بابم دیتبووی. دەیزانی چەندە ڕەزاگران و ناشیرینە. هەر ئەویش ئەو ناوەی بە سەردا بڕیبووم. هەڵبەت من بە بیستنی ناوی سەرزل

له سەر خۆم هەڵدەبەزیمەوە نە بە بیستنی ناوی سمایلی... بەڵام کە گەورەتر بووم و دیمەنی ئەو کاک سمایلەم چاو پێکەوت زانیم بە هەڵە چووبووم و لە خۆڕایی ناوی سەرزلم بۆ خۆم پەسەند نەکردووە.»

قالە لێم دەپرسیێ: «جا ئەوە چییە؟ وا لە دڵت گران هاتووە. دەی ئێمە هەمووومان ناوێکی دووهەممان هەیە کە لە ناوەکەی خۆمان زۆرتر دەکار دەکریێ. هەر ئەتۆ و عەلیلە بە من دەڵێن قالە، ئەگینا هەموو کەس بە من دەڵێ چاو دەرپەڕیو. کوا ئەمن چاوم دەرپەڕیوە؟ من ئەگەر بەو ناوەم بانگ نەکەن وەدەزانم هەر لەگەڵ منیان نییە.»

عەلیلە دەڵێ: «واز لەو قسە قۆڕانە بێنن. وەرن توخودا بە دڵ با دۆعا بۆ دایکم بکەین بەڵکو پشتی چاک بێتەوە.»

فکر و خەیاڵی فاتێ، ئیزنی خواردن و خەوی بە کاوەیس نەدەدا و لە بری خەو هەر خەونووچکە بوو کە دەیکردە لیزگە[١٨]. پێی سەیر بوو ئەو چی و هەمزاغا چی؟ چۆنە بە شوێنیدا ناردووە؟ تەمای دەچی‌تر کردووە؟ کە چاوی بە کاوەیس کەوت ئێرەیی پێ بردو بۆ یەک دەم بە دڵیدا هات خۆزگە ئێستا کاوەیس دەبووم و ئاغا نەدەبووم. کاوەیس ئەودەم نەیزانی ئێستاش زۆر شتی بۆ ماوەتەوە.

هەمزاغا کوتی: «کاوەیس دەزانم فاتێی کاک وسێنت خۆش دەوێ. لە قەرار ئەویش دڵی لەگەڵتە. من نازانم ئەو شەلە چی بە تۆ کوتووە. تۆ باشتر دەزانی هەرگیز ئاغا و کچە ڕەعیەتیان نەگوتووە. نە من و نە خوشکەزایەکەم کارمان بە فاتێ نەداوە. ئەو شەلە هاتوە پێم دەڵێ کە چووم بە فاتێم کوتووە ئاغا کاری پێتە و لای تاوپەڕان[١٩] وەرە سەر کانی بزانە دەڵێ چی؟ نازانم بۆ ئەو درۆ زەلامەی کردووە. من و فاتێیان هەرگیز نەکوتوە. تۆ بچۆ بیبینە.»

کاوەیس ویستی دەربارەی سەرکڵاوەکەی خۆی لە هەمزاغا بپرسێ بەڵام وای بە باش زانی هەر باسی نەکا.

---

١٨- لیزگە: زەنگیانە و مووروو کە دەهۆنرێتەوە پێی دەڵێن((لیزگە مووروو))

١٩- تاوپەران: زەردەپەڕ. ئێوارێ. ڕۆژئاوابوون.

لای تاوپەڕان کاوەیس خۆشی خۆشی چوو بۆ لای کانیکەوان به خەیاڵی خۆشی خۆی و به پێشنیاری هەمزاغا بۆ ژوان و دیتنی فاتێ. نەگەیشتبوه سەر کانی که کەوته بەر پەلاماری پێنج براکەی فاتێ. ئەوەنده له پڕ کەوتنه سەری که بیری دەسکردنەوەی هەر نەهاته نیزیک مێشکیشی. کەس نەیزانیبوو کێ خەبەری به ژاندرمانی دابوو. کاوەیسان به نێوەگیانی، شەکەت و هیلاک له چنگ براکانی فاتێ دەرکێشا و گەیاندیانه نەخۆشخانەی سەردەشتێ، بەڵام لەوێ هیچیان دەگەڵ پێ نەکرا بەڕێ کرایه سابلاغ، لەوێش به پەله بۆ ورمێ. کاوەیس ئیتر نەبۆوه به کاوەیسەکەی جاران. ژیانێکی تازەی بەبێ خۆی و فاتێ دەس پێکرد. ئەوه پرسیاری کاوەیسه له حاڵێکی زۆر ئەستەم و ناخۆشدا.

: «دوکتور چیم به سەر هاتووه؟ چاک دەبمەوه؟ هیچ دەربارەی من به دایکم مەڵێن له تاوانم شێت دەبێ[٢٠].»

: «ڕۆڵه گیان! ورەت بەرمەده. هەر ئەوەی تا ئێره زیندوو ماوی جێی شوکره، بڕوام وایه چاک دەبییەوه. وا وێدەچێ چارەت هەر زیندوومانه.»

: «چاره چییه؟ ئاغای دوکتور؟»

: «ڕۆڵه گیان! چارەت هەمان چارەنووسته واتا ئەوەی به سەر مروڤ دێ چارەنووسێتی.»

: «یانی لات وایه ئەو بەڵایەی به سەر من هاتووه چارەنووسی منه؟ کێ ئەو چارەیەی بۆ من نووسیوه؟

:«دیاره چارەنووس کێیه. چارەنووس خودای بان سەرمانه.»

: «یانی ئاغای دوکتور! پێنج زەلام له ناکاو به گۆپاڵ وەگیانم کەون بەبێ ئەوەی ئیزنی پرسیارێکم هەبێ یا تەنانەت کوتنی «بۆ»یەک. تۆ بڵێی له بەر چی ئەمه بۆته چارەی من؟ تۆ پێت وایه خودا ویستوویەتی چی به من ڕابگەیەنێ؟»

---

٢٠- لەتاوان: لەسوێیان- لەحەژمەتان.

: «کوڕم زۆر خۆت بەم پرسیارانەوە ئازار مەدە. وردە وردە چاک دەبییەوە و بڕوام پێبکە هەموو شت لە بیر دەبەیەوە. من بە چاوی خۆم زۆر کەسم دیوە کە زۆر ڕووداوی تاڵ و ناخۆشی ژیانیان بە نەختە خۆشییەک گۆڕیوەتەوە و لە بیریان کردووە تا گەیشتوونە ناخۆشییەکی تر. وێدەچێ تۆش مرۆڤێکی باش و بەکار بی. دوایی کە باشتر بووی زۆرتر بەیەکەوە دەدوێین پێم وایە زۆرم کار پێت دەبێ.»

: «من هیچ قسەیەکم نییە. بەڵام تەنیا دایکێکم هەیە. نازانم چ ماوەیەکە لێرە کەوتووم؟ جا نازانم دایکم ماوە یا مردووە؟ بۆی نیگەرانم.»

مردووە. خات زڵەخا دوای سێ مانگ کە هیچ کەس خەبەری زیندووبوونی کاوەیسی نەدابوویە مردبوو، هەڵبەت بەر لە مردنی ئامینە شەل تا دڵی هاتبوو و توانیبووی ژاری ڕک و قینی خۆی دە گیانی ڕشتبوو. هەواڵی بەدرۆی مردنی کاوەیس و هەروەها زۆر شتی تریشی پێ ڕاگەیاندبوو.

***

# ٦

...فاتێ هیچ ڕۆژێ نەبوو کە بە ئازاریکەوە سەر نەنێتەوە. دایکی ئەگەر مابایە، بێ شک هەر جارێ کە فاتێی دیتبا پێی دەگوت: «ماڵی بابانت وێران بێ ئەو شەش منداڵەت بۆ وا زوو لەو مێردە گولەی دەرفرتاند؟»

براکانی فاتێ تا حەمە نەکوژرابوو بۆ ئەمەگناسی خۆیان لە حەمە، جارجارە سەرێکیان لە ماڵە حەمە هەڵدێنا. هەر مانگا مرد و دۆ بڕا، ماڵ بوو بە ماڵە فاتێ و ئەوانیش پێیان لەوێ بڕا. فاتێ نەیدەتوانی بە تاقی تەنیا خۆی لە ژێر نیگای قورسی سوورە چۆمێ ڕابگرێ بەتایبەتی پیاوێک لە سوورە چۆمێ نەبوو کە لە دڵیدا خەونێکی بۆ فاتێ نەدیتبێ. هەر بۆیە ئێوارەیەکی بە شەش منداڵەوە تێکیەوە پێچا و هاتە سەردەشتێ و ئەو کونەگورگەی ئاوەدان کردەوە. جوانییە بێ وێنەکەی کە ئێستاکەش لە ژێر پەردەی تەم و مەینەتی زۆرەوە هەروا بە جوانی خۆی وەبەر چاوان دەدا، بۆ کارەکەری لەدەرگای زۆر ماڵی سەردەشتێی داو گەلێ ژن و مێرد لەسەری بوو بە شەڕیان. بەتایبەتی ئەو ژنانەی خۆیان بە کەم دەدیت کە ئەو سەردەم زۆربەی ژنان وابوون. ئەو دەم بەپێچەوانەی ئێستا کە ژنان دەسەڵاتی مێردیان بە دەستەوەیە و زۆر بە تێڕادیوی دەتوانن چاو دە چاوی مێردەکەیان ببڕن و بڵێن یا ئەمن یا ئەو ژنەتیوە، ناچار دەبوون مل داخەن و خۆ گێل بکەن کە چلۆن کاتێ فاتێ دەهاتە ماڵیان، مێردەکانیان نەشەیان دەبزووت و بزەی سمێڵیان دەهات. ئەوەی لە دەست ئەم جۆرە ژنانە دەهات ئەوە بوو هەرچاویان بەسەر چاوە دڵڕفێنەکانیەوە بێ. کاتێ فاتێ دەیڕوانی،

لێوە دڵخوازەکانی فاتێ کاتێ دوو قوڵکەی بچووکی لە دوو بەری ڕوومەتی هەڵدەکەند و ڕوخساری فاتێ کە چایی وەبیر مێردەکان دەهێناوە. بەڵام خودا هەڵناگرێ فاتێ ئەو کەسە نەبوو کە کەسێک بە پیاو  بزانێ. جاروبارە کە دەیویست منداڵەکانی دە خەو بکا بە دەم ئەوشتەی کە پێی وا بوو لایی‌لاییە بۆ منداڵەکەی دەڵێ و هەویش نەبوو، بە کووچەباغی خەیاڵاتی ڕابردووی بابردووی‌دا دەڕۆیشتەوە. لە پڕ دەنگێکی ئەفسووناوی وردەوردە وەک تەمێک دە ئامێزی خۆی دەگرت و لە هەستی و هەناسەی جیای دەکردەوە.

: «وەی لە زاڵم، بە محبووبە گچکەڵانەکەم دەڵێم کە لە شیلانێکی باریکە، مەمکی ئەو بابان وێرانەی لە بۆ من بمێنێ  بە سێوە لاسوورە کە ئەوەتانێ لە باغچەی هیران و نازەنین و تازەفەریکە، وەی زاڵم نەمێنی.»

کیژ دەڵێ: «ئەگەر ئەمن ڕۆژێکی تۆ نەبینم بە نوێژی نیوەڕۆیە لێم دەبێتە شەو و دەیجوور و تاریک و چۆڵە.»

هەر چەند ئەم دەقە لە شریتێکی کاک "عەزیز شارۆخ"ەوە وەرگیراوە بەڵام چونکە فاتێ دەقەکەی خۆی بە دەنگی کاوەیس گوێ لێ ببوو، ئەو دەم کە هیچ شەوێ نەبوو لە شەوانی شێتێتی خۆی کە پڕ بە هەموو هەستی ئەم مەقامەی بە دەنگە بەسۆزەکەی بە گوێی دڵدارەکەی، فاتێ، هەر ئەو فاتێیەی ئێستا وەبیری کەوتۆتەوە نەچرپێنێ. ئەو دەقەی فاتێ لەبەرخۆیەوە دەیگوت دیارە زۆر لە ئەوەی کاک عەزیز جیاوازبوو. وێدەچوو زۆر وشەی لەبیر کردبێ و بۆخۆی وشەی دیکەی لە بری دانابێ هەر بۆیە دەقەکەی فاتێ دەقێکی نوێ بوو لەو مەقامە.

موچڕکێک بە لەشی فاتێ‌دا هات، دە لەشی دا بڵاو دەبۆوە، هەزاران هەزار گرموولەی بچکۆلەی نەستی دروست کرد. چاوەکانی بوونە دوو کەشتی و لە دەریای  بێ بنی دووتنۆک ئەسرین‌دا نوقم بوون.

ئامینە شەل دەڵێ: «کچێ دەس هەڵگرە خۆ تۆ شێت نەبووی شەق لە بەختی خۆت هەڵدەدەی. ئەو دم گولە کوا بە مێرد دەشێ. دەتەوێ دواڕۆژ لە برسان بمری؟ دەتەوێ بە درێژایی تەمەنت قەرەواشی زڵەخا دڵتۆقیو بکەی؟ دەس هەڵگرە چی دیکە ئابڕووی خۆت دەگەڵ ئەو منداڵۆکەیە مەبە. دیارە

خودا که ئەو جوانییە بێ وێنەی داوە بە تۆ، بەخت و ئیقباڵی بڵێندیشی لە پاش داوت کوتاوە. تۆخودا حەیف نییە بەم هەموو جوانی و لەبارییەوە تەواوی عومرت خەریکی ڕیخ ڕشتن و دەسکەنەی نۆک و خوری شوشتن و پشکنینی بی. تۆ قابیل بە ماڵە ئاغایانی بۆخۆت دەزانی چەندەم خۆش دەوێی. بە خودای لە کچەکەمت هەڵنابوێرم.»

ئا لێرەدا ئەگەر لەگەڵم هاوڕێ بن وچانێ دەگرم. لە پڕ بە زەینمدا هات بە وردی بەو ڕستەیەدا بێمەوە کە ئامینە شەل بە فاتێی کوت: «بۆخۆت دەزانی چەندەم خۆش دەوێی.»

ئەم ڕستەیە بۆ من زۆر ئاشنایە، لە باری دەروونناسییەوە کە ورد لێی بڕوانین، ئەوە دەگەیەنێ کە وێژەر بە زیرەکی تەواو بەردەنگ تووشی کایەیەکی دەکا کە یاساوڕێساکەی بۆخۆی دەینووسێ، واتە کاتێک تۆ بە کەسێک بڵێی: «بۆخۆشت دەزانی کە من.....» یەکەم، بەردەنگ پێویستە شتەکە بزانێ. دووهەم، نە تەنیا لە دەروونی خۆی کە پێویستە لە دەروونی وێژەرەکە بە باشی ئاگادار بێ. سێهەم، نە تەنیا ئاگادار بێ کە دەبێ ڕادە و ئەندازەکەشی بزانێ. لە هەمووی ئەوانە گرینگتر ئەوەیە کە وێژەر بە گوتنی ڕستەیەکی ئەم جۆرە، بەردەنگ بە ڕاستی بێ دەسەڵات دەکا و لە ئیختیاری خۆی دەگرێ. لە پاش گوتنی ئەم ڕستەیە لە لایەن وێژەرە کە بەردەنگ ناچارە هەرچی وێژەر پێی دەڵێت وەک ڕاستی و حەقیقەتێکی نەگۆڕ بسەلمێنێ. ئەو جۆرە پێوەند گرتنە دەبێتە هۆی ئەوە کە تۆ بەبێ ئەوەی کە ڕاستییەکەت ئەزموون کردبێ، تەنیا بە پێی ئەزموون کردنی یەکێکیتر و هەروەها بە خاتری ئەوە کە تێکەڵ بە کایەکەی خۆی کردووی، ئەو ڕاستییە بسەلمێنی. ئاکامی ئەم چەشنە یاری و کایهکردنانە دەبێتە هۆی نەوەی ئاستی بیر و هزر و هەست و عاتیفە. لە ڕاستیدا فاتێ هەر نەیدەزانی ئامینە شەل چەندەی خۆش دەوێ. ئەوەی لە دواییدا بۆی دەردەکەوێ ئەوەیە کە باس باسی خۆشەویستی ئەو نەبوو باس باسی ناخۆشویستنی بوو.

١) نکات مهم درس اقتصاد
اقتصاد کلان

ئەو چەند ڕستەی سەرەوە فڕی بە ڕۆمانەکەی ئێمەوە نییە. تەنیا هەڵەیەکی من بوو بە هۆی ئەوە کە وەک دارتێلێکی[21] بەجێماو کە ئێدارەی کارەبا هەر ئاوڕی لێناداتەوە لە سەر چەقی ڕێگا ماوەتەوە بۆ ئەوەی ڕێگا بە هەموو کەس و هەموو شت خوار بکا. منیش نەهاتم خەتێکی ڕەش بەم دوو ڕستەیەدا بێنم کە کوڕەکەم نووسیبووی و هەرگیز بە بیری‌دا نەدەهات ڕۆژێ من لە کاغەزەکانی ئەویش بۆ نووسین کەڵک وەرگرم، من کە لە بیرم نەبوو ڕەشیان بکەمەوە. ئەوەی نووسراوەکەی منی تایپ کردبوو لای وا بوو ئەوە بەشێک لە ڕۆمانەکەیە. چون وا دیارە ئەوان هەر تایپ دەکەن بەبێ ئەوەی بزانن چ تایپ دەکەن، لە کاتی هەڵەبڕیدا کە یەکێ لە هاوڕێیانی قەڵەم و نووسین ئەرکەکەی وەئەستۆ گرتبوو، ئەویش ئەو هەڵەیەی منی وەک چەشنێک تەکنیکی چیرۆکی پۆستمۆدێڕن لە بەرچاو گرتبوو کە بەس ڕوونە وا هەر نەبوو.

: «خۆت دەزانی هەروەک کچی خۆم خزمەتم پێ کردووی بە قسەم بکە چی دیکە قسە لەگەڵ ئەم دمگولەی مەکە. دوایی پێت دەڵێم کە ئاورت دە جەرگ و هەناوی کێ بەرداوە و خۆت خەبەرت نییە.»

هەڵبەت ئامینە شەل نە ئەو دەم و نە لە دواییش‌دا بە فاتێی نەگوت کە ئاوری دە جەرگ و هەناوی کێ بەردابوو. چون ئەو کەسە هەر کاوەیس بوو کە ئامینە شەل قەت ئەوەی پێ نەدەگوت.

ئازیزەکەم ئای، ئەمن ئای، ئەمن ئای، ئەمن ئای، ئەمن ئای، ئای، ئای، ئای

ئازیزەکەم ئای، ئەی جوانەکچی چەشنی گوڵی سووری موکریان، ئای، ئای لەو ڕۆژەوە تۆم دیتووە. ئای ئەمن ئای، ئەمن ئای شێواوە ژیانی من ئازیزم ئای. ڕۆیشتی لەگەڵ بۆنی بەیانانی هەڵاڵان ئای من ماوم و تەنیایی وڵات و فرمێسکی شەوانەم. دەنگی  کاک عەزیز شاڕوخ لە کاسێتێکی زۆر قەدیم کە لە ماڵمان‌دا بوو کە بەبێ مۆسیقا تەنیا دەنگی کاک عەزیز بوو پیادەم کردووە.

---

۲۱- دارتێل: دارکارەبا- عامود.

ژانێکی لە ڕادەبەدەر خۆی لە پشتی فاتێ وەستابوو، هەوەڵ دووقەد ببوو لە پاشان ببوو بە سەری گۆچان، کێویێک خۆی بە پشتیەوە هەڵاوەسیبوو. هەستی بە قورساییەکی یەکجار زۆر دەکرد. بەڵام قورسایی نەبوو. چون لە کاتی کارکردنی هەر ڕۆژەی لە ماڵاندا زانیبووی قورسایی چییە. ئەوە زۆرتر وەک بزمارێکی قورس و گەورە دەچوو کە دە ئێسکی پشتیان ڕۆ کردبێ.

بەسێ بە هانایەوە هات: «کچێ فاتێ ئەوە بۆ وا سەرت دە بەرەخۆ ناوە؟ چ قەوماوە؟»

فاتێ دەنگی تەواو گۆڕابوو. بەسێ بە بیستنی دەنگی هەڵبەزییەوە.

: «کچێ بۆ ئاوا قسان دەکەی؟»

فاتێ نەیتوانی بڵێ: «بە قوربانت بم بەسێ ئەوە خەریکم دەمرم»

بەڵام بەسێ زانیی فاتێ دەیهەوێ بڵێ: «ئەوە دەمرم. فریام بکەوە» هەڵبەت فاتێ نەیگوتبوو بە فریام بگە ئەو بەشەی بەسێ لە خۆیەوە ساز کردبوو تا بتوانێ هەرچی زووترە پەنا بۆ ماڵی حاجی مەحمەد بانەیی ببا تا ئێسترێکیان لێوەرگرێ و فاتێی باوێتە سەر پشتی، دەنا بە هیچ پشتێکیتر کە لەو ماڵەدا بوو نەدەچوو.

حاجیژن گوتی: «بێ و نەبێ دەبێ  ئارەقەی لێ سارد بووبێتەوە. بەستەزمانە لە بەری بەیانییەوە هەتا بانگی شێوان دێ و دەچێ بەبێ ئەوەی ساتێک وچان بدا.»

بووکهەنار کوتی: «جا بەو نیوەشەوە بۆ کوێی دەڕفێنن؟ کوا؟ خۆ نەخۆشخانە وەکی دی نە دوکتوری لێیە، نە کەسێک کە دوو حەبان دە گەرووی پیاوی ڕۆکەن یان دەرزێکی تێکوتن، کێ ئێستا لەوێیە؟ ئەگەر بە قسەی من دەکەن برێک خوێی گەرمی بۆ لە سەر پشتی دانێن تا بەیان دادێ ئەو دەم کارێکی دەگەڵ دەکرێ.»

خوێی گەرم و نەرم نەرم داماڵینی بەسێ، فاتێی هێندێک لە فاتێی جاران نیزیک کردەوە.

حاجی‌ژن یەک بە خۆی قیژاندی: «کچەتیوە ((تووبا)) بڕۆ ئەو ژنەتیوە بابان وێرانەی لە کادێنێ وەدەرنێ. ئەم شەو شۆرکەیەک میز و تەپێک گووی بۆ کردووین، نازانم ئەو ژنەتیوە شێتوشوورە بۆ بە ئێرە فێر بووە؟»

بووکهەنار کوتی: «ماوەیەک بوو گوڵە شێت فێری ڕەزەکەی کاکم ببوو. شەوانە دەچوو دە ئاخوڕەکەیان دا که لە نێو ڕەزە تازەکە سازیان کردووە دەنووست. بەیانیان کە وەدەر دەکەوتن دەیاندیت لە بەر درگای ژوورەکەیان سەوەتێک گوو کراوە. هەتا زانییان کاری گوڵە شێت بووە، هێندەی نەمابوو سەد شەڕ لەگەڵ جیرانەکەیان بکەن. لای خۆیان وای بۆ چووبوون کە ڕەنگە کوڕە شیرین‌عەقڵەکەی ئەوان ئەم کارە دەکا.»

گوڵە شێت ڕەهاترین عەبدی خودا بوو. نە کەسی هەبوو و نە هی کەسێک بوو. نە دوێنێی هەبوو نە ئیمڕۆ و سوور و عەیانە نە سبەی. شتێک بوو دە نێو شتەکان‌دا وەک هەوا. لە هەموو جێیەک بوو. کەس تا ئەو دەم نەیزانیبوو لە کوێ‌ڕا هاتووە؟ بۆچی هاتووە؟ لە کێ بووە؟ یان کێ لەو بووە؟ ئاخۆ لە دار بووە؟ لە بەرد بووە؟ لە دێو بووە؟ لە درنج بووە؟ لە جندۆکە بووە یان لە خۆی بووە؟ ئەوەی هەموو کەس دەربارەی گوڵە شێت دەیزانی ئەوە بوو وەک چۆن تاو هەر ڕۆژە لە پشت گردی دارەتوو دێتە دەر و تاوپەڕان لە لای نێزەڕۆیە ئاوا دەبێ. گوڵە شێتیش لە قوژبنێک کە زۆرترماڵی حاجی محەممەد بانەیی بوو بە سەری ئالۆز و تۆزاوی وەدەردەکەوت و شەوانەش وەک نیسێ کە لە خاوەنەکەی‌دا دەتوێتەوە، لە شەودا شرتوگوم دەبوو و دە هەناوی خەستوخۆڵی شەودا ئەوەندە دەخولاوە تا شوێنێ وەدۆزێ و تاوێ لێی وەحەسێ و بیچمی گوویەکی خۆی بۆ بەرەبەیانی لە بن درگایان بنەخشێنێ بەڵام لە ئاکام‌دا هەر ماڵە حاجی محەممەد بوو کە دەبوونە خاوەن بەرەکەتەکەی گوڵە شێت. گومان لەوەدا نییە کە خودا بە گوڵە شێتیشی بە قەرا هەر مرۆڤێکی تری خۆی ئازا و ئەندام دابوو. بەڵام تایبەتمەندی گوڵە شێت لەوەدا بوو کە لە دوویانی زۆرتر لە هەموو ئەندامەکانی تری لەشی کەلک وەردەگرت، هەوەڵ زاری بوو کە هەرچی ددانە نەماوەکانی گوڵێ پێی نەشکابا ئەوە بە زاری‌دا

هەڵدەخلیسکا خوار و خودا دەزانێ لە کوێیدا دەگیرساوە. پێم وا نییە کەس وەبیری بێتەوە کە شتێک چووبێتە زاری گوڵێ و تازە ڕەنگی دەرەوەی دیتبێتەوە. لە گەرم و سارد، لە ڕەق و نەرم، لە تفتوتاڵ، لە توند و تیژ، لە ترش و مزر، لە شیرین و مەیلەوخۆش، لە کوڵاو و نەکوڵاو، لە بەتام و بێ تام بۆ گوڵێ فەرقی نەدەکرد و هەمووی ئەوانە دە قوڕگی گوڵێ شێتدا بڵێی یەک و دوو دەبوونە جنێو، چ جنێوێک ڕەنگە دە فەرهەنگەکەی «کووچە»ی ئەحمەدی شاملووشدا وێنەیان پەیدا نەبێ و تا ئێستا بأوەڕ ناکەم فەرهەنگی هیچ میللەت و گەلێکی سەربەخۆ، یان ناسەربەخۆ هەرگیز جنێوی ئاوای بە خۆیەوە دیبێ و نە هەرگیز بۆی ساز دەبێ، بەڵام ئەندامی دووهەمی گوڵێ کە هەر چەندە بێئەدەبیشە، بەشی زۆر خوارووی لەشی بوو کە هەرچی بۆی نەجووراباا چونکە مرۆڤ شتی بە ددان دەجوێ ئەویش تاقە ددانێکی نەمابوو، بەری بەیانیان لە بەر درگا و بانی خەڵک هەر دەم بە نەخش و نیگارێکی تازەوە دەیچاندەوە.

گوڵێ بە تووبا دەڵێ: «وەی دە دمی بابی ئەو کەسەی بڕیم[22] بانگت دەکا تووبا. دیار بوو هەر کەس ویستبای تووبا بانگ بکا دەبوو ناوی بێنێ و تازە ئەودەمە بوو کە دەمی بابی ئەو کەسە دەبوو بە دەرک و بان و ماڵی هەموو کەس.

تووبا لە کادێنێ ڕا هەرای کرد: «دایە چبکەم ئەو ژنەتیوە شێتوشوورە ناڕواتە دەر و هەر جنێوی پیسیشم پێدەدا.»

حاجیژن قیژاندی: «هەتیوە عەوڵا لە کوێی؟ بۆ ناچی ئەو ژنەتیوە شێتو شوورەی بەردەباران بکەی.»

گوڵێ شێت لە کادێنێ دەرپەڕی لە حاڵێکدا نە دار مابوو، نە کا مابوو و نە بەرد مابوو، نە سەتڵ مابوو نە ترومپایەکەیان نە گەسکە کۆڵەی قوژبنی حەوشە کە تێیان نەڕیابێ.

---

٢٢- دەدمی بابی... بڕیم: جنێوێکی باوی نێو ژنانە لە موکریان.

بڕیم: گوی تێ بکەم.

عەلیلە کوتی: «گوڵێ وەرە بتبەم لە ئاغای «قاف»ت مارە بکەم ژنی نییە و لە ژنێکی زۆر جوانی وەک تۆ دەگەڕێ. هەر چاوی پێت بکەوێ بۆت شێت و شەیدا دەبێ.

قالە کوتی: «عەلیلە ئەوە دەڵێی چی وەڵڵا گوڵێ هەر گووشی بۆ ناکا. جا چۆن مێرد بە ئاغای «قاف» دەکا. تۆ نازانی کێ ناردوویەتە سەری و مێردی پێ نەکردووە؟»

گوڵە شێت بە قالەی دەڵێ: «هەتیوە سەر دەرخۆنەیە[٢٣] کوڕی شای چی؟ بایزاغاش داوای کردووم مەگین گووم ببینێ.»

عەلیلە دەڵێ: «گوڵێ ئەرێ ڕاستە دەڵێن بە جەوانی[٢٤] زۆر جوان بووی؟»

: «هەیهوو لە بەر هەتیوی فاتێ قوون باگردانی، خۆ لە دایکت جوانتر نەبووم». ڕۆ بووە بەردێکی و تێیهەڵکردن بەڵام نەیئەنگاوتن. ئەوانیش وەکوو مزرەق بە دەوری گوڵە شێتدا دەسووڕان.

گوڵێ عاشقە و سووتاوە　　　کوڕی شا بۆی نەماوە
شازادە دەبێ حەیا کا　　　گوڵێ گووشی بۆ ناکا

***

---

٢٣- دەرخۆنە: تەنەکەیەکی پان کە لەسەر تەندوور دادەنرێ.

٢٤- بەجەوانی: بەلاوی. بەگەنجێتی.

# ٧

...... نیوتۆن کوڕە جوولەکە بوو. بابی لە سەردەشتێ زێڕینگەریی هەبوو. هەڵبەت تەنیا جوولەکەیەک بوو کە لە هەڵبژاردنی شوێنی ژیان تووشی هەڵە ببوو. چون ژنانی ئەوێ لە بری زێڕ زیاتر زیویان بەخۆیانەوە دەکرد. زێوەکەش زۆرتر دوو قڕانی قەدیمی بوون کە قەتارە و گوارەی بە بەند و سووخمەبەند و شتێکی وەک سەرپشتێند و یەخەبەرۆکی ئەوڕۆیان پێ ساز دەکرد. بابی نیۆتۆنیش ناچار بوو  لەباتی زێڕینگەری، زێوینگەری بکا، بەڵام بە گشتی پیاوێکی باش و سەروڕوو خۆش بوو. کە کوردیی دەگوت هەر خۆش بوو ئیتر وەدوای هیچ کارێکی خۆت نەکەوی و لە لای بمێنییەوە و پڕ بە دڵت بە قسەکانی پێبکەنی. هەر وەک لە بەشی سێهەمدا ئاماژەم پێ کردووە، دراوسێمان بوو. ئەوەی دەربارەی نیۆتۆن لە بیرم ماوە ئەوانەن: هاوتەمەن بووین ئەڵبەت وریا بن باسی بابی ناکەم باسی خۆی دەکەم. بێ باب گەورە بوو. وەک دەگێڕنەوە سێ مانگ بەرلەوەی لەدایک بێ نیۆتۆن بابی لە پڕ مردبوو، خاڵی نیۆتۆن کە ئەویش لە سەردەشت دەژیا و دووکانی وردەواڵەی هەبوو چاوی بە سەریانەوە بوو. کوڕێکی تا بڵێی نەوسن بوو. بەڵام سەرەڕای ئەو نەوسنی‌یەی لە گەڵمان نەدەهاتە دزیی باخ و ڕەزان. ئەگەرچی بەشی زۆری ئەو شتانەی ئێمە دەماندزی ئەو بەقوزەڵقورتی دەکردن. ئەوەی سەیرە ئەوە بوو ئەگەر نیۆتۆن دەستی بە خواردەمەنی ئێمە ڕاگەیشتبایە هەر وەک گەزۆ و مازوان دەیخوارد. لە حاڵێکدا ئێمە لە ترسی گولبوون نەدەبا هیچ شتێکی لێوەربگرین. حاجی محەممەد بانەیی ساحێب ماڵەکەمان دەیگوت ئەوەی شتی جوولەکان بخوا گول دەبێ. هەڵبەت هەموو

جارێش ڕەسوە گولەی کە لەو بەر دووکانی ئاسینگەری و ناڵبەندییەکەی حاجی، خوانچەیەکی دانابوو و وردەواڵەی دەفرۆشت، پێشانی دەداین و دەیگوت:

: «چاو لەو گولەی بکەن. دەزانن بۆ ئاوا گول بووە؟ گێژە سەردەمێک حەزی لە کچە جوویەک دەکرد. خواردەمەنی لە دەس کچەکە خوارد و ئەو ئاوا گول بووە. من ئەو دەم زۆر لە نیۆتۆن نیزیک بووم، ناوی بچووکی ئیسحاق بووە. دەڵێن مەلا سەدیق بە بابی گوتبوو وەرە ئەگەر کوڕت بوو ناوی بنێ عومبەر[٢٥] بەڵکوو لە قیامەتدا خودا بە حورمەتی ئەو ناوە پیرۆزە لەو کوڕەت خۆش بێ. دەڵێن بابی نیۆتۆن ئەو قسەیەی زۆر لە دڵ گران هاتبوو و پێی گوتبوو

: «مامۆستا ئەو قسەیە لە تۆ ناوەشێتەوە، من بە نیازم ئەگەر منداڵەکەم کوڕ بوو ناوی بنێم ئیسحاق، دیارە وەک بیستوومە لە قوڕئانیشدا ئەم ناوە هاتووە ئەگەر خودا نەیبەخشێ هیچ کارێکی دەگەڵ ناکرێ چ عومبەر بێ چ ئیسحاق.»

مەلا سەدیق دەڵێ: «ئەو زێڕینگەرە مەلعوونە کفری کردبوو، هەر بۆیە وا زوو مرد و چاوی بە کوڕەکەی نەکەوت.»

دەڵێن ئیسحاق بە پێی وەسییەتی بابی بوو بە ئیسحاق. بە یەکەوە لە قوتابخانە لە سەر کورسییەک دادەنیشتین. ئەو ساعەتانەی دەرسی دینی و قوڕئانمان هەبوو ئیسحاقیان لە کلاس وەدەر دەنا. کە وەدەر دەکەوت چاوێکی تەوساویی لە ئێمە دەکرد و ئێمەش لە بەر ئەوەی هەقلەمەقۆمان[٢٦] نەچێ هەزار جار خۆزگەمان دەخواست بریا جوولەکە باین.

ئەوە با بڵێم: «من هەرگیز بڕوام بە قسەکەی حاجی محەممەد نەبوو کە دەیگوت هەر کەس نان و شتی جوولەکان بخوا گول دەبێ، ئەگەر ڕاستتان

٢٥- لەبەشێکی زۆری ناوچەی موکریاندا عومەر ئاوا دەردەبڕن.

٢٦- هەقلەمەقۆ: یاری و گەمەی منداڵان.

دەویَ زۆر جاران لە ماڵە ئیسحاق خواردنم خواردبوو نەک گول نەببووم زۆریشم پیَ خۆش بوون.»

ئیسحاق زۆرتر لە دەوروبەری ڕەزی حەمە قالیل دەخولاوە. کە ڕۆژێک پرسیارم لێکرد.

: «ئەریَ نیۆتۆن ـ ئەودەم ئێمە خەڵکی لاوەکیمان بە ناوی خۆیەوە بانگ نەدەکرد. تۆ بۆ ئەوەندە لە دەوروبەری ئەو ڕەزە دەخولێیەوە؟»

: «با لە بەینی خۆماندا بیَ، نابیَ جاریَ بە هیچ کەسی بڵێی. من بەنیازم قانوونی جازیبەی زەوی کەشف بکەم.»

: «قانوونی جازیبەی زەوی ئیتر چییە؟»

دەڵیَ: «ئەوەتا. تۆ چاو لەو سێوانە بکە بەو دارەوەن.»

کوتم: «دەی باشە ئەوە چاوم لێکردن.»

پێم دەڵیَ: «هەرگیز بیرت لەوە کردۆتەوە کاتێک سێوێک دەگا و لە دارەکە بەر دەبێتەوە بۆ دەکەوێتە سەر زەوی و ناچیَ بۆ ئاسمان؟»

لە قاقای پێکەنین دەدەم دەڵێم: «گێژۆڵڵا. بۆ چما سێو، سێروویە[٢٧] باڵی هەبیَ و بفڕیَ بۆ سەران؟» پێم وایە ئەتۆش عەقڵت گۆڕاوە. هەتیوە نیۆتۆن نەچی لە لای کەسێکی تر ئەو قسەیەی بکەی دەنا دەڵێن، گوڵە شێت ئەتۆی بووە.»

بزەیەکی هاتیَ کە ئێستاش هەر لە بەر چاومە. ساڵێک دواتر خاڵی تێکەوەی پێچان و لەگەڵ خۆی بردنی بۆ ئیتالیا. نازانم ئێستا چۆنە و چ دەکا. بەڵام زۆر کوڕی چاک بوو، هەمیشە دۆعای بۆ دەکەم خودا ئاگاداری بیَ.

عەلیلە دەڵیَ: «وەرن کوڕینە با بڕۆینە سەرانگوێلکی ماڵی حاجی حەمەدئاغا. دیتم زبڵێکی زۆریان لیَ ڕشتووە.»

باڵ دەگرین، دەفڕین بیَ خەم و خەیاڵ. سەرخۆش و ڕەها و سەرمەست، لە پشت ماڵە وەستا ئەحمەد لیَهالابابن کە لێی هالاین لەویَ بووین.

---

٢٧- سێروو: رەشۆڵە- ریشۆڵە.

قاله خۆی بۆ ڕانەگیرا بە خۆشییەوە قیژاندی: «ئەی گیان ئەو هەموو زبڵەی ئەورۆ ڕشتوویانە.»

کەوتینە گیانی زبڵوزاڵ. دەستمان لە پیمەڕە بەکارتر بوو. خۆمان نەماندەزانی لە چی دەگەڕێن، گرینگیش نەبوو، هەرچی دیتبامانەوە هەر ئەو شتە بوو کە لێی دەگەڕاین.

قاله گوتی: ئەی گیان عەلیلە ئەمن بزمارێکم دیتەوە هیچ خواریش نییە.»

من خولخولەیەکم دیتەوە. عەلیلە جیلێکی[28] درێژی دوزییەوە. قاله توورەکەی بەتاڵی خەنە. من باوەشێنێکی دڕاوی حەسیر. عەلیلە دەرزیلەی سەران. من شانەیەکی تەختەی دوو سەری قژی ژنان. قاله قوتووی بەتاڵی بۆیاغی کەوشان. من بەردەپێیەکی شکاو. عەلیلە چیتری نەدۆزیبۆوە کە لە پڕ قاله قیژاندی ئەی گیان خودایە ئەمن پزدانێکم[29] دیتەوە. دەتکوت من و عەلیلە دۆزیومانەتەوە هەرتکمان بە یەکەوە هاوارمان بەرز بۆوە، ئەی گیان. قاله هەر کە ویستی هەڵیدا شتێک وەک چڵم بە دەم و لیچی پووچی قالەدا شۆڕ بووە. دەستی کرد بە جنێودان: «سەگبابانە پڕیان کردووە لە تف و چڵم. پەڕۆیەکیان وەگیر نەکەوتووە کە چڵمی دەپزدان دەکەن؟»

کوتم: قاله با بچین لە سەرچاوەی بیشۆینەوە و هەڵیدەین.»

بە دەسکەوتەکانمانەوە بە غار هەڵاتینە سەر سەرچاوەی شار. پزدانەکەمان بە جوانی شوشتەوە و قالەش دەمولیچی خۆی. گوپمان بۆ نەمابووە هەتا توانیمان پزدانەکە هەڵبدین، وەک هیچ پزدانێکی نەدەچوو کە تا ئەوێ ڕۆژێ دیتبوومان. گووپی ئەکوانی دێوی[30] دەویست تا هەڵیبدا. زۆر زۆری خایاند تا زانیم ئەوەی ئەوێ ڕۆژێ بە حاڵی سەگ هەڵماندابوو پزدان نەبوو بەڵکوو شتێک بوو کە بە عەقڵی مرۆڤ گەیبوو بۆ بەرگریکردن لە زۆر بوونی تووتکەسەگی وەک ئێمە، و ئەوەی بە لیچی پووچی قالەدا شۆڕ ببووە

---

٢٨- جیل: جیر.

٢٩- پزدان: فوودانە- میزەڵدان.

٣٠- ئەکوانی دێو: ئەو دێوەزمەیەی لە چیرۆکەکەی ئەمیر ئەرسەلاندا هەیە.

چڵمی منداڵان نەبوو بەڵکوو تووی پیاو بوو کە دەڵێن هەر ئەوەندەی بە دەم و لیچی قالەوە شۆڕ ببۆوە بۆ ئاوسکردنی تەواوی ژنی ئامادەی سەر زەوی بەس بوو، و قالەی بەستەزمان ئێستاش کە ئێستایە ڕەنگە نەیزانیبێ چ قورساییەکی بە دەم و لیچی هەڵگرتبوو، هەڵبەت چونکە من زۆرتر دەگەڵ نێۆتۆن دەخولامەوە تا ئەو دەم کە کۆچیان نەکردبوو زۆر شتی لێ فێر بووم، دەوبارەشدا کە بۆم گێڕاوە هەڵبەت زۆر دواتر، ئەو شتانەی پێ گوتم. ئەگینا پێم وایە عەلیلە و قالە ئێستاش لە سەر ئەو باوەڕەن کە ئەوەی ئەوێ ڕۆژێ بە حاڵی سەگی هەڵمان دا پزدان بوو.

حاجیژن دەڵێ: «لەوەتی ئەو ژنەتیوە شێتوشوورە فێری ئەو کادێنەی بووە بەرەکەتیش لە ماڵمان بڕاوە. من نازانم کەی و بە کوێدا خۆی تێدەکوتێ. دەڵێم کچەتیوە زارا کە هات تاریک بێ ئەو درگایە گاڵە دە با ئەو دێوەزمەیە نەیەتە ژوورێ. کە چی ئەو ئەستۆشکاوە بۆ مێرد دڵ تۆقیوە، هێند سەر بە کووچەدا دەکێشێ هەتا لە بیری دەچێتەوە درگاکە دابخا. هیچ سەگباب و گۆڕ بە گۆڕبابێکیش ڕێگای لێ ون نابێ تا بێتە ئێرە و ئەو دڵ تووقیوانەمان لە کوڵ بکاتەوە.

بووکهەنار کوتی: توخودا ئامۆژن! ئەو قسانە چییە دەیکەی؟ خۆ زارا و تووبامان پێوە نەبن کەوڵمان لە حاجەت دەکەوێ. خۆ مینا جارێ شلکە و بۆ کاری قورس نابێ. نابینی ئەو دو بەستەزمانە لە بەری بەیانان هەتا درەنگانی شەو یەک پشوو لە سەر پێ ڕاوەستاون. پێتوایە ئەو هەموو ڕیخە کێ دەیرێژێ؟ کێیە  تفاق دەبەر مانگایان دەکا؟ کێ دەیاندۆشێ؟ کێ مەشکەی دەژێنێ؟ کێ ئاوردوو دێنێ؟ کی تەندوور دادەخا؟ کێ هەویر دەشێلێ؟ کێ ئەنگوتک دەگرێ؟ کێیە پێوەی دەدا؟ کێیە؟

حاجیژن قسەی پێ بڕی: «باشە، باشە. زۆری لە دوو مەدە. ئەمن زگم بە تۆ دەسووتێ، هەموو ڕۆژێ دەبێ تەپێک گووی ئەو ژنەتیوە بڕێژی. نازانم بووکهەنار بۆچی ناهێڵی ئەو هەتیوە چاوشۆڕە لە باتی تۆ بیرێژێ؟»

: «ئامۆژن! تۆخودا گوناحت دەگاتێ ئەوەندە کەریم ئازار مەدە. خۆ ئەویش هەر کوڕی تۆیە، یەکی وەک ئەحمەدە وەک عەولایە.»

: «داوێکی بێنە. جارێکی تر قسەی وام گوێ لێبێ، ئەوەی پەندی دنیایە بە سەرت دێنم.»

بووکهەنار بێدەنگ بوو تا من بڵێم: «بووکهەنار بووکی حاجیژن بوو. من تا ئێستا هیچ ژنێکم لە سەر زەوی نەدیوە تا ئەو ڕادەیە لە سەرەخۆ و لە خۆبردوو بێ.» لە هەموو کەسم خۆشتر دەویست تەنیا دوایە نازێم لەو خۆشتر ویست. بە نیگای مێهرەبان و بزەی هەمیشە لە سەر لێوی، ئەوەی دایکم لێی دریغ کردبووم بۆی وەدی دێنام. کە دەیدواندم هەرچی ترس و دڵەڕاوکە بوو لە دڵمی دەتاراند. کەم هەڵدەکەوت کە نەڵێم خۆزگە ئەو دایکم دەبوو.

من ناوی بیست و یەک جندۆکەم لەبەر کردبوون. چوار لەو جندۆکانە هی حاجیژن بوون کە بە سەرهاتەکەیانم موو بە موو لە زاری قۆستبۆوە و هەر جارێک وەبیر خۆمم دەهێناوە بەتایبەت کە شەو دەبوو موو بە مووی لەشم لە ترسان دەبوو بە نەشتەر. ئەو چوار جندۆکەیە بریتی بوون لە ١ـ مەلۆس ٢ـ پەمۆ ٣ـ خاڵدار ٤ـ باڵدار. لەو چوارانە بە قسەی حاجیژن ئای لە مەلۆس چ جندۆکەیەک بوو! سێ دانەیتریان خات ئامانی دراوسێمان پێی ناساندم. پێمی نەدەناساند تاکوو ئەوەندەی لە بەر پاڕامەوە هەتاکوو ڕازیم کرد باسیان بکا. دەیگوت لەوانەیە شەوێ بۆ تۆڵە ئەستاندن بچنە زگی. سێ جندۆکەکەی خات ئامان ئەوانە بوون: شەش قامک، شەوشەوە و شەوسار. پێنجیان لەو جندۆکانەی ناویانم لەبەر کردبوون حاجیمحەممەد دەیگوت کاتێ لاو بووە بە چاوی خۆی دیتوونی و دواندوونی. دەیگوت جندۆکەکان ئاوا خۆیان پێ ناساندووە: فاتە سوور، مەلەنگ، سەرقژن، پێکوڵ و دەڵێ. چوار دانەشیان، دایە گەورەی خۆم بۆی گێڕابوومەوە کە کێ بوون. یەکیان لەو جندۆکانە کە بەبێ شەرمێوە پێشیان بە مەلا مینەی بابی دایە گەورەم گرتبوو، ناوەکەیم لە بیر نەماوە. ئاخر ئەو دەم ئەوەندە لەو جندۆکەیە دەترسام لەوانەیە بە ئانقەست لە بیری خۆم بردبێتەوە. دووهەمیان گەزنەدار و سێهەمیان میرئاو و چوارەمیان بەرلەکوڵە بوون. ئەو جندۆکانەی دایە گەورەم بە ڕاستی زۆر سەقەت و بێ ڕەزا بوون. چوار پێنج جندۆکەی تر

کە عەلیلە و قالە باسیان دەکردن چونکە هەر لێیان نەدەترسام ناویانم لە بیر نەماوە، ئاخر عەلیلە و قالە بۆخۆیان نەیاندیبوون، زۆرتر لەم و لەو ناویان بیستبوون من پێموایە ناوەکەشیان بە هەڵە دەکوت هەتا نیۆتۆن هاوەڵم بوو هەموو جارێ پێی دەگوتم: «بڕوایان پێ مەکە. جندۆکە هەمووی درۆیە. تەنیا لە بەر ئەوەی بتترسێنن بۆ ئەوە کە بێدەنگ بی و هیچ نەڵێی ئەو چیرۆکانە ساز دەکەن»

بەڵام من دەڵێم: «دە با شەوێکی نیۆتۆن بێتە ماڵی ئێمە و ناچار ببێ بە تاقی تەنیا نیوەشەو بچێتە ئاودەستان لەو بەری ئەو حەوشە گەورەیە ئەگەر بە چاوی خۆی لە جیاتی بیست و یەک جندۆکە، بیست و یەک هەزاریشی نەدی هەرچی دەڵێ با بیڵێ. نیۆتۆن لە کوێ دەزانێ کە من چەندە گریاوم هەتا بتوانم دایکم ڕازی بکەم لە جیات کێشی ڕەحەتیەکەم، دۆخینم بۆ تێهەڵکێشێ هەموو کەس وەباڵ بەو ڕاستییە دەکێشێ کە دوژمنی ژمارە یەکی جندۆکە دوو شتن: دۆخین و بیسمیلا. ئەگەر دەست بە دۆخینەکەت بگری و یەک لە دوای یەک بڵێی بیسمیلا، بیسمیلا، بیسمیلا، ئەوەی جندۆکەیە لە دنیادا لە چاک و خراپیان، لە ورد و درشتیان هەڵدێن، تەنانەت ئەو جندۆکەیەش کە بابی دایە گەورەم یانی مەلا مینە تووشی هاتبوو و بە چاوی خۆی دیتبووی کە لینگێکی لەو سەر شار داناوە و لینگێکی لەو سەری شار و داهاتبۆوە و ڕوو بە مەلا مینەی بەستەزمان. گوایە هەر ئەوەندی پێگوتبوو: «مەلا مینە ئەوە ئەتۆی؟»

مەلا مینە جا نازانم ئاخۆ دۆخینی نەبووە یان ئەوەندە ترساوە یان ئەو جێگەیەی لێی ڕاوەستابوو لە مابەینی دوو لینگی ئەو جندۆکەیە دەبێ چی هەڵاوەسرابێ و چی دیتبێ کە بیسمیلاشی لە بیر چۆتەوە. ماوەی شەش مانگ بەبێ زمان لە سەر جێی کەوتبوو. من نێوی ئەو جندۆکەیەم زوو لە بیر خۆم بردەوە. پێشتر کوتبووم کە ئەوەندەی لێدەترسام. پێم خۆش نەبوو هەرگیز نە بۆخۆم و نە کەسێکی تر ناوی بێنێ ناوێکی زۆر سەیری هەبوو وەک زەندەقبەرە یا زەندەقچەڕە. هەر چەندە ڕەحەتی کێشدار خۆشترە لە پانتۆڵی دۆخیندار بۆ هەڵکێش و داکێش پێ کردن. بەڵام دۆخین ئەوەی هەیە

دەتپارێزێ لە جندۆکان. من تاکوئێستا لە سەر دۆخین زۆرم وێکەوتووە[31]. ئاخر لە پێش‌دا نەمدەزانی چۆن گرێ لە دۆخین بدەم. هەموو جارێ لێم گرێپووچکە دەبوو. هەتا دەهاتم بیکەمەوە، بەتایبەتی لە زستانان کە هەم جندۆکە زۆرتر بوون و هەمیش دەستم بە سەرمایە دەچوو و دۆخینەکەم بۆ نەدەکراوە میزم بە خۆم‌دا دەکرد، هەر چەندە عەیبیشە چەند جارێکیش خۆم پیس کرد و چاکتر لە جارانم وێکەوت. بەڵام هەر چی بێ بە ڕای من وێکەوتن باشترە لەوەی لە پڕدا لەگەڵ جندۆکە ڕووبەڕوو بی، خۆ دیارە لە نێوچاوانی جندۆکەکانیش وەک نێوچاوانی ئینسانەکان نەنووسراوە کامەیان باشن و کامەیان خراپ، کە وا بوو باشتر ئەوەیە لە پێش‌دا هەموویان بە خراپ بناسین.

هەموو جارێ کە وێم‌دەکەوت گوڵە باخ بە منی دەگوت: «ڕۆڵە گیان! ئەوانە بە درۆ وات پێ دەڵێن. جندۆکە هەر نییە. ئەوەی پێت‌وایە جندۆکەن، هەموو نیسێی دار و خشپەی گەڵا و ترپەی پێی ڕێبوار و شەققەی ناڵی ئەسپە لە سەر بەرد. خەڵک لە بەر ئەوەی دە تاریکایی دان لەو شتانە دەترسن. دەنا ئەگەر چرایەک لە تاریکایی‌دا هەڵکرابا، دەیاندیت کە هیچ جندۆکەیەک لە ئارادا نییە.»

من دەڵێم: «باجە گوڵێ! ئەی ئەوە نییە چ بەڵایەکیان بە سەر گوڵە شێت هێناوە؟»

گوڵەباخ ئاخێکی لە ناخەوە هەڵکێشا و گوتی: «ڕۆڵە! زوویە ئەو شتەت لێ حاڵی بێ. ئەوەی گوڵە شێتی تووشی ئەم حاڵ و ڕۆژە کردووە کاری جندۆکە نەبوو کاری ئەوینە. ئەوین.»

من ئەودەم نەمدەزانی چەندەم نازێ خۆش دەوێ تا بزانم ئەوین یانی چی؟

***

---

٣١- زۆرم وێکەوتووە: زۆرم لێدراوە. تێهەڵدانم زۆر خواردووە.

## ٨

عاشقان دێن لە دوور دیارن          ڕەنگیان زەرد و لێو بەبارن
مەنعیان مەکەن ساحێب یارن          بە دەردی دڵ گرفتارن

ئەوە شێعری گورانییەکی زۆر خۆشی حەسەن زیرەکە کە لە ئێزگای ڕادیو کرماشان تۆمار کراوە موسیقا ژەنەکانی کەسانێکی وە موجتەبا میرزادە و عەبدولسەمەدی و چەند کەسێکی دیکە موزیکیان بۆ لێداوە.

ئاوێنە پەیامێکی ناخۆش و دڵتەزێن بوو کە خستیانە نێو دەستی کاوەیس. هەر ئەو کاتەی ئەو گورانییەی حەسەن زیرەکی گوێ لێدەبوو، بە درێژایی تەمەنی نەگریابوو، یان هەر وەبیری نەدەهات گریابێ. دایکی ئیزنی نەدەدا بگری. دەیوست کاوەیسی کوڕی ببێ بە پیاوێکی لێهاتووی وێچوو، گریان ئەوڕوخسارە پیاوانەیەی کاوەیسی ناحەز دەکرد و ئەو ئاواتەی دایکی ناڕەوا. دآیکی پێی دەگوت: «کوڕم کاوەیسە! گریان بۆ پیاو نەهاتووە.»

هەر بۆیە کە خۆی دە ئاوێنەدا دی هەر چەندە لە وێنەی تازەی خۆی سڵەمییەوە، بەڵام ڕێگەی سەرچاوەی فرمێسکی نەدۆزییەوە. هەر باشتریش ئەوە بوو کە نەیدۆزییەوە دەنا ڕەنج بەخەسار و دەست بەتاڵ دەگەڕاوە چونکە سەرچاوەی فرمێسکەکەی بە تەواوی کوێر ببۆوە و حاشا لە دڵۆپێکی. هەر لە بن چاوی چەپی بە سەر ڕوومەتە گەش و شەقەکەی‌دا هێڵێکی کەوانی تا بن گوێی، سووچی چاوی چەپی ئابڵۆقە دابوو. کاوەیس هەر ئەو دەم بڕیاری دابوو کە تازە نەگەڕێتەوە وڵاتی خۆی. هەر چەند کە دوکتور دڵنیای کردبوو کە بە تێپەڕبوونی زەمان ئەو خەتەبرینە خۆ دەگرێتەوە و وردە وردە ئاسەواری نامێنێ. کاوەیس لە دوای ئەوە کە زانی لە کوێ کەوتوە و خۆی دە ئاوێنەدا دیت هەوەڵین پرسیارێک

که بۆی دروست بوو ئەوە بوو: «ئەرێ بێتوو فاتێ بمبینێ کە چم بە سەر هاتووە دەبێ بڵێ چی؟»

لێرەدا ئەو مەبەستە بو من سەرنجڕاکێشە. کاوەیس لەوەتی چاوی کردبۆوە دایکی خۆی دیتبوو کە بە چ لەخۆبردوویی و سەختی و دژوارییەک ئەوی گەورە دەکرد. گیانی دە گیانی کاوەیسدا بوو. دڕوویەک لە دەستی کاوەیس ڕۆچووبا، دایکی هەستی پێ دەکرد و هاواری بەرز دەبۆوە. کاوەیس سەرەڕای ئەو خۆشەویستییەی دایکی کە هەستی پێ کردبوو، ئەوەی بۆی گرینگ و مەبەست بوو فاتێ بوو. سەیرە دایکێک بە هەموو فیداکارییەک کە دەرحەق بە منداڵەکەی دەکا دە کێشەیەکی عاتیفی‌دا هەڵبەت ئەگەر بوێرین نێوی کێشەی لێ بنێین، هەمیشە بە یەکی تازە پێ گەیشتوو دەدۆڕێنێ. بڵێی هۆی ڕاستەقینەی ئەم مەسەلەیە چ بێ؟ فاتێ تەنیا چەند نیگا و بزە و قسەی پێشکەش بە کاوەیس کردبوو و لەم لا خات زڵەخا خوێن و حەیات و جوانی و هەست و نەست و هەرچی کە هەیبوو لە ئاوات و ئارەزوویەکانی را بگرە هەتا حەز و مەیل و خەون و خەیاڵەکانی، هەمووی بە کاوەیس بەخشیبوو. بەڵام ئێستا لە تاران لە سەر تەختی نەخۆشخانە، تەواوی داهات و سەرمایەی دایکی ئەو چەند بزە و نیگا و قسەیەی فاتێ ناهێنێ. ئاخۆ بە هۆی ئەوەوە نییە کە خات زڵەخا ڕووی لە ڕابردوویە و فاتێ ڕووی لە داهاتوو؟

کاوەیس بە هۆی مافی زیندووبوون و لاوبوونی دەبێ لە ڕابردوو کە ئیستعارەکەی دایکێتی دابڕێ و ڕوو دە داهاتوو کە ئیستعارەکەی فاتێیە بکا. کە وا بوو چەشنێک ناچاری کاوەیس لە فاتێ گرێ دەدا هەر ئەو ناچارییەیە کە کاوەیس لە دایکی جیا دەکاتەوە. لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە لە نالەبارترین حاڵ و وەزعیش‌دا دایک هەروا دایک دەمێنێتەوە. لە حاڵێک‌دا لە وەزع و حاڵێکی نالەبار و خراپ‌دا خۆشەویست و خۆشەویستی، حەز و حەزلێکردوویی عاشق و ماشق دەتوانن تووشی ئاڵوگۆڕ بێن کە ڕەنگە کاوەیس لەو مەبەستەش نیگەران بووبێ. هەروەها دەکرێ بڵێین جیاوازی دایک و گراوییەکەی لەوەدایە - کە وێدەچێ ڕاستیش بێ بەڵام تا ئێستا نەمدیوە یان نەمبیستووە کەسێک بە ڕاشکاوی دانی پێدا بێنێ - کە حەز و دڵداری مرۆڤ دەتوانێ تەواوی ئەو

خزمەتگوزاریانییەی دایک بۆ مرۆڤی ئەنجام داوە، ئەنجام بدا بەڵام دایک هەرگیز ئەو خزمەتگوزاریانییەی حەز یا دەستگیرانی مرۆڤ لە دەستی دێ، لە دەستی نایە، هەر بۆیە ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ لە دەور و کاریگەری دایک کەم دەبێتەوە و بە دەور و شوێندانەری ژن واتا حەز و دڵداری مرۆڤ زیاد دەبێ. هەڵبەت پێویستە ئەوەش بڵێم من بیرم بۆ زۆر شتی دیکەش دەچێ کە وازی لێدێنم. سەرەڕای ئەو شتانەی کاوەیس بە چاوی خۆی دیتبووی واتا ئەو برینانەی دە لەش و دەموچاوی‌دا بوو، لاقێکیشی لە چەند جێگەوە شکابوو کە چەند نەشتەرگەرییەکیش کرابوو تازە نەختێکی خۆی گرتبوە و کاوەیس تازە زانیبووی کە ناچارە دەگەڵی بە کاوەخۆ بێ و لەگەڵی هەڵبکا. هەر چەندە کە دەبوو چۆنیەتی ئاگادار بوونی خات زڵەخا لەو ڕووداوەی کە بە سەر کاوەیس‌دا هاتووە بەشەکانی پێشوودا هاتبا. بەڵام ئێستاش نازانم ئەو کەمتەرخەمییە لە لایەن کێوە ڕووی داوە من یان کاوەیس؟ یان دوکتور؟ یا خودی خات زڵەخا؟ یان سۆفی حەسەن؟ تازە چی لەگەڵ ناکرێ ناچارم بۆخۆم لێرەدا باسی بکەم.

خات زڵەخا کە پێی زانی هەر چەندە دەبوو هەر لێرەدا باسی ئەوە بکرێ کە چلۆن لە بەسەرهاتەکە ئاگادار بوو و کێ پێی ڕاگەیاند چونکە لە بەشەکانی داهاتوودا باسی دەکرێ با دووپات نەکرێتەوە ئاگایانە وازی لێدێنین ـ نەیدەزانی خۆی بە کوێ‌دا بکا. هەر لە ژووری ماڵە خۆیەوە گابۆڕی کێشا. هەر چەند ئەو کەسەی خەبەری دابوویە و دوایی ناوی دێنین، ویستی نەهێڵی لەخۆی بداو سەروقژ بڕنێتەوە، نەیتوانی پێشی بگرێ. سەر و قژێکی بۆخۆی نەهێشتەوە. هەر لە حەوشەی‌ڕا ئەوەی خۆڵ و پووش و پەڵاشێکی وە بەر چاو دەهات هەمووی بە سەری خوی‌دا کرد تۆش بدیتبایە نەتدەزانی بە چ شتێکی بشوبهێنی. بە سینگکوتان و لە خۆدان، خۆی گەیاندە بەر درگای ماڵە فاتێ. ئەوەی خەبەرەکەی دابوویە بە چەشنێک خەبەرەکەی گوتبوو کە خات زڵەخا دەبوو بچێتە ئەوێ.

: «زڵەخا! قوڕی عالەمێ بە سەرت بگەیە، براکانی فاتێ لە سەر فاتێ کاوەیسیان کوشت.» هەر ئەوندە بەس و ئێستا لە بەر درگای داخراوی ماڵە فاتێ دەستەوەستان مابۆوە و ئەوەی جنێوێکی دەیزانی هەر چەندە زۆری لە ڕێگای هاتن‌دا واتا لەو چەند هەنگاوەدا خەسار کردبوو. هەر دەیگوت: «ئەی... وەی...

ئەی دڵم تۆقی... فاتێ چت لێ کردم، گوتم بووکی کوڕم بی نەک قاتڵی کوڕم. بڵێ بزانم چۆنت دڵ هات بیکوژی، ئەی هاوار، کاوەیسم ڕۆ، چرای ماڵم ڕۆ، سێبەری سەر سەرم ڕۆ، کوڕە شایەکەم ڕۆ، تاقانە کوڕە جوانەکەم ڕۆ.»

ژنان دەوریان دابوو.

: «کچێ! زڵەخا! بەسە خۆت کوشت. ئیشاڵڵا ئەوشتە درۆیە. بە خودای هیچ نەقەوماوە و ناقەومێ. ئەوەتا کوڕەکەی خات پیرۆز لێرەیە، دەڵێ بەڕێیان کردۆتە سەردشتێ بۆ نەخۆشخانە و بە خودای بە سلامەتی زۆر زوو دەبینی دێتەوە.»

خات زڵەخا لاقی لەدوو نەدەهاتن. دستیان کێشا و بۆیان کردە پێ. سەری بە هەنیسکانەوە هەڵدەقەندرا. لە خۆڕا دەپاڕاوە. لە پڕ دەیکوت:

: «تۆخودا لێم مەشارنەوە، دە پێم بڵێن کاوەیسم ماوە؟»

: «ئاخر کچێ! بۆ هەدا نادەی. بە خودای شوومی باش نییە ئەو کارانەی دەیکەی بڕوا بکە هیچ نەقەوماوە. دەڵێن تەنیا نەختێک بریندار بووە. دەرمانی دەکەن ئیشاڵڵا سبەی ئەو وەختانە دێتەوە لات.»

وڵات بە تەواوی تاریک ببوو. ئەو ژنە دەیتوانی زووتری بۆ دەسنیشان بکا بۆچی نەیکرد؟ با هەر بمێنێتەوە، دەیهێنینەوە. هەڵبەت سبەی و دوو سبەی و سێ سبەی و دەیان سبەی تریش نەیانهێناوە. چونکە ئەو دەم کە مەترسی مردنی لە گۆڕێدابوو لە ورمێش چییان بۆ دەگەڵ نەکرا و بە پەلەپەل بەڕێیان کردە تاران کەسی خۆی دەگەڵ نەبوو. هیچ کەس نەیدەزانی لە کوێیان خستووە و لە چ حاڵ دایە. هەڵبەت هەڵەیەکی تریش ڕووی دابوو لە کاتی بەڕێکردنی بۆ تاران لە دەفتەری نەخۆشخانەدا شوێنی بەڕێکردنەکەی تەورێز نووسرابوو ـ کە لەم جۆر هەڵانە لە ژیانی هەر کەسێکدا بۆی هەیە ڕوو بدا.

خات زڵەخا شەوانە بە سەردوولکان سەری پڕ ماتەم و قەت خۆشی نەدیوی خۆی دەخستە نێو گۆڕی سارد و سڕی جێگەی خەو و تا بەری بەیان وەبیری بێتەوە کە کاوەیس نەگەڕاوەتەوە ئەو دەم بە گریان و ناڵە لە جێگەوبان ببێتەوە. لە خواردن کەوتبوو. هەر چی زۆرتر پرسیاری دەکرد کەمتر وڵامی دەدرایەوە بە ڕاستی خەڵکی "سوورەچۆمی" هیچ کامیان نەیاندەزانی کاوەیس بۆ کوێ بەڕێ کراوە چونکە ئەو دەم کە کاوەیسیان لە سوورەچۆم بردە سەردەشتێ کە

زانیبوویان لەوێ چی دەگەڵ ناکرێ بەڕێ کرابووە سابلاخ. لەوێش نەیانتوانی چی دەگەڵ بکەن بەڕێ کرابووە ورمێ لەوێش کە دوکتۆران زانیان پێویستی بە نەشتەرگەرییەکی دژوار هەیە کە لەوانە ناچار بن لاقی ببڕنەوە لە خۆیان ڕانەدیبوو بەڕێیان کردبوو تاران. ئەو چەند کەسەی لە پاشان وەشوێن کاوەیس کەوتبوون دەست بەتاڵ گەڕابوونەوە. لەوانە یەکیان سۆفی حەسەن بوو. یەکیان مەلا برایم بوو کە هەمیشە پێیەکی لەم دیوە بوو و پێیەکی لەو دیو.

خات زلّەخا هەر ڕۆژ کە دەگوزەرا زۆرتر ناچار دەبوو باوەڕ بەوە بێنێ کە لەوانەیە تازە چاوی بە کاوەیس نەکەوێتەوە. کەمتر دەچۆوە ماڵ، زۆرتر لە مەزرا و باخ و ڕەزەکانی نیزیکی دێ دەخولاوە و بە کاوەیسی هەڵدەگوت. لە پڕ دەتدیت یەک بە خۆی هاوار دەکا و سینگی دەکوتێ و سەر و قژی خۆی دەڕنێ. جارجارەش تووک و دوعای لە فاتێ و براکانی دەکرد بەڵام زمانی لێ تێکەڵ دەبوو: «ڕەببی خودا تۆڵەی منت لێ کاتەوە ئامین.»

کە لە جنێودان ماندوو دەبوو دەستی دەکرد بە لاواندنەوەی کاوەیس.

: «کوڕە ڕۆڵە گیان! کاوەیسە! ئەتۆ برسیت نییە؟ دەنگ ناکەی کوڕم! لە برسان دەمری، چیت پێخۆشە بۆت بێنم. ئەدی توونیت نییە؟ وەرە ئێرە دە سەر سەرت گەڕێم. ئەوە نان و چام بۆ هێناوی. بەسە. ڕووحەکەم، چی دیکەمان ناوێ. ئەوەندە خۆت ماندوو مەکە. بەس کار بکە. کوڕم خۆت کوشت. دە هەستە وەرە لام. تاوێک وچان بدە.»

ئینجا لە پڕمەی گریانی دەدا.

:«ئەوە بە قسەی دایکی خۆت ناکەی. چ قەوماوە؟ خۆ تۆ ئەوەندە بێرەحم نەبووی. ئاخر هەر تۆ نەبووی دەتگوت: «دایە گیان! قەت خەفەت مەخۆ تا منت هەبێ خەمی هیچت نەبێ. بە خودای ئەم شانەم شل بوو بەو شانەمەت هەڵدەگرم.» ڕۆڵە گیان! ئەتۆ هەر وەرەوە لام نامهەوێ هەڵمگری. بۆخۆم دەڕۆم. تۆ هەر برسی مەبە. ئەتۆ تینوو مەبە، دە سەر سەرت دەگەڕێم. ئەمن چیم ناوێ.

ئێواران دەستی خەیاڵی بەتاڵی کاوەیسی بە دەستەوە دەگرت. هەر وەکوو نیسێ دەخوشی و بەرەو ماڵ شۆڕ دەبۆوە. تەنیا سێ مانگ توانی چاوەڕوانی کاوەیسەکەی بکا. خات زلّەخا کاوەیسی لە ڕووحی خۆی خۆشتر دەویست، خات

زڵەخا تەنیا ئەو منداڵەی هەبوو. هەر لێرەدا پرسیارێک لە بەر دەممان خۆی قوت دەکاتەوە.

پرسیار: ئەگەر خات زڵەخا تاقە کوڕێکی نەبوایە کە یادگاری ئەوینێکی پاک و پیرۆز و خوێناوی بوو و لە جیاتی شەش، حەوت منداڵی چڵمن و ناحەز و ڕەزاگرانی لە پیاوێکی تر هەبوایە، هەر بەم جۆرەی خۆش دەویستن؟ ئەرێ بە ڕاستی شتێک بە ناوی هەستی دایکانە هەیە؟ ئەی بۆ دەڵێن دایکی وا هەیە جیاوازی لە نێوان منداڵەکانی خۆی دادەنێ واتا هێندێکیان لە سەر سەریان دادەنێن و تاقمێکیان لە ژێر پێ. من دایکێکم پێ شک دێ کە هەموو ڕۆژێ کوڕەکەی خۆی بە دەست بابی بە لێدان دەدا تەنیا لە داخی خەسووی کە زۆری ئەو نەوەیەی خۆش دەویست.

دایکێکم دەناسی کە یەکێ لە کچەکانی کە خۆشتر دەویست کردبوویە خانم و نەیدەهێشت دەست لە ڕەش و سپی بدا لە حاڵێکدا کچەکانی تری وەک قەرەواش و کڵفەت چاو لێدەکرد و شەو و ڕۆژ دەکارێی بەردابوون. هەروەتر دایکێک شک دەبم هەر لە بەر ئەوەی نەژاکێ و جوانییەکەی هەر بمێنێ و خۆشی ڕابوێرێ، دوو کچوڵەی منداڵی خۆی دابووە دەست دآیەن و هەرگیزا و هەرگیز ئاوڕی لێ نەدانەوە ئەننەهوو لەوی هەر نەبوون. من دایکێکم دەناسی کە....... خات زڵەخا لە بێ کاوەیسی سەری نایەوە.

قالە دەڵێ: «عەلیلە! وەرە بچینە قۆتانێ خۆمان لە ژنان بگرین. نازانی شتی چەندە سەیر بۆ یەکتری دەگێڕنەوە.»

عەلیلە پێی کوت: «هەتیوە قالە! هیچ دەزانی بمانگرن، دارمان لە کوێ ڕۆدەکەن؟»

: «عەلیلە! خۆ تۆ جاران ئەوەندە ترسەنۆک و خوێڕی نەبووی. ئێمە منداڵین کەس گومانی خراپمان لێ ناکا.»

من گوتم: «دەرویش کەریم دایم و دەرهەم چاوی دەوێ بڕیوە بە خودای بزانن دەمانکوژن.»

قاله دەڵێ: «هیچ گوویەکی پێناخورێ، بۆخۆم بەو چاوانەم بەیانییەکی زوو درویێش کەریمم دیت لە سەربانی قۆتانێ خۆی مات دابوو چاوی دە ژنان بڕیبوو. هەر قسان بکا ئەمنیش قسان دەکەم.»

قۆتان ئاودەستخانەی ژنان بوو. دیوێک بوو کە پێنج شەش کونیان تێکردبوو بۆ ئەوەی ئەوژنە لادییانەی بەری بەیانی زوو کەلوپەلیان بۆ فرۆش دەهێنایە شار بۆ دەست بە ئاو گەیاندن دەچوونە ئەو شوێنە. لە دیواری پشتەوەی قۆتان کە دەکەوتە سەر کەلاوەیەک قەڵشێکی باریکی تێکەوتبوو کە قاله دیتبوویەوە. بە یەکەوە دەچووین لەوێڕا زۆر بەبێ حەیاییەوە چاومان لە لینگ و لەتەری ڕووتیان دەبڕی و ئەوەی کە دەبوو نەبیینین دەماندیت و ئەوەی کە نەدەبا ببیسین دەمانبیست.

کاوەیس ئەو پەیامە ناخۆشەی کە ڕوخساری تازەی خۆی تێدا دی وەلانا و لە پڕ پرسیارێک لە بیری ڕوخسارە نالەبارەکەی جیا کردەوە.

: «بڵێی دایکی ئێستا لە چ حاڵ و وەزعێکدا بێ؟»

دایکی حەوتوویەک بوو نێژرابوو. تا چوار مانگ دواتریش جاروبارە ئەو پرسیارەی هەر لە خۆی دەکرد: «بڵێی دایکم ئێستا لە چ حاڵ و وەزعێکدا بێ؟» کاتێک وڵامی ئەم پرسیارەی بە دەس گەیی کە لە بەر وەڕەزی بە دوو شەققە لە بن هەنگڵەوە لە حەوشەی نەخۆشخانە بە ئاسپایی فێری ڕێگا ڕۆیشتن دەبۆوە کە لە پڕ لە دەرەوەی حەوشەی نەخۆشخانە چاوی بە کوڕە سەرزلەکەی ئامینە شەل کەوت. هەر وەک شێتان یەک بە خۆی هەرای کرد: «ڕەسووڵ. ڕەسووڵ.»

ڕەسووڵ ناسییەوە. بۆ لای هات تا ئەوەی دەیویست بۆی بگێڕێتەوە. ئەوەی ویستی و بۆی گێڕایەوە ئەوانە بوون: دایکی واتا خات زڵەخا ئەتۆ سڵامەت. فاتێ بە دوای تێهەڵدانێکی زۆر بە دەست براکانی ئاخروئۆخری بە تکاکاری هەمزاغا و سوێند و خواهیش کردنی مامۆستا، براکانی لە کوشتنی چاوپۆشیان کرد. دوو برا گەورەکەی لە بەر کاوەیس گیراون لە زیندانی سابڵاخن. بۆخۆی لە دەس ئاکاری نالەباری دایکی ڕای کردۆتە ئێرە و هەرگیز حازر نییە تازە هەتا دایکی زیندوو بێ چاوی بە سوورەچۆمێ بکەوێتەوە. ئەوەشی بۆ گێڕاوە کاتێک خۆی لە خەودا بوو گوێی لێببوو کە دایکی بە پووری دەکوت: «ئاخری تۆڵەی خۆمم لێ

ئەستاندەوە. ئاورم دە جەرگی بەردا. هەروەک ئەو ئاورەی دە جەرگی منی بەردابوو. چووم بە درۆ بە هەمزاغام کوت هەتیوی زڵەخایە چۆتە زگ کچی کاک وسێن و بێسیرەتی کردووە...: «جا بزانە ئاغای دێیەکانی تر چۆنت باس دەکەن هەمزاغا.»

بۆ پووری گێڕابۆوە کە هەمزاغا هەوەڵێ باوەڕی پێ ناهێنێ. بێ و نەبێ هەمزاغا دەبێ ئەو پرسیارەی لێکردبێ: «کچێ ئامین دەس هەڵگرە بوختانان مەکە لە خودای بترسە.» یان ئەو پرسیارەی لێکردبێ: «ئامین بەقات پێ ناکەم بوختانی پێ دەکەی پێشتریش پاشملە باست دەکرد. یا خراپەی ئەوت دەگوت.»

زۆر جۆری تریش پرسیار هەن کە دەکرێ هەمزاغا لە ئامینی کردبێ ئەوەی کە ڕەسووڵ گوێی لێببوو لە دایکی، ئەوە بوو کە ئامین سوێندی بۆ دەخوا و دەستی بۆ بە قورئاندا دەدا. پووری ڕەسووڵ چەپۆکێک بە تەپڵی سەری ئامینە شەلدا دەدا.

«دەڵێ ماڵوێران! چون وێراوتە بە درۆ سوێند بخۆی؟» واتکرد بۆیە ئاوات بە سەر هات.»

ئامینە شەل دەڵێ: «ئاوام بە سەر هات بۆیە وامکرد. دەستم خۆش بێ چاکچاکم کرد.»

هەمزاغا لە دووی کاویس دەنێرێ. ئاماژەیەک ناکا بە وەی ئامین بۆی گیرابۆوە. تەنیا دڵنیای دەکا و دەی نێرێتە ژوانی فاتێ و ئەوە براکانی فاتێ بوون کە لە جیاتی فاتێ دەچنە ژوانگە. کاوەیس بۆ ماوەیەک حەبەسابوو. خەمی دایک و خەمی فاتێ، بەڵام ئەو قسانەی ئامینەشەل پێشتر بە کاوەیسی کوتبوو. پێشتر کاوەیسی بنکۆڵ کردبوو هەرچی کردی خۆی بۆ نەهاتەوە سەر باری پێشووی. ئەوە بوو کە لە تارانێ گیرساوە.

***

# ٩

: «بەسم بگرە بەر تیر و تانووت و تەشەر و توانجان. بەسم سەرکۆنە بکە. ئاخر تۆ کێی؟ وەک قیلی کەوای سپی بە منەوە نووساوی؟ ناتهەوێ دەس‌بەردارم بی؟ چیت لە گیانی من دەوێ؟ چەندم بە قسەی تۆ نەکردووە کە لات وایە ئازارەکەیم نەچێشتووە؟ چەندم بە ئەمری تۆ دانەنواندووە کە بەرهەمەکەی وێکەوتنم نەبووبێ؟ چەندم تەنیا لە بەر ئەوەی تۆ دەترسای خۆ حەشار نەدا کە دەرئەنجامەکەی هەڵوەدا بوونم نەبووبێ؟ دە واز بێنە. من لەو هەموو پێداگرتنەی تۆ واقم وڕ ماوە و سەرم سووڕ. من دەمەوێ ببم بە کەسێکی تر. من حەز دەکەم ئەو جۆرەی خۆم پێم‌خۆشە ژیانم بەرمە سەر. من پێم‌خۆشە کە تەواوی پەردەکانی ژوورەکەم دادەمەوە. چراکان هەموو بکوژێنمەوە. ئینجا تەنیای تەنیا لە سەر کورسیلەیەک دانیشم و چاو لە تاریکایی ببڕم. دیسان وازم لێ ناهێنی، پرسیارم لێدەکەی.»

: «ئەمجار چ قەوماوە؟ گەمییەکانت لێ نوقم بووە؟ خەونی ئالۆزپالۆزت دیوە؟ فلانی ئەو جارەش لووتی پێدا نەهێنای؟ ئارەقەی شەرمی سەر نێوچاوانتی نەدی؟»

«خۆ پێشتر پێم گوتبووی دەبێ خۆت بڕازێنیەوە، با وەبەر چاوی بێی. پێت‌وایە بەو شاڵوارە کۆنەی مامت پێی بەخشیوی و دووقەدت لە کەمبەر هاڵاندووە و بە کەڵاشە جیلە جرپنەی دە پێت دایە و ئەو سەرە بە گوێزان تاشراوە و قەڵافەتە ناڕێکەت، کچی کابرای ئاوری بۆت تێبەر دەبێ؟ بەرخی بابم مەرجی دڵداری تەنیا ئەوە نییە تۆ بڵێی دەی جا من خۆشم دەوێ. مۆنەم لێ مەکە. ڕووم لێ وەرمەگێڕە ئەکەر لە من دەپرسی من دەڵێم وازی لێ بێنە.»

: «ئەگەر لە گیانم بڵێی دەسبەجێ دەڵێم باشە. بەڵام لەوی...»
: «تۆ دەڵێی بۆچی وا گیرۆدە بووی؟ چ زۆرە کچی جوان، دەڵێن مەجنوون کە بە تکاو ڕەجای کەس دەستی لە خۆشویستنی لەیلا هەڵنەدەگرت...»
«باشە، باشە مەیگێڕەوە، دەیزانم. دەیبەنە کابەتووڵڵایە تا ئەو ئەوینەی لە سەری بکەوێ بەڵام هەر کە مەجنوون دەستی بە کابە ڕادەگا لە بەر خودا دەپاڕێتەوە بڵێسەی گڕی ئەوینەکە و خۆشەویستییەکە خۆشتر بکا.»
: «بە ڕاستی لات وایە هەر جوانێ کە تووشی هاتی دەتوانی پێوەندی ڕووحی و گیانی لەگەڵ پێک بێنی. کە وا با دەبوو فەرهاد، وامیق، ڕۆمیئۆ و مەم وازیان لە شیرین، عەزرا، ژولیەت و زین هێنابایە. تۆ بە هەڵە چووی ئەمە لە ئیختیاری چاودا نییە، کێشەی دڵە. بەبێ ئەوەی بتەوێ دەبینی لە شوێنێک سەرت هەڵداوە. بە تاڵاو و ئازار ڕۆژووت دەکەنەوە کە نێوکتیان لە بەندی جەهانی بەقا کردەوە، دەبی بە چەرخەمتەی گێژی دەستی هەر بایەک، ئەوەی تەنیا ڕۆژێک لە تۆ زووتر نێوکیان بڕیبێ وەها دەرسی چکۆڵە بوونت دەدەاتێ کە زۆر جاران خۆزگە بە ژیانی بێچووە پشیلەیەک دەخوازی. گەسکەکۆڵەی قوژبنی حەوشە دەبیندرێ و وەبەر چاو دەکەوێ بەڵام تۆ نا. مریشکە قوڵە و مانگا بەڵەک و ورچە ورچە وەبەر چاوان دەکەون بەڵام تۆ نا. هەر وەک گەورەشاعیری فارس ئەحمەد شاملوو دەڵێ: «بزە لە سەر لێوت جەڕڕاحی دەکەن[32]» من دەڵێم: «هەر زۆر زوو بزەت لێدەدزن تا لە دواییدا زەحمەتی جەڕڕاحی کردنەکەیان نەکەوێتە سەر ئەستوو شانیان.» ترس و دڵەخورپەت بۆ دەکەن بە نوشتوویەک و بە دەرزیلەیەک وای لە پشتی کراسەکەتەوە هەڵداوەسن کە هەرگیز دەستی خۆتی نەگاتێ تا لێی کەیەوە. ئا بەم شێوەیە خوت لێ ون دەبێ. خۆت نناسی وەک ئەوەی هەر نەبی. وەک بەردێکی کە هەمیشە لە بەر درگایە و چۆن بە کەڵکی هیچ نایە هەمیشە لەوێ ماوەتەوە. هەرگیز نەبووە کەسێک کارێکی پێی بووبێت. یان

---

٣٢- جەڕڕاحی: نەشتەرگەری بزەی سەر لێوت هەڵدەکەنن.

وەک سەدان شتی بێکەلکی تر کە لە ژێرخانێ فڕێ دراون و لە سەر یەک کەڵەکە کراون و نە هەرگیز وازیان لێ دێنن و نە وازیان لێ ناهێنن.

ئەودەم کە خۆت لە ماڵدا نەدیتەوە خۆت لە کۆڵاندا دەبینییەوە لەگەڵ تاقمێکی وەک خۆت لێدراو. وەک خۆت بادراو، وەک خۆت تەنیا... وەک خۆت...، خۆت کە خەریکی دار و هەلووکێنی. هەلووکەکە وەپشتی یەکێ لەو دوو کچانە کەوت کە ڕەنگە لە ئاسمان ڕا بەردەبووبنەوە، چونکە هیچمان نەماندیتن تا هەلووکەکە وەپشتی یەکیان نەکەوت.»

تۆ دەڵێی: «چ زۆرە کچ»

: «بەڵام ئەودەم زۆر نەبوون تەنیا دوو کچ بوون و هەلووکەکە وەپشتی یەکیان کەوت و تەنیا ئەوەی هەلووکەکە وەپشتی نەکەوت، نە ئەوی هەلووکەکەی وەپشتی نەکەوت چاوی دە من بڕێ و تەنیا ئەو بە منی گوت...»

«من هەوەڵ جار بوو چاوی کچێکم لە نزیکەوە دەدەیت هەڵبەت نا، درۆ ناکەم هەوەڵ جار بوو چاوی کچێکی جوانم لە نیزیکەوە دەدەی کە بە منی گوت، هەڵبەت بە منی نەگوت «بێتەربییەت.» من لە خۆڕایی ئەوەم گوێ لێبوو. ئەو چاوەی کە من دیتم چاو نەبوو بە هەڵە چووبووم زار بوو دەم ولێو بوو، زارێ کە بە منی کوت: «ئەوە چ دەکەی لەم کووچە و کۆڵانەدا، وەرە وەدوام کەوە با قسەیەکت پێ بڵێم.»

من هەروا ڕاوەستابووم. ئێستایە دەڵێم ڕاوەستا بووم، ڕاوەستابووم؟ دانیشتبووم، ئەوەندەی بزانم چووبووم دە بیرەوە[٣٣]. بە ڕاستی نازانم چۆن بووم، جۆرێکم لێ هاتبوو، وەک پێشووی خۆم نەدەچووم، هەستێکی سەیر دایگرتبووم، نامۆییم لە خۆم و هاوەڵەکانم دەکرد، زۆر لەمێژ بوو، دەتوانم بڵێم لەو دەمەی ڕا کە لە عەلیلە و قالەی جیا ببوومەوە بۆ سێ جەمەی خواردن نەبایە و یەک وادەی نووستن، منداڵی گوێ لەمستی کۆڵان بووم. لەگەڵ هەتاو وەدەر دەکەوتم و لەگەڵ هەتاویش ئاوا دەبووم. بەڵام لە پڕ

٣٣- چووبووم دەبیردەوە: لە فکرو خەیاڵ ڕۆچووبووم. خەیاڵ بردبوومی.

یەکێ پەیدا دەبێ سوور سوور دەزانێ تۆ هیچ خەتایەکت نەکردووە. بە چاوی خۆی حەتمەن دیبووی کە دارەکە بە دەست سولەیمانەوەیە. هەر ئەویش بوو کە هەلووکەکەی لە پشتی کچەکە دا. بەڵام چاو دە چاوت دەبڕێ. دەڵێم نا بە درۆ دەڵێم هەوەڵ جار بوو کە چاوم دە چاوی کچێکی جوان دەبڕی. دەمەویست بڵێم من نەبووم بەڵام ئەو کەسە منی دەنگ دا.

تۆ دەڵێی: «کچ زۆرە.»

: «بەڵام خۆ هیچیان نایەن لە هیچ و خۆڕایی بەرد بە شووشەی دڵی منداڵێکی وەکوو من دابدەن. ئەرێ من ئەو دەم منداڵ بووم؟ من ئەو دەم تەمەنم سێزدە ساڵ و چوار مانگ و نۆ ڕۆژ بوو.»

لێم دەپرسی: «دوایە چیت کرد؟»

: «چیم کرد؟ جارێکی تر ون بووم نە دەخۆمدا کە دەخۆیدا. شەش مانگی خایاند تا چاوم پێی کەوتەوە، تا چاوم بە چاوی کەوتەوە. شتێک بە زرمە لە نێو دڵمدا شکا. هەر دوو پێم لەرزی. زۆری نەمابوو بەربیمەوە. هەستێکی زۆر خۆشی ئاشنا لەشی داگرتم. دڵم جۆرێکی لێهات. وەدوای کەوتم، ماوەیەکی بە نێو شەقامەکانی شاردا سووڕاندمیەوە، ئینجا ونی کردم. سەیری هەرلایەکم دەکرد، هیچ شوێنی لێ نەمابوو. وەک ڕۆژی هەوەڵ کە چاوم پێکەوت و پێم وا بوو لە ئاسمان بەر بۆتەوە، ئەمجارەش پێم وا بوو بەرەو ئاسمان هەڵکشابوو، بەڵام ناویم دەزانی؟ خۆی بوو. پێشتر بیستبووم ئەوەی لە دوای ونبوونی لە دەستم دەهات ئەوە بوو کە بگرم، ناوی لە سەر هەرتک قۆڵم، لەسەر ڕووبەرگی تەواوی کتێب و دەفتەرەکانم، بە بزمار لە سەر دارچنارەکەی نێو حەوشەمان، بە نووکی دەرزی لە سەر هەموو میدادە ڕەنگییەکانم[٣٤]، لە سەر دەسکی ترومپای نێو حەوشەمان، لە گۆشەی بنەوەی پارێزگای خوراسان و پارێزگای سیستان و بلووچستان و پارێزگای خوزستان و هەرتک پارێزگای ئازەربایجانی نەقشەی ئێران کە لە هۆدەکەم هەڵاوەسیبوو نووسی. ناوێکی ڕەمزاویم دروست کرد لە پیتەکانی

---

٣٤- میدادە ڕەنگییەکانم: قەڵەمی ڕەنگ. قەڵەمی نەقاشی.

هەوەڵی ناوی خۆم و ناوەکەی ئەو. لە سەر تەختەیەکی هەڵم کەند و کردم بە مۆر. هێچ شوێنێکم پێ شک نایە کەسی لێ نەبووبێ و من مۆری خۆمانم لێ نەدابێ، هووم لە شووشەی پەنجەرە دەکرد تا هەڵمی لە سەر پێک بێ و پاشان بە قامکم ناویم دەنووسی و ئەوەندە بە حەز و مەیل و تاسە چاوم تێدەبڕی تا هەڵمەکە وردەوردە دەبوو بە فرمێسک و دآدەچۆڕا و منیش لە گەڵی.»

هەموو جارێ لە بێ دەرەتانی پەنام بۆ ((مانی))ی خەیاڵ دەبرد کە لە ئەرژەنگی هەستی خۆی وێنەی جوان و ڕازاوەی ئەوم بۆ بکێشێتەوە بەڵام... لە پڕ تۆ دەنگم دەدەی.

: «ئەی بابە ئەتۆش خەریکی زۆری فوو لێ بکەی. کێ هەبووە تا ئێستا دڵداری نەکردبێ؟ هەر کەسێ کە دەیبینی لەم بارەوە ئەزموونێکی تایبەتی هەیە. من کە وای بۆ دەچم کێشەی تۆ بەر لەوەی کێشەیەکی دڵداری و خۆشەویستی بێ، کێشەیەکیتر بێت.»

دەڵێم: «ئەم قسەیەت ڕاستە، بۆخۆشم ئەوەی دەزانم کە کێشەی من کێشەیەکیترە. تۆ پێم دەڵێی: «دەی باشە هەر چی هەیە با هەبێ. بۆم بگێڕەوە کە چۆنت دواند؟»

: «بە ڕاستی من چلۆنم دواند؟ ئەبێ بە شوێنیدا بڕۆمەوە، جارێکی تر بیدۆزمەوە و لێی بپرسم.»

***

# ١٠

ئەسەد ببوو بە دەست و پێ و چاو و گوێی دوکتور. ئەو دوکتورەی لە خۆڕا لێی ببوو بە باب، دیارە زۆریش لە خۆڕا نەبوو. دوکتور وەجاغی کوێر بوو. خێزانی دەمێک بوو نەمابوو. بە تەنیا دەژیا. کە زانی کاوەیس لە خۆی بێ کەس‌وکارترە و لە ماوەی ئەم چەند مانگەدا کە لە نەخۆشخانەی کەوتبوو هیچ کەس پرسیاری لێنەکردبوو، کەس سەردانی نەکردبوو، بۆی بوو بە باب. بردییەوە بۆ ماڵی خۆی. کاوەیس بوو بە کوڕی. بوو بە وەکازی دەستی و لە ڕاستی‌دا هەموو کەلێنێکی ژیانی بۆ پڕ کردبۆوە. زۆر جاران کە دوکتور نەخۆشی دەدیتن ئەسەد بەردەستی بوو. دۆکتور سەری لە زیرەکی و وریایی کاوەیس سوڕمابوو. بۆخۆی ببوو بە یەک‌پارچە دوکتور بە تایبەتی لە جێ‌هێنانەوەی ئێسکی شکاو و لە جێ دەرچوو، شارەزایەکی تەواو بوو کە باوەڕکردنەکەی بۆ دوکتوریش کە عیلمەکەی دەزانی زۆر دژوار بوو. دەستی بە سەر هەر ئەندامێک یا ئازای لەش‌دا کێشابا دەیزانی چی بە سەر هاتووە. دوکتور هانی دا بۆ خوێندن. ئەویش خوێندی. شەو و ڕۆژی نەدەناسی. دەیخوێند و دەیخوێند و دەیخوێندوە. دەتگوت لە پێش‌دا زۆرتر بۆ لە بیرکردنی ڕابردوویەتی کە بەم شێوەیە دەخوێنێ. بەڵام هەرچی بوو دوکتور لە ڕادەی تێگەیشتن و فێربوونی سەری سوڕمابوو. برینەکانی دەم‌وچاوی تا ڕادەیەکی زۆر سارێژ ببوونەوە. وەک پێشوو بەرچاو نەبوون. بەڵام لاقی ئێستا بە تەواوی جێی خۆی نەگرتبۆوە. هەموو جارێ کە دوکتور پرسیاری لێدەکرد: «کاوەیس بیروڕات دەربارەی ئەم نەشتەرگەرییەی کە لە سەر لاقتم کرد چۆنە؟»

ئەویش هەموو جارێ بە پێکەنین بە دوکتوری دەکوت: «دوکتور. ئەڵبەت تا ماویەکی هەر پێی دەکوت دوکتور. دوکتور وێدەچێ دەبێ جارێکیتر بۆخوم بیشکینمەوە و بۆخۆم هەڵیبەستمەوە.»

سەرجەم لەم ماوەیەیدا کە کاوەیس لەگەڵ دوکتور دەژیا زۆر ڕازی بوو تەنیا جارجارە ئەو چقڵەی دە دڵی چەقیبوو، ئازاری دەدا. ئەو دەمانە کە بە کووچەباغی خەیاڵاتی ڕابردوویدا تێدەپەڕی و دەگەیشتە ئەو شوێنەی بۆ هەوەڵ جار ئەوەی هەیبوو لە هێز و تاقەت و ئیرادە کۆی کردبۆوە تا بە فاتێ بڵێ: «ئەرێ فاتێ بۆ وا جوانی؟»

فاتێ بە دەم تریقانەوە لە وەڵامیدا گوتبووی...

چی کوتبوو؟ لە بیری نەمابوو. خەریک بوو لە خەیاڵاتی خۆیدا قسەی دە زاری فاتێ دەکوشی. گوتبووی: «ئەرێ کاکە وەیسە! دەڵێی چی؟»

فاتێ کە ئەو دەم سەردانی ماڵە کاوەیسی دەکرد پێی دەگوت: «کاکە»

کاوەیس لە پێشدا زۆری پێخۆش بوو کە فاتێ ئاوای بانگ دەکا بەڵام کە هێندێک گەورەتر ببوو پێی تووڕە بوو، هەرچی کاوەیس فاتێی جوانتر دەدەیت. بیستنی وشەی کاکەی لە زاری فاتێی پێ ناخۆشتر بوو. کاوەیس لە پڕ وەبیری هاتەوە فاتێ گوتبووی: «بۆ پێت ناخۆشە پێت بڵێم کاکە؟»

: «چونکە ئەمن کاکی تۆ نیم.»

: «ئەدی بۆ جاران پێم دەگوتی کاکە چیت نەدەکوت؟»

: «جا ئەودەم کاکت بووم»

: «ئەدی ئێستا بۆ نابی بە کاکم؟»

" «ئێستا ناتوانم ببم بە کاکت.»

: «یانی تازە ناتوانم بێمە ماڵتان؟»

: «بۆ ناتوانی؟ دەتوانی. هەموو ڕۆژێ وەرە بەڵام بە من مەڵێ کاکە.»

: «ئەی پێت بڵێم چی؟»

کاوەیس پێکەنی و چی نەگوت. زۆری حەول دا وێنەی فاتێ سەرلەنوێ لە سەر لاپەڕەی سپی خەیاڵی خۆی بکێشێتەوە. بە باشی بۆی نەدەچۆوە سەر یەک. هەژدە ساڵ تەمەن ڕابواردن بە تاقی تەنیا لە ماڵێکدا کە ماڵی خۆت

نەبێ لە شارێکدا کە شاری خۆت نەبێ و مانەوە لە نێو ئاسن و بەرد و پۆلا و بێدەنگیدا زۆر شتت لێ دەستێنێ. دووربوون لە شیناوەرد. لە گوڵ، لە ئەسپ، لە پەپوولە، لە بولبول، لە مێرووولە، لە مێشوولە، لە قوڕ، لە پەین و ڕیخ و شیاکە، لە بۆنی نانی گەرم، بۆنی دووکەڵی خەستوخۆڵی تەندوور، بۆنی ڕۆنی کەرە لە نێو نانی گەرمەتەندوور، بۆنی سۆز و خۆشەویستی دایک و ئەگەر هەتبوو بابیش، بۆنی مێخەکی خات پەریزادی دراوسێیان، بۆنی گوڵە مێلاقە، گوڵە ئەتڵەس، گوڵە مەیموون، گوڵە مێخەک، گوڵە بەیبوون، بۆنی ڕەشەڕیحانەی شینکراو لە نێو چەلەنگی ڕۆن، لە پاش ئاوپرژێن کردنی لای ئێواران دەتکاتە کەسێکی تر، هەستێکی تر، چاوێکی تر و کاوەیسێکی تر. هەر چەند وەیدەزانی ئەوەی بە سەری هاتووە، دەبێ فاتێ دەستێکی هەر تێدا بووبێ هەڵبەت چ بەڵگەیەکی بە دەستەوە نەبوو، بەڵام زۆرتر دەگەڕا لە بەڵگەیەکی بۆ پاکانە کردن بۆ فاتێ. خودا هەڵناگرێ فاتێش لە گیانی خۆی خۆشتر دەویست. زکری بە نێوی کاوەیس دەکرد تا ئامینە شەل ئەوەندەی سەر گرت کە:

«نەکا دڵت دابێتە دەس ئەو چاو حیزە. نەچی خۆت بە پێی کوڕی زڵەخا دڵتۆقیوی ببەستی. کچێ سووکت دەکا. دەتکاتە پەندی دنیایە.»

ڕاست و چەپ خەبەری لەو دیارییانە بۆ دێنا کە بەڕێوەیە و هەر بینا بە دەستی گەیشت.

: «فاتێ! کچێ! هیچ دەزانی بەختت سەری هەڵداوە. ئەگەر پێت بڵێم ئاورت لە نێو دڵی کێدا کردوتەوە ڕەنگە لە خۆشیان گەشکە بتگرێ. کچێ پێم بڵێ چت لە کابرای کردووە. خواردن و خەوت لێ ئەستاندووە.»

کابرا کێ بوو دە زینی ئامینە شەلدا دوو کەس کابرا بوون، یەکەم ئاغای پیر و کەنەفت و لە کارکەوتووی دێ، کە ئایلێبڕابوو هەر چەند بە دەسەڵات و زیبکوزاکون بوو. تا هەمزاغا تینوگوڕێکی مابوو ئامینە شەل خۆشی دەگەڵ ڕابوارد کە پیر و کەنەفت و زورهان بوو ئەوە کردبوویە دەستەی خۆی بۆ پیلانێکی نهێنی. دووهەم کەس کە دە زەینی ئامینە شەلدا بوو، خوشکەزای هەمزاغا بوو کە لە دەرەوەی وڵات دەژیا.

: «ئاغا! فەرمووتان ئەو خوشکەزایەت کە لە ئەلمان دەژی ناوی چ بوو؟»
: «ناوی مەسعوودە، لەوێ خەریکی خوێندنی دەرسی دوکتوریە.»
: «فاتێ ناوی مەسعوودە بۆ دوکتوری دەخوێنێ کە هەمزاغا تاریفی جوانی تۆی بۆ کردووە ئاوری گرتووە، ڕای سپاردۆتە خاڵی بە هەر جۆرێک بێ تۆی بۆ بخوازێ. ئێستا خۆت پێم بڵێ هەر لەم دمگولە چاو حیزە و هەر لەو دوکتور مەسعوودە؟ ئیشاڵڵا ئەوەندە گەوج نابی کە نەزانی کێ هەڵبژێری؟»

مەلی فریو! ئەی باڵندەی دەنگ خۆشی وەخت و بێ وەختان. ئەی موژدەدەری بارانەی ڕەحمەت لە هەوری نەزۆک و ئەستێور، ئەی هیوای سەوزی چرۆ لە ویشکەدار و گەندەڵەدار و گوورانی سەوزەڵانی چاوەڕوانی لە بەستەڵەکی دڵی کەسیرە و بەتەم. ئەی باڵندەی هەزار ڕەنگی تاوسنەخشی خۆشدەنگی فریو. تۆ بڵێ، کێ لە تۆ ڕاست بێژترە لە کاتی سەرەنگرێ بوون دە نێو چاڵاوی پڕ هاڵاوی گێژ بوون. دە پێم بڵێ تا ئێستا چەندە بەختی جوان و ڕازاوەت بە بەرگی ڕەش و نەهامەتی و نامرادی داپۆشیوە، تا ئێستا چەندە خەونی خۆشت بە مۆتەی ترسێنەر و بەسامی مەرگ پساندووە، تا ئێستا چەند جار لە چەند جێگە دڵێکی ئەویندار و عاشقت لە خۆشەویستەکەی وەرنەگێڕاوە؟ فریو ئەی قوڵینگی هەرزەکاری بێستوونساز. فریو ئەی چۆڵبڕی گورچووبڕی لە خۆڕایی. ئەی ژەنگی بێڕەنگی خۆشەویستی و ئەوین. من سەدان جاری تریش دەتدۆزمەوە. بە دواتدا دێم هەنگاو بە هەنگاو و دە ئامێزت دەگرمەوە بە هەموو هەست و هەناسە و هێزمەوە، بمناسەوە، بمناسەوە چونکە لێم ڕوون بۆتەوە کە مرۆڤ پێدواویستی بە فریو زۆرترە تا ڕاستی. چونکە هومێدێکی کە لە فریوەوە سەرچاوەی گرتبێ بۆ مرۆڤ گەلێ باشترە لە ڕاستیەکی کە بەرەوپێشی نابا. کە وا بوو ئێمە هەمیشە تا هەین فریوی فریو دەخوێن هەر لە بەر ئەوەی فریو بەرەو ئەو شتانەمان دەبەن کە پێمان خۆشە بەرەو ڕوویان بچین. واتا کە فریو لە گۆڕێدا بوو هەڵبژاردنی ئێمە لە نێوان خۆشی و ناخۆشیدایە نەک لە نێوان چاک و خراپە. کاوەیس وەبیری هاتەوە بەر لەوەی براکانی

فاتێ بکەونە گیانی ماوەیەک بوو فاتێ دوورتر لێی ڕادەوەستا. هەر چەندی دەیویست لە فاتێ نیزیکتر بێتەوە تا هۆیەکی لێ بپرسێ، فاتێ بە هۆی دوورتر ڕاوەستانی لێی ئاشکرا نەدەکرد. ئەو دەم بوو کە لە بەر پەرۆشی پەنای برد بۆ دنیای پانوبەرین و خەیاڵاوی شێتایەتی و دەستی بە پنجکی تەنیایی و کانی و حەیران گرت. کاوەیس دەڵێ: «هەژدە ساڵ چ زوو تێدەپەڕێ، هەر دەڵێی دوێنێ بوو کە فاتێ گوتی»

: «کاوەیس گیان! ئەگەر براکانم لەتلەتم کەن دەسبەردارت نابم.»

کاوەیس ئێستا لە دڵیدا بە فاتێی دەگوت: «فاتێ گیان! براکانت منیان لەتلەت کرد ئەو دەم کە دەستت لێ بەردابووم.»

کاوەیس هاتەوە لای خۆی. کەسێک لە دەروونیدا بوو پرسیاری لێدەکرد: «ئەرێ ئێستاش دڵت هەر لە لایەتی؟»

کاوەیس بە زەینیدا تێپەڕی کە بڵێ: «بەڵێ، فاتێ بڵێی چ ئاڵوگۆڕێکی بە سەردا هاتبێ؟» دەڵێ: «خۆزگە دەمتوانی جارێکی تر بیبینمەوە. بڵێی مێردی کردبێ؟ ئەگەر مێردی کردبێ دەبێ بە کێی کردبێ؟»

کاوەیس تەواوی ئەو جحێڵ و لاوانەی لە دێ دەژیان و دەیانتوانی فاتێ بخوازن وەبیر خۆی هێناوە.

گوتی: «ئەو جۆرەی فاتێ دەناسم هیچ کام لەمانە پەسەند ناکا.»

هەڵبەت ئەو دەم کاوەیس لەوانە بوو بیری بۆ من و تۆش چووبا بەڵام بۆ حەمە ناحەزی قاچاخچی نەدەچوو. هەر لە بەر ئەوەی هەر جارەی کە وەبیر فاتێ دەکەوت هاوسەرەکەی وەک لاوێکی وێچوو[٣٥] دەهاتە بەرچاو و لە دڵی خۆیدا هەموو جارێ دەیکوت: «خەنی لە خۆی.»

دیسان کاوەیس گەڕاوە سەر حیساب و کیتابی ڕۆژ و مانگ و ساڵ. هەژدە ساڵ تەنیایی، هەژدە ساڵ لە زیندانی خۆدابوون، هەژدە ساڵ لە کێشە و بێنە و بەرەی دەروونادابوون. هەژدە ساڵ حەول و تەقالا بۆ چارەسەر نەکردنی هیچ شتێک، هەژدە ساڵ تەمەن لە بێدەنگیدا لە خۆفریودانێکی لە

---

٣٥- شیاو.

خۆڕاییدا، هەژدە بەهار، نا هەژدە بێ بەهاری واتا هەژدە زستانی سارد و سڕ، هەژدە تەنیایی لە قەوارەترازاوی یەکەیەکە، هەژدە ڕەشنامەی پڕاوپڕ لە بوختان و درۆ و هەڵبەستە.

کاوەیس ویستی بڵێ: «چ زوویەکی درێژخایەن بوو!!»

بەڵام نەیگوت، بیری وەک چۆلەکەیەکی بێ ئارام هەڵفڕی لە سەر وشەی «زوو» ڕاوەستا، «زوو» چییە؟ یانی نێزیک، وەک ئەو شتەی ها لە بەردەستە و دەستت پێی ڕادەگا و هەر دەم ئیرادە بکەی هی تۆیە. بەڵام ئەو زووە «زوو» نییە. ئەمە دەسەڵاتە. زوو لە جینسی کات و زمانە، زوو، ئاوە، چۆمە کە دەڕوا، بەردەوام دەڕوا، بایە کە ناسەکنێ، تێپەڕینی چرکەکانە، یەک بە دوای یەکدا، هەموو بە یەک شێوە و یەک قەوارە، یان خڕخڕ، یان پان پان، یان درێژ درێژ یان کورت کورت، دێن و دەچن بە لەز، بە پەلە، بە پڕتاو بەبێ ئەوەی تۆ لە بەرچاو بگرن، بەبێ ئەوەی بڕوانن کە تۆ چاوەڕوانی، بەجێت دێڵن، بەبێ ئەوەی لەبەرچاویان بی کە تۆ مندالّی، مێرمندالّی، لاوی، پیاوی، دەنێوەوەچووی، بەسالاچووی، لەرزۆکی، یا بەکەیفونەهەنگی کە واتا «زوو» دەبێتە نیزیکترین چرکە. بەڵام کەمترین چرکە زووترین چرکە نییە. جاری وایە چرکەیەک هێند وێک دێ کە وەبەرچاو ناکەوێ، وەک چرایەک کە بەر لە وەی هەڵبووبێت، کوژابێتەوە، یانی تەنیا مانای بوونەکەیە، ئەگینا شکڵ ناگرێ. وەک پارادۆکسێک، وەک خەمێکی خۆش، وەک پەیدای ناپەیدا و جاری واشە چرکەیەک بە قەدەر ئەبەدییەتێک لێک دەکشێتەوە و بۆی هەیە لەم بە ئەبەدییەتە یەک چرکەییەدا مرۆڤ سەر هەڵبدا یان سەر بنێتەوە، کە وا بوو هەژدە ساڵ دەبێتە هەژدە جار سێ سەد و شێست و پێنج ڕۆژ و شەش ساعەت کە ئەویش ئەگەر ورد کەینەوە دەبێتە.... کوتەکاغەزێکی هێنایە پێش خۆی دەستی کرد بە حیساب کردن. نووسی: هەژدە جار سێسەد و شێست و پێنج ڕۆژمان هەیە نووسی ٦٥٧٠ = ١٨×٣٦٥ حیسابی کرد و خوێندیەوە شەش هەزار و پێنجسەد و حەفتا ڕۆژ، دوایە ڕۆژێک لە بیست و چوار ساعەتان پێک هاتووە کە وا بوو ١٥٧٦٨٠ = ٦٥٧٠×٢٤ دەیخوێندەوە سەد و پەنجا و حەوت هەزار و شەشسەد و

هەشتا ساعەتمان دەبێ. بەڵام وەبیری هاتەوە شەش ساعەتە زیادییەکانی هەر ساڵێ حیساب نەکردووە ئەویش حیساب دەکا ١٠٨=٦×١٨ دەیخوێنێتەوە سەد و هەشت ساعەتیشمان لێرە هەیە ئەگەر لەوەی پێشووی زیاد کەین سەرجەم دەیکردە یەکسەدو پەنجا و حەوت هەزار و حەوتسەد و هەشتاو و هەشت ساعەتی تەواو.

: «بیژوو! جا چۆن نازانی ساڵێک دەکاتە چەند ڕۆژ؟»

عەلیلە چاوی لە قالەی دەبڕی و هەروەتر ئەمنیش، بەڵام زۆرتر چاوەڕوانی لە قالەی هەیە تاکوو من. قامکەکانی قالە لە بنەوە دەیان ئیشارەی جیاواز لە یەکتری بۆ بەڕێ کرد. عەلیلە بە خەیاڵی خۆی دەستی قالەی خوێندەوە.

: «ئاغا دەکاتە چوار سەت و شێست و سێ ڕۆژ.»

هەر بە گوتنی ئەوە، قالە وەک ژووشک وێک هات هەر سەری دەلەقاند و ئیشارەی تازەی دآدا.

: «دەست ڕابگرە هەتا جوان تێت بگەێنم کە یەک ساڵ چەند ڕۆژە.»

: «ئاخ، ئای. ئاغا بە قوربانت بم زانیم، دەیڵێم. ئاخ ئاغا بە خودا فێریان بووم»

: «دا دووپاتی بکەوە، ئاغا سێسەد و شێست و پێنج ڕۆژە.»

: «زۆر باشە جا ئەو جار بڵێ یەک شەو ڕۆژ چەند ساعەت و چەند خولەکە؟»

ئەوجار ئەوە ئەمنم کە ئیشارەی بۆ بەڕێ دەکەم. دەستێکم دەکەم بە چوار قامکی و دەستەکەی ترم دوو قامکی و لە بنەوە پێشانی عەلیلەی دەدەم بەڵام ئەو گێژەیە بەو بەریدا دەیخوێنێتەوە.

: «ئاغا دەبێتە چل و دوو ساعەت.»

: «دە جا بگرە تووتکی سەگی! ئەگەر وا بێ حەتمەن بە قسەی تۆ دەکاتە سەدهەزار دەقیقەش. ئەتۆ بۆ دەرسەکەت حازر ناکەی؟»

: «ئاغا بمبەخشە، لەوەبەدوا جوان حازری دەکەم[٣٦]. توخودا بەسە، غەڵەتم کرد. بە خودای دایکم نەخۆش بوو بردمانە نەخۆشخانە.

: «حەرامزادە! ئەوەندەت تێهەڵدەدەم تاکوو ئەتۆش دەنێرمە نەخۆشخانە لای دایکە تۆپیوەکەت.»

: «ئاغا! تۆخودا ئەو جارە بیبخشە...»

: «ئەوە کێ بوو؟ دەست هەڵێنێ بزانم»

: «ئاغا ئەمن بووم.»

: «ئەتۆ؟»

دا وەرە پێشێ بزانم، دەچمە پێشێ تا بزانێ.

: «ئەتۆ؟ بڵێ بزانم دەکاتە چەند ساعەت؟»

: «دەبێتە بیست و چوار ساعەت»

: «چەند خولەک؟»

: «ئاغا هەزار و چوارسەد و چل خولەک»

: «ئەها، خەراپ نیە بەڵام چونکە ڕووداریت[٣٧] کرد تۆش دەستت بگرە»

ژان و ئێشەکەی عەلیلەی دەگەڵ خۆم بەش دەکەم.

: «زۆر باشە هەتیوە پیسە. ئەتۆ بڕۆ سەر جێگەی خۆت دانیشە، ئەتۆش لە سەر تەختەڕەشە بۆم حیساب کە هەژدە ساڵ دەبێتە چەند ڕۆژ، چەند ساعەت، چەند خولەک و چەند چرکە؟»

کاوەیس خەریک بوو حیسابی دەکرد.

***

---

٣٦- حازری دەکەم: ئەزبەری دەکەم. لەبەری دەکەم. دەرخی دەکەم.

٣٧- ڕووداری: بێ ئەدەبی.

# ١١

کاوەیس دەڵێ: «سەرجەم دەکاتە پێنجسەد و شێست و هەشت میلیون و سیوشەش هەزار و هەشتسەد چرکە. کە وا بوو من تا ئێستا پێنجسەد و شێشت و هەشت میلیون و سی و شەش هەزار و هەشتسەد جار، نەمدیوە!!»

یەکێ لە قوتابییەکان دەڵێ: «ئاغا بە عەلیلە بڵێ بیشیخوێنێتەوە.»

قریوەی قوتابیان بەرز دەبێتەوە. عەلیلە لە بنەوە هەڕەشان دەکا.

ئاغا دەگوڕێنێ: «بێدەنگ بن. ئەوە کێ بوو لە خوڕا هەڵیدایە؟»

عەلیلە دەیزانی کێیە، بەڵام دووزمانی نەکرد و بە ئاغای نەگوت.

کاوەیس سەرلەنوێ دووپاتی کردەوە پێنجسەد و شێست و هەشت میلیون و سیوشەش هەزار و هەشتسەد چرکە. یانی ئەوەندە جار مردن و ئەوەندە جاریش سەرهەڵدانەوە.

بە خۆی گوت: «سەیرە! هیچ شتێک هەتا سەر لە سەر باری خۆی نامێنێ، ئەوەی لەو ژمارەیە بە دەستم هێناوە ئەوەیە کە یەکبین لێی زیاد دەبێ بەڵام لە کوێڕا دێن. لەرزێک کەوتە گیانی. لە منەوەڕا دێن. کە واتا دایمودەرهەم ئەوە لە وجوودی من کەم دەبێتەوە و لەم ژمارەیە زیاد دەبێ. کە وا بێ منداڵ کە دەبێ زۆرترین ژمارەیە و ژیانی مرۆڤ یانی دوابەدوای یەک لە وجوودی خۆت کەم بکەیەوە و بیبەخشی بەو شتانەی لە خۆت هاڵاندووە. لەو کەلوپەلەی پێت وایە هی تۆن و هی تۆ نین، تەنیا هەر کامیان چەند چرکەیان لە ژمارەی وجوودی تۆ داگیر کردووە. دەجا بەپێچەوانەی

بیری مرۆڤ، ئەوە مرۆڤ نییە کە دەژیت بەڵکوو ئەو کەرەسە و کەل‌وپەل و ئەو شتانەی لە خۆمانی دەهاڵێنین لە جیاتی ئێمە دەژین و هەڵگری بایەخ و قەدر و ئەرزیشی ئێمەن. ئێمە لە ڕاستی‌دا هیچ نین بەدەر لە گومانێک لە بوون یان بوونێکی گومان‌لێکراو. هەر بۆیە هەرگیز هیچ نابینین و تەجروبە و ئەزموونی ئیمڕۆی من بە کەڵکی هیچ کەسێکی تر تەنانەت هی خۆشم نایە. هەر لە بەر ئەوەیە لە دەوروبەری ئێمە هیچ ئاڵوگۆڕێکی ئەوتۆ بەدی ناکرێ. هەر بۆیە ژیانی یەک چەشن و نەگۆڕی ئێمە بۆتە تەختی پڕۆکراست و هەمووومان بە یەک سایز و قەوارە دەردێنێ.

دایکم دەڵێ: «بە خودای ئەختەر گیان! پێم سەیرە ئەتۆ وا دەڵێی. دەنا ئەمن منداڵەکانم لە قسەم دەرچن  وەک ماری پێوەیانەوە دەدەم. ئا ئەو کوڕەمت دیوە جاری وا بووە کاری بە قسە نەکردووم قەوارەی ڕەش و شینی وام تێکردووە دیتبات سەرت سوڕ دەما هیچ نەیوێراوە دەنگیش بکا.»

لە جیات ئەختەر خانم ئەوە حاجی‌ژنە کە دەڵێ: «سەد جار پێم گوتوە کچێ! مەحزی ڕەزای خودا ئەوەندە لەو منداڵانەت مەدە، گوناحت دەگاتێ بە قسەم ناکا.»

دایکم دەڵێ: «جا حاجی‌ژن! خۆ ئەتۆش کە دێتە سەرت لە من خراپ‌تر دەکەی، بزانە هەر جارەی چ لەو کوڕە بەستەزمانەت دەکەی.»

حاجی‌ژن دەڵێ: «حەقی خۆیەتی، هەرچی کە بە سەری بێنم. ئەو بیژووە سەگە ئەگەر لە ترسی حاجی وێرابام نانیشم نەدەدایە و لە مێژ بوو لە ماڵم وەدەر نابوو.»

ئەختەر خانم دەڵێ: «بەپێچەوانەی باوەڕی ئێوە من پێم وایە هەرگیز نابێ لە گوڵ کاڵتر بە منداڵی بگوترێ تا چ بگا بە وەی کە لێدەی و ئازاری پێ بگەیێنی، لام وایە خوداش پێی خۆش نابێ بەندەیەکی ئەو ئازار بدەی.»

دایکم دەڵێ: «ئەختەر! چۆن شتی وا دەڵێی. منداڵ کوتەکی لەسەر نەبێ نازانێ قۆناخ لەکوێ‌یە. دەنا ئەوێ ڕۆژێ بەو کوڕەم کوت مەشقەکەی بۆ خوشکی تەواو کا، بە قسەی نەکردم وەها قەوارەیەکم دە بەدەنی کردوە

ببینی سەرت سورِ دەمێنێ. دا سەرزل وەرە نیشانیان بدە با بزانن چم لێکردووی.»

ناوێرم نیشانیان نەدەم. ئەختەرخانم کە دەیبینێ خۆی بۆ ڕاناگیرێ.

: «هەی لاڵ بم ڕۆڵە! جا توخودا ئەوە کارە دەگەڵ ئەو منداڵە بەستەزمانەت کردووە. توخودا ئەتۆش بە خۆت دەڵێی دایک؟»

: «کچێ ئەختەر! دەڵێی چی؟ ئەدی پێت وایە لە خۆڕا دەڵێن لێدان لە بەهەشتێڕا هاتووە؟ بە خودای لەو ڕۆژەوە تا پێی دەڵێم دا مەشقەکەی بۆ بنووسەوە بێ یەک و دوو خەریک دەبێ و بۆی دەنووسێتەوە.

ئەختەرخانم دەڵێ: «من پێم وایە ڕێز گرتنی منداڵ و ئامۆژگاری بەجێی...

گوێم بە تەواوی لە قسەکەی ڕاناگرم هەڵدێمەوە کۆڵان. عەلیلە و قالە و بایز و خدر و قلێریش لەوێن.

: «عەلیلە هەرگیز دایکت لێت دەدا؟»

: «دایکم هەرگیز لە هیچمان نادا. دایکم هەر چەند کە لە کاری ماڵانڕا دەگەڕێتەوە زۆر شەکەت و ماندوویە. بەڵام هەتا هەموومان یەک بە یەک ماچ نەکا و باوەشمان پێدا نەکا دەست لە ڕەش و سپی نادا. پێم وایە بۆ حەسانەوەی خۆی ئەم کارەی دەکا.

کاوەیس سەری هەڵێنا. میلەکانی کاتژمێرەکە وەها توند دەسووڕانەوە کە پێی وا بوو تا بەری بەیان چرکەیەک لە چرکەکانی لەشی ئەو نامێنێتەوە و هەموو خەسار دەبێ. هەستا بۆ لای پەنجەرە چوو، گۆشەیەکی پەردەکەی وەلا دا و بە ئاستەم پەنجەرەی کردەوە، شەوی خەست و ڕەش، ئاسمانی ئەستێرەئاژن و شنەی بایەکی فێنک کە هێدیهێدی گەڵای دارەکانی حەوشەی ماڵە دوکتوری دەلەرەاندەوە، هێنایەوە سەر ئەم باوەڕە کە زەمان لە دەرەوە لەگەڵ زەمان لە ژوورەوە جیاوازیی هەیە. کاوەیس ماوەیەک بوو هەر لە خۆڕا حەجمینی لێ هەڵگیرابوو.

***

## ١٢

پێم دەڵێ: «بۆچی خۆتمان لێ نەناس دەکەی؟ خۆ من باش ئاگاداری تۆم. من ئاگام لێبوو کە چەند بە وەسواس وەک ئەوەی لە بەندی جەرگ و دڵت چاوەدێری بکەی کە لێت نەپسێ، ئەو شریتەت لە دڕکوداڵ و چقڵ و دڕوو دەکردەوە. من ئاگادارت بووم کە هەر وەڕووی خۆت نەدەهێنا کە دەیان چاو لە سەرتۆ لەنگەریان گرتبوو. ئەو دەم کە بە سەرسوڕماوی دەیاندیت چلۆن پیاوێکی وێچوو، پیاوێکی بەسەروسیما، بە جلوبەرگێکی کۆک و پۆشتە، بە کەوشی بریقەدار، بەبێ ئەوەی تۆزاویبوونی پێ گرینگ بێ، بەبێ ئەوەی زامداربوونی دەستی بە دڕک و چقڵ پێ مەبەست بێ، هەر وەک دزێکی زۆر بەئەزموون کە خەریکە ئەوەی دزیوێتی لە خۆشی دەدزێتەوە تا دەنگوباسی دزییەکە دەکەوێ چوویە ژێرخانیماڵەکەتان، بوخچەیەکت کردەوە، پاڵتۆیەکی کۆنت دەرکێشا و شریتە ئاڵۆز و پسپسەکەت خستە نێو گیرفانی پاڵتۆ کۆنەکە هەر وەک پێشووت قەد کردەوە. من گوێم لێبوو چۆن بە درۆ وڵامی پرسیارەکەی خێزانت داوە.

: «پیاوەکە! بۆ چوویە ژێرخانێ؟»

: «ژێرخان؟ من حەوتوویەکیشە چاوم بە ژێرخان هەر نەکەوتووە.»

: «بەڵام هەر ئێستا خۆم گوێم لە دەنگی درگاکەی بوو.»

: «نا.نا بڕوا بکە بە هەڵە چووی، لەوانەیە دەنگی شوێنی تر بووبێت یان گوێت زرینگاوەتەوە.»

تۆ پێم بڵێ چ دەقەوما ڕاستت پێ گوتبایە. لانیکەم درۆیەکی ڕاستترت گوتبایە. گوتبات لە کەوشە سپۆرتەکانم دەگەڕام، بۆیە چوومە ژێرخانێ. دەجا ئێستاش پێم ناڵێی ئەو شریتەی دۆزیتەوە و هەر وەکوو گیانی خۆت دەتپاراست چی تێدا بوو. بە ڕاستی ئەوەندە بۆ تۆ گرینگە؟ لە چی نیگەرانی؟ بۆچی هەر وەک ڕازێکی پڕ لە مەترسی لەم و لەوی دەشارییەوە. من تۆم دەدەیت کە چلۆن بە ترس و نهێنی، زۆر بە ئەسپایی زەبتە سەوتەکەت لە هاڵەکەتان هەڵگرت. ئەو دەم کە تەواوی ئەندامانی بنەماڵە هەر یەکەی بە کارێکەوە سەرقاڵ بوون و تۆیان نەدەدیت کە چلۆن گوێت هەڵخستبوو تا بە بیستنی خشپەیەک و یا دەنگێک زوو لە سەر جێگەی دابنێییەوە، بیری هەموو شتت کردبۆوە. هەر کە خیزانت بە زەبتەوە تۆی دیتبا، دەتزانی کە چی دەبێ پێ بڵێی.

: «بە ڕاستی جێی شەرم و شوورەییە!! لە سەر سێ کابانانڕا لەم ماڵەدا دەبێ ئەوەندە تۆزوخۆڵ وڵاتی داگرتبێ. جا ئێوەش بە خۆتان دەڵێن ژن؟»

ئەگەر بە درێژایی عومرت بێزت لە تۆز و خۆڵ و چڵکوچەپەر هاتبێ، ئەم جارەیان خۆشت لێهات، تۆی دەپەڕاندەوە. لە وانە بوو گەلێکیش شەرمەزاری خۆیان ببنەوە بە هۆی کەمتەرخەمیان لە پاک و خاوێن کردنی ماڵدا. بەڵام وا ڕووی نەدا، شانس خۆی بە شانتدا هەڵاوەسیوە، هەڵبەت هەر ئەوەندە هەتا دەچوویە ئەو دیوی کە خۆت ناوت لێ ناوە دیوی تایبەتی خۆم. بەڵام زۆرتر نهێنیخانەیەکە کە خۆتی تیا ون دەکەی. خۆتی تێدا دەشارییەوە لە خۆت و لە من. لە خاوخێزانت. لەو کەرەسە و کەلوپەلەی نیشانەی بوونی تۆیان پێوە لکاوە. وەک ناوێکی کە لە سەر مۆرێکی هەڵدەکەندرێ و وردەوردە بایەخ و نرخی لە خاوەنەکەی خۆی زۆرتر دەبێ بە چەشنێکی بەبێ ئەو مۆرە بڕوات پێ ناکرێ، بەبێ ئەو مۆرە پووڵی خۆت نادەنەوە دەس خۆت، خانووبەرەکەت بەبێ ئەو مۆرە خانووبەرەی تۆ نییە، وات لێدێ ئیتر بڕوا بە خۆت ناکەی و تۆش وردەوردە هەستونەستی خۆت لە دەس دەدەی، دەبیتە شتێکی تر وەک قارەمانی چیرۆکی «مەسخ»ی کافکا. تۆش دابەش دەبی. یا دەتوێیەوە لە نێو ئەو کتێبانەی کڕیوتن و لە

سەر یەکت داناون بۆ ئەوەی هەرگیز ئاوڕێکیان لێ نەدەیەوە. ئەو ڕادیۆ پێنج مەوجە سێیرایەی تەنیا یادگارێکە لە بابت بۆت ماوەتەوە و ئەوەندە بۆ لای نەچووی کە هەر وەبەر چاو نایە، ئەو قەفەسە بەتاڵەی هەڵتواسیوە لە بەر بێدەنگیی مەلێ باوێشکی دێت، ئەو سێتارەی شەرمەزاری ئەوەیە نەیتوانیوە تۆ فێرە ژەنینی خۆی بکات و وەها عادەتی بە ئارەقەی دەس و نێوچاوانی تۆ گرتووە کە وەختە سوێی بێتەوە. ئەم تابلۆیەی ئوستاد فەڕشچیان کە هەتا چاوت پێی دەکەوێ زۆرتر دڵنیا دەبی کە لە شوێنێکی باشت هەڵناوەسیوە، ئەسپەکەی نێو تابلۆیەکە زۆر شێوەی مرۆڤە ئەسپی ئوستوورەکانی یۆنان دەدا و دەشتوانی پێ و شوێنی سەدان ساعەت دڵتەنگی و بێدەنگی و وەڕەزی و تەنیایی خۆت لە سەر هێڵ و خەتەکانی دەستنیشان بکەی.

من تووڕە دەبم. لام وا بوو کەس نامبینێ. پێی دەڵێم، نا بە تۆ دەڵێم.

: «تۆ! کێی؟ یەک دەم وازم لێ ناهێنی؟ چیت لە گیانی من دەوێ، وەک چەقە پێمەوە نووساوی یانی چی؟»

پێم دەڵێ: «بۆ تووڕە دەبێ؟ ئەگەر ڕاستیت دەوێ ئەوە تۆی کە واز لە من ناهێنی. ئەم شوێنەونکێیە کە دەیکەی، واز لە سەرنجی من ناهێنێ. منیش وەک خۆت پێمخۆشە بزانم ئەم شریتەی بە سەگمەرگی لەو هەموو دڕکوداڵەت کردەوە وا بە نهێنی شاردتەوە چی تێدایە؟ منیش پێمخۆشە بزانم ئاخر گۆرانییەکانی مامۆستا حەسەن زیرەکە، ئەگەر هەون، کامە گۆرانییەتی. ئاخر چیت لێ بشارمەوە من زۆرم بیرەوەری خۆش خۆش لە گۆرانییەکانی زیرەک، یان کاک محەممەد مامڵێیە. هێچ پێمخۆش نییە پێت بڵێم کە چەندەم بە گۆرانییەکانی کاک محەممەدەو، دڵداری کردووە. ئاخۆ هی مەزهەری خالقییە، ڕەنگە ئەسڵەن پارچە مۆسیقایەک بێ لە کارەکانی جەلیل شەهناز یان ئەحمەد عیبادی یان سەمفۆنیایەک بێ لە کارەکانی بێتهۆڤن یان بۆ زۆر دوور بڕۆین بۆ شمشاڵەکەی قالەمەڕە نەبێ یان بەشێک لە بەیتی شێخ فەرخ و خاتوون ئەستێ لە زمانی حەمەدی بەیتان یا چوارینەکانی

خەیامە بە دەنگی مامۆستا هەژار یان، یان ڕەنگە هەر ئەو شتەش بێ کە تۆ بە شوێنیدا عەودالی.»

من دەڵێم: «تۆ! بە هەڵە چووی من بە شوێن هیچ شتێدا عەودال نیم بەڵکوو تەنیا لە بەر وەڕەزی و بێوازی سەرم لێ ئەستوور بووە بۆخۆشم نازانم چ دەکەم.»

پێم دەڵێ: «ئێستا تۆ چاوەڕوانی من باوەڕ بەو قسەیەت بکەم لە حاڵێکدا خۆشت باوەڕت پێی نییە. من زۆر باش دەزانم کە تۆ چ دەرد و مەرگێکت هەیە. من دەزانم لە مێژساڵە تۆ بەشێک لە وجوودی خۆت لە شوێنێک لێ بەجێ ماوە.نا باشتر ئەوەیە بڵێم لە کیست داوە. ئێستا لەو بەشە دەگەڕێی. تۆ ئەوە باش دەزانی کە لە ڕابردوودا بەجێت هێشتووە بەڵام لە بیرت چۆتەوە لە چ جێگەیەک یان لە لای چ کەسێک جێ ماوە. تۆ بێتاوانی، پەلەیان لێکردی، وەک ئەوەی بە گوێ هەڵتکێشن، هەڵیانکێشای. قەوارەیان لێک ترازاندی، هەڵیانبڕی لە خۆت. لە خەیاڵە خۆشەکانت، لە خەونە پڕ پەپوولەکانت، لە هێلانە چۆلەکەکانت، لە دەستە گوڵە گوڵاڵەکانت  کە هەر سووکەبایەک کە دەهات چەند پەلکی لێ دەڕفاندی تا دەگەیشتییەوە لای، تەنیا چڵەکەی  بە دەستەوەت دەما کە تۆش بە تووڕەیی توورت دەدان. بە ناتەواویان هێشتییەوە، هەر بۆیە ئێستا ساتێک لە هیچ جێگە و شوێنێ هەدادانت نییە. لە هیچ کوێ ناحەسێیەوە. تەنانەت لە ماڵە خۆشت، لەو شوێنەی کە دەبێ ئارامی لێبگری، هەست بە نامۆیی و ماندوویی دەکەی. من حەقت پێ دەدەم، کێ توانایی ئەوەی هەیە بەبێ ئەوەی خاوەنی دڵی بێ، خاوەنی بیرەوەری و یاد  بێ، خاوەنی خەون و خەیاڵ و حەز و تاسە بێ، ناوی مرۆڤ لە خۆی بنێ. مرۆڤ کە بیرەوەریی نەبوو، مێژووی نابێ. کە مێژووی نەبوو وەک ئەوەیە کە لە دوێنێڕا نەهاتبێ کە دوێنێی نەبێ مرۆڤ هەڵاوەسراوێکە لەنێو بۆشاییدا. بێ سەر و خوارەوە. بێ چەپ و ڕاستە. بێ باکوور و باشوورە، بێ ڕۆژهەڵات  و بێ ڕۆژئاوایە، بێ سەرەتا و بێ کۆتاییە، تەنیا بڵقێکە، بەڵام ڕاست نییە چونکە بڵقیش حەجمی هەیە. بڵق داگیرکەرە. فەزایەک داگیر دەکا. پەردەیەکە کە هیچێک دەشارێتەوە دە نێو

هیچایی خۆیدا و دەیکاتە شتێک. بەڵام تۆ چیت؟ دەتهەوێ ئەوەی لێیان ئەستاندووی، ئەوەی لێیان شاردوویەوە، ئەوەی لێیان داگیر کردووی یان ئەوەی لێیان گۆڕیوی، وەچنگ بێنییەوە. بەڵام تۆ بە هەڵە چووی و ناتوانی، تۆ ئەو پەردەیەی بە سەر هیچی وجوودی تۆیان کێشاوە تا ئەو نەبوونەی وجوودت وەک بوونێک نیشان بدەی، لێیان ئەستاندووی ناوی تۆیان لێ سڕیوەتەوە، هەر بۆیە گێژ و هەڵوەدا لە کوتکوت و پسپسی شریتێکی کۆن و ئاڵۆز هاڵاوی چونکە نازانی کامە گۆڕی بێ کێل دەبێ بدەیەوە، کامە پرێسکەی شاراوە بدۆزییەوە، کامە لێفە لە سەر کامە هەتیوی ڕەنجی دڵت هەڵدەیەوە. بۆ وا چاوم لێدەکەی بڕوات نەدەکرد بەم چەشنە شارەزای ڕازی نهێنی دەروونت بم. لێم دەترسێی لەوەی تا ئەو ڕادەیە دەتناسم. لێم دەترسێی کە لە شوێنێکی باست بکەم و ئەو ئابروویەی کە هەرگیز نەتبووە بیبەم. نا بڕوام پێ بکە بە هەڵە چووی من تەنیا بینەرێکی وەک تۆ وەڕەز و بێوازم. منیش وەک تۆ لە شتێ دەگەڕێم سەرقاڵم بکا. بۆ ماوەیەک لە خۆم دوور بکاتەوە. هەست دەکەم بێت و بە دواتدا بێم، سەرقاڵ دەبم، خۆم لە بیر دەچێتەوە. ئەو شریتەی تۆ دۆزیوتەتەوە سەرنجی منیشی بۆ لای خۆی ڕاکێشاوە، ڕەنگە منیش وەک تۆ بم، پرسیارم هەبێ لە شتێک بگەڕێم کە لێیان شاردوومەوە یا کوو لەخۆم دەگۆڕم لە کیسم دابێ یان لە قومارێکدا دۆڕاندبێتم. دە وەرە با بەیەکەوە گوێی بۆ ڕادێرین.

من لە وڵامدا پێی دەڵێم: «کاکی خۆم! وەرە مەردی خودا بە، لانیکەم تۆ مایەیەکمان بۆ دانێ من لە هەڵگرتنی خۆشم وەڕەزم چ بگا بە تۆی لاپرسەنی زۆربڵێی بەرەڵڵا.»

خەمگین و داچۆڕاو و خەمبار لەوەی لە شتێکی کە وەچنگم نەهێناوە دەبێ بەشیشی بکەم، دەمخاتە سەر بیری ئەوە کە جارێکی تریش پێویستە سەرلەنوێ بە خۆمدا بێمەوە.

***

## ١٣

حاجی محەممەد دەڵێ: «بێگومان ئەم جار تێکی دەشکێنێ. بڕوام پێ بکە یەک نەفەریشیان لێ زیندوو ناهێڵێ. چەکوچۆڵێکی زۆر باشی وەدەست کەوتووە. هەر چەندە شەڕی پارتیزانی پێداویستی بە چەکوچۆلی زۆر نییە. باشترین چەک لەم چەشنە شەڕانەدا، کە لایەک بە هێزێکی گەورە و چەکی قورس و تەیارە و تانک و تۆپ و لایەکی تر تفەنگ و چەند چەکی قورس و نیوەقورس بێ، تەنیا غیرەت و مەردئازایەتییە کە بەختەوەرانە ئەوانەی ئێمە چیان لە هەموو شت لە لا زۆرترە، غیرەت و مەردئازایەتی و بوێرییە، چ حەوجێ بە تاریف کردن نییە، خۆت باشتر دەزانی لە گەڕانەوەکەی بۆ ئەو دیو و لە پاش بە فیرۆچوونی کۆماری کوردستان چ ئاورێکی لە ڕێگەدا کردەوە. چوار دەوڵەت بەرەو ڕووی هاتبوون، دەتگوت مێشێکی لێ میوان نییە. هەر کەسێکیتر لە جێی ئەو بایە سەری شۆڕ دەکرد و خۆی بەدەستەوە دەدا. بەڵام «مەلا» هەمیشە کەشکی خۆماڵی لە پلاوی بێگانەی بەتامتر زانیوە. تەوآوی ئەو هێزانەی هاتبوون کە ڕێگەی ڕۆیشتن و دەرچوونی لێبگرن، چەواشە کرد. نە شاخی ئەستەم و هەڵەموت، نە چۆمی خوڕێن و سەربزێو، نە سەرما و سەخڵەت و برسییەتی بەرگەی غیرەتی پیاوانەی نەدەگرت. هەر لەبەر چاوی واق وڕماوی چوار دەوڵەتان، خۆی و پێشمەرگە ئازا و کۆڵنەدەرەکانی گەیاندە یەکێتی سۆڤییەت. لەوێ بوو بە ژنەڕاڵ.

وەستا کەریم دەڵێ: «حاجیئاغا! ڕاستە دەڵێن بەعس ڕاسپاردەی ناردۆتە لای بۆ ئاشتی و ڕاگرتنی شەڕ؟»

: «لای خۆمان بمێنێتەوە، دوێنێ شەوێ مەلا برایم لە قەڵادزەیڕا گەڕاوە دەیگوت ئەرتەشی هیتلێریش ئێستا بێ باشاری «مەلا» ناکا. ئەوجار قشوونی بەعسی بەیەکجاری تێک دەشکێنێ، ئەڵبەت ئەوەشم بیستبوو کە دەوڵەتی ئێران لە بنەوە یآرمەتی «مەلا» دەدا.»

وەستا کەریم وێدەچوو ئەو قسەیەی بە دڵەوە نەنووسابێ گوتی: «یا ڕەببی ئەو قسەیە ڕاست نەبێ، بە خودای پشت بە عەجەمان ببەستێ ڕۆژێک دەبینی لەپڕ پشتی تێکرد.»

حاجی محەممەد کوتی: «وەستا کەریم نابێ ئاوا چاو لە مەسەلەکە بکەی. کاکە گیان! ئەوە سیاسەتی پێ دەڵێن، هەویرێکە زۆر ئاو دەبا. ڕەنگە هەمیشەش وا نەبێ. جارێ ئەوە بە قازانجی «مەلایە»، مەگین نەتبیستووە کە دەڵێن دوژمنی دوژمنەکەت دۆستی تۆیە.»

وەستا کەریم پێی کوت: «حاجیئاغا! ئەگەر قسەی ڕاستت دەوێ ئەمن هیچ لە سیاسەت ناگەم بەڵام ئەوەندەی دەزانم کە عەجەم بۆ متمانە نابێ.»

حاجی دەڵێ: «برا گیان! ئەتۆ زۆر لە خۆڕایی نیگەرانی. تۆ پێت وایە شۆڕشێکی ئاوا گەورە و بەربڵاو بەبێ لە بەرچاو گرتنی هەر چەشنە پێداویستی و لێکدانەوەیەک سەری دەگرت و تا ئێرە دەیتوانی خۆی ڕاگرێ؟ حەتمەن پیاوی بەتەگبیریان دەگەڵە و دەبێ قەرار و مەدارێکیان دانابێ. دەبێ مەرجێک هەر دەگوڕێدا بێ بەڵام ئێستا گرینگترین کار ڕادانی هێزی داگیرکەری بەعسە.»

وەستا کەریم دەڵێ: «ئیشاڵڵا خودا بۆخوی وەخێری دەگێڕێ. حاجیئاغا ئەرێ بزانە کاتی بیبیسی نەهاتووە؟»

حاجی محەممەد کاتژمێرە باخەڵییەکەی دەردێنێ و چاوێکی لێدەکا و دەڵێ: «عەوڵا! عەوڵا! ئەتۆ چیتر ئاسنی مەکوتە بڕۆ سەری کووچەی ڕاوەستە هەر کە ژاندەرمێکت دی کە دێتە لای ئێرە ئاگادارمان بکە.»

عەوڵا وەدوای ئەنجامدانی دەستوورەکەی بابی کەوت. حاجی چوو لە قوژبنی دووکانەکەی ڕادیۆیەکی کە بە دەسماڵێک لە بەرچاوان شاردرابۆوە

وەدەری خست: «وەستا کەریم! کورسیلەکەت بێنە ئێرە با دەنگ نەچێتە دەر.»

وەستا کەریم چوو بۆ لای و گوتی: «حاجیئاغا! هیچ بیستووتە کە دەڵێن حەسەنە ڕووت دەستی دەگەڵ ئەمنیە[38] هەیە و ڕاپورتچییە؟»

: «وەستا کەریم! منیش ئەوەم بیستووە. ئەگەر ڕاستت بوێ ئەو ناپیاوە ئەوەی بڵێی لێی دەوشێتەوە. دەڵێن مەلا سەعید بە ڕاپۆرتی ئەو گیراوە.»

: «بەڵێ وام بیستبوو و شتێکی سەیرتر ئەوەیە خودا بە گوناحم بۆ نەنووسێ دەڵێن کچ و ژنەکەی بۆ ژاندەرمان دەبا!»

: «حەک لەو قەباحەتەی! دەڵێن حەیا قەترەیەکە، ئەگەر تکا، تکا! بە خودای کە عەلیم و خەبیرە وەستا کەریم بڕوام پێبکە پیاوی وەک «مەلا» نەبووبایە ئێستا ژاندرمان دە کاژیلەی[39] سەرمان‌دا عارەقیان دەخواردەوە.»

حاجی هەرای کرد: «کەریم! بە غاردان بڕۆ قاوەخانە دوو چایان بێنە، ئەگەر کاک قادری خەیاتیش لەوێ بوو پێی بڵێ، هەڵبەت بە گوێی‌دا بڵێ بابم دەیگوت لەگەڵ وەستا کەریم خەریکین گوێ بۆ بیبیسی ڕادەگرین، پێمان خۆشە بێیە لامان لە بیرت نەچێ ئەگەر ویستی بێ، سێ چایان بێنە.»

حاجی محەممەد بەو عەکسەی لە هەڕەتی لاوەتی کیشابووی و لەودا بە سینگ و بەرۆکی ڕووتەوە لە حاڵێک‌دا دوو میلی قورسی وەرزشی پاڵەوانیشی، خستبووە سەر شان و ئێستا لە گۆشەی دووکانی ئاسنگەرییەکەی لە پێش چاوی خۆی هەڵاوەسیبوو، دەری‌دەخست چەندە مەیلی لە پاڵەوانیەتی هەیە، ڕەنگە ئەو پیشەی ناڵبەندی و ئاسنگەری هەر لە بەر ئەوەی هەڵبژاردووە کە پێوەندی بە تاقەت و هێز و توانای زۆر هەیە، هەر چەند ڕەسووڵ کە کوڕی گەورەتر بوو ئاسنگەرییەکەی لە ناڵبەندییەکەی جیا کردەوە و ڕەسووڵ بەتەواوی کاری ناڵبەندی گرتە بەر و دووکانەکەی لە دووکانی حاجی دوور کەوتەوە و حاجی بۆخۆی و سێ

---

٣٨- پیاوی دەزگای پاراستنی حکوومەت راپۆرتچی: کەسێك کە ئیخباری دەکا.

٣٩- کاژیلە: کاژەڵاك. کاسەی سەر.

کوڕەکەی تری خەریکی گێڕانی ئاسنگەرییەکە بوو. ڕادیۆکەی هەڵگرد خڕەخڕە و خشەخشی نەیهێشت حاجی گوێی لە پرسیارەکەی وەستا کەریم بێ کە هەواڵی براکەی حەسەنی لێپرسیبوو کە ماوەیەک بوو لە شۆڕشەکەی «مەلا»دا بوو. دەجا پرسیارەکەی هەر وا بێوڵام ماوە. وەستا کەریمیش لێی دووپات نەکردەوە. لەو کاتەدا کاک قادری خەیاتیش وەژوور کەوت و بە دوایدا کەریم بە کەشەفێک[٤٠] چاوە.

: «بابە! قاوەچییەکە دەیگوت پەتەی ماوە یان بۆی بنێرم؟»

: «بڕۆ بڵێ بیست پەتەی تریشم بۆ بنێرێ.»

کاک قادر چاکوخۆشی دەگەڵ کردن.

حاجی گوتی: «کاک قادر! هەواڵی تازە چت پێیە؟»

: «حاجیئاغا! دەڵێن ئەمنییە چوونە زگ خدرئاغا و چەکیان لێگرتووە و قۆڵبەست بەڕێیان کردووە بۆ جەڵدیان. ڕەحمانئاغای برای بە شوێنیدا چووە. دەڵێن ئەوە حەوتوویەکە لەوێ ماوەتەوە و هیچی پێ نەکراوە. گوایە لە یەکێک دەگەڕێ بەڵکوو بۆی جێبەجێ بکا و بە بەرتیل بۆی ڕزگار بکا.»

وەستا کەریم گوتی: «بە خودای دنیا سەیر گۆڕاوە. پیاوەتی هەر باوی نەماوە، کابرا دەچێ ماڵە خەڵکی وێران دەکا تا ماڵە خۆی ئاوەدان بکا یا ڕەببی هەر کەس سیخۆری دەکا و گوزاریش لە خەڵکی دەدا ماڵی وێران بێ.»

کەس چی تری نەگوت چونکە دەنگوباسی شۆڕش دەستی پێ کردبوو. تا سەرکەوتن، تا وەدەسهێنانی سەربەستی تەنیا چەند هەنگاوێک ڕێگە ماوە، تا کێ یارمەتیمان بدا تا گەیشتن بە سەرکەوتن تەنیا چەند برین ماوە تا کە بێت و زامی هەناومان ساڕێژ بکا. تا گەیشتن بە یەکتر و یەکبوونەوەمان تەنیا چەند خۆزگە ماوە، خۆزگە، خۆزگە، خۆزگە وا دەبوو.

❊❊❊

---

٤٠- کەشەف: سینی.

# ١٤

....حاجیژن گوتی: «کچێ! گوناحت دەگاتێ، تۆ بۆ ئەوەندە ئەو بەستەزمانەی ئازار دەدەی؟ خوا هەڵناگرێ.»

دایکم دەڵێ: «حاجیژن! ئەتۆ نازانی چ دەردێکم دەداتێ. هیچ کارێکم بە قسە ناکا. هەر ئێستا کە جلی تازەی دەبەر دەکەم نەگەیوەتە هۆوەندەی لە قوڕ و چڵپاوی هەڵدەکێشێ، وەڕەزی کردووم ئەوەندەی لیباس بۆ بشۆم، بڕستم لێ بڕاوە.»

زۆری لێ ترسام دەنا دەگەڕامەوە دەمگوت: «حاجیژن! ڕاست ناکا بە خودای دەست لە یەک کراسیش نادا، بۆخوم هەمیشە دەیبەم، دایکی عەلیلە دەیانشوات.»

ئەگەر من وێرابام ئەو قسەیە بکەم بێ یەک و دوو وڵامی حاجیژن ئەوە بوو: «دەزانم، بۆخۆم باشتر لە تۆ ئەوەی دەزانم.»

حاجیژن لە جیات ئەو وڵامەی من وڵامی دایکمی داوە: «کچێ! سەبرێک بگرە منداڵن، هەڵدەبەزن، دادەبەزن، دەکەون پیسیش دەبن، لە کنەخۆ تۆ دایکی.»

بە قسەکانی حاجیژن ئەمن نەشە ببووم. دەتکوت ئەو دوو باڵەی هەمیشە بە ئاوات بووم هەمبێ داویانمێ، پێیان دەفڕم. کوتم کە دایکم لە چێشت لێنان بەدەر هیچ کارێکی نەدەکرد، ئەویشی لە بەر ئەوەی بۆخۆی لێیدەنا کە بێزی لە ئیدیکە دەکرد. تا خات فاتێ لە پشت نەکەوتبوو، شیووکوڵی ئێمەی دەکرد کە ئەو پێی نەکرا خات زارای جیرانمان بە پارووە سابوونێک و تمەنێک پووڵ ئەوەی شیووکوڵ بوو بۆی دەکردین. تا خات

فاتێ بوو هەموو جارێ بە خۆشییەوە دەچووم لە دوای عەلیلە و قالەی. ئەودەم دایکم بوخچەیەکی گەورەی جلوبەرگی چڵکنی لە پشتی هەر کاممان قایم دەکرد. دوو پارووە سابوونیشی دەدا دەستم: «ئەو سابوونانەت لە ڕێیە لێ نەکەوێ. بیاندە بە دەست خات فاتێ. نەیاندەی بە کەسێکی‌تر.»

من خات فاتێم گەلێک لە دایکم خۆشتر دەویست، خات فاتێش منی هەر وەک عەلیلە چاو لێدەکرد. هەموو جار کە دەیدیتم سەد جار خۆی بە قوربان دەکردم، هەڵبەت ئەوە عادەتی بوو. خۆی بە قوربانی هەموو کەس دەکرد بەپێچەوانەی دایکم کە هەموو کەسی بە قوربانی خۆی دەکرد. من هەستم دەکرد کە خات فاتێ منی زۆر خۆش دەوێ، دەیزانی زۆر لەگەڵ عەلیلەی بە یەکەوەین. هەر جارێکی دەیدیتم ماچی دەکردم لە سەر ئەو هەژارییەی کە تێدا نووقم ببوون هەمیشە شتێکی پێ بوو کە دەیدا بە من و عەلیلەی بیخۆین. پێی دەگوتم: «بەخودا ڕۆڵە گیان! ئەتۆم بەقەرا عەلیلەی خۆش دەوێ.»

هەموو جارێ بە بیستنی ئەو قسەیە نەشە دەبووم. هەر ئەو دەم بوو کە ئەو هەستە ناخۆشە داگیری کردم کە هەست بکەم دایکی خۆم کە کوڕی ئەو بووم ئەوەندەی خۆش نەدەویستم. هەر کات شیوەکانمان دەبرد بۆ خات فاتێ ڕووخۆشی ئەوم دەگەڵ عەلیلە دەدەیت دەمگوت

: «عەلیلە هەزار خۆزگەم بە خۆت بەس نییە ئەگەر هیچتان نییە دایکێکی زۆر باشت هەیە.»

عەلیلە دەیگوت: «ڕاست دەکەی وایە، هیچ کەس لە دایکی من باشتر نییە، بەڵام سەرەڕای ئەو دایکە باشە خۆزگە بە تۆ دەخوازم.»

: «بە من؟ جا بۆچی بە من؟ مەگین دایکت نەدیوم؟»

: «چونکە تۆ بابت هەیە، خۆزگە منیش بابم هەبوایە.»

: «بابم هەیە؟»

ئەمە پرسیارێک بوو هەر ئەو دەم لە خومم پرسی. بەڵێ بابم هەبوو بە ڕواڵەت، بەڵام هەرگیز نەمدەدیت. بەیانیان زوو وەدەر دەکەوت دەچوو بۆ ئیدارە، کارمەندی دەوڵەت بوو، کە دەهاتەوە بەبێ ئەوەی هیچ کام لە

منداڵەکان ببینێ، یان زوو سەری لە کتێبێک ڕۆ دەکرد، یآن ڕادیو سییرا پێنج مەوجەکەی بە گوێیەوە دەگرت و ئاگای لە زەمین و زەمان دەبڕا. ئەو دەمانەی کە وێمدەکەوت و نیازم بوو کەسێک بە هانامەوە بێ، دیار نەبوو، ئەو دەمانەی کە دایکم لێی هەڵدەقورینجاندم، دیار نەبوو بێ دەستێ بە سەرمدا بێنێ. ئەو دەمانەی تاریکایی و شەوەزەنگ نیسێی هەر شتێکی دەکردە دێو و درنج بۆ ترساندنی من و منیش لەرزۆک وەک دارەبی دوو دەستم بە دوو چاوان دەگرت و هەناسە، کێ بڕکێیان بوو کە خۆ دە سینگم بکوتن و ئارەقەی لەشم کە سارد سارد دەبوو و دەیلەرزاندم، هەرگیز لە پەنام نەبوو کە لە ئامێزم بگرێ و بڵێ: «مەترسە ڕۆڵە گیان! ئەوەی لێیان دەترسی هەموو خەون و خەیاڵی خوتن، تاو هەڵێ هەموویان هەڵدێن، مەترسە کوڕم! مەگین نابینی من وا لە لاتم؟»

لە ڕاستیدا بابم لە دەسەڵاتی دایکمدا ون ببوو، توابۆوە، نەماندەدیت. بۆخۆی چاکی لە بەر دەکرد، چاکی دەخوارد، چاکی دەخواردەوە، چاک دەگەڕا، چاکی ڕادەبوارد و ئێمەی بەرهەمی کەمتەرخەمی خۆی بە کەمجیکڵدانی دایکم ئەسپاردبوو و دایکیشم تەنیا لە بەر ئەوەی کەسێک پێی بڵێ  ژنێکی باشە حازر بوو هەر ئەو سات و دەمە هەر حەوت منداڵی لە چاوتروکانێکدا بکاتە پردەبازی ئەو کەسە تا خوای نەکردە جێگەیەکی لەشی پیس نەبێ. دایکم بۆ سواڵی تاریف و پێهەڵاگوتنی، لە هەر کەسێک با بۆ ئەو فەرقی نەبوو حازر بوو لە خۆی و هەستی خۆی نەبا لە هەموو شتێک گوزەرابا، هەڵبەت ئەو هەموو  شتەیە کە باسی دەکەم زۆرتر منداڵەکان و ویست و ئارەزووی منداڵەکانی بوو کە هەرگیزاوهەرگیز لە بەرچاوی نەدەگرتن. من کە کوڕە گەورەی ماڵێ بووم، زۆرتر قوربانی دەکرام تا ئەو باشتر بنوێنێ. حاجی محەممەدی سێحەب ماڵمان کە لە حەج گەڕاوە، بەبێ ئەوەی هەرگیز خەونی ئەوەشمان دیبێ دوو دەمانچەی ئاورپژێنی بە دیاری بۆ من و براکەم هێنابوو. دەمانچەیەک کە ئەو دەم هیچ منداڵێکی سەردەشتی شتی وای بە عومری خۆی نەدیتبوو. کە پلاپیتکەکەت داگرتبا پڕیشکەی ئاور لە لوولەکەی دەهاتە دەر، هاوڕێ دەگەڵ دەنگێکی

خۆشی تایبەتی. تا ئێستا کە من خەریکم ئەوەی دەنووسم هەرگیز بە قەدەر ئەو کاتەی کە لەگەڵ براکەم قامکمان لە سەر پەلاپیتکەی ئەو دادەگرت، هەستم بە بەختەوەری نەکردووە. ئەو دۆستەم کە بەم نووسراوەدا هاتەوە ئەوە لە چەند شوێن بۆم دەنووسیٚ براکەم بناسێنم. هەرچەند خۆم بەئانقەست باسی خوشک و براکانی خۆم نەکردووە، بەڵام لە بەر دڵی ئەو دۆستەم پێویستە بڵێم ئەو برایەم کە لێرە باسم کردووە لە خۆم ساڵێک بچووکتر بوو هەرچی ئاکار و ڕەفتار و خوو و خدەی من بوو ئەگەر هی من نەبوا دەبوو بە هی براکەم. هیچ شتێکمان وە هیچ شتی یەکتر نەدەچوو. دەتگوت لە دوو دایک و بابان بووین. ئەوەندەی من گوێ‌لەمست و ئارام و دەرس‌خوێن و لە سەرخۆ بووم، ئەو تەمبەڵ و دەرس‌نەخوێن و هاروهاج و بەدفەڕ و زمان‌پیس بوو، چۆلەکەی بە ئاسمانەوە بە بەرد دەنگاوت، تا لەبەر بەدفەڕی خۆی دەستی لە چەن جێگەوە نەشکابوو ڕۆژ نەبوو بیست سی دانە چۆلەکە نەکووژیٚ، بەڵام بە دوای ئەو چەند جار دەست‌شکانەی‌دا، چاکی نەدەئەنگاوتن، نیشانە تیٚ‌گرتنەکەی تێک‌چووبوو، ئەوە شووشە و پەنجەرەی خەڵکی بوو یەک بە دوای یەکدا دەشکان و ئەو برایەشم یەک بە دوای یەکدا وێی‌دەکەوت، بەڵام چارەی هەر نەکرا ناچار کەمتر ماڵی جیرانمان هەبوو شووشەی دە پەنجەرەکەدا مابیٚ، زۆربەیان لە نایلۆن و مقەبا لەجیاتی شووشە، کەڵکیان وەرگرتبوو. ڕۆژ نەبوو لە مەدرەسەی لە بەر نەنووسینەوە و نەخوێندن وێی نەکەویٚ، ئاخری قەرارمان دانا کە من ڕۆژیٚ بە قڕانێک کە جیرەی ڕۆژانەی بوو، مەشقەکانی بۆ بنووسمەوە، هەرچەند لە کاتی خەرجکردنی پووڵەکەی زگم پێی دەسووتا و بەشم دەدا، بەڵام ئەم کارەمان بوو بە هۆی ئەوەی کە من لە خوێندن‌دا لە جاران زیرەکتر بم و ئەویش لە جارانی تەمبەڵتر. هەر لەبەر ئەوە زۆر جاران لە قوتابخانە خۆی دەدزییەوە هەتا زەنگی قوتابخانە لێیدەدا، خەریکی شەڕەسەگ دەبوو. سەگ نەمابوو کلکەسووتەی بۆ نەکەن. ببوو بە بابیان. (بنکەی تەندروستی) ئەو وەختە کە دەستووری تۆپاندنی سەگە بەڕەڵڵایەکانی بە دەستەوە بوو سەمی دەدانیٚ ئەو برایەم نازانم لە کویٚ ماستی وەچنگ دێنا ماستی دەدانیٚ و

زیندووی دەکردنەوە. جارێکیان لە بیرمە دایکم پووڵی دابوویە لە قەسابییەکەی نیزیک سەرچاوە، گۆشت بکڕێ هەر نەهاتبۆوە، ناچار دەبێ واز لە گۆشت لێنان بێنێ بۆ نەهاریش ئەو برایەم هەر نەهاتبۆوە، بە ناچار من و بابم وەشوێنی کەوتین زۆری لێگەڕاین تا ئاخری لە لای نێزەڕۆیە لە حاڵێکدا، دە دوازدە سەگی زەلام و نێرەکەری لە خۆی هالاندبوو خەریک بوو ئەو گۆشتەی کە دەبوو نەهاریَ ئێمە بیخۆین دەیدا بە سەگەکان. بابم کەوتە سەری بە شەپان هێنایەوە ماڵ و منیش لە داخی ئەو نەهارەی کە دەبوو گۆشت بخۆم و ماشێنەم خواردبوو، سەگەکانم وەبەر بەردان دا، قروچکەیان دەگەیشتە ئاسمان. جا کاکە ئەوەندە بەسە بۆ ئەوەی بیناسێنم یان زۆرتری لە سەر بڕۆم؟ بە هەر حاڵ ئێوە دەتانتوانی ئەم بەشەی نەخوێننەوە بۆ ئەو برادەرەم نووسیبوو. دەمگوت ئەو دەم من، من نەبووم ئەوە خودی بەختەوەری بوو کە دەیانتوانی دامبەشن بە سەر ئەوانەی هەستیان بە بەدبەختی و چارەڕەشی دەکرد. کە دەمانچەکەم بە دەستەوە دەگرت هەستم بە دەسەڵات دەکرد. هەر وەک ئەمیرخانی لەپزێڕین کە لەنێو قەڵای دمدم هەستی بە دەسەڵات دەکرد. زەینم دەستی کرد بە پرسیار و پشکنین، لە خۆم پرسی لە پێشدا کێ بکوژم باشترە؟ بیرم هەر بڵێی یەک و دوو ئاغای «قاف»ی لە بەر دەمم قوت کردەوە و من دەمانچەکەم تێگرت: «ئێستا بتکوژم؟»

پێوەم نەنا، وەلام دا، پێمخۆش بوو هەوەڵ دەمانچەکەم ڕوو بە دایکم بگرم، لە پاشان بە ئاغای «قاف»ەوەی بنێم. دوای ئاغای «قاف» بە «یۆسف»یەوە بنێم کە لە شەڕەگەڕەکدا دەستەی مچەکوێری بوو، چەند جار لە کۆڵان لێیداوم ئینجا لە پاش هەمووان بە برا هەرە چکۆڵەکەمیەوە بنێم کە هەمیشە لە سەر کۆشی بابم دانیشتبوو، خۆی بۆ شیرین دەکرد و بابم پێی هەڵدەگوت. بەڵام هەرگیز نەمتوانی بە دەمانچەکەم، هیچ کامیان بنگێوم. هەر ماوەیەکی کورتم بە دەستەوە بوو. دایکم دەمانچەکەی لە من و براکەم ئەستاند. ڕەنگە زۆرتر لە ترسی ئەوە بوو، کە نەکا خوای‌نەکردە ئەو یەکێک بێ لەوانەی پێی بکوژم، ئەڵبەت ئێستاش نەیزانیوە کە لە پێش

هەمویاندا دەخۆییم گرتبوو. بێتوو بیزانیبا باسی سەر بوو. زۆر بەداخەوە دەمانچەکەی بە گریان، لە دەستی دەرکێشاین، گوتی: «دەیشکێنن، بۆتان هەڵدەگرم با هێندێک گەورەتر بن» گریان و پاڕانەوەی من و براکەم بێبەهاترین شتێک بوو بو دایکم کە لە خۆڕایی خەسارمان دەکرد. دآیکم وەها دەمانچەکانمانی بێسەروشوێن کرد کە هەموو جارێ کە پرسیارم لێدەکرد دەیگوت «بە خودای بۆخۆشم نازانم لە کوێم تاقەت کردوون.»

دایکم بە شاردنەوەی دەمانچەکانمان، هەوسارێکی لە ملی من و براکەم کردبوو هەرچی پێی خوش با پێیدەکردین.

ئەگەر مەشقی[٤١] بۆ خوشکەکەت بە خەتێکی خۆش بنووسییەوە، کە زۆریان بۆ داداوە و بۆی تەواو نابێ. مێشکی سەرمی بە نووکەنووکەکەی بردووە. دەمانچەکەت بۆ دێنم نەختێکی کایە پێ بکەی.

گیانکێشان گەلێ خوشتر بوو لە نووسینەوەی مەشق.

: «هەمووتان جوان گوێتان لێ بێ. پێنج جاران لە ڕووی دەرسی تەلەیفۆن بنووسنەوە.»

ئێستاکەش ڕقێکی زۆرم لە ئەلێکساندر گراهام بێلە. ئەوەی لە خۆڕا تەلەیفۆنی داهێنا و عەزابێکی گەورەی ڕووحی بۆ ئێمە پێکهێنا. پێنج جار نووسینەوە لە ڕووی دەرسی تەلەیفون، یانی لانیکەم پێنج ساعەت بێ پسانەوە سەرداخستن. یانی پێنج هەزار دڵۆپ ئارەقەی ڕەش و شین دەرکردن، یانی هەزاران جار پلێتەی چڵم لە لووت شۆڕبوونەوە و ئینجا بە کەپۆ دەگەڵ جازیبەی زەوی، واتا کەشفەکەی نیۆتۆن بەربەرکانی کردن و هەڵکێشانی دووبارەی بۆ شۆڕبوونەوەی سێ بارەی ئەو هات و چۆیە بەردەوام تا وەپشت ملت دەکەوت.

: «ئەستۆ شکاو بڕۆ ئەو چڵمەت بسڕە.»

---

٤١- مەشق: ئەو نووسینەوەی مامۆستا بۆ قوتابی دیاری دەکا.

پێنج جار نووسینەوە لە ڕووی دەرسی تەلەیفون یانی تازە ئەوێ ڕۆژێ نەچوونە کۆڵان و وازهێنان لە خۆشییەکانی خوزێن، تۆپە باگردێن، باخەڵێن، سەرەکەی بیج قەدەرە بە گیانی تۆ و شەپشەپێن.

: «ئەوە لێتان دووپات دەکەمەوە بێتو بە خەتێکی خۆش نەینووسنەوە ئاورتان لە سەر پشتی دەکەمەوە. وای بە حاڵی ئەو کەسەی دەرسەکەی تێپەڕێنێ.»

: «دایە گیان! بە قوربانت بم هەرچی پێم دەڵێی بە قسەت دەکەم، تەنیا دەرسی تەلەیفونی بۆ نانووسمەوە، پشتم شکا هەتا هی خۆم نووسییەوە.»

: «کەوابوو تازە ئەتۆش چاوت بە دەمانچەکە ناکەوێ.»

بەڵام کایە بە دەمانچەیەکی کە کەس وێنەی ئەوی نییە، شتێکی دیکەیە. ئەوەی توی ناوێ، بە دیتنی لێت دەترسێ، سەرت بۆ دادەنوێنێ. رەنگی دەمانچەکەی من ئەو جۆرەی لە بیرم بوو سەوزێکی تۆخ بوو. دەبێ دروستم گوتبێ ئاخر تەنیا یەک ساعەت دە دەستمدا بوو و کایەم پێ کرد کە دآیکم لە چنگی دەرێنام. هەر ئەودەم کە دەمانچەکەم بە دەستەوە بوو واتا لەو یەک ساعەتەی من خاوەنی دەمانچەکەی خۆم بووم عەلیلە و قالە هاتبوون لەدوام کە برۆمە کولان. بە دزی دایکم لەبەر پەنجەرەڕا نیشانم دان، هەر کە وەژەیەکم لێ هێنا و پڕیشکی ئاگری پژاند، هێندەی نەمابوو هەرتکیان لە تاوانی شێت بن. سەد سوێندیان دام. سەد جار پاڕانەوە بۆیان بەرم کە جارێکی ئاگری لێهەستێنن، لە ترسی دایکم نەموێرا. لەو ڕۆژەوە عەلیلە و قالە زۆرتریان خوش دەویستم.

دەرسی تەلەیفون سێ لاپەڕەی ئەو دەمی کتێبەکەمانی گرتبوو. بەڵام دەنووسینەوەدا بە خەتی من، کە درشتم دەنووسییەوە هەموو جارێ دەیکردە دوازدە لاپەڕە. سابیر ئەو کوڕە کوردەی لەو دیویڕا هاتبوونە سەردەشتێ، بە شازدە لاپەڕە تەواوی دەکرد. تەنیا عەلیلە بوو دەیتوانی بە هەشت لاپەڕەی دەفتەرەکەی سەر و بنی پێکبێنێ. بەڵام هەر لە سەر ئەو پێکهێنانی سەر و بنی دەرسی تەلەیفون چەندەی وێکەوتبوو. ئاغای «قاف» ناچاری دەکرد لە ڕووی دەفتەرەکەی خۆی بیخوێنێتەوە نەک لە ڕووی

کتێبەکە. خەتی عەلیلە ئەوەندە ناخۆش بوو بە حەزرەتی فیل نەبوا ڕەنگە ئەگەر داڕووخانەچیش[٤٢]، لە بەرچاو نەگرین بە هیچ کەسی‌تر نەدەخوێندرایەوە. بۆخۆشی کە نووسیبووی نەیدەتوانی لە دوو سێ خەتی هەوەڵ زیاتر لە ڕووی بخوێنێتەوە. تەنیا من و قالە دەمانزانی بۆچی وا وردیان دەنووسێتەوە تا دەفتەرەکەی زوو تەواو نەبێ ناچار نەبێ بۆ کڕینی دەفتەری تازە، پووڵ لە خات فاتێ وەربگرێ. عەلیلە ئەوەندە وردی دەنووسی و وشەکانی دەپاڵ یەک دەخزاندن کە ئەو چەند نموونە خەتی بزماری و ئەوێستایی و عیبرانی کە وێنەی دە کتێبە مێژوویەکەمان‌دا بوو، باشتر دەخوێندرایەوە. بەڕاستی کە عەلیلە لە نووسین‌دا خەتێکی تایبەتی یەک کەسەی ساز کردبوو کە دەنووسرا بەڵام نەدەخوێندرایەوە!!!

قالەش کە هەمیشە و دایم، وەک چەقە بە عەلیلەوە نووسابوو، دەتگوت خودا بۆ ئەوەی خەلق کردوە کە ئەو شەپ و زللە و شووڵکانەی وە عەلیلەی دەکەوت بۆی ببژێرێ و ئامارەکەی بداتە دەستی. عەلیلەش زۆری شانازی بەوە دەکردکە سی شوڵکی تەڕی وێکەوتووە و نەگریاوە. کە چی درۆی دەکرد، دەگریا، بەڵام بەبێ فرمێسک، چون ئەگەر چاوەکانی عەلیلە سەرچاوە گەورەکەی شاریش با، بەم هەموو تێهەڵدان و تێ‌کوتان و شەپ و مست و زللە و پێلاقە و گوێ بادان و قەڵەم لە نێو قامک‌نان و لە سەر پێ ڕاگرتن لە حاڵێک‌دا دوو دەستی دەبوایە بلیند کردبا و یا زیندانیکردنی دە عەمبارە تاریک‌وتنووک و پیسەکەی قوتابخانەدا دەبوو، تا ئێستا ئیشک ببا. من دەتوانم بە ڕاشکاوی بڵێم بەشێکی زۆر لە سەرچاوەی چاوی عەلیلە دەرسی تەلەیفون ویشکی کردبوو. عەلیلە ئەوەندە جەریمەی تەواو نەنووسینەوەی دەرسی تەلەیفونی کەوتبووە سەر کە عێل و عەشیرەتێکیش کە نووسیبایان، بۆیان تەواو نەدەبوو. عەلیلە سەرجەم هەشتاوشەش جار نووسینەوەی دەرسی تەلەیفون بە ئاغای «قاف» قەرزدار بوو. ئاغای «قاف» دەیگوت: بێتوو کەسێک جارێکی بەتەواوی و بە خەتی خۆش لە

---

٤٢- دکتۆری دەرمانخانەش.

ڕووی ئەو دەرسەی نەنووسیێتەوە بۆ هەر جار نەنووسینەوە بیست شوڵکی تەڕ، یان پێنج جار نووسینەوە جەریمە دەکرێ. من و قالە کە حیسابی جەریمەکانی عەلیلەمان بۆ ڕاگرتبوو، دەمانزانی بۆ ئەوەی عەلیلە لەگەڵ ئاغای «قاف» پاک لە پاک بن، دەبوو ئاغای «قاف» هەزار و حەوتسەدو بیست شوڵک لە عەلیلە بدا. ئەمن و قالە خۆمان کوشتبا و زۆرمان تاقەت هێنابا هەر یەکی دەمانتوانی پەنجاە شوڵکی وەئەستۆ بگرین کە خۆم هەر کە بیریشم لێ دەکردەوە ئازای لەشم وەژان دەکەوت. تازە دەماوە هەزار و شەش‌سەد و بیست شوڵک کە بە هاسانی کەری نێڕیشی سەقەت دەکرد. جا بۆیە ئاغای «قاف» ئەگەر ڕاستت بوێ بەو کارەی سەرچاوەی چاوی خات فاتێشی وشک کردبوو.

خات فاتێ هەموو ڕۆژێ چەند جاران بۆ کاوەیس نا، هەڵە لە منە بۆ عەلیلە دەگریا و چی لە دەست نەدەهات.

دایکم وەها دەمانچەکانی من و براکەمی شرت‌وگوم کردبوو کە هیچ شوێنێ نەمابوو عەقلی من و براکەم پێی گەیشتبا و نەمانپشکنیبێ. دیارە کە هیچ دەمانچەیەک نابێتە ئاو، کە چی هی ئێمە ببوو بە ئاو و بە عەرزیدا ڕۆچووبوە خوار. من پێم وایە ئەگەر مەئموورێکی بەئەزموونی ئێمڕۆی کا.گێ.بێ(KGB) یان مووساد یان سی.ئای.ئێی ئەمریکا ئەودەم زگیان بە من و براکەم سووتابا و هاتبان ئەو دیو و پێشخانەیەی تێیدا دەژیاین سەر و بنیان کردبا دەمانچەکەمانیان بۆ نەدەدۆزراوە چونکە هیچ دەمانچەیەک دە ئارادا نەبوو کە بتوانن بیدۆزنەوە، زۆر درەنگ من و براکەم زانیمان دایکم لە بەر خۆشەویستنی لە ڕادەبەدەری خۆی و لە بەر ئەوەی دڵی خوشک و مێردی خوشکەکەی ڕاگرێ و پێی بڵێن چ ژنێکی باشە، ئەو دوو کوتە دڵەی من و براکەمی دابوو بە دوو کوڕەکەی پوورم کە کایەی پێبکەن و خۆشی پێ ڕابوێرن. وەی هەزار خۆزگەم بە خۆیان.

***

## ١٥

....  عەولا گوڵەجەرگەی حاجیژن بوو. ئەوەندەی خۆش دەویست، کە پێی خۆشبوو بتوانێ تەواوی دنیایە، بکاتە نانێکی گەرم و ڕۆنی کەرەی تێهەڵسوێ و بیدا بە عەولا بیخوا و کاری دنیایە یەک سەرە بکا و لەکۆل ئەو هەموو سووڕان و سەرەگێژەیەی بکاتەوە. بە پێچەوانە ڕکی هەرە گەورەی لە کەریم بوو. هەرچەندە کەریم زڕکوڕی حاجیژن نەبوو، بەڵام زۆر پێی خۆشبوو کە زڕکوڕی با تا بە کەیفی خۆی، هەرچی دەماری لەشی بوو هەمووی دەرکێشابایە، هەرچەندە ئێستاش کە زڕکوڕی نەبوو دەمارێکی وای بۆ نەهێشتبۆوە. هەرچی کەریم زۆرتر لە ئەمرو نەهی دایکی دا دەبوو، عەولا سەربزێو تر و ڕوو هەڵماڵاوتر و تەپلۆستر دەبوو. هەموو جارێ حاجیژن بە نهێنی بە عەولای دەکوت: «هەی بە قوربانت بم، ئەگەر جارجارە لەبەر چاوی بووکهەنار و ئەوانیتر بە قەستی لێت تووڕە دەبم و جنێوت پێ دەدەم بەدڵی نەگری. دەنا دەڵێن بۆ ئەوەندە کەریمی ئەزییەت دەکەی؟ با ئەو بێ ناموسانە بیر نەکەنەوە بە تەنیا هەر تۆم خۆش دەوێ و لە گوڵت کاڵتر پێناڵێم.»

حاجیژن بە درێژایی ئەو تەمەنە دوورو درێژەی کە لەگەڵ حاجی محەممەد ڕاببواردبوو. حاجی وەک بەری دەستی خۆی دەناسی. هەر لە ڕووی گنجی نێو چاوانی حاجی تێدەگەیی کەئەوڕۆ فرۆشی چەندە بووە. یان ئەوڕۆ چ خەبەرێکی خۆش یا ناخۆشی بەدەس گەیوە، یان دیسان لە مزگەوتێ کەوشەکەیان لێ گۆڕیوە و کەوشێکیان بۆ بەجێ هێشتووە کە ئەگەر جنێویان بە بابی دابا قەت ئەوەندە پێی هەڵنەدەبەزییەوە. بە تایبەت کە

هەموو گنجەکانی ڕوخساری کەوتبانە سەریەک، حاجیژن دەیزانی کە دیسان لەجێی توتنی بێشەمە زبڵیان بە حاجی فرۆشتووە. جا ئەودەم بوو حاجیژن وەخۆ دەکەوت، بەپێی حاڵ و وەزع، ئاکار و رەفتاری جیاوازی دەگرتە بەر : «تووبا! تووبا! کچەتیوە بابان شێواوە! ئەتۆ لە چ جەهەندەمێکی؟ مەگین نازانی بابت ماندوومردوو هاتۆتەوە. بڕۆ لە دیوی بابت دۆشەگەڵەکەی بۆ بێنە. ئەلێرەی بۆ ڕاخە فێنکە، تا دۆیەکی ساردی بۆ تێدەکەم.»

یان بە نازێکی پیرەژنانە کە ڕەنگە هەر پیرە پیاوانیش تێی بگەن دەیگوت: «حاجی گیان! یاخودا بەخێر بێیەوە. بە خودای ڕووناکایی ماڵمانی، چۆن بوو ئەورۆ وا وەدرەنگی کەوتووی؟»

حاجیژن ئەو قسەیەی لە حالێکدا بە حاجی دەگوت، کە حاجی لە هەموو ڕۆژێکی زووتر هاتبۆوە یان دەیگوت: «حاجی گیان! بە خودای نامانەوێ، نەچی لە سەر ئێمە خۆت زۆر ماندوو بکەی، هەر نیسێت (سێبەرت) لەسەر سەرمانبێ بەسمانە، شوکری خودا چ نەماوە بۆمان نەکڕی. خۆت زۆر ماندوو مەکە، ئەی ئەو کوڕە زەلامە نێرەکەرانەت بۆ چییە؟»

حاجی وەک هەمیشە لەخۆیەوە دەیگوت «مەکری زەنان، بارخەران، خەرنەبەرد!!»

حاجی کە دۆیەکەی دەخواردەوە، یان کە دەچووە ژوور و چاییەکی دەخواردەوە حاجیژن پەیدا دەبوو. هەرچی خراپەیەکی لە شەیتانێکی خراپ دەوەشاوە و هەرچی چاکەیەکی کە لە پیرێکی نوورانی و عیرفانی دیترابا دەیکردە دوولیستە و لیستەی خراپەکارییەکانی بە نێوی کەریم بۆ حاجی دەخوێندەوە لە پاشان لیستەی ئاکارە باشەکانی بەنێوی عەوڵا دەرخواردی مێشکی ماندووی حاجی دەدا، کەریم کە لە شەیتانبوونی خۆی بێخەبەر بوو، هەرکە وەژوور دەکەوت، دەکەوتە ژێر تەوس و جنێو و زۆر جاریش شەپ و مست و پێلاقەی دەسەڵاتی باوکی تاکوو کەریم ئەرخەیان بێ کە حاجی ئێستاش بە زیبک و زاکوونە و هەروا ئاسینگەرێکی بە تاقەت و توانایە.

با وەکوو زۆر جاران حاجیژنم دەدی چەندە ناجوامێرانە کەریم بە لێدان دەدا، دیسان من حاجیژنم خۆش دەویست. چونکە تەنیا کەسێک بوو لەو ماڵە پڕ خێزانەدا لە سەرم وەجواب دەهات و نەیدەهێشت ئەو پەندەی بۆ خۆی بەسەر کەریمی دەهێنا، دایکم بەسەر منی بێنێ. چارشێوشانەکەی هەمیشە جێگایەکی ئەمن و ئەمان بوو کە لە دەستی خۆشەویستی دایکم!!! خۆمی لێ بشارمەوە. بەڵام لەحاجیژن زۆرتر، بووکهەنارم خوش دەویست لەسەر هەموو کەس وەجواب دەهات تەنانەت لەسەر گوڵە شێتیش، هەموو جارێ بە خەسووی دەگوت:

: «ئامۆژن! بەخودا گوناحت دەگاتێ بۆ ئەوەندە ئەو منداڵە بەستەزمانەی ئازار دەدەی؟ خودا هەڵناگرێ.»

حاجیژن بە تووڕەییەوە دەڵێ: «بێدەنگ بە بێدەنگ، لێم مەبە بە مەلا، بە دەس خۆم نییە خۆشم ناوێ، قەتم خۆش نەویستووە هەرکە چاوی لێدەکەم دەڵێی گووی لەسەر گۆڕی بابم دەکا. هەروەختە هەرتک چاوی دەرێنم، چاوشۆڕە.»

: «ئامۆژن! جا ئەو بەستەزمانە بڵێ چی؟ ڕاست و چەپ ئەتۆ بە تێهەڵدانی دەدەی. هەر چاکە بە حاڵ ماویشە.»

: «دەیجا گوڵە باغ! تۆ کە ئەوەندەی لەسەر وەجواب دێی. بۆ نایبەیە دیوەکەی خۆتان با لەگەڵ تۆ و ئەحمەد بێ.»

: «بە خودا پێم ناخۆش نییە ئامۆژن! بۆخۆت دەزانی من و ئەحمەد و سێ منداڵ لەو دیوە چکۆڵەدا بە زۆری جێگەمان دەبێتەوە ئەگینا وەک منداڵی خۆم ئەویشم بەخێو دەکرد.»

کەریم تەمەنی شازدە ساڵ بوو بەڵام هێندەی وێکەوتبوو، شکابۆوە. ئەوەندە دەکاری سەخت و ناخۆشیان هاویشتبوو، هەر سەری هەڵنەدابوو. سوێندت لەسەر دەخوارد کە تەمەنی نەگەیوەتە یازدە ساڵیش. هەرچەند عەوڵا چوارساڵ لە کەریم بچووکتر بوو. بەڵام بە قەڵافەت و شان و باهۆ دەتگوت برا گەورەی کەریم بوو، هەرجار کە بیانوویەکی وەدەس کەوتبا

لەبەر چاوی حاجیژن کە نەیدەشاردەوە چەندەی کەیف پێ سازە، کەریمی وەبن خۆی دەدا و دەکەوتە سەری و بە مست دایدەگرت، بە دایکم و بە بووک هەنار لە ژێر دەستی ڕزگار نەدەکرا تا وەگریانی نەخستبایە وازی لێنەدەهێنا. کەریم هەرگیز نەیدەتوانی دەستی لەگەڵ بکاتەوە. ئەوەی لە دەستی دەهات ئەوە بوو کە بەدەستان دەموچاوی داپۆشێ تا مستی قورسی عەولا لووتی نەشکێنێ. حاجیژن کە لە دوورەوە چاوی لێدەکردن، هەموو جارێ دەیگوت: «حەک عەمرت نەمێنێ خوێڕی ترسەنۆک! چاو، چاوی لێکەن چەندە حیزە! خۆ عەیبێش ناکا دەشگری! خوێڕی ترسەنۆک.»

هیچ کەس لە حاجیژنی باشتر نەدەزانی کە کەریم بۆ ئەوەندە خوێڕییە. لە ڕاستیدا بۆخۆی خوێڕی کردبوو. کە چکۆڵە بوو. بۆخۆی کەریمی بۆ عەولا لە عەرزدەدا و دەیگوت: «عەولا گیان! وەرە زوو وەرە ئەو دزەم بۆ گرتووی، وەرە بیکوژە.»

عەولا کە لە پێشدا وەی دەزانی ئەوە چەشنێک کایەیە[٤٣]، نەرم و هێدی لە کەریمی دەکوتا بەڵام کە حاجیژن دەنگی دا کە توندتری لێبدا تا وەگریان دەکەوێ توندتری لێدەدا! هەتا کەریم فێرە گریان بوو. تا گەورە بوون ئەمە کایەی هەموو ڕۆژەی حاجیژن و عەولا و بۆخۆی بوو. حاجیژن هەرگیز نەیشاردەوە و لە لای زۆر کەسان درکاندبووی. بێتوو لە خودا نەترسابا بە دەس خۆی کەریمی لەناو دەبرد. کە منداڵ بوو ئەودەم بۆ عەولای لە عەرز دەدا جار جارە کەریم لە بنەوە دەستێکی دەکردەوە بەڵام کە دەکەوتە ژێر چەپۆکی حاجیژن، ئیتر وازی لەدەستکردنەوە هێنا و بۆ هەمیشە حیز و دەستەوستان ماوە. هەموو جارێ حاجیژن دەیگوت: «ئەو هەتیوەیە ئاوا ڕزیو و ڕیوەڵەیە. بە خودای دەترسم بە سەربازی نەگرن کە ماوەیەکی لەکۆڵمان ببێتەوە.»

ماوەیەک بوو هەرکات حاجی محەممەد و وەستا کەریم و کاک قادری خەیات دەکەوتنە قسە و باسان، کەریم گوێی بۆ قسەکانیان هەڵدەخست.

---

٤٣- کایە: یاری. گەمە.

هەموو جارێ بڕبەندێکی هەڵدەگرت و بە بیانووی ساف و لووسکردنی دەسکی داسەکان لێیان نیزیک دەبۆوە. هەموو وجوودی دەکردە گوێی و بەڕێی دەکردە نێو کۆزیلکەی پیاوەکان. غیرەت، مەرد ئازایەتی، شەرەف، سەروەری، سەربەستی، پاڵەوان، شۆڕش، چەک، پێشمەرگە، شەهید، هەمووی ئەو وشانە بۆی تازە بوون. بەبێ ئەوەی بزانێ مانای تەواویان چییە؟ خۆشی لێیان دەهات. کەتەنیا دەماوە، دووپاتی دەکردنەوە و وێردی سەر زاری بوو. جار جارە کە لەگەڵ تەنیا ئاواڵەکەی «باقی» کوڕی کاک قادری خەیات دەبوو. ئەوەی کە لە زاری پیاوەکانی بیستبوو موو بەموو بۆی دەگێڕاوە، بەدەم هەستان و دانیشتن، بەدەم هەستان و خەوتن بە دەم هەستان و وەستان، هەروا دووپاتی دەکردنەوە. هەڵیدەمژین. دەیکردنە خوێنێکی گەش و سوور و ئاڵ، تێکەڵ بە خوێنە پیس و زەرد هەڵگەڕاوەکەی خۆی دەکرد. هەستێکی خۆش و نامۆهەموو جارێ لەشی دادەگرت، ئیتر هەستی بە هیچ ئازارێک نەدەکرد. ئەهوەن دەبۆوە، لە لێدان و کوتان نەدەترسا، کە چاوی بەحاجیژن و عەولا لە لای یەک دەکەوت دڵی دانەدەخورپا.

: «قەت خودا پیاوی ئاوا ئازای لە سەر ڕووی زەوی خەڵق نەکردووە.»

: «ڕاستە بەخودای دەڵێن وەها ترس و دڵەڕاوکەیەکی خستۆتە گیانی بەعس کە شەوانە لە ترسی هێزی «مەلا» خەو لە چاویان ناکەوێ.»

: «بیستووتە کە دەڵێن جارێکیان لەگەڵ چەند هاواڵی بەبێ ئەوەی چەکدار بن، بنکەیەکی بەعسیان داگیر کرد و چەک و تەقەمەنێکی زۆریان وەچنگ هێناوە. کوا پیاوی وا لەسەر زەوی هەیە؟ خودا بۆخۆی ئاگادارێتی.»

: «بە خودای حاجی! دڵم ڕوونە ئەمجارەیان، بێشک سەر دەکەون.»

: «بە خودای وەستا کەریم! بڕوام پێ بکە ئەگەر ئێستا ئەمن لاو بوایەم و تاقەت و هێزێکم هەبوایە، هەرگیز بۆ ساتێکیش لێرە نەدەبووم، زۆر لەمێژ بوو ڕەگەڵیان دەکەوتم. وەستا کەریم دەڵێ: «ڕاست دەفەرمووی حاجیئاغا! ئێستا هی وەک من و تۆ تەنیا بەردەستیان دەگرین. تازە بەکەڵکیان نایەین. دەبێ چەند کەسێکیش دابنێن کە ئاگایان لە ئێمە بێ.»

کەریم زۆری ناوی «مەلا» لە باب و ئەوانی‌تری بیستبوو. بەڵام نەیدەتوانی ڕوخسارێکی زەینی بۆ دروست بکا. هەموو جارێ بە بیستنی وشەی «مەلا» بیری دەچوو بۆ لای مەلا ئەحمەد، مەلای مزگەوتی گەڕەکەکەیان. بە کۆڵێک ڕدێنی سپی و پشتێکی کۆم و دەنگێکی نووساو کە هەر جار کە لە مزگەوتێ قسەی دەکرد و ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد، لەو چەند کەسەی دەوروبەری بەدەر کەس گوێی لێ نەدەبوو دەفەرموێ چی؟

: «بڵێی ئەو «مەلا»یەی بابم و هاواڵەکانی باسی دەکەن چلۆن بێت. خۆزگە تەنیا یەک‌جار چاوم پێی بکەوتبایە.»

کەریم سەیر ئاڵ و گوڕی بە سەردا هاتبوو. ئارام و بێدەنگ دەهات و ئارام و بێدەنگ دەڕۆیی، نە تووک و دۆعاکانی حاجی‌ژن، نە جنێوەکانی حاجی محەممەد، نە بیانوو پێگرتنەکانی عەوڵای برای، بۆ ئەوە دیسان پەلاماری بدا و نە ئەی کوێر بم بۆت ڕۆڵە و ئەی خۆشی نەدیوەکەی کە هەرجار بووک هەنار دەیگوت، هیچیان شوێنیان لەسەر دانەدەنا. دەتگوت هیچ کامیان وەبەرچاوی نایەن. شۆقێکی سەیر لە چاوی‌دا دەبیندرا، چاوەکانی کە پێشتر وەک دوو چرای کوژاوە بوون، لەپڕ هەڵبووبوون و دەتروسکانەوە. لە زستانی سارد و سڕی دڵی دا بیانوویەکی بچووک، بۆ مانەوە، بۆ درێژەپێدان بە بوون، هەرچەندە بوونێکی ئاوا نەبوون ئاسا، بۆنێکی سەخڵەت و ناخۆش، ببوو بە نەمامێک و ئێستا چرۆی دەرکردبوو. پرپشکێک لە تیشکێکی خودایی پەڕی بووە نێو دڵی هەمیشە کەسیرە و بە خەفەت ڕەنجاوی و خەریک بوو وردە وردە ڕۆژێکی ڕووناک و گەشی بۆ پێک دێنا. کەریم دەستی لەرزۆک و لاوازی خۆی بۆ لای دەستی بەهێزی «مەلا» درێژ کردبوو «مەلا» دەستی گرتبوو. گەرمای دەستی هەست پێ کردبوو. کێشابوویە لای خۆی. کردبوویە دەستەی خۆی.

بەری بەیانە، نا بەیانی نەبوو، شەوەکەی، کەریم لەگەڵ باقی کوڕی کاک قادری خەیات بەپێی بڕیاری پێشوویان بە دزی وەڕێ کەوتن. کەریم بە باقی کوتبوو لەهەموو جێیەک دەڵێن دەچێتە سەردانی مامم. کەریم دەمێک بوو دەیزانی مامەحەسەنی دەستی دە دەستی «مەلا» ناوە....

***

# ١٦

...... پێت خۆشە دەورت چۆڵ بکەن. زۆرت پێ خۆشە بە تەنیا بمێنییەوە. تەنیایی ئەگەر بۆ زۆربەی خەڵک ئازاردەرە و دەبێتە هۆی وەڕەزیان، بۆ تۆ گەلێ خۆشە و زۆری کەیف پێ دەکەی. تۆ ئەو قۆناغەت تێپەڕاندووە کە پێویست بە کەسێکی تر بێت، سەدان جار بەخۆت داهاتوویەوە و سەدان جار دوور بوونەوە لە خۆت و گشت ئازاو ئەندامەکانی لەشت تاقی کردۆتەوە و لە ڕاستی‌دا تۆ لەگەڵ خۆت بە تەواوی پێک هاتووی، مرۆڤی تر ناتوانن چێژ لە تەنیاییان وەربگرن. چون لەکاتی تەنیایی‌دا لە خویان دەترسن. گێژ دەبن. نازانن دەبێ چ مامەڵەیەک لەگەڵ خۆیان بکەن. بەڕاستی چ مەترسییەک لە تەنیایی دایە؟ بۆچی مرۆڤ ڕەنج و ئازاری ئەوە بە گیان و دڵ دەکڕێ کە بە درێژایی تەمەنی لەگەڵ کەسێکی تر ژیان بباتە سەر کە دە کوورەیەکی جیاواز دا سوور کراوەتەوە و لە قالبێکی تر دراوە، بە شیرێکی تر فرچکی گرتووە و لە شتێکی تر ترساوە و بە نەقڵ و جەفەنگێکی تر پێکەنیوە و لە پەنجەرەیەکی تایبەت و تاکە کەسی خۆیەوە دەڕوانێتە دیمەنی ژیان و هەستی. چێشتێکی تری پێ بە تام و خۆشە. گەلێک حەزی لە خەوە و خۆشی لە دەنگی حەسەن زیرەک نایە. بابی خۆی لە بابێ تۆ پێ پیاوترە و دایکی لە دایکت کابانتر و جوان و شۆخ و شەنگ‌تر و هەروەها خوشکیشی لە خوشکت، برای لە برات، مامی لەمامت، خاڵی ئەگەر هەبێ لەهەموو خاڵەکانت و هیچ بڕوای بە بەڵگە هێنانەوەش نییە و هەروەها لای وایە کە تۆ پێویستە لەهەست و هەناسەی ئەودا بتوێیەوە. کە سەرمای بوو سەرمات

بێ. کەگەرمای بوو دەبێ تۆش ئارەقە بڕێژی هەروەک ئەو، ماستی مانگات لە ماستی گامێش پێ خۆشتر بێ!!!

دەبێ هەروەک ئەوە دەڵێ ڕەنگی بۆر و ڕەشت، لە ڕەنگی ئاچخ باشتر لێ بێتەوە، چونکە ئەولای وایە پیاوانەترە و دەبێتە هۆی ویقاری تۆ و سەر بڵیندی ئەو. مرۆڤ ئەم کێشەیانە بە گیان و دڵ دەکڕێ تەنیا لەبەر ئەوە کە تەنیا نەمێنێتەوە. چونکە دەترسێ تەنیایی ببێتە هۆی ئەوە کە لەبیر بکرێ، واتا بە هێند نەگیرێ، وەبەرچاو نەکەوتنیش، یانی ئاوڕلێنەدرانەوە. یانی لووت پێدا نەهاتن. بەحیساب نەهاتن لەگەڵ نەبوون، لە قەڵەم کەوتن، وێنە لەگەڵ نەگرتن، ئەم هەستە پاڵەپەستۆیەکە کەهەر لە منداڵییەوە، منداڵ ئازار دەدا، تا ئەو دەمەی کە سەری ناهومێدی دەخاتە سەر ئەژنۆی شکاوی. ئەم دەردە لە کەمایەسی و بێ دەرەتانی منداڵ سەرچاوە دەگرێ. مەبەست ئەوەیە کە من دەبێ بۆ ئەوەی بە خۆم بسەلمێنم کە زیندووم و هەم. نەفەس دەکێشم. بیر دەکەمەوە، دایم و دەرهەم دەبێ لە لایەن ئەم و ئەو متمانەم پێ بدرێ و دیارە کەسیش لە خۆڕا بە دۆی کەس نالێ ئای چەند ترشە. پێویستە یەکبین بەرتیل و ڕشوەتیان بدەینێ بە درۆ پێیان هەڵبلێین. هەتا بەدرۆ پێمان هەڵبلێین. دەبێ بەمنداڵە گێل و حۆلەکەیان بڵێین: «ئەرێ هیچ زانیوتە ئەم کوڕەتان لە کردەوەی ڕا دیارە دەبێتە ئەنیشتێنی دووهەم.»

یان:«باڕەکەڵڵا. ئەو کچەتان بەو نەققاشییەی کێشاویێتەوە شتێک بۆ پۆل سیزان ناهێڵێتەوە تا شانازی بە خۆیەوە بکا:»

یان: «بە ڕاستی ئەو کوڕە ڕەزا شیرینەتان ئەم جۆرەی ئەو قابڵەمەیە دەکوتێ لەوانەیە دوا ڕۆژ بتهوڤن و مۆزارت و باخ و برلیۆز و چایکۆفسکی شەرمەزاری بێ مرخی خۆیان بن. بڕوام پێ دەکەن؟ کە دەزانم بڕوام پێ دەکەن، ئای لەو سەلیقە جوانە. ماشاڵڵا ئەو کراسەت چەند لێدێتەوە. هەر بەو دەستەی دەیدەی بەو دەستەش وەری دەگریەوە، بەیانی وەریدەگریەوە. هەر بۆیە مرۆڤی تەنیا بێ هۆوییەتە و خاوەن ناسنامە نییە. ناسنامە تەنیا ئەوە نییە لە بەرگێک نووسیبێتیان ناوت ئەوەیە و شۆرەتت فلانی، لەو ساڵەدا لە دایک بووی و ژمارەی ناسنامەکەت ئەوەندەیە و لە

فلان شاردا چاوت کردۆتەوە و ناوی دایک و بابیشت هەر وەها، ناسنامەی ڕاستەقینەی ئەوەیە. خانوو بەرەکەت چەند نهۆمە؟ ماشێنەکەت چییە و مۆدێلی چەندە؟ یەخچاڵەکەت سایدبای سایدە یان ئاساییە؟ تەلەفزیۆنەکەت لە پەنجا ئینج تێپەڕیوە؟ لە هەر شایی و کۆڕێک دا کچەکەت کراسێکی چوار سەد هەزار تمەنی دەکڕێ؟ هەڵبەت لەبیر نەکەین ئەگەر تا چاپی ئەم ڕۆمانە چوارسەد هەزارەکە نەبوو بێتە یەک میلیون. کوڕەکەت جل و بەرگی مار کە لەبەر دەکات. ئێواران دەتوانێ لەبەر چاوی برسی خەڵک مریشک و گۆشت ببرژێنی و بۆن و دووکەڵەکەشی بکەیە خێر و خێرات و لە گەرووی خەڵکی ڕۆ بکەی. حەوتووی جارێک کۆڕ و مەجلیسێک لە ماڵە گەورەکەت ساز دەدەی و تاقمێک بانگ هێشتن بکەی تا بێن و بە چاوی خۆیان ببینن کە تۆ چ بەختەوەرێکی و لە چ بەهەشتێکی خوداییدا ژیان دەبەیە سەر تا لە حەسرەت و ئیرەیی و خەفەتدا چاویان کوێر ببێ و تۆش ئەو دەم هەست بە تەنیایی نەکەی و لەبەر خۆشبەختی گەز گەز زیاد بی و ئیتر لە زەویشدا جێگەت نەبێتەوە.

بەڵێ ڕاستە من پێم خۆشە تەنیا بم. گەرەکمە وەبەر چاوان نەیەم، پێم خۆش نییە کە بایەخ و نرخی، خانووبەرەکەم، ماشێنەکەم، باخ و مڵک و ماشەکەم لە خۆم و ئینسان بوونی خۆم و کەسایەتیم سەرتر بێ. من لام وایە دۆڕاوێکی گەورە و تەنیایەکی لەبیر کراوە ئەو کەسەی ڕۆژ و شەو کوێرەوەری دەکێشێ تا هەرچی زۆرتر کۆ بکاتەوە و لە خۆی بهاڵێنێ. وەها مرۆڤێک دوای ماوەیەک، بۆ خۆی دەبێتە مارک و مۆدێل و ژمارە و ئینج و کۆمپانیایەک. خۆی دەخنکێنێ لەنێو ئەو شتانەی لە دەوری خۆی کۆ کردۆتەوە تاکوو بەڵگەیەک بن بۆ پێشاندانی بەختەوەری و سەروەری و گەورەیەتی خۆی. بەڵام لەگەڵ لەبرەوکەوتنی هەرمۆدێلێک لە ماشینەکەی، خۆشی مۆدێلێک لە برەو دەکەوێ و ناچار دەبێ سەر لەنوێ بە تەقەلا و حەولی زۆر خۆی هەڵکێشێتەوە بە وتەی ئیمڕۆ خۆی ئاپدەیت کاتەوە بەڵام بە پێچەوانە من ئەم چەشنە کێشەیانەم نییە.

: «بە ڕاستیتە؟ تۆ ئەم کێشانەت نییە؟ یان چونکە وەک ئەوانت پێ ناکرێ ئەم ئیدەعایە دەکەی؟ تۆ بڵێی ئەم قەناعەت و غیرەتەی باسی دەکەی، زۆرتر لە دەستەوەستانی و بێ دەسەڵاتی و بێ مشووریی تۆوە سەرچاوەی نەگرتبێ؟ ئەگینا کێ بێ پێی ناخۆش بێ خانووبەرەیەکی چەند نهۆمی مۆدێرن بە هەموو پێداویستی و کەلوپەلی ناوماڵ و موبلمان لە باشترین مارکە و کۆمپانیا، ماشێنێکی قیمەتی کە نموونەی وەبەر چاو نەکەوتبێ، باخێکی چەندین هێکتاری بە خانووبەرەیەکی خۆش لە ناوی دا، پارەیەکی بێ ئەژمار لە بانک دا. هەر ساڵ شەش مانگ سەفەر و گەڕان و سەردانی وڵاتانی دەرەوە و هەروەها....»

: «من دەڵێم ئەوانەی کە باسیان دەکەی ئەگەر هەروەک کەرەسەیەک لە خزمەت مرۆڤدا بوون بۆ گەیشتن بە چەشنێک ئارامی و ئەمنییەتی خاتر و ئاسایشی ڕووحی، چاوپۆشیان لێناکرێ. بەڵام ئەگەر بۆ گەیشتن بەم شتانە، پێویست بێ هەرچی ئارامی و ئەمنییەت و ئاسایشی ڕووحی خۆمە بۆیان لە دەست بدەم چی؟ لات وانییە ئەو دەم ئەوە مرۆڤە دەچێتە ژێر دەسەڵاتی هەر ئەو شتانەی کە بڕیار وابوو لە خزمەت بەختەوەریی مرۆڤ دابن.»

پێم دەڵێ: «زۆر باشە تۆ ڕاستم پێ بڵێ مەگین خۆت بە درێژایی ئەو هەموو ساڵەی تەمەنت، کێشەی هەمووڕۆژەی ژیانت لەگەڵ خاوخێزانت لە سەرچی بوو؟ نە ئەوە کە هەرگیز نەتتوانی پێیان بسەلمێنی کە بەبێ جل و بەرگی ڕازاوەش مرۆڤ دەتوانێ هەست بە بوون و بەختەوەری و کەسایەتی بکا. لەبیرت چۆتەوە کە شەو تا بەیانی بە گوێیان دا دەتچرپاند، کە گەوهەری ڕووح و مرۆڤایەتی، گەلێ بە نرخترە لە ڕۆاڵەتێکی ڕازاوەی بۆش. بەڵام لە وەڵامدا پێیان دەگوتی، ئەوانەی باسی دەکەی هەموو ڕاستە، بەڵام نە لە ناو ئەو کۆمەڵەدا و لە ناو ئەو خەڵکەدا. ئەگەر بێتوو وەک ئەوان لەبەر نەکەی، وەک ئەوان نەگەڕێی و نەخۆی و بە زمانی ئەوان نەدوێی بە چاوی سووکت چاو لێدەکەن. هەر ناتدوێنن. تۆش هەرچەندە لەڕواڵەتدا بێدەنگت کردبوون بەڵام دەتزانی باوەڕیان پێ نەهێناوی. هەرکە لە شاییەکی بانگ هێشتن کرابای. هەمان کێشەی جاران بە هەمان وشەگەل و مەنتیقی ڕابردوو، سەر

لەنوێ، و هەمان دڵتەنگی و دڵهێشان و لووت بادان و تا چەند ڕۆژان بەرد بەکابەی یەکتری دادان. زێڕی فلانە ژن، کراسی فیسارەکەس، بەختەوەری ئەوان خزم و کەس و کار، دەبوو بە چقڵ و دەچاوت ڕۆ دەچوو. تۆش کە جگە لە قسەی مفت و خۆڕایی کە پوولێکی نەدەکرد چیترت بە دەستەوە نەبوو ئەو چەند ڕۆژە ناچار دەبووی بە تەنیایی خێوەتێک لەناو دڵتدا هەڵدەی و خۆتی تیا بشاریەوە. ئەگەر درۆم لەگەڵ نەکەی هەر لەم خێوەتە دابوو کە عادەتت بە تەنیایی گرت، هەر لەم خێوەتە دابوو کە دەیان و دەیان جار بە خۆت دا هاتیەوە تا توانیت خۆت لەبەر کەی، هەرکە کەست بە دەور و بەرتەوە نەدەدیت، هەستت بە بەختیاری و سەربەستی و سەربەخۆیی دەکرد و هەر لەو خێوەتەدا و لەو دەمەدا بوو کە گەیشتییە ئەو قەناعەتە، هەر کات و ساتێک کەست بە دەورەوە نییە لە نێزیکترین مەودای خۆت دای، خۆت دەناسییەوە وەک جاری جاران، دەم بەبزە. بەبێ کێشە و ئاژاوە، دەبینی کە جیهان مافوورەیەکە ڕاخراوە لە ژێر هەنگاوی هەرزەکارانەتدا. بۆتە شانە بۆ داهێنانی کاکۆڵە پەخش و پەرێشانەکەت. شەوڕۆژ دووقەرەواش و نۆکەری حازر بەدەستت هەیە. چییە؟ پێت سەیرە کە بەم جۆرە بە خۆتت دەناسێنم. مەگین تۆش خۆتت وا نەدیوە؟ من دەزانم بۆ ئەوەندە تەنیاییت پێ خۆشە. چونکە بەبێ ئەوەی کەس تۆ ببینێ بەدزی زەبتە سەوتەکەی هەڵدەگری دەیبەیە دیوە تایبەتیەکەی خۆت و زۆر بە ئەسپایی تەنانەت بە بێ ئەوەی ئیزن بدەی کە من، منێکی کە بەم جۆرە ئاگادار و شارەزای هەموو ژیانی شاراوەتم. منێک کە ئاگادای تەنانەت ئەو شتانەشم کە لە خۆت شاردووتنەوە و هەرگیز نەتویراوە لەلای خۆتیان بدرکێنی، ئەو شتانەی هەر کە چاوت پێیان دەکەوێ چاوت دەقووچێنی تا نەیانبینی. دەجا بۆ بە زمانی خۆت پێم ناڵێی لەم شریتەدا بە شوێن چیدا دەگەڕێی، من خۆم باش دەزانم ئەو شتە چییە؟ پێم خۆشە لە زمانی تۆوە بیبیسم تا بزانم تۆ چەندە لەگەڵ من ڕوو ڕاست و یەک ڕەنگی؟ ئەگینا هەر ئەو جۆرەی زۆر شتم پێ گوتووی، زۆر شتی تریش ماوە کە پێت دەڵێم ئەودەمەی کە دەتناسینم، دەتترسێنم، دەتتاسێنم.»

: «نا، هەرگیز وا نییە، تۆ بە هەڵە چووی، تۆ تەنیا دەتوانی دەست لەسەر ئەم بەشە لە من دانێی کە خۆم ئیزنت دەدەم. ئەویش لەبەر ئەوەی کە دەمهەویَ خۆم لەدەست بەشێک لە خاتیرە و بیرەوەری لە کار کەوتووی بەکەڵک نەهاتوو کە لە هیچ و خۆڕایی ڕادەیەکی زۆریان لە حافیزەی من داگیر کردووە ڕزگار بکەم هەر بۆیە خۆم گێل کردووە و تۆم فریو داوە کە ئەننەهوو هەر نەمدیتووی. بەڵام لەبیر نەکەی کە مرۆڤ توانایی ئەوەی هەیە، نالەبارترین و ناخۆشترین کاتەکان تێپەڕێنیَ، برسێتی و توونیەتی. ئازار و ئەشکەنجە و مەترسی گەورەش لە لای پووش بیَ بە مەرجێکی بەش بەش و کوت کوت نەکرابیَ. ئەگینا هەرکە بەش بەش کرا، ئیترئەوە مردنە کە لە زاتی ئەودا خۆی دەسەڵمێنیَ. کە وابوو من هەر ئەوەندەم ئیزن پێداوی بۆ ناسینم کە بە تەواوی نەمناسی، ئەو جۆرەی کە نەبێتە هۆی مەرگ و نەمانم. ئەگەر ڕاستترت دەویَ. هەر دووکمان یەک کەسین. بەڵام من زۆرتر لە تۆیەکم و تۆ ئەو کەسەی کە من دەیکەم بە تۆ. بەڵگەی باوەڕپێکراوت دەویَ. ئەم شریتەیە کە تاکوو من پێت نەڵێم چی تێدایە، بۆ تۆ چی تێدا نییە و ناتوانی پێم بڵێی چی تێدایە. کە واتا لەوە زۆرتر دەوری زانای هەموو شت زان بۆ من مەگێرە هەر چەندە نایشارمەوە، پێم ناخۆش نییە. ئەو پەلەقاژە لە خۆڕاییەت، ئەو خۆلە هەموو کارێکی من هەڵقوتاندنە بیَکەلک و بیَ فائیدەیە و ئەم هەڵبەزین ودابەزینەی ڕۆژانە و شەوانەت ببینم. کەچی لە وڵامدا پێم دەڵیَ:

: «من باش دەزانم کە تۆ ئێستاش دڵنیانیت. دڵنیای؟»

***

## ١٧

...... به درێژایی شەو، لێفە و دۆشەگ و سەنیرم ئازاردا. نەمهێشت ساتێک بسرەوین. سینگم دەهاویشتە سەر سەنیر و دوو قۆڵم لە دوو لاوە دەبوونە دوو سەوڵ و جەستە و لەشم گەمی و لە دەریای نائاشنای بێ خەوی دا بە پێچەوانەی لووزەو و ڕەوتی دەریایەکە دەڕۆیشتم و گەمی سەرلێشێواوی وجوودم بێ هیچ چەشنە ئامانجێک بەم لاوبەولادا دەدا. ئەوەندە کە لە پێ دەکەوتم ئینجا شەکەت و ماندوو و بێ هیوا لە زاڵبوون بەسەر شەپۆلەکانی بیروخەیاڵ و بێ خەوی لە گۆشەی شکاوی شووشەی پەنجەرەی ژوورەکەمدا چاوم بە جریوە جریوی بەختەوەرانەی چەند ئەستێرە دەکەوت و بۆ چەند سات سوکناییم دەهاتێ. ئەم گۆشە شکاوەی شووشەی پەنجەرەی ژوورەکەم، ئای نازانی کە زستانێ چەندەی باو سەرما هەڵمژی. ئای کە چەندەی دەکێشەی هەڵلەرزین و دووبەرەکایەتی ددانەکانی سەرو خوارێی هاویشتم. ئای نازانی کە من چەندە تەمبەڵ و تەپلۆس بووم کە نەهاتم بە کوتە مقەبایەک یان بستە نایلۆنێک دایپۆشم. هیچ شەوێک نەبوو بڕیار نەدەم بەیانی کە لە خەو ڕاست بوومەوە بەرلەوی دەموچاوم بشۆم. هەوەڵ کارم گرتنی ئەم کەلێنەیە و هیچ بەیانییەک نەبوو کە ئەم بڕیارەشم وەک هەزاران بڕیاری تری ژینم وەپشت گوێ نەدەم. ئۆخەی ئەم وەپشتگوێدانە ئەمشەو چەندە بە هانامەوە هاتووە. بۆ ساتێک منی لە ناو گێژاوی بیروفیکرم، لەناو خەیاڵاتی سەرەڕۆم. لەناو پەلەقاژەی لەخۆڕایی بۆ سازکردنی شتێکی کە هەرگیز نەمزانیوە و نازنم چیشە. لە سەرگەردانی بۆ دۆزینەوەی ئەو شتەی کە نایناسم، بەڵام دەزانم چەندەم نیاز پێیەتی ڕزگار کردووە.

لێم دەپرسی: «دەی باشە لە دوای چرکەکە چی؟ هیچ دەزانی کە ئەمە بە ڕۆاڵەت چرکەوساتێکە. ئەگینا خۆی لەنێو خۆشیدا دەتەنێتەوە. وەک شیر کەبە

ئاور زیاد ئەکا و هەڵدەچێ. زیاد دەکا. هەروەک زیادبوونی سەللوولەکانی گیانلەبەران، لەپێش‌دا یەکە. دەبێتە دوو. ئینجا دەبنە چوار، چوارەکە دەبنە شازادە شازدە کە شێست وچوار، بگرە تا دڵت دەیهەوێ چرکەکان دێن و دەبن و تۆ دێنین و دەبەن، لە لای ئەستێرەکان بە جریوە جریوەکانیان بۆ لای باو بۆرانی سەخڵەتی زستان هەر لەوێ ڕا بۆلای کۆنە مقەبا و بستە نایلۆن، هەر لەوێش ڕا بۆ لای تەواوی ئەو شتانەی لەبەری بەیانییەوە چاوت پێیان کەوتووە. هەستی بەری بەیانان لە خەو دەرپەڕێن. بەبێ دەم و چاوشووشتن بەرەو بازاڕ بوون. بایی پێنج قڕان ماست کڕین، لە پێش‌دا لێی چێشتن. تا ناچار نەبێ بە سەری‌دادەیەوە. هیچ پێ نەکران لە بەرانبەر پرتەوبۆڵە و نێوچاوانی وەک ماستی ترشی کابرای ماست فرۆش.

ئینجا لە مەیدانی مەنگوڕان پەڕینەوە و چوونە مەیدانی ئارد لەوێش هێندێک شت کڕین و گەڕانەوە. شەش حەوت نەفەری لەو قاپە ماستە هاڵان و دەنگ‌دانی زووبە زووی گەورەکان. هەتیوە هەر تێی هەڵکێشە، بە قاپووچکە مەیخۆ و مافی چایی شیرین خواردن نەبوون هەرچەندە بۆی تامەزرۆ بوون و ئینجا بە پەلە کتێب و دەفتەر هەڵگرتن و بە سەدان ترسی تایبەتەوە چوونە مەدرەسە و بیانووگرتنی موعەللیمی عەجەم لەوەی کە لەسەر کلاسی دەرسی پێی پێکەنیوی. سەد سوێند خواردنی بێ‌کەڵکی تۆ و زۆر  وێکەوتنی تۆ بە ناحەق لە لایەن ئەوەوە. تەمبێ کردنی تەواوی کلاس(پۆل) تەنیا لەبەر ئەوەی دوو منداڵ دەرسەکەی لەبەر نەکردووە. شەڕە شەپی نێو حەوشەی قوتابخانە، بە دزی چاولێکردن لە ئیملای حەسەن و لەوی زۆرتر وەرگرتن و پرتە و بۆڵە و شکایەتکردنی ئەو لە لای موعەللیم:«ئاغا بە خودای هەمووی لە ڕووی من نووسیوەتەوە بۆ دەبێ لەمن زۆرتر وەربگرێ؟»

ئەمر بە وستبوونی لە لایەن موعەللیم و دمەلا سکەکردنی لە لایەن منەوە. تووڕە کردنی مامۆستای دەرسی دینی تا نێوی دایک و بابمان بێنێ و ئینجا لە ناخی دڵەوە پێکەنین و فشەکردن لەگەڵی. بە پەلە دەرپەڕین لە کلاس لە کاتی پشوودان بۆ وەبەرکەوتنی شیرینی لە پێش خزمەتی مەدرەسە، گەڕانەوە بۆ ماڵ و هەروەک ڕۆژانی‌تر، ئەسپەناغی سوور کراوە خواردن و هەروەک هەمیشەش

پێ ناخۆش بوون و نەوێرانی ئەوە کە بتوانی تەنیا جارێک بڵێی ئەی چەند ناخۆش بوو. ئینجا بەرە بەری چوونەوەی دووبارەی مەدرەسە. چاو قورس بوون بۆ خەوێکی بێ خەبەرانە و منداڵانە بە هۆی دەنگی نەرمی ئەو پیاوەی هەموو ڕۆژە سەری ساعەتی دووی پاش نیوەڕۆیە دەستی بە کوتنی هەواڵەکان دەکرد، ئەودەمەی کە نیو ساعەت دواتری، تۆ دەبا لە سەر کلاس بای و ئای کە خەو بە دەنگی ئەم کابرایە چەند خۆشە! ئەم جارە نەچوونەوەی ئەوێ پاش نوێژی بۆ مەرەسە لەبەر کێ بەرکێی دار و هەلووک لەگەڵ منداڵەکانی گەڕەکی سەرەوەمان. دەس پێکردن و جیابوونەوە لە جیهانی ئاشکرا و بەرچاو و نوقم بوون دە جیهانێکی تردا کە نۆرەی سولەیمان هات تا بە دارەکەی هەلوولەکەکە دوور کاتەوە. تا ئەو جێگەیەی کە دەتوانێ کەچی هەلووک وەپشتی کچێک دەکەوێ تا هاواڵەکەی ڕوو دەمن بکا و لەهیچ و خۆڕایی بە من بڵێت «بێتەربییەت!!» هەر بەم جۆرەیە کە دەبینی جریوە جریوی چەند ئەستێرە لە درزی شکاوی شووشەی پەنجەرەکەی ژوورەکەمەوە کە دەبوو پاییزێ گرتبایم و نەمگرت بۆ چرکەیەک نا، بۆ کات ژمێرێک نا کە بۆ ئەبەدییەتێک من لە جێگەوبانم دەستێنێ و تۆ تەنیا ئەوەت لە لا گرینگە کە من چۆنم دواندووە. سەری ئاڵۆزی ئەم پرسیارە لەم لاوەیە. تۆ ئەبێ بەم چەشنە پرسیارم لێ بکەی: «ئەو چۆنی ئەتۆ دواند؟»

من باوەڕم بە مە هەیە. هەر مرۆڤێک کە لە دایک دەبێ خاوەنی نیوەی وجوودی خۆیەتی، نیوەکەی تری وجوودی لە دایکێکی‌تر یان پێش‌تر هاتۆتە سەر دنیا و چاوەڕوانی بەتۆ گەیشتن و کامڵ بوونی خۆی و کامڵ کردنی تۆیە، یان تۆ دەبێ چاوەڕوانی بەدنیاهاتنی بی، هەشە هەر دوو نیوە هاوکات لە دوو شوێنی جیاواز دێنە سەر دنیا. ئەو نیوەی‌یەی باسی دەکەم تایبەتییە و هیچ کەسێکی تر جێی ناگرێتەوە. ڕەنگە ئەگە نیوەیەکەت کەوتە لات و ماوەیەکی تێکەڵاو بوون وا بیر بکەیەوە کە ڕاست بۆ خۆیەتی. پڕ بە پێستی تۆیە. بەڵام کە ورد ڕوانیت و ڕوانی و نەتویست چاو ببستی و نەیویست خۆ فریودا، دەبینی بە یەکەوە هەر وەک کەوشی لینگاولینگن. بە ڕواڵەت پڕ بەپێتە، بەڵام ئازارت دەدا ناتوانی پێی بڕۆی. بە ناچاری دەپێی دەکەی و تەنیا دڵ بەوە خۆش دەکەی کە بە هەرحاڵ

منیش کەوشم هەیە. بەڵام چ بوونێک؟ کە نەبوونی بۆ مرۆڤ سامانێکە. من ئەو شتانەم نەدەزانی. سەیر ئەوەیە هەمیشە ئەو دەمە خاوەنی گەوهەری ئەزموون دەبین کە هەموو دەرفەتەکانی ژیانێکی بەختەوەرانەمان لە کیس داوە تازە هیچ بەرەیەکی دوای خۆشت، تەنانەت ئەگەر منداڵی تۆش بن حازر نین ئەزموون و تەجرەبەکانی تۆ بە خۆڕاییش بکڕن. دەمگوت: «ئەودەم منیش حازر نەبووم لە ئەزموونی هیچ کەسێک کەڵک وەربگرم. تەنیا شتێکی ئەودەم دەمزانی ئەوە بوو کیژۆڵەیەکی جوان و لەبەر دڵان و خاو و کەم تەمەن کە تازە لە ئاوێنەدا بەشێک لە خۆی کەشف کردبوو، تازە چاوی بە سێحری ئەفسوونی چاوەکانی خۆی کەوتبوو. بەبێ ئەوەی هەلووک وە پشتی ئەو کەوتبێ. یان ئێشێکی پێ گەیشتبێ. لەجیاتی هاواڵەکەی کە دەبوو ڕوو لە سولەیمان، کە کوڕە پووری من بوو بکا، ڕوو لە من دەکا دەڵێ: «بێ تەربییەت!»

من ئەو دەم دەمزانی ئێسک گرانم، بیستبووم، سەرزل بووم، بیستبووم، خوێنتاڵ بووم، بیستبووم، ژاری مار و سندان و ژهری هەلا هەلا و دڵەدەرد بووم. نەوسن و گرینۆک و چڵمن بووم. هێندەم لە زمانی دایک و باب و مام و خاڵ و پوور و خوشک و برا و دۆست و مامۆستام بیستبوو کە خۆم باوەڕم بە هەموویان هێنابوو. زۆرم لە دڵ گران نەدەهات. کە دەمبیست، هەر بۆم گرینگ نەبوو. لەوانەیە بە مافی خۆم دانابێ کە دەربارەی من وا بڵێن یان ڕەنگە بە مافی ئەوانم دەزانی کە وام ناو بەرن.

بەڵام ئەوەی لە زاری ئەو کچە کە هەرگیز نەیدیبووم و نەمدیبوو – هەڵبەت ئەگەر ئێستا ئەم چیرۆکەم نووسیبا ئەو ڕستەیەی پێشووم نەدەنووسی – بیستم، شتێکی یەکسەر جیاوازتر بوو لەو نازناوانەی پێشووم، چونکە من هەرگیز بێ تەربییەتیم نەکردبوو. تەنیا تاوانی من ئەوە بوو کە ڕاوەستابووم و هێندێک تووڕە لە سولەیمان کە بۆ وریا نەبووە کەسێک واتا دوو کچ بەوێدا ڕادەبرن، هەرچەند منیش ئەودەم ئاگاداریان نەبووم دەتگوت لە ئاسمان ڕا بەربوونەوە تا من وەک خۆم یانی پێشووی خۆم نەمێنمەوە.

من ئەو شەوە خەوم لێنەدەکەوت، چوون کارێکم نەبوو کە بیکەم. ئاخرسبەینێ دەبووە هەینی و ڕۆژی پشوودان بوو. دەیان جار، ڕاست ناڵێم، سەدان جار،

ڕەنگە زۆریشم نەکوتبێ بە ڕووداوەکەی ئێوارەدا هاتمەوە. هەڵبەت ئەم ڕووداوە هەرچەند زۆری ئازار دەدام. بەڵام ئەوەش بڵێم. خاڵێکی بچووکی دڵخۆشکەریشی تێدا بوو کە لەدواییدا ئاماژەی پێدەکەم. من بە خۆم دەکوت: «دەی زۆر باشە تۆ وەرە وەک کوڕێکی باش ئەو فام و عەقڵ و بیر و هۆشەی کە هەتە یەکجێ کۆی کەوە. سەرنجت لە هەر جێگەیەکی کە گیرساوەتەوە خڕی کەوە ئینجا بەو دوو قومە ئاو کە بە باڵی شەمشەمەکوێرە دەیخۆیەوە و ئەو چرایەی کە مەولانا بە ڕۆژی ڕووناک پێی وەدوای ئینسان کەوتبوو بە دەستەوە بگرە، وەک هێرکووڵ پووارۆ زۆر لە سەر هەست، بەڵام بە ئەسپایی سەر لە نوێ بەڕووداوەکەدا وەرەوە. من دەڵێم خۆ گەلێ کووچە و کۆڵان لەم شارەدا هەن. ئەوەی کە دوو کچ کە لە دواییدا زانیم نە خزمی یەک بوون و نە جیرانی یەکتر، بەڵکوو دوو هاوپۆل بوون. لە ڕۆژێکی تایبەتدا، لە ساعەتێکی دیاریکراودا، بڕیار دەدەن کە بچنە جێگەیەکی. ئەوەی کە هیچ کام لەم دوو کچە لەم کاتەدا کارێکی تری بە دەستەوە نەبووە وەک سەردانی خزم و کەس و کارێک لەگەڵ دایکیان، یان کاری نێو ماڵ، وەک سەوزی پاک کردن یان ماڵ هەڵگرتنەوە یان زۆر کاریتر کە دەیتوانی ئیزن نەدا کچێک لەو ساعەتەدا لەگەڵ هاواڵەکەی لە ماڵ وەدەر بکەوێ، وەک هەڕەشەی باوکی دڵ پیس و دەمارگرژی برای گەورە و نیگەرانیی دایک یان ئێرەیی خوشکی چکۆلە و هەروەها دەیان شتی تر. تازە گریمان ساغ بوونەوە تا وەدەر بکەون. دەی ئەگەر یەکێک لەو کچانە کارێکی لە ناو بازار هەبوایە و کوتبای با لە پێشدا بچین هێندێک مارگە و زەنگیانە بکڕم ئەودەم پێتان وایە هەلووکی سولەیمان هەر لە حەوا دەماوە تا ئەم دوو کچە ساعەتێک دواتر بەوێ دا تێپەڕن. ئینجا هەلووکەکە، ئەرکی خۆی بەجێ بگەیەنێ، سەیر ئەوەیە هەلووک لە لایەن کێ تاو دەدرێ! وە پشتی کێ دەکەوێ و کێ جنێو بەکێ دەدا و کێ شەو خەوی لێ ناکەوێ! هەڵبەت جنێو نەبوو، من پێشتر زۆر جنێوم پێ دراوە. ئەودەم کەلەگەڵ عەلیلە و قالە بووم، شەو و ڕۆژمان بەجنێوبیستن ڕادەبرد. وشەی «بێتەربیەت» جنێو نەبوو بۆ من وەک ڕازێک بوو، ڕازێکی نهێنی، وەک نووسراوەیەکی ڕەمزاوی کۆن و سەربەمۆر بوو کە دەبوو ڕەمزەکەی بکەمەوە. دەبوو ڕازەکەی ئاشکرا بکەم، ئەوەی ئەودەم زۆر

منی خستە سەر ئەم باوەڕە، ئەوە بوو ئەو دەمە کە  پێی گوتم «بێتەربیەت».
چاومان تێک ئاڵقابوو. لە چاوی‌دا شتێکم بەدی دەکرد، شتێکی ئاشنا، شتێکی وەک بێشتی، شتێکی کە نەیبینی بەڵام بڕوات هەبێ کە هەیە. هەر وەکی خۆت کە هەی و کەس لەبەر دیتنی خۆی تۆ نابینێ و تۆش عادەتت کردوە بۆ ئەوەی هەست بە بوونت بکەی ئەشێ  ببیندرێی. وەک دەنگێکی بێدەنگ، وەک شۆقێکی نادیار، وەک بانگهێشتنێک بە بێ پەیام  و نووسراوە و وشە و رستە و کەلامێک. من لە خۆم پرسیار دەکەم: «ئەگەر ئەوێ ڕۆژێ من لە قوتابخانە ڕام نەکردبا. ئەگەر نەچووبام لە دوای سولەیمان و خدر و کاوە و هەمزە و سوارە و داود، ئەگەر بڕیاری کێبرکێی دار و هەلووکێن لە گوڕێ نەبا، ئەگەر ئەو دوو کچە بڕیاریان نەدابا کە دروست لەو کاتەدا بەو جێیەدا تێپەڕن، ئەگەر هەلووکی سولەیمان لەجیاتی ئەو هەزاران خاڵەی کە دەیتوانی لە دارو بەرد و پەنجەرە و دیوارەوە بگرە هەتا هەر شتێکی کە ئەودەم لەوێ هەبوو، بێ و تەنیا لەسەر پشتی کچێک بنیشێ، کە ئەگەر سولەیمان بە ئانقەست هەزاران جاری‌تر پشتی ئەو کچەی بە هەلووک نیشانە کردبا دڵنیام هەرگیز جارێکی نەدەئەنگاوت.

تازە ئەو کچەش خۆی نا، بەڵکوو هاواڵەکەی ژانەکە هەست پێبکا و بەمن بڵێ: «بێ تەربییەت!!» کە وابوو هیچ گومان لەوەدا نییە کە «بێ تەربییەت» دەتوانێ ئیما و ئیشارەتێک بێ، نیشانەیەک بۆ هەنگاونان بە ڕێگایەکی تایبەت‌دا، ڕێگایەکی تایبەت بە من. ڕێگایەک بۆ ئەوەی لە ئێستا ڕا بگەڕێمەوە بۆ ڕابردووم بۆ ڕزگارکردنی ئەو شتانەی بەجێم هێشتوون لە چنگ نەمان و فەوتان بە دەست ئێستێ و سبەی. من دەچمە ئەم سەفەرە، کە گەڕامەوە پێت دەڵێم کە چۆنی دواندم. تا لە بیرم نەچووە ئەوەش بڵێم بڕیارم دابوو، باسی خاڵێکی بچووکی دڵخۆشکەری خۆمتان لا بدرکێنم. من لە قسەکەی خۆم پاشگەز دەبمەوە، چیتان پێ ناڵێم تەنیا مافی ئەوەتان دەدەمێ خۆتانی لەسەر ماندوو بکەن هەرچی پێتان خوشە دەملی منی بپەستێون. وەک دەڵێن با دەش بێتە سەر نۆ.

***

# ١٨

......: «نمیشه جانم. باید قبلا وقت رزرو می‌کردی. اگه بخوای می‌تونم واسه سه ماه دیگه بهت وقت بدم.»[٤٤]

: «له سەر سەرت گەڕێم، من نازانم دەڵێی چی؟ تەنیا ئەوەندە دەزانم دەڵێن دوکتورێکی زۆر باشە بۆ ژانی پشتی، منیش لە بەر ژانی پشتم ساتێ هەدا دانم نییە.»

: «بە ڕاستی نەیدەزانی بەردەستەکەی دوکتور چی پێ دەڵێ؟»

: «عمو نمی‌دونم چی میگی؟ خدایا چکار کنم؟ عزیزم میگم اگه می‌خوای دکتر شمارو ببینه باید سه ماه دیگه بیای، متوجه شدی؟»

: «ئاخر بەقوربانت بم. ئەمن غەریبم. لەو شارەدا ناسیاوێکم نییە. لە سوورەچۆمێ ڕا هاتووم. نیشانەی ئێرەیان داومێ. نازانی من بە چ عەزابێک گەیشتوومە ئێرە.»

مونشیەکەی دوکتور لەوە زۆرتر خۆی بۆ ڕانەگیرا. قەڵس و تووڕە گوتی:

: «عمو دیگه وەقتمو نگیر. همینه که گفتم. دیگه وقت نداریم.»

: «کچم وەرە تۆ ئەو جوانییەت مەمگەڕێنەوە، ئیزن بدە با دوکتور چاوی پێم بکەوێ. ناتوانم زۆر لەو جەهەندەمەی دا بمێنمەوە، بە خودای نە کەس دەناسم و نە پووڵێکی واشم پێیە کە بەشم بکا. یەک تەنم  پێیە، کارەکانم هەروا لە عەرزی ماونەتەوە.»

---

٤٤- نابێ گیانەکەم. دەبوایە پێشتر نۆرەت گرتبا. ئەگەر بتەوێ دەتوانم بۆ سێ مانگی دیکە کاتت بۆ دیاری بکەم.

دوکتور لە دیوی موعاینەدا وشەگەلێکی ئاشنای دەبیست. خۆی بۆ ڕانەگیرا، درگای کردەوە. چاوی بە دیمەنی پیاوێکی پیری لادێیی کەوت کە هێندە داهاتبووە. دەتگوت شتێکی زۆر بە بایەخی لێ کەوتوە و داهاتۆتەوە تا هەڵیگرێتەوە. بەڵام ئەو شتەی لە دەستی کەوتبوو دەوری لاوەتی بوو کە هەرگیز نەدەهاتەوە دەستی. بە خۆڕایی داهاتبۆوە.

خەیاڵ دەمباتە جێ ژوانی شەوانی لاوەتی ئەمما

خرینگەی بازنە و خرخاڵ و بەرمووری ئەوم نایە

شێعری مامۆستا هێمن لە کتێبی ناڵەی جودایی، بە زەینی نەخۆشەکەدا تێنەپەڕیبوو بەزەینی مندا تێپەڕی و نووسیم.

دوکتور دەتکوت لە ڕابردوویەکی دووردا ئەم پیرەی دیوە. ئەوەی عەکس و وێنە و نەققاشی پێشتر دیتبووی هەمووی وەبیر خۆی هێناوە. تەنانەت بیری چوو بۆ لای تابلۆی گەمی کێشەکانی بەستینی ڤۆلگا کە ڕێپین نەققاشی ناوداری ڕووس کێشاوێتەوە. تاکوو بزانێ ئاخۆ ڕووخساری ئەم پیرەی لەنێو ئەو کەسانەدا دیوە کە نەققاش، ڕوخساری کێشاونەوە. چی وەگیر نەکەوت. هەر لەبەر درگا لە کچە دەپرسێ:

: «خانم چی شده؟»

: «آقای دکتر نمی فهمم چی میگه. زبونشو متوجه نمی‌شم. حدس می‌زنم می‌خواد امروز معاینه‌ش کنید. قبلا وقت نگرفته.»

: «اشکالی نداره. نفر آخر بفرستتش تو.»

کچە بەردەستەکە وەک ئەوەی بۆخۆی کارەکەی بۆ جۆر کردبێ گوتی: «عمو بشین آخرین نفر تورو می‌فرستم تو، حالا برو دعا کن که شانس آوردی، دوکتور می‌بیندت.»

سۆفی حەسەن چوو لەسەر کورسیلەیەک دانیشت و چاوی وێک نا، هەر بڵێی یەک و دوو، گەڕاوە سوورەچۆم. حەلیمی خێزانی دیت کە هێزی ڕێگا ڕۆیشتنی نەبوو، ئەگەر پێداگرتنی لە ڕادەبەدەری حەلیم نەبوایە، هەرگیز بەجێی نەدەهێشت. وەرزی کار بوو، هەرچەندە عەزابی

دەکێشا بە دەس ژانیپشتیی‌یەوە، بەڵام دەیگوت چ جێگەی ئەوەیە لەم کاتە ئەستەمەدا ئاوارەی غوربەت بم؟ گەڕاوە مەتەبی دوکتور.

دە دڵی دا کوتی:«بریا حەلیم چووبا، داوای یارمەتی لە یەکێ لە کوڕەکانی مام ڕەحیم کردبا.»

دەستی بەسەر دڵی خۆی‌دا هێنا، گریمانەیەک کەوتە بەردەستی. وەک مەڕمەڕێک لە ژێر دەستی‌دا بوو. هەمیشە کایەی بەو مەڕمەڕە دەکرد. هەر دەم کە کاری دەکرد، یان ئێواران لەپاش نوێژکردن لە مزگەوت کە لە حەوشەی مزگەوت لە بەربەڕۆچکەی پاییز خۆی هەڵدەخست، یان تەواوی ئەو کاتانەی کە ڕادەکشا تا تاوێک بحەسێتەوە لەپڕ ئاور لە پشتی بەردەبوو.

هەر لەودەمەی‌ڕا کە چاوی بە تەرمەکەی غەفووری کوڕی کەوت هێندەی گوتبوو: «ڕۆڵە غەفوور بۆ پشتت شکاندم؟»

هەر بە ڕاستی پشتی شکا و تازە خۆی نەگرتەوە و نەگرتەوە. هەردەم کە تەنیا دەبوو و چاوی حەلیمی دوور دەدیت لەگەڵ خۆی دەکەوتە وت‌وویژ.

: «خودایا گیان بە قوربانت بم، کەس سەرەدەر لە حیکمەتی تۆ ناکا، هیچ پیر و چاکێک نەما کە نەیکەم، تا غەفوورت دامێ بۆخۆت داتمێ و بۆخۆشت لێت ئەستاندمەوە من زۆر شوکرانە بژێرم. بەڵام بە قوربانت بم ئاخر کەی ڕەوایە هەژدە ساڵ بەندی جەرگت، هەژدە ساڵ نەونەمامی ژینت بە خوێنی دڵت ئاو بدێری، چاوەدێری بکەی کە لە ڕۆژی پیری و ئیختیاری و تەنگانەدا گۆچانی دەستت بێ، لە پڕئەمنیە کە هەرگیز خێری سێ قڕانانی بۆت نەبووە، بێجگە لە زوڵم و زۆری نەبێ، لێت پەیدا بن و بە بیانووی ئیجباری تاقە کوڕەکەت بە زیندوویی بەرن و بە مردوویی بۆت بهێننەوە. ئینجا بەو پەڕی بێشەرمییەوە پێشت بڵێن.

: «عمو خدا صبرت دهد. شهید راه وطن شد. بچەی خوبی بود تو تمرین تیراندازی تیر خورد. از دستمان کاری برنیامد. ما متأسفیم.»

سۆفی حەسەن چاوی هەڵێناوە. دیتی تەنیا دوو کەس ماوە نۆبەی بگاتێ. بە خۆی گوت: «خۆ برسی نیم، بۆ نوستنیش، بن درگای ماڵێک، بن دارێک، بەردێک، دیوارێک جێگەیەک هەر پەیدا دەکەم.»

چاوی خستەوە سەر یەک. بیری چووە لای دوکتور: «خودا دەست دە عەمری بگرێ.»

دەیانگوت: «دوکتوری باشە»

: «ئەگەر نەیدیتبام هەموو ئەو خەرجانەی تا ئێرە کردوومە دەبوو بە هیچ؟ پێی بڵێم لە کەیەوە ئەم ژانەم بە پشتێوە نووساوە؟ خۆ هەر بمبینێ دەزانێ لەبەر ژانی پشتمە کە وا دووقەد بوومەتەوە.»

سۆفی حەسەن خەریک بوو وەبیری بێتەوە کێ بوو کە ناونیشانی ئەو دوکتۆرەی دابوویە و چەندەشی تاریفی پیاوەتی کردبوو. هەرچەندەی حەولی دا، وەبیری هەر نەهاتەوە، لەبەر خۆیەوە کوتی:

: «جا چ فەرق دەکا، هەر کەس بوو خودا خێری بنووسێ. با جارێ بزانم چم دەگەڵ دەکا هەر خودا بکا پێویستم بە عەمەلیات نەبێ. نە وەختم هەیە و نە پووڵی عەمەل و نە جێگا و شوێنێ بۆ مانەوەم و نە کەسێکی ئاشنا و ناسیاو کە ئەم بەر ئەوبەرم پێ بکا.»

«وا باشە ئەگەر ڕای دوکتور لەسەر نەشتەرگەری بێ لێی بپاڕێمەوە جارێ برێک لە ژانی پشتم لە کۆڵ بکاتەوە، جا منیش کۆڵێکی دوعا بۆ دەکەم. هیچ پێم خۆش نییە کە لە شاری غەریب وەبەر چەقۆیان بکەوم، بێچارە حەلیمی خۆشی نەدیو، ئەم جار بە لەرزۆکی و بێهێزی بێ وەدوای من بکەوێ و خزمەتم بکا. لەوەتی وەبیرم دێ قەتم خێر بۆی نەبووە. لەوەتی پێی ناوەتە ژیانی من چەرمەسەری و ناخۆشی نەبێ چی نەدیوە. قوڕ بەسەرە بەر لەوەی بێتە لای منیش هەروا نەحەساوە بوو. تا گەیشتە ماڵە من بە دەس زڕدایک و بابی تووڕە و تۆسنەوە نیوە گیان ببوو. ئینجا کە هاتە پەنام. نەخۆشێکی سەختی پێوە نووسا. ئەم شەخس و ئەو چاکە و ئەم دوکتور و ئەو دوکتورە هەتا برێک خۆی گرتەوە، ئەم جار منداڵی نەدەبوو، هیچ جێیەک نەمابوو خۆی تێناوێ. نە پیر، نە چاک،

نە شەخس، نە مەرقەد و گومبەز و دوکتوری سابلاغ و ورمێ و تەورێز، تا خودا رووحمی پێکرد و غەفووری دایە غەفووریش وا بەم جۆرە سەری نایەوە.»

سۆفی حەسەن چاوی هەڵێناوە، یەک نەفەری مابوو نۆرەی بگاتێ.

تاریکی تەواو وڵاتی داگیر کردبوو. هەر کە زانیبووی مەتەبی دوکتور لە نهۆمی حەوتەم دایە. بەندی دڵی پسابوو. بەو پشتە بیانووگر و زیزەیە کوا دەیتوانی تا حەوت نهۆم وەسەر کەوێ؟ بەختەوەرانە هەر لە پلیکانی هەوەڵ کە پێی دانابوو لێی کە وەسەر گەڕێ، کەسێک هات و یارمەتی دا و لە ئاسانسۆری هاویشت. تا چاوی لە سەر یەک دانا گەیشتبووە مەتەبی دوکتور، ئێستا کە بیری لێدەکردەوە. خودا خۆشی ویستبوو کە هەم بە ئاسانی وەسەر کەوتبوو و هەمیش دوکتور ڕێی دابوو موعاینەی بکا. سەری بەرداوە و لە دڵە خۆیدا شوکری خودای بەجێ هێنا.

***

## ١٩

..... لە ماڵە عەلیلە بە ڕۆژی ڕووناکیش چاو چاوی نەدەدیت، ئەوەی بەزەڕ بوو، هاو ماڵیان بوو، لە ڕشک و ئەسپێ و دووپشک و مێش و مشکەوە بگرە هەتاکوو ئەو وردیلەی لە قوتابخانە بە دەرس پێیان گوتبووین و ناوی مێکرۆب بوو و هەروەها لەو شتانەی لە ماڵە عەلیلە زۆر بەرچاو دەهات و هیچ پێویستی نەدەکرد چاوی بۆ بگێڕێ تا بیبینی، برسێتی و سەرما و شێ و مەینەت و هەموو چەشنە ئازارێ بوو. بەڵام لەنێو ئەم هەموو تاریکایی و ناهۆمێدییەدا، ڕۆژێکی گەشیش سەری هەڵدابوو.

عەلیلە دەیگوت: «ئاوا چاو لە دایکم مەکە کە وا بەجێ وبان کەوتووە، پوورم دەیگوت: «لە سەردەمی خۆیدا هیچ کەس لە دنیادا لە فاتێ جوانتر نەبوو.» گوایا بە تیغی جوانی بێوێنەکەی خۆی بریندار بووە. هەڵبەت لەوەیدا کە جوانییەکەی فاتێ بێ وێنەبوو، هیچ گومانی تێدا نییە، بەڵام ئەوەی کە فاتێ قوربانی جوانییەکەی خۆی بووە وتەیەکە کە تەنیا لە زاری خوشکی بابی عەلیلە واتە پورە ئەستێی هاتۆتە دەر.

هەموو جارێ دەیگوت: «بە قوربانی خودای بم کاری سەیر و سەمەرە دەکا ئەگینا هەرگیز حەمە و فاتێیان نەگوتبوو.»

لە ڕاستیشدا، حەمە و فاتێ لەباری روخسارەوە ڕێک بە پێچەوانە بوون وەک شەو ڕۆژ کە وێڕای ئەوە دژ بە یەکن، هاوکاری یەکتریشن. وجوودی هیچ کامیان بەبێ ئەویتریان ئیمکانی نییە، دوو دژی هاوکار کە تایبەتمەندییەکانی یەکتر بە باشترین شێوە دەردەخەن. گومان لەمەدا نییە کە ئێمە تەنیا بە دەرک و فامکردنی تاریکایی و ڕەشاییە کە ڕووناکایی و سپیایی فام دەکەین. و هەروەها هەرکە دزێویمان فام کرد بە تەواوی هەست و نەستمان پەی بە جوانی دەبەین. ئەگەر فاتێ توانیبێتی ڕادەی جوانی

مرۆڤێکی جوان و لەبار بەیان بکا. لە هەمان حاڵدا حەمەش توانیبووی ڕادەی ناشیرینی مرۆڤ بچەسپێنێ. فاتێ هەر جۆرێک بووبێ یان حەمە هەر شێوەیەکی هەبووبێ من باوەڕم بەوە هێنابوو کە لە تاریکایی و شەوەزەنگی بەردەوامی ماڵە عەلیلەیدا، ڕۆژێکی گەش سەری هەڵدابوو کە هەردەم زۆرتر دەگەشاوە و دەبریقاوە. بەهەموو تاریفێکی جوانی کە فاتێ هەیبوو، نازێی کچی لەوی جوانتر بوو و من نازێم زۆر خۆش دەویست، هەر بۆیە عەلیلەشم زۆر خۆش دەویست. هەر بۆیە ڕقی هەرە زۆریشم لە ئاغای «قاف» بوو کەتەماحی لەنازێ کردبوو، نازێ تەنیا دوازدە ساڵ تەمەنی بوو. منیش دوازدە ساڵانە بووم. عەلیلە سێزدە ساڵی تەمەن بوو ساڵێک لە قوتابخانە وەپاش کەوتبوو. من و نازێ گەیبووینەوە سەری، من و عەلیلە و قالە لە کلاس لەسەر یەک کورسی دادەنیشتین.

ئەودەم کە تازە لەو گەڕەکەدا ماڵمان چووبووە ماڵە حاجی محەممەد، من حەوت ساڵانە بووم. لەگەڵ عەلیلە و قالە ئاشنا بووم. ئەودەم «نازێ»م نە دەناسی ماوەیەکی خایاند تا لە داوی کەوتم. بەڵام ئەو جۆرەی لە قالەم بیست، ئەو و عەلیلە بە یەکەوە گەورە ببوون و هەمیشەش بە یەکەوەت دەدیتن. تەنانەت لە خەون و خەیالیش‌دا بە بێ یەکتر نەتدەدیتن. هەرچەند بە تەمەن قالە لە عەلیلە گەورەتر بوو بەڵام عەلیلە وەها شوێنی لەسەر دانابوو کە دەتگوت برا چکۆلەیەتی. هەرگیز نەبوو عەلیلە خەونێک بگێڕێتەوە و قالەنەڵێ «بەخودای ئەمشەو منیش ئەو خەونەم دیوە.»

یان هەرگیز نەمدیت عەلیلە بیرەوەرییەک بگێڕێتەوە و قالەش دوابەدوای ئەودا نەڵێ:«کوڕینە عەلیلە ڕاست دەکا منیش لەوێ بووم لە پشت بەردەکەی خۆم مات کردبوو دەنا هەموو شتێکم بە چاو دیت.»

بۆ هەموو شت دەگەڵ عەلیلە بوو تەنیا لەکاتی ئاودەست چوون بوو کە دڵی دەهات چەند هەنگاوێک لێی دوور کەوێتەوە. هەر وەک مرۆڤ و نیسێکەی دەچوون. تەنیا لە کاتی خەو بە هۆی تاریکی، نیسێیەکە لە خاوەن نیسێکەی جیا دەبووە، هێشتا هەتاو بڕیاری ئەوەی نەدابوو کە ئەوێ ڕۆژێ بێتە دەر یان نەیەتە دەر کە نیسێکەی عەلیلە دەچوو لە پەنای خاوەنەکەی

ڕادەوەستا کەبە جووڵانەوەی ئەو بجووڵێتەوە. بە هەستانی هەستێ، بە هەڵاتنی هەڵێ و بە کەوتنی بکەوێ. قاله وەها بە عەلیلەوە نووسابوو کە ئەگەر ڕۆژێک بەتاقی تەنیایان دیتبا بێ گومان دەیانگوت عەلیلە نەماوە، بە تەواوی خۆی خستبووە ژێر دەسەڵاتی عەلیلە. بە ئەمر و دەستووری عەلیلە دەژیا، قاله دوو ساڵ لە یەک کلاس دا مابۆوە، دەرسی تەلەیفون بەر لە عەلیلە، قالەی زۆر وەگریان خستبوو، ئەوەندە کز و باریک و ڕیوەڵە بوو. لە ڕێگا ڕۆیشتن‌دا هەمیشە گومانی لێک هەڵوەشانی ئازای لەشی لێدەکرا. هەرگیز نەبوو جارێک بە بێ دووپڵیتەی چڵمی بیبینی کە هەر وەک دوو مار دەچوون کە سەریان لە کونەکەیان دەرهێنابێ. لەسەری کلاسێ دەتگوت ئیزنی ئەو دوو مارە شینەی لووتی قالەی بە دەست مامۆستایە، هەرکە چاوی لە قاله دەبڕی هەرتک مار سەریان دەبردەوە نێو کونەکەیان و هەرکە مامۆستا ڕووی دە لایەکی تر دەکرد شۆڕ دەبوونەوە و لە کونەکانیان دەهاتنەوە دەر. هەرچەند خات بەسێ دەسرەیەکی گەورەی بە دەرزیلە لە سەر شانی قاله دابوو، بەڵام قاله وەها خووی بەو هەڵکێش داکێشە گرتبوو کە وازی بۆ لێ نەدەهات. دەجا کاتێ منداڵەکانی‌تری کلاس لە پشتەوە ڕا کەپۆیان بە پەڕۆشانەکەی قاله دەستڕی زۆریان لێ وەدەنگ نەدەهات. بێچارە خات بەسێ ئێستاش نەیزانیوە ئەو هەموو چڵمەی کە شۆردوویەتی چڵمی هەموو کەس بووە جگە لە قالەی خۆشەویستی. بە پێچەوانەی قاله، عەلیلە کوڕێکی گورج و گۆڵ و بەخۆوە بوو. هەرچەندە تەمەنی سێزدە ساڵ بوو، لە کۆڵان‌دا کەس دەرەقەتی نەدەهات. بە چاوی خۆم دیتوومە منداڵی پازدە ساڵانەشی وەگریان خستووە. بۆخۆی ئەوەندە ئاغای «قاف» لێیدابوو کە لە گریان کەوتبوو، هەمیشە وەک برایەکی ئاگای لە قاله بوو. هەرچەند وەک باسم کرد بە تەمەن لە عەلیلە گەورەتر بوو بەڵام ئەگەر عەلیلە نەیپاراستبا، منداڵانی کۆڵان کەوڵیان لە حاجەت دەخست. هێند درێژ و باریک بوو، منداڵەکانی گەڕەک ناویان نابوو «حووج»، هەموو پێی فێر ببوون چۆنی لە عەرزێ بدەن. خۆیان بە لاقی دادەدا و دەیانکێشا تا دەهات کەدابێتەوە و نەهێڵێ لاقی بگرن. بە عەرزییان‌دا دەدا. هەر لەبەر وەش بوو

کە لە عەلیلە جیا نەدەبۆوە. بە پێچەوانەی عەلیلە کە ئاگای لە قالە بوو من هیچ قالەم خۆش نەدەویست. ئەودەم وام هەست دەکرد لە بنەوە چاوی لە دووی نازێیە. بەڵام دیارە لە ترسی عەلیلەی نەیدەوێرا شتێک دەربڕێ یان ئیشارەیەکی بداتێ. سەرە ڕای ئەوە کە ئەم ڕاستییەم دەزانی لەوەی کەلە یەک ماڵدا دەژین و شەو و ڕۆژ نازێ بە بەر چاوی‌دا دێت و دەچێ، ئێرەییم پێ دەبرد. هەر چەند ئاگاداریش بووم کە نازێ ڕووی ناداتێ بەخۆم نەبوو بەڵام پێم خۆش‌بوو عەلیلە لە گۆڕی نەبوایە. تا ئێستا دەیان جار لە خۆڕایی پەلێم پێ گرتووە و دەیان جارم لێداوە، بە دەس خۆم نەبوو کە باسی نازێ دەهات، جۆرێکم لێ‌دەهات. موچڕک ئازای ئەندامی دادەگرتم، نەمدەتوانی هەستی خۆم ئاشکرا بکەم، ئاخر زۆر لەگەڵ عەلیلە ڕەفیق بووین. ئەو کارەی منیش خەیانەت و بێ ناموسی بوو! بەڵام لەو لاشەوە ئەوەندەم نازێ خۆش دەویست کە ئەگەر ڕۆژێک نەمدیتبایە بێ شک نەخۆش دەکەوتم. ئەو دەمانە کەیفم زۆر ساز دەبوو کە دایکم دەیگوت ئەو شێووکوڵەی بۆ ماڵە خات فاتێ بەرە. من لە خۆشیان لە ماڵێ ڕا بە هەلینگ‌دان هەڵدەهاتم بۆ لای ماڵیان ئەی بەڵکوو چاوێکم بە نازێ بکەوێ هەرچەندە دەمزانی ئەو دەمەی عەلیلە و قالە لەماڵ نین و لەگەڵ منداڵەکانی تری گەڕەک خەریکی هەقلە مەقۆی خۆیانن. بەڵام خۆ من نەدەچووم عەلیلەی ببینم یان دیسان چاوم بەو چاو دەرپەڕیوەی، قالە، بکەوێ. دەچووم بەڵکوو چاوم بە نازێ بکەوێ. بەقەستی لەبەر درگایان ڕا هەرام دەکرد: «عەلیلە! عەلیلە!»

لە پڕ نازێ وەدەر دەکەوت بە هەزاران نازی شاراوە کە خودا دەهەزاران شتی‌تر دا شاردوویەتەوە و لە نازێ‌دا ئاشکرای کردووە بە بزەیەکی کە بێتوو لیئۆناردۆ داوینچی بیدیتبایە ناچار دەبوو بزەی مۆنالیزاکەی خۆی بگۆڕێتەوە بە بزەی «نازێ»ی من و دەبوو ناوی تابلۆکەشی کردبایە «بزەی نازێ»!!!

وەک وەبیرم دێ هەمیشە من لە دەربڕینی هەست و ئیحساسم گرفتم هەبوو بە تایبەت ئەودەم کە چاوم بە نازێ دەکەوت. دەنگم دەبوو بە دوو

دەنگ، وە دەنگی کەسێکی‌تر دەچوو کە من هەرگیز نەمناسییەوە، بۆم نائاشنا و ناخۆش بوو. دەنگم وەک ئەوە دەچوو کە بەردی لە شووشە بخشێنی. سەرەڕای ئەوە کە دەنگم دەستی نەگرتم. وە ڕنگیشم لە تاوان هەڵدەهات، زمانیشم نامۆیی لەگەڵ دەکردم و قسەکانمی لێ دەشاردمەوە. جارێکی لەجیاتی ئەوە کە بڵێم «دایکم دەڵێ شیوەکانمان بۆ سبەی دەوێ.» زمانم وەها تێکەڵ بوو ئەو رستەیەم گوت:«دایکت دەڵێ ناشیوەکان دایکم» نازێ پێکەنی زۆر بە نازەوە، وەک ئەوشتەی کە ویستوویەتی وەچنگی هێناوە کوتی: «فەرموو دایکم هاتۆتەوە لە ماڵە».

جا من چیم دابوو لە دایکی. هەموو بیانووەکانم هەر لە بەر خۆی بوو. لە بەردەمم ڕاوەستابوو، پێدەکەنی. من لە فیکری ئەوە کە ئەو سەربزێوە ئابڕووبەرەیە، ئەو زمانە کات نەناسە ئەو لە خۆڕازییە بێ کەڵکەم ڕام کەمەوە و دەئیختیارمی بگرمەوە.

نازێ وەک ئەوەی بیهەوێ قالەم بە چاو دادا کوتی: «عەلیلەش دەمێکە لەگەڵ کاک قالەی وەدەر کەوتوون.» لە کاتی گوتنی ناوی قالە سەکتەیەکی بچووکی بە قالە کرد بۆ زۆر بزاوتنی من.

: «چی بڵێم. ئەی خودایە، ئەی خودایە تازە دەزانم مامۆستا گۆرانیش دەبێ دە هەل‌ومەرجێکی وەک من کەوتبێ کە دەڵێ: «چی بنووسم خوایە هێزی ئینشایەک» دەبێ نە هیچی مابووبێ بۆ گوتن و نە هیچ شتێک بۆ نووسین.

من تەنیا ئەوەندەم بۆ مابۆوە کە بە نازێ بڵێم زۆر مەمنوون و کوتم: «زۆر مەمنوون»

: «نەتگوت بۆ هاتووی؟» بە پێکەنینەوە.

من نەمگوتبوو یان ئەو نەیبیستبوو یان کایەی دەگەڵ دەکردم.

ساڵێک لە هاتنمان بۆ ماڵە حاجی محەممەد تێپەڕیبوو کە دەگەڵ عەلیلە ببووینە دوو دۆستی گیانی گیانی. کە تازە هاتبوومە ئەو گەڕەکە و ئێستا لەگەڵ عەلیلە ئاشنا نەببووم ڕۆژێک عەلیلە لەگەڵ سێ برایان بە شەڕهات. لەبەر خاتری نازێ نەبوو کە ئەودەم هەر نەمدەناسی لە بەرخۆی بوو لەبەر

عەلیلە کە لە سەرم کردەوە. پێم نامەردی بوو بە سێ کەسان لە یەک کەس بدەن. کەپۆم لەخوێن هات. یەک دوو جێگەی ڕوومەتیشم داڕووشابوو و قۆڵی کراسەکەشم تەقەڵەکانی هەڵوەشابوو. بەڵام توانیمان چاک چاکیان لێدەین. هەر سێ برامان وەگریان خستن. عەلیلە پێی گوتم:

: «کوڕی چاک – ئەودەم ئێستا ناوی یەکترمان نەدەزانی – وەرە بچینەوە ماڵی ئێمە با دایکم کراسەکەت بۆ بدووریتەوە.»

پێشنیارەکەیەم بە دڵ بوو. دەترسام بەو کراسە دڕاوە بچمەوە ماڵ تووشی گێرەوکێشە ببم، دایکم لێم لە بیانوو بوو، چووم و هەرئەدەم بوو کەچاوم بە نازێ کەوت. جۆرێکی چاو لێدەکردم کە ناچار دەبووم سەرم داخەم. ئێستا دەتوانم بە ڕاشکاوی بڵێم هەر ئەودەم، لەبەری بەزیم. چەند ڕۆژ دواتر کە خۆشاردنەوەمان دەکرد. من چووم لە کادێنی ماڵە حاجی محەممەد دا خۆم شاردەوە کادێنەکە وەها لە کا ئاخندرابوو کەبە دژواری لەبن درگا جێی خۆم کردەوە. ئێستا بە تەواوی دانەمەزرابووم کە یەکێکی تریش خۆی دەو جێیە کوتا.

جێگەی کەسێک کە دوو کەسی تێدابێ، دیارەچۆنە! وەها پێکەوە نووسابووین. دەتگوت یەک کەسین. گەرمایەکی دامێ کە دە لەشم دابوو بە تەزوو، کەوتە گیانم. پێم سەیرە چۆن بوو ئەو هەموو کایە ئیشکەی کە دەکادێن دابوو بە گڕوئاگری ئەوساتەی لەشی من ئاگری نەگرت؟ بەڕاستی ماڵە حاجی محەممەد شانسیان هێنا. نازێ هاتبوو ئاگرم تێبەردا و دای. ئەودەم چکۆڵە بووم  بەڵام نەک ئەوەندە کە نەزانم دە چ خۆشییەکی لە نەکاو دام. بە بزە جوانەکەی لاڵی کردم.

کوتی: «بڵێی لێرە بمانبیننەوە؟»

زمانێکم بۆ نەمابوو کە پێی بڵێم: «نا» یان «با»

لاقم وەلەرزین کەوتبوون. وەک مێژۆکە. لەرزینێکی خۆش و هەرگیز لەبیر نەکراو، پێم خۆش بوو کات ڕاوەستێ و بە قەرا ئەبەدەییەت، ئەم ڕاوەستانە زەمان بەرێ.

عومری خۆشی ئای چ کورتە! ئای چ کورت! تا لەگەڵ تۆ چاو ترووکا تێپەڕی.

من هەر ئەودەم لەو کادێنەدا تەنیا دەماوەی چاوترووکانێکدا گەورە بووم. باڵام کرد پێم خۆش بوو هەمووی ژیانم هەر خەریکی خۆشاردنەوە بم. جیهانیش هەمووی ببێتە کادێنی ماڵە حاجی محەممەد و پڕ پڕ لە کا ئاخندارب بە چەشنێکی تەنیا جێگەی یەک کەس ببێتەوە ئەو یەک کەسەش من بم، ئینجا یەکێک لە پڕ خۆی لە باوەشت باوێ و پێت بڵێ: «ئەرێ بڵێی لێرە بمانبینەوە؟»

خۆم کۆ کردەوە و گوتم: «دایکم دەڵێ بە خات فاتێ بڵێ ئەم شیوانەمان بۆ سبەی لازمە.»

تا من ئەو ڕەستەیەم تەواو گوت. نازێ تەواو لە بزەی هەڵکێشام شیرینی، شیرینی، شیرین.

***

# ٢٠

....... مەلا بانگدانێ کە حاجیژن هەستا بۆ نوێژکردن، وەک هەمیشە چوو کەریم دەنگ بدا بۆ ئەوەی مانگاکان دەر بکا و ڕەگەڵ گاڕانیان بخا. کەریم لە جێگەوبانەکەی دا نەمابوو. پێی وابوو بۆخۆی زووتر هەستاوە و وەشوین کاری هەر ڕۆژی کەوتووە. کە چووە حەوشە بۆ دەسنوێژ هەڵگرتن دیتی کە مانگاکان دەرنەکراون و هەر لە جێی خۆیانن. بۆ ساتێک حەبەسا.

: «تۆ بڵێی ئەو تووتکە سەگە بەو نیوەشەوە چووبێتە کوێ؟»

بیری بۆ هیچ کوێ نەچوو. لە خۆڕا هەستی بەو دڵتەنگییەکی غەریب کرد. هەروەک ئەودەم کە کەریم دەزگیدا بوو. هەروەک ئەودەم کە لە هیچ و خۆڕایی خەم و خەفتێک وەها دایگرتبوو کە دەو ماوە کەمەدا[٤٥] بڕستی لێبڕیبوو. دەستی بۆ هیچ کارێک نەدەچوو هەر ئەودەم بوو کە دایکی بووکهەناری بووکی، خەبەری دابوویە کە سەیدە لاڵە هاتۆتەوە کتێب بۆ خەڵکی دەگرێتەوە. بێ شکە، وای لێهالاون کە وەبەر ناکەوێ. تۆش بۆ ناچی بۆ لای کتێبێکت بۆ بگرێتەوە. دەڵێن قسەکانی بێیەک و دوویە. هەرچی بە هەر کەسێ گوتووە هەر وەک موقەدەرێک بۆی هاتۆتە پێش و نەیتوانیوە خۆی لێ لادا. خەبەری لە ڕابردوو و داهاتووی مرۆڤ هەیە کوڕە. گەورەکەی دەرویش حەسەن، بۆ خۆت دەزانی کە چ شێتێک بوو. لە ژووری ماڵەکەیاندا بە گوریس بەستبوویانەوە. بردیانە لای، هەر بەیەک نوشتە چاکی کردۆتەوە.

حاجیژن چوو بۆ لای سەیدەلاڵە. بەڵام هەموو جار کە وەبیری دەهاتەوە دەیگوت: «بریا هەرتک ئەژنۆم شکابان و نەچووبامە لای، خۆزگە هەرتک چاوم کوێر دەبوو بەڵام سەیدە لاڵەم نەدەدیت.»

---

٤٥- دەو ماوەکەمەدا: لەو ماوە کەمەدا.

سەیدە لاڵە نەیهێنا و نەیبرد لە حاجیژنی حاڵی کردبوو کە ئەو منداڵەی لە زگی دایە، لەبەری چووبا باشتر بوو. چوون لە چارەنووسی ئەودا نووسراوە کە ئەو منداڵە سەرەخۆرەیە! حاجیژن چوو بۆ لای سەیدە لاڵە تا ئەو دڵتەنگییە کە ڕۆژ و شەو وەک مۆتە چنگی دەبینەقاقای ناوە لەکۆڵی بکاتەوە، وازی لێبێنێ، کەچی سەیدە لاڵە هەر بەیەک جاری لە عەرزی کوتا. وای لێهات کە لە پێ کەوت. دەستی بۆ هیچ کارێک نەدەچوو. زارا و تووبا کە ئەودەم زۆر گەورە نەبوون بە تەواوی لەناز کەوتن. حاجی محەممەد کە هێشتا نەببوو بە حاجی بە ناچار لێبڕا بۆ ماوەیەکی، حاجیژن بەڕێ بکاتەوە بۆ شاری سنە، بۆلای بنەماڵەکەی. حاجی محەممەد بۆخۆی خەڵکی بانە بوو کە لاو بوو چووبووە سنە و هەر لەوێ فێری ئاسنگەری و ناڵبەندی ببوو، ئەو کەسەی کاری لە لا دەکرد و فێری کاری کرد بابی ئەو حاجیژنە بوو کە ئێستا خێزانی بوو، بنەماڵەی حاجیژنیش هەر بانەیی بوون بەڵام لەمێژ ساڵ بوو لە شاری سنە دەژیان. بابی حاجیژن کە حاجی محەممەدی بە لاوێکی باش و لێهاتوو و ڕاست و دروست دەناسی کچەکەی خۆی لێ مارە کرد، ئینجا سەرمایەی دە ئیختیار نا کە هەر شوێنێ بۆ کار هەڵیدەبژێرێ، ئاسنگەری و ناڵبەندی لێ دامەزرێنێ و لەسەر پێی خۆی ڕاوەستێ. حاجی محەممەد دوای پرس و ڕایەکی زۆر سەردەشتی بۆ کار و ژیان هەڵبژارد، ئەلحەق کاریشی گرتی. توانی لە ماوەیەکی کورتدا سەروەت و سامانێکی زۆر پێک بێنێ و ئێستا کە دەیدیت باب و کاکە گەورەکەی حاجیژن چوونە حەجێ. حاجی ئەو هەلەی قۆزتەوە و بە حاجیژنی کوت: «تۆ کارت بە منداڵەکان نەدابێ بۆ خۆم ئاگام لێیان دەبێ. ئەوە بووکهەنار چاوی لە سەریانە، دەتوانێ پارووە نانێک و ئیستکانە ئاوێکیان بە گەروو دابکا. تۆ بچۆوە ماڵە بابت، ماوەیەک لە وێندەرێ بحەسێوە. تا باب و کاکت لە حەج دەگەڕێنەوە. ئەودەم منیش دێم لەدوات و بە یەکەوە دەگەڕێینەوە.»

حاجیژن بە نابەدڵی و بە زگێکی شەش مانگەوە، وەڕێ کەوت. بەڵام بە وتەی حاجیژن و پێشبینی سەیدەلاڵە، سەرەخۆرەی نێو زگی کاری خۆی کرد. باب و کاکی هەرگیز نەگەڕانەوە، چون لەگەڵ دەستەیەک حاجی دیکە لە

کاتی گەڕانەوە لە عێراق را لە لای حاجی ئۆمەران وەبن ڕنوو کەوتبوون چەند نەفەریان نەبێ، ئەوانی‌تر هەموو مردبوون، کە باب و کاکی حاجی‌ژنیشیان لەگەڵ بوو. تا هەواڵی مەرگی باب و براکەی پێی گەیشت، ئەوەی توک و دۆعایە لە سەیدەلاڵە و منداڵەکەی نێو زگی کرد. دەیان جار ویستی لە ناوی بەرێ. دەچووە سەر پەیژەیەک و لە پلیکانی پێنجەمەوە جووت پێ خۆی فڕێ دەدا خوار تا بەڵکوو منداڵەکەی لەبەر بچێ. هیچ تفت و تاڵی و تیژی و ترشی و سوێرییەک نەمابوو کە قاپ قاپ بە گەرووی خۆی‌دا نەکا تاکوو بەر بهاوێ. هەموو جارێ کە کەسی لێ دیار نەبوو بە مستان بەردەبووە زگی خۆی و تووکی لێدەکرد. دڵتەنگییەکەی حاجی‌ژن بە پێچەوانەی بیروڕای حاجی محەممەد نە تەنیا کەمتر نەبوو کە گەیشتە ئاستێکی ئەستەم، بەڵام منداڵەکە وەک فریزوو لێی هاڵابوو. بە هیچ جۆرێک لێی جیا نەدەبۆوە. هەتاکوو بە کەڵەگایەتی پێی نایە سەر دنیایە. ئەگەر بە دەست حاجی‌ژن بوایە، پێی خۆش بوو ناوی بنێ. سندان و دڵەدەرد، قوزەڵقۆرت و ژەهری هەلا هەلا.

بەڵام ناویان لێنا کەریم. حاجی‌ژن هەتا ئەو دەمەی کە چوو کەریم لەخەو ڕاست بکاتەوە، لە خراپە و سووکایەتی چ نەمابوو کە دەرحەق بە کەریم نەیکردبێ.

هەرکەسێک تاقە جارێک ڕوو بەڕوو بوونەوەی حاجی‌ژنی لەگەڵ کەریمی کوڕی چاو پێکەوتبایە، بێ هیچ شک و گومانێک سوێندی دەخوارد کە کەریم زڕ کوڕی حاجی‌ژنە و بۆ حاجی‌ژن هیچ گومانێک نەمابوو کە کەریم سەری باب و براکەی بەهاوکاری سەیدە لاڵە خواردووە.

ئێستا کەدەیدیت بەو نیوە شەوە کەریم لەجێی‌وبانی‌دا نەماوە، نەیدەزانی چۆن بە حاجی ڕابگەیەنێ.

: «ئەحمەد، بە ناشکوری ناڵێم هەر دەڵێی کوڕم نییە. هەرگیز بۆ ئەوە نابێ هیچی لەلا باس بکەم ڕەسوولیش کە لەگەڵ ئێمە نییە و لێمان دوورە با بچم لە عەولای بپرسم. بزانم هیچ خەبەری لەو مشکە تۆپیوە هەیە؟»

بۆ هەوەڵ جار ناچار بوو ئەو ئەرکەی دەملی کەریمی پەستاوتبوو خۆی بەجێی بگەیەنێ.

بە پرتەو بۆڵە و جنێودان وەڕێ کەوت. حاجی محەممەدی بەڕێ کردە بازاڕ بە بێ ئەوەی هیچ شتێکی دەربارەی دیار نەبوونی کەریم پێ بڵێ. دڵتەنگی وردە وردە بەسەریدا زاڵ بوو. دڵتەنگییەکی ئاشنای لەبیر کراو، پەنای بۆ بووکهەنار برد: «جا چوزانم ئامۆژن ئەوەی ئەو بەستەزمانە لێقەوماوە کێشاوێتی و تا ئێستا ماوە زۆری خودا روحم پێکردووە. چەندەم دەگوت، تۆ خودا ئامۆژن ئەوەندە ئەو منداڵەی ئازار مەدە. باب و کاکت ئەجەلیان هاتبوو، موقەددەری خودایی بوو، ئەو منداڵە بێ تاوانە لەنێو زگی تۆدا چ گوناحێکی کردبوو؟»

: «دا بەسە بەسە، دەمت وێک بێنە. لێم مەبە بە مەلا مەزبوورە هەر ئەوە مابوو ئەتۆش نەسیحەتم بکەی. تەماشا ئێمە هاتووینە لای کێ!»

: «ئامۆژن بۆ لێم دڵمەند دەبی؟ من دەمویست بڵێم بەو ژیانە ناخۆشەی کەریم هەیبووە هەر کەسێکی تریش بایە ڕۆژێک تاقەتی لەدەست دەدا.»

: «ئەوە دەڵێی چی بووکهەنار؟ ئەو هەتیوە نەعەملاوە لەو ڕۆژەوە کەوتە نێو زگم لە خێر و خۆشی بێ بەشی کردم لەبیرت چوو هەوەڵێ چ نەخۆشییەکم پێوەنووسابوو. بڕۆ لە دایکت بپرسە باشتری لەبیر ماوە، سەیدە لاڵەش ئەوەی پێگوتم. هەر ئەوەم مابوو لەوە بەدوا وەشوێنی بکەوم تا بزانم چۆتە کامە جەهەندەمێ.»

کەریم و باقی کوڕی کاک قادری خەیات هێندەی نەمابوو کە بە دەست ئەمنیەی پاسگای پارێزەری سەر سنوور بکوژرێن. کەوتبونە بەر دەسرێژی ژاندرمان، ئەو شوێنەی هەڵیانبژاردبوو کە پێیدا بپەڕێنەوە. کوێرە ڕێگەیەک بوو کە بە پەنای پاسگادا تێدەپەڕی هەرچەندە ڕێگەیەکی زۆر نێزیک بوو بۆ گەیشتن بەو دیوی، بەڵام قاچاقچی زۆر بە ئەزموون نەبا، هیچ کەس نەیدەوێرا پێیدا بپەڕێتەوە. ناخافڵ ڕوویان لەوێ کردبوو، ئەگەر لە بەختی خۆیان قوڵکەیەک لە پەنای چۆمەکەدا نەبوایە هەردووکیان پێکرابوون. هەر ویزەی گوللە بوو لەبن گوێیان دەهات و تۆزوخۆڵ و پەلاشی لە پشت و

تەنیشتیان وەهەوا دەخست. وەها لە ترسان عەرزەکەیان لە باوەش گرتبوو کە هیچ دایکێک نەیتوانیوە بەم شێوەیە دەگەڵ منداڵەکەی ببێ بە یەک. لەبەر هاژەی چۆمە خوڕێنەکەی بەردەمیان بە ئاستەم گوێیان لە دەنگی کەسێک بوو کە دیار بوو لەوبەری چۆمەکە دەنگیان دەدا. کە باش گوێیان هەلخست یەکێک پێی دەگوتن:

: «کوڕینە هیچ سەرتان وەدەر نەخەن ئەگینا دەتانپێکن. جارێ هەر لەوێ بە بێ هیچ جووڵەیەک بمێننەوە.»

کەریم بە هاوالەکەی گوت: «باقی وا بزانم لە ڕێ هەتڵە بووین.»

باقی پێی گوت: «کەریم پێم وایە ڕاست هاتووین بەڵام وێدەچێ ئەم پاسگایەیان تازە دانابێ. پێشتر وەک بیستبووم لەم گۆشەی سنوور هیچ پاسگایەکی لێ نەبووە.»

: «بەڵام باقی تا ئەو جێیەی من بزانم دەڵێن ئەم بەرەی سنوور هەمیشە ژاندرمی لێ بووە.» ماوەیەک تێپەڕی، دەنگی کابرا دیسان بەرز بۆوە.

: «کوڕینە جوان گوێ ڕاگرن. ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە وەدەر کەون.

دەبێ زۆر لەپڕ و گورج و گۆڵ هەڵێن بۆ لای خوارووی بەستێنی چۆمەکە. لەوێ خۆتان لە پەنا دارە بیەکانی دەم چۆم حەشار بدەن. هێندێک لەوێ سەبر کەن ئینجا هەر بە نێو دارە بیەکاندا داگەڕێنە خوار، تووشی پردەبازێک دەبن پێی دابپەڕنەوە و وەرنە ئەم بەری چۆمەکە. ڕوو بە ڕووتان ڕەزیک دیارە بڕۆنە نێو ڕەزەکە لەوێ دەتانبینم.»

هەتا لە چۆمی پەڕینەوە کەریم و باقی نیوە گیان ببوون. بە تایبەت باقی کە قەڵافەتی دوو هێندەی کەریم بوو پێی عەیب بوو لەکن کەریم بگری ئەگینا لە دڵە خۆیدا چەند دەستی شین کردبوو! ناحەقیان نەبوو ماوەی چوار ساعەت لە قولکەیەکی لە قەبر بچووکتردا مانەوە و ئیزنی هیچ چەشنە جووڵانەوەیەک نەبوون و مەترسی کوژران بەدەست ژاندرمان، لە دەست و پێی خستبوون و بڕستی لێ بریبوون. لەوکاتەوە لە شار وەدەر کەوتبوون، جیا لە چۆڕێک ئاوی کانی سەر ڕێگە و چەند هێشوو ترێ ڕەشەی ڕەزەکانی سەر ڕێگایان نەبێ هیچ شتێ لە گەروویان نەچووبووە خوار.

بەڕاستی وەها شەکەت ببوون. لە ڕۆیشتن‌دا پێیان لە عەرزی دەخشاند. لەپڕ دەنگەکە بە ئاشکرایی لە نێزیکەوە گوتی.

: «هەڵمەکشێن بۆ سەرێ. وەرن بۆ ئەم لایە.»

کابرایەکی کەڵەگەتی بە شان و باهۆ بە ڕوخسارێکی تاوەسووت لێیان وە دەردەکەوت و قەڵس و تووڕە.

: «خودا بتانگرێ. ئەمە چ کارێک بوو کردتان؟ هەر خودا بۆخۆی مەیلی لەگەڵ نەبوو ئەگینا دەبوو وەک بێژینگتان لێ بێ!!»

هیچ کامیان زمانیان نەدەگەڕا. چاوێکیان لە یەک کرد و سەریان بەردآوە.

: «بڵێن بە ڕاستی ئێوە کێن؟ چ کارەن؟ بۆلێرەن؟ لەچی دەگەڕێن؟»

لێیان نێزیک بۆوە هەرکە چاوی پێیان کەوت زانی ساعەتێک زووتر پرسیاری لێکردوون. ئێجگار شەکەت وماندوو و هیلاکی دیتن.

: «وەرن جارێ لێرە دانیشین، تاوێک وەحەسێن. پارووێەک نان بخۆن دوایی بەشێنەیی ولامی پرسیارەکانم بدەنەوە.»

کەریم هەڵیدایە: «ناوم کەریمە. کوڕی حاجی محەممەدی بانەییم.»

: «من حاجی محەممەد زۆر باش دەناسم. زۆری کار بۆ کردووم، داخودا ئێستا حاڵی چۆنە. زۆر لە مێژە لێی بێخەبەرم، چەند جارێک کە ڕێم دە سەردەشتێ کەوتووە. بۆم نەلواوە سەردانێکی بکەم. خۆ ئێستا لە پێ نەکەوتووە؟»

: «نا شوکور زۆر باشە.»

: «ئێستاش هەر بۆخۆی دووکانەکەی دەگێڕی؟»

: «بەڵێ کاکە ڕەسووڵم دەکاردا لە بابم جیا بۆتەوە ئەو خەریکی ناڵبەندی‌یە.»

: «دەی جا زۆر باشە ئەوە ئەتۆ. ئەی ئەو کوڕەی لە گەڵتە کێیە؟»

: «ئەوە باقی کوڕی کاک قادری خەیاتە.»

: «کاک قادریش باش دەناسم، ئەو رانگوچۆغەیەی ئێستا دەبەرم دایە ئەو بۆی درووم. ئەتۆ بابت چۆنە کوڕم؟»

: «بابی منیش شوکور زۆر باشە.»

: «دەی ئەوە ئێوەم ناسی. باشە جائەو جار پێم بڵێن لێرە چی دەکەن کە هێندەی نەمابوو گۆڕغەریب ببن.»

کەریم کوتی: «کاکە! ڕەنگە ئێوەش مامم بناسن مەلا حەسەنی بانەیی پێ دەڵێن دەباڵ شۆرش دایە. بابم ناردوینەتە لای. پەیامێکی گرینگە کە دەبێ هەرچی زووتر بەدەستی بگا. بۆ ئەوەی تەنیا نەبم کاک قادری خەیات ئیزنی دا باقی دەگەڵم بێ.»

: «بە ڕاستی چ کارێکی گەوجانەتان کردووە. ئەم کارە لە حاجی محەممەد بە دوورە چۆن توانیویێتی دوو منداڵان دەنێو ئاور باوێ؟ مەگین چوونە لای مەلا مستەفا هەروا بە سووک و سانایی دەکرێ؟ وەزع لێرە زۆر ئاڵۆزە، ئەگەر لەمن دەپرسن ئەم شەو لێرە لە لای من بمێننەوە. بەیانی زوو بۆخۆم بەڕێگایەکی ئەمندا بەڕێتان دەکەمەوە سەردەشتێ. خۆم چەند ڕۆژی تر سەفەرێکم بۆ ناوچەی بارزان لە پێشە. پەیامەکەی حاجیم بدەیە. بۆخۆم دەیدەمە دەست کاک حەسەن.

کەریم و باقی چاوێکیان لە یەک کرد کە کابرا نەیتوانی نەیخوێنێتەوە.

گوتی: «کوڕە ئەگەر ڕاستت پێ نەگوتبێم. لە پاشان بۆخۆت پەشیمان دەبییەوە.»

کەریم دەستی کرد بە سوێند خواردن تا ئەو جێیەی کابرا کەریمی دڵنیا کرد کە باوەڕی بە قسەکەی هێناوە. شەو خەریک بوو هەرچی هەبوو و نەبوو لە ئامێزی خۆی دەگرت و جیهانێکی یەک ڕەنگ و یەکسانی پێک دێنا.

❊❊❊

## ٢١

..... دوکتور سۆفی حەسەنی لەسەر تەختەکەی ڕاکێشا و پرسیاری لێکرد.

: «چته عمو؟»

سۆفی حەسەن بە نالّە نالّ گوتی: «بە قوربانت بم ئاغای دوکتور ئەو ژانەپشتە بڕستی لێ بڕیوم، بە جارێ کوشتوومی. قەت بلّێی ساتێ هەدادانم هەبێ، لە دەست و پێ کەوتووم. فەڕزی خودام بۆ بەجێ ناگەیەندرێ.»

دوکتور هەروا کە خەریکی موعاینەی پشتی بوو لێی پرسی «اهل کجایی عمو مثل اینکه از راه دور آمده‌ای؟»

: «جا بە قوربانت بم بلّێم خەلّکی کوێم. هێندە دوورە پیاو نایگاتێ. خەلّکی سوورە چۆمیم. لە لای سنووری عێراقێ.»

دوکتور بۆ ساتێک دەستی لە موعاینە کردن هەلّگرت و زۆر بە وردی چاوی لە ڕوخساری سۆفی حەسەن بڕی، دەتگوت دەیهەوێ دەنێو ڕۆخساری‌دا ڕوخساری کەسێکی ئاشنای خۆی دەرکێشێ. ئەوجار پرسیاری لێکرد.

: «خوب حالا بگو اسمت چیه؟»

: «حەسەنم ناوە قوربان، سۆفی حەسەنم پێ دەلّێن.»

ئیتر چی دیکەی لێ نەپرسی، زۆر بە وردی موعاینەی کرد و چوو لە پشت مێزەکەی دانیشت و دەستی کرد بە نووسین. لە پڕ سەری هەلّێنا و ڕووی لە سۆفی حەسەن کرد کە بە دژواری خەریک بوو خۆی کۆ دەکردەوە:

: «عمو شما باید هرچه زودتر عمل بشین. یکی از مهره‌های ستون فقراتتون بدجوری ساییده شده. اگر زود عمل نکنین براتون مشکل جدی بوجود می‌یاره.»

سۆفی حەسەن وای چاو لە دوکتور دەکرد کە نیشان بدا تەواو لە قسەکانی نەگەیوە.

بەڵام چونکە دەبوو جوابی بداتەوە. جوابەکەی بە پێچەوانەی چاو لێکردنەکەی بوو.

: «بە قوربانت بم ئەمن ناتوانم خۆم عەمەل بکەم. نە پووڵەکەیم هەیە و نە وەختەکەی و نە کەسێک کە وەدوای کارم بکەوێ.»

بەڕای ئێوە من چاکی بۆچووم کە دوکتور و سۆفی خەریکی کایەکردن دەگەڵ یەکترین؟

ئەوجار دوکتور بە فارسی سۆفی حەسەنی تێگەیاند کە بێتوو خۆی عەمەل نەکا مەترسی مردنی لە گۆڕێ دایە. سۆفی حەسەنیش بە کوردی دوکتوری تێگەیاند کە بێتوو خۆی عەمەل بکا و بکەوێتە نێو جێگەوبان مەترسی مردنی حەلیمی خێزانی هەیە کە بێکەس و داماو ماوەتەوە. لێرەدا دوکتور بە دەرفەتی زانی و بەبێ دەنگی بە گۆشەیەکی زەینی خۆی دا ڕۆ چووە خوارێ و دەستەیەکی بیرەوەری لەنێو پووشەیەکی تۆزاوی کۆن کە جاڵجاڵۆکە داوی لەسەر تەنیبوو دەرکێشا و فوویەکی لە تۆزەکە کرد، تۆز و خۆڵی نیشتووی سالانی ڕابردوو وە حەوا کەوت چی نەمابوو دوکتور وەکۆخە بکەوێ. نەکەوت، بە دەستی داوە جاڵجاڵۆکەکەی لێ سڕیوە و هەڵیداوە چەند بیرەوەری لێ خوێندەوە. ئەوەی لێی دەگەڕا نەبوو، خستیوە سەر جێگەی خۆی و پووشەیەکی تری دەست دایە، سۆفی حەسەن بە بێدەنگی خۆی و چاو دەچاوی دوکتور بڕین، حەولی دەدا فەزا نەشێوێنێ. دوکتور بە هەمان دەستوور خاوێنی کردەوە و هەڵیداوە. دەستی کرد بە خوێندنەوەی.

خات زڵەخا دەڵێ: «ڕووحەکەم کاوەیس گیان! بچۆ بۆ ماڵە کاک حەسەن و بە خات حەلیم بڵێ: «دایکم دەیگوت بێزەحمەت پنە و وەردێنەکەم بۆ بنێرە.»

باجە حەلیمم زۆر خۆش دەویست بە قەدەر دایکم ئەوەندە ڕووخۆش و بەسەروزمان بوو، هەر نەبێتەوە. هەرگیز نەبوو بۆ کارێک دایکم بمنێرێتە

لای و لە گەڕانەوەدا گیرفانم پڕ نەبێ لە مێوژ و گوێز و سنجوو و لەتکە، منداڵی نەدەبوو، دایکم دەیگوت: «پێم دەڵێ خات زڵەخا بە خودای پێت خۆش بێ و پێت ناخۆش کاوەیس کوڕی منیشە.»

هەموو جارێ کە دەیدیتم ئەوەندە بە قوربان و سەدەقەم دەبوو کە لە شەرمان وەسەر ئاو دەگەڕام.

دایکم دەیگوت: ڕۆڵە کاوەیس گیان هەمیشە بە دمی خات حەلیمەوە پێبکەنە – چەند جار منداڵی لەبەر چووە- دەڵێن منداڵی نابێ، هەر بۆیە تۆشی وا خۆش دەوێ. زگ سووتاوە.

دەڵێم: «دایە ئینسان ئەگەر جێگەیەکی بسووتێ دەگری و دەناڵێنێ. دەی جا چۆن دەتوانێ لەبەر ژانەکەی منداڵی دیکەی خۆش بوێ؟»

: «دەڵێ ڕۆڵە گیان ئەو سووتانە وەک سووتانی تر ناچێ. لە ڕاستی‌دا دڵی دەسووتێ وەک مردن دەچێ؟. وا باشە واز بێنی لەم پرسیارانەت من نازانم چۆنت تێبگەیەنم. هەر ئەوەندەی بزانە کە خات حەلیم بە قەرا من تۆی خۆش دەوێ. تۆش دەبێ ئەوت خۆش بوێ.»

دوکتور پووشەکەی وێک ناوە و بردی لەسەر جێگەی خۆی دایناوە. هاتەوە سەرخۆ و بە فارسی دەستی کرد بە پرسیار کردن لە مام حەسەن و مامە حەسەنیش هەر بە کوردی وڵامی داوە. دەقی ئەم پرسیار و وڵامە ئەمەیە کە لە خوارەوە هاتووە.

: «مامە ئەتۆ ئەم شەو لە کوێ دەخەوی؟»

: «بە قوربانت بم بستە جێگەیەکم لەسەر ئەم عەرزی خودایە هەر وەدەست دەکەوێ.»

: «مامە ئەوە کەست نەبوو لەگەڵت بێ؟»

: «بە قوربانت بم کەسی کەسان هەر خودایە ئەوم لەگەڵە بەسە.»

: «مامە کەوای لێهات ئەم شەو ئەتۆ میوانی من دەبی. هێندێک ئازمایشت بۆ دەنووسم سبەی بەیانی لەگەڵ خۆم دەتبەمە نەخۆشخانە. خۆشم نەتیجەی ئازمایشەکانت بۆ وەردەگرمەوە.»

: «زۆرت لێ مەمنوونم. بە قوربانت بم بەڵام ناتوانم زەحمەتت بدەم. هێندێکم پوول لەگەڵ خۆ هێناوە. قوژبنێکی دەبینمەوە ئەم شەو لێی وەردەکەوم. عادەتم گرتووە. ئەگەر دەکرێ جارێ لە ئازمایشت و شتی دی دەگەڕێم. نەختێکم دەرزی و دەرمان بۆ بنووسە کە ئەو ژانەم لەکۆڵ ببێتەوە، ئیتر چیم ناوێ مەگین خۆشییەکی سەری تۆ نەبێ.»

: «نابێ، ناهێڵم بچی بۆ هیچ جێگەیەکی تر. ئێستا وەبیرم هاتەوە کە کوتت خەڵکی سوورە چۆمم. من ماوەیەک لەسەردەشت و دەوروبەرەکەی ژیاوم چەند کەسێکی لە خەڵکی سوورە چۆمێ دەناسم، پێم خۆشە ئەم شەو لە لام بی و بە وردی باسی ئەوانم بۆ بکەی. بزانم چۆنن؟ چۆن نین. ماون یا مردوون؟

: «بە ڕاستیتە ئاغای دوکتور؟ بە قوربانت بم ئەتۆ هاتوویە ئەو ناوچەیە؟ کەی هاتووی؟ تۆ چی و ئەو کاول بووە چی؟»

: «بەڵێ بە ڕاستیمە ماوەیەک لەو ناوچەیەدا ژیاوم. لە کاتی شەری بارزانی دەگەڵ بەعسیەکان‌دا. من وەک دوکتورێک، ناردرامە ئەو شوێنە بۆ دەوا و دەرمانی برینداره‌کانی شەڕ. وا هەڵکەوت جارێکیان ماوەی چەند ڕۆژان لەگەڵ چەند دوکتوری تر لە سوورە چۆمێ، ئەو شوێنەی تۆ دەڵێی خەڵکی وێم ماومەوە. هەر بۆیە چەند کەس لە خەڵکی ئەوێ دەناسم.»

: «دەی بە قوربانت بم دە پێم بڵێ کێ لە خەڵکی وێ دەناسی تا هەر ئێستاکە پێت بڵێم ماوە یان مردووە؟ هەر چەند ئەو ماوەیەی لە ڕێی ئێرەدابووم لێم روون نییە لەوێ چ ڕووی داوە؟»

: «نا مامە ئێرە جێی ئەو قسە و باسانە نییە، لە لایەکی ترەوە لەبەری بەیانەوە من لەسەر پێ بووم و زۆر شەکەت و ماندووم، وا باشە بە یەکەوە بچینە ماڵی ئێمە، لەوێ زۆر بە تێر و تەسەلی لەگەڵ یەکتر دەدوێن. ئەوەش بڵێم نیگەرانی هیچ شتێکی مەبە. کەسم لە ماڵ دا نییە، من بە تەنیایی دەژیم، دەجا زەحمەتت ناکەوێتە سەر شانی هیچ کەسێک، ئەگەر لەبەر ئەوە نیگەرانی. هەر وەها با ئەوەشت پێ‌بڵێم – خوێنەری بەڕێز وەک نووسەرێک چۆنی بۆ چووم کە بڵێم دوکتور و سۆفی حەسەن شتێک لێک

دەشاردنەوە؟» - کە نەکا دوایە بە بیستنی هەڵبەزیوە مامە ئەمن زمانی کوردی بە باشی دەزانم. بە ئانقەست بە فارسی قسەم دەگەڵ دەکردی. ئەو دوو ساڵەی لە سەردەشت و دەوروبەری بووم و نەخۆش دەهاتنە لام هەر بە کوردی دەمدواندن تا بە جوانی فێری ببم.»

: «ئێستا کەوا دەفەرمووی بە قوربانت بم ئەمن ئیدی هیچ قسەیەکم نییە- من لێرە ئەم پرسیارە دەکەم سۆفی حەسەن بە ڕاستی هیچ قسەیەکی نەبوو یا نەیدەویست هیچ قسەیەکی هەبێ؟ - هەر جۆرێکی پێت باشە با وابێ ڕەبی خودا دەست بە عەمر و ماڵتەوە  بگرێ. ڕەبی هەموو ئاوات و ئارەزووەکانت وەدی بێ.»

دوکتور نیگای ڕۆیشتبووە دوورەوە، کە سۆفی حەسەن خەریک بوو هەر شوکری خودای بەجێ دەهێنا.

❊❊❊

## ٢٢

..... چ لەپڕ دەنگم دەدا و دەڵێ: «دەی جا زۆر باشە، پێم بڵێ تۆ لە کەیەوە ئەوەندە لەسەر دڵان و باش بووی کە تا خێزانت کوتی ئەرێ نامانگەیەنیە ماڵە بابم؟ بەبێ ئەوەی وەک هەمیشە نێوچاوانت تێک بنێی و دەسبکەی بە پرتە و بۆڵە کردن لە سەر عەرز و ئاسمان کە هەرگیز ئیزنی ئەوەیان نەداوە بەتۆ بە کاوی دڵ ڕابوێری و لە بەرانبەرت خێزانت وەک کەو بۆت بخوێنێتەوە تاکوو یەکەکەی دەڵێ و تۆش دوویەکەت و هەروا درێژە بەم یەک و دوویە بدەن تا هەر کامتان لووتتان دەکەوێتە لایەکی تر. ئەم جارەیان بێ هەست و خوست بەرزەپا بووی وجلوبەرگت لەبەر کرد و ماشێنەکەت لە کاڕێژ[٤٦] دەرکێشا و دەست لەسەر سینگ ڕاوەستای. کە فەرمووت کردن. تۆ نەتتوانی ئەو نیگا سەیرەی کە خێزان و منداڵەکانت لەگەڵ یەکیان گۆڕییەوە نەبینی. بەڵام وەک هەمیشە وەدوای تەعبیر و لێکدانەوەی نەکەوتی، زۆر بە پەلە بووی. بە پەلەتر لەوە کە وەکوو هەمیشە خۆت نیشان بدەی، خودا خودات بوو هەرچی زووتر بیانگەیەنی، تا لەکۆڵت ببنەوە. ڕاست بڵێ چی دی لەمنی مەشارەوە. لەکەیەوە وەها کات و ساتێکت بە ئاوات دەخواست؟ دەبڵێ چت لەبن سەری دابوو؟ ئەی بۆچی وا داگیرسابووی. گەرووت ئیشک ئیشک ببوو، بە زۆری خۆت وەکۆخە خست تا گەرووت هێندێک ساف بکەی. دەنگت وەک دەنگی جارانی خۆت نەدەچوو. دەتگوت بەرەو نووسان دەچوو، دەنگی سیدییەکەی نێو ماشێنەکەت بەرز کردەوە. کامران مەتەری دەیگوت. چەندت حەز لەم دەنگە بوو. دەنگێکی عاشقانەی بەسۆزی خۆش. دەنگێکی تایبەت، لەو دەنگانەی هەرگیز لەبەر

---

٤٦- کارێژ: لەموکریان لەبری گەراج بەکاری دێنن.

چاوت، ناکەوێ. یەکڕاست زەینت چووە سەر کامران مەتەری. لە خۆت پرسی هۆی چ بوو ئەم دەنگە خۆشە تەنیا یەک کاسێتی بڵاوکردەوە؟ ڕاستی ئەویش کێشەیەکی وەک خۆتی هەبوو؟ تۆ لە خۆتەوە بۆت ڕاستە و پاستە کرد. گوتت خەتای نییە کەمتەرخەمی لە لایەن ئەو کەسانەیە کە گورانییەکانیان بۆ ساز دەکرد. ڕەنگە ئەوان گرفتیان هەبووبێ و ئەم گرفتەیان شوێنی لە سەر کار و ناو و ژیانی کەسێکیتر دانابێ. هەرچەند هیچ بەڵگەیەکی باوەڕپێکراوت بە دەستەوە نەبوو، بەڵام هەر لە هیچ و خۆڕایی زگت بە خۆت سووتا. دە داوی گۆرانیەکەی کامران مەتەری کەوتییەوە. ئەو دەنگە زۆر سەیرە تا دەیبیسی بڵێی یەک و دوو بە کووچە و کۆڵانەکانی شاری بیرەوەری بە دوای خۆتدا دەتکێشێ. هەتا هەوەڵین ژوانگەی ژینت. هەوەڵین ئەزموونی عیشق و دڵداریت، هەوەڵین هەستی هەر تەنیا خۆ نەویستن و خۆ نەدیتن. بەڵکوو تا تێکەڵاوی، هەست و هەناسەی یەکی تر بوون. ڕاتناگرێ. دەنگێکی بلاوێن کە مرخی ئەوەی هەیە تۆ لە هەر وەرزێکی ژیانت دابی، سەر لە نوێ بەهارێکی تازە و سەر سەوز، پڕ پڕ لە بەستەی خۆشەویستی پێشکەش بە تۆ بکا، دەنگێکی تایبەت بە خۆی وەک دەنگی عەلی مەردان کە تایبەتە بە خۆی، وەک دەنگی سەیید عەلی ئەسغەری کوردستانی، کە تایبەتە بە سەییدعەلی ئەسغەری کوردستانی وەک دەنگی عومەر دزەیی. بەڵام لەنێو هەموو ئەو دەنگە بەرزانە کە بێوێنەن بە ڕای من ئەوە تەنیا دەنگی کامران مەتەرییە کە سۆزی عەشق و ئەوینی لێوەدێ لانی کەم بۆ من. «سڵاو لەتۆ کیژی کوردی مەهاباد.»

خێزانم دەڵێ: «ئەرێ بۆچی شتێکی خۆشتر دانانێی؟ ئەوەندەمان گوێ لەوە بووە وەڕەز بووین، ڕێک لەو دەمە دایە کە ئەو پێم دەڵێ: «دەزانم هەستت بەچی کرد، لە جوابێک دەگەڕای کە بە خێزانتی بڵێی. من جوانم دەدیت چۆن بەلێشاو جوابی جۆراجۆر لە تاریکخانەی زینت دەڕژانە دەرێ. بەڵام هیچ کامت پەسەند نەکرد. وا بزانم نەتدەویست ڕێبازی جاران بگریە بەر. بە پێچەوانەی هەمیشە کە بە شەڕ و ناخۆشی لێک جیا دەبوونەوە. ئەم جارەیان پرسیارت لێکرد چت پێخۆشە دایئێم؟ چون هەرگیز نەبوو کە هەر

دووکتان کەیفتان بە شتێک بێ و ئەوجا زۆریشتان نەمابوو بگەنێ. کامران مەتەری گۆرانییەکی تریشی دەست پێکرد.

سابڵاخی مە چەن خۆشە    لێی دێ بۆنی وەنەوشە
سەیرانی کووچە باغ و چیاکانی زۆر دڵکێشە

گەیاندتنە ئەوێ. ئای چەندەت خودا خودا دەکرد کە خەزوورت لە ماڵ نەبێ تا ناچار نەبی وەژوور بکەوی و ئینجا تەواوی ریسەکەت لێ ببێتەوە خوری. بە ڕاستی ئەگەر ئەودەم خەزوورت لە ماڵ بایە. بەم کەم ڕوویی‌یەتەوە چۆنت خۆ دەرباز دەکرد.؟

: «وەرە ژوورێ، تاوێک لە لامان دانیشە. چایەک، میوەیەک.»

: «زۆر سوپاس، ئیشاڵڵا کاتێکی تر موزاحیم دەبم.»

: «کوڕە موزاحیمی چی؟ وەرە ژوور بەو گەرمایە دەچییە کوێ؟ وەرە دانیشە یەک دوو دەستیش تاوڵە دەکەین.»

ئای لەو دەمەدا چەندە دڵ و زمانت لە یەک دوور بوون و وەک هەمیشە خەریک بووی لە درۆیەکی بەر دەست دەگەڕای. کە لەو وەزعەت ڕزگار بکا.

: «وەڵڵا زۆرم پێخۆشە بێمە خزمەتتان – ئەوە زۆریشت پێ ناخۆشە – بەڵام دەگەڵ کاک ئەحمەد بڕیارمان داناوە بچینە دەفتەری گۆڤار بۆ پێداچوونەوە بە نووسراوەکاندا»

ئای لەو درۆ گەورەیە. خۆ تۆ دەتتوانی پێی بڵێی کە سەرەخۆشێکم بەدەستەوەیە. بەڵام نا، حەق بە تۆیە، نەتدەتوانی ئەمە بڵێی، دەنا خەزوورت دەیپرسی.

: «سەرەخۆشی، سەرەخۆشی چ کەسێک؟»

تۆش لەو دەم و دەستەدا هەرگیز نەتدەتوانی کەسێکی زوو بمرێنی کە ئەو نەیناسیبا، چون ئەگەر بیناسیبا، دیار بوو لەگەڵت دەهاتە سەرەخۆشی، نا، باوەڕ دێنم کە درۆیەکەت بێ عەیب و ئیرادە. ئای لە درۆ. وای لە درۆ، درۆ تەزبیحی دەستی هەر ئینسانێکە کە بە درۆش دەڵێن، بێزمان لە درۆ

هەڵدەستێ. ئەی درۆ! ئەی پیرۆزترین بەرهەمی ژیانی کۆمەڵایەتی مرۆڤ، تۆ ئەگە نەدەبووی ئەم جیهانە هەرگیز ئاداری بە سەر پاداریەوە نەدەماوە. ئەی درۆ! چ ئاور کە ڕاستی هەڵیگیرساندووە، تۆش بە ئێعجازی دەمی مەسیحایی خۆت کووژاندووتەوە. چها تەنافی گیانکێشت نە تەنیا لە ملی تاوانبار کە لە ملی بێ تاوانیشت داماڵیوە و چەندە ئەو مرۆڤانەی هەرگیز چاوی دیتنی یەکتریان نەبووە وەک دوو کەسی کەس دوو برای گیانی لە یەک نێزیک کردۆتەوە. چەند کەست لە حاڵ و وەزعی ناخۆش ڕزگار کردووە، تاکوو ئێستا چەندە منداڵت لە ئازار و ئەشکەنجە بە دەست دایک و باب و برا گەورە و مامۆستای قوتابخانە و خاڵ و مام و پوور و منداڵی تر ڕزگار کردووە. چەندەت چەتری یارمەتی و ئاگاداریت هەڵداوە لەسەر سەری ئینسانی دەستەوەستان، ئینسانی نەقوستان. ئینسانی موعتاد، نەخۆش و لێقەوماو، ئینسانی بێکەسوکار، ئینسانی ترسەنۆک و خوێڕی، ئینسانی هەڵوەداو بەڕەڵڵا، ئینسانی گوناهکار و خەتابار، ئینسانی دز و جەردە و خۆفرۆش و جاش، درۆ! ئەی نێزیکترین کەسی هەرکەس! ئەی هانادەری ڕۆژانی تەنگانە. تۆ پێم بڵێ کە نەبی کێیە کە بێ هیچ چاوەنوارییەک بێتە یارمەتیم؟ کێیە کە دێت و دەستم دەگرێ وکۆڵ کێشەکانی ژیانم دەکاتەوە؟ هەمیشە و هەمیشە هەر حەق دەدا بە من.

: «پێم دەڵێ بەڵێ. بەڵێ خەزوورت لە ماڵ نەبوو ئەم جارەیان شانست هێنا، دەی باشە، زوو بگەڕێوە. ئەی بۆوا لە خۆت ڕاماوی؟ بیر لە چی دەکەیەوە؟ لەمن؟ لەوەی کە چلۆنم فریو بدەی و لە ئەستۆی خۆتم داڕنی؟ من هیچ کارێکم بە تۆ نەداوە، فەرموو؛ هازا گۆ و هازا مەیدان.»

پێی دەڵێم: «ئەرێ پێت دەکرێ چیدیکە دەوری زانای هەموو شت زان نەگێڕی؟ خۆزگە دەمزانی وەکوو قورنوو بە ڕووحی منەوە نووساوی چت لە گیانی شەکەتی من گەرەکە؟ بە ڕاستی بوونی تۆ دەناو خۆم دا هەر وەک دوو چاوی گەورەی زەلام دەبینم کە دایم و دەرهەم دەڕوانێتە من، کە چ دەکەم و چ ناکەم و چ دەخۆم و چ ناخۆم و چ دەبەر دەکەم و چ دەبەر ناکەم و چلۆن بیر دەکەمەوە و چلۆن بیر ناکەمەوە، چ دەڵێم یان ناڵێم و بە

تەواوی، ژیانی لێ کردوومە جەهەندەم. دەکرێ مەردی خودای بی بۆ ماوەیەک وازم لێ بێنی؟»

پێم دەڵێ: «تۆ بە هەڵەچووی، موشکیلەی تۆ من نیم، خۆتی، تۆ لە خۆت دڕدۆنگی، تۆدۆڕاوی، و لە شتێک دەگەڕێی کە پێت وایە لێت ون بووە. تۆ لە نیشانەگەلێک دەگەڕێی کە بە دۆزینەوە یان خۆت وەکوو خۆت بچەسپێنی. نە وەک ئەو جۆرەی کە نیشان دەدەی، ئەگینا نە دەهاتی بەم چەشنە شتیانە لەبەر چاوی واق وڕمای تەواوی ئەو کەسانەی دەیاندیت، چلۆن پیاوێکی بە ویقار و وێچوو و کۆک و پۆشتە بە کەوشی بریقەدار وەنێو چرپ و چاڵ و دڕک و داڵ کەوێ و هەر چەندە چەند جێگای دەستی بە چقڵ و دڕوو زامدار دەبێ، دیسان دەست هەڵناگرێ و ئەو شریتە کوت کوت و پس پس کراوەی کە لە چرپی و چاڵەکە هالابوو، ئاوا لەسەرەخۆ و بە هێمنی کۆ بکاتەوە و هەر وەک بەشێک لە ئەندامی لەشی ئاگاداری لێبکا. دەیجا باشە کە وابوو خۆتۆ ناتوانی لە منی بشارییەوە، مەگین تەواوی ئەو پەلەکردن و ماڵ چۆل کردنەت بۆ ئەوە نەبوو کە بچیە زگ شریتەکە؟ منیش هیچ نامهەوێ بیشارمەوە خەریکم بگەڕێمەوە ماڵێ تا بچیە سەر شریتەکە.

***

# ٢٣

.... دایکم دەڵێ: «بە خودای ئەختەر خانم! ئەو منداڵانەی من، ئەگەر بیشانکوژی لە جێگایان هیچ ناخۆن.»

هیچ وانییە. من و دوو خوشکەکەم و براکەم چاوێکی تاسەبارمان لە یەکتر کرد. هەمیشە بۆ وەڕاست گەڕانی قسەی دایکمان و دەربڕینی ڕادەی عەقڵ و فام و شعوورمان کە دیسان خێرەکەی هەر بە نیسیبی دایکمان دەبوو، ناچار بووین نەوسمان وەها کوێر بکەین کە مورتازێکی پێگەیشتووی هیندی لەدەستی نەدەهات. بەختەوەرانە دایکمان وەک مورشیدی ئەعزەم لە لامان بوو و بە مۆرە، دەستی ئێمەی سالیکی ناکامڵی ڕێگەی تەریقەتی دەگرت و هەرگیز ئیزنی نەدەداین کە لە ڕێگەمان هەتڵە بین. هەر لەبەر ئەوەی ئافەریمی ئەم و ئەوی پێبگا و هەموو دەوروبەر بزانن چەندە منداڵەکانی بە ئەدەب و ئاقڵ و بێدەنگن. ئەگەر دووپشکیش پێوەی دابان، لێی قەدەغە کردبووین کە بڵێین وەی و ناچار بووین سپاسیشی بکەین. بەڵام ئەو شتانەی، ئەختەر خانم بۆ خواردنی دانابوون، لە نان پەنجەرەی ڕا بگرە کە بۆخۆم سوێم بۆی چووبوو، هەتا شیرنی و غورابی و بیدمیشک و ئاجیل و بامیە و زولوبیا کە بە هەڵکەوت ئەگەر ساڵێ جارێک چاوت پێبکەوتبایە. ئێستاش لەگەڵ دایکم خەریک بوون لەبەرچاوی نەوسنی ئێمە وردە وردە دەیانخوارد. بڕوام پێبکەن شێخ حەسەنی خەرەقانی و بایەزیدی بەستامی و ئیبراهیمی ئەدهەمیشی لە چلەکەیان دەردەکێشا و (چلەی پێ دەشکاندن)، تا چ بگا بە ئێمەی بە زۆر عاریفانی پێنەگەیشتووی ناکامڵی نەوسنی بێ عەبا و جبە. چی نەمابوو لە تاو ئەو هەموو شتە خۆشە هەر بەڕاستی ببین بە

عاریف، ئەو جۆرەی ئێمە چاومان لە شتەکان بڕیبوو، سەیر نەبوو بە هێزی چاومان وەحەوایان بخەین. دایکم هەر خەریک بوو لە بنەوە لێوی لێ کرۆشتین و بە دەستیش هەر کە ئەختەر خانم ڕووی وەرگێڕابا یان بۆ کارێکی لە ژوورەکە وەدەر کەوتبا تێیدەکوتاین. بەڵام وا دیارە بە درێژایی مێژوو، هەمیشە دەسەڵاتی نەوس بە سەر مرۆڤدا زیاتر بووە لە دەسەڵاتی دایک بەسەر ئەولاددا. ئێمەش خۆ یەک و دوو نەبووین دایکم باشارمان بکا. چوار بووین ئەودەم هەر وەک کەمتیار بە یەکەوە و زەڕرە زەڕرە. وردە وردە بەبێ ئەوەی پێشتر بڕیارێک لە نێوانماندا ببەستین دەستمان کرد بە دەستدرێژی کردن. دە دڵمان دا هاو ڕا ببووین کە لە پاشان هەرچی بۆمان دێتە پێش با بێتە پێش. هەر ئەشکەنجە و ئازارێکمان بە گیان و دڵ دەکڕی. بەڵام چیتر توانایی ئەوەمان نەبوو، ئەو هەموو خواردەمەنییە خۆش و جوانەی لەبەر چاومان ببینین و دەست بەسەر چاو ودڵ و نەوسماندا بگرین. دەجا هەوەڵ بە ترسەوە و کەم کەم، دوایە بە پەلە پەلە و توند توند. لە ئاکامدا بە هەلینگدان و هەڵاتن. ئەختەر خانم بۆ پاراستنی بەشێک لەو شتانەی دانابوون، چارەی لەوەدا دیت کە بڵێ: «ڕەنگە برسی بووبنەوە وا وێدەچێ ئەم شتانە بەری دڵیان ناگرێ، با هەستم بچم پارووێکیان نان و ماست بۆ بێنم.»

بەڵام من گومانم لەوە دانییە کە هەر ڕەنج بە خەساری پێدەماوە چونکە تازە ئەوەی دەیتوانی لە چنگ ئێمە ڕزگاری بکا. پیاڵە ماستەکەی نەدەهێنا.

دایکم تەنیا کارێ لە ماڵێ توانی دەگەڵ چوار منداڵان بیکا ئەوە بوو کە بە سەری حەزرەتی حاجی سەیید عەبدوڵڵای ئەفەندی سوێند بخوا کە هەرگیز لەگەڵ خۆی بۆ هیچ جێگەیەکمان نەبا کە دیار بوو لە دەستی نەدەهات ئەو سوێندەی بەرێتە سەر.

دەڵێم: «عەلیلە خۆ لە مێژە خۆ شارنەوەمان نەکردووە دەڵێی چی ئێوارێ لە پاش گەڕانەوەمان لە قوتابخانە لەگەڵ منداڵەکانی دیکە، خۆشاردنەوەیەکی بکەین.

: «دەڵێ ئێوارێ منداڵەکان لەبەر نووسینەوەی مەشق و دەرسەکەیان هیچیان نایەنە کۆڵان.»

: «دەڵێم جا هەر بۆ خۆمان دەیکەین. من و تۆ و قالە پێت خۆشە بەنازێش بڵێ، دەبینە چوار کەس.»

: «تازە باسی نازێ مەکە، نازێ دوازدە ساڵێتی. بۆ ئەوە نابێ تازە پێی بنێتە کۆڵان بڕیار وایە هەر بەو زوانە بچێتە کڵفەتی.»

پردی قیامەتم لێ دەپسێ: «کڵفەت؟»

وەها هەڵدەبەزمەوە کە عەلیلە پێی سەیر دەبێ: «نا، جا چۆن شتی وا دەبێ؟ ئەدی مەدرەسەکەی چ لێدەکا؟»

پێشتر ئێمە کڵفەتمان هەبوو ناوی زبێد بوو. هیچ بەڵایەک نەمابوو کە من بە سەری نەهێنم هەڵبەت بە شێکیان بۆ خۆی فێری کردبووم کە بە سەری بینم، بەڵام زۆرتری ئەوەی بە سەرم دەهێنا بۆ خۆم دەمدۆزییەوە. بەستەزمانە لە ترسی ئەوەی نەکا وەدەری بنێن هەرگیز نەیدەوێرا؛ باسی هیچ شتێک بکا. هیچ جنێوێکی پیس نەمابوو کە لە کۆڵان فێری نەبم و لە ماڵ دا پەیتا پەیتا بە زبێدی نەڵێم. زۆربەی ئەو کاتانەی چاوی دایکم دوور دەدیت، زبێدم دەکردە کەری خۆم و سواری دەبووم. نەقیزەکەم لە داری ساز کردبوو. هەر لەبەر ئەو کەرسوارییەم نازانی چۆنم لە پشتەوە دەو بێچارەیە دەکوتا. هەتا ڕۆژێک کە دایکم لە ماڵ نەبوو لە سەر پشتی کە هاتمە خوار لەپڕ دەرپێکەی خۆی داکێشا و نیشانی دام. چم لەو چارە ڕەشە کردبوو! تەواوی سمتی ڕەش و شین هەڵگەڕابوو. زۆرم زگ پێ سووتا. دەتوانم بڵێم ئەودەم گەلێ ڕقم لە خۆم هەستا، دەستم بە سەر سمتی داهێنا. کوتم: «زبێدە بۆت دادەماڵم هەر ئێستا بۆت چاک دەکەمەوە.»

زبێدە ئەو دەم تەمەنی چاردە ساڵ بوو منیش دوازدە ساڵانە. خۆی خستە بن دەستی من کە بە وتەی من بۆی چاک بکەمەوە. بە دەسخۆم نەبوو کە گەرم داهاتم. هەروەک ئەو دەمم لێهات کە دەگەڵ نازێ لە کادێنی ماڵە حاجی محەممەد پێکەوە نووسابووین. و خۆمان شاردبۆوە. ئاورم گرتبوو. زبێد گوتی:

: «وەرە کەمێکیش ئەتۆ ببە بە کەری من. بووم بە کەری، سوارم بوو لێی دەخوڕیم، بەڵام تێی نەدەکوتام. خۆم نەمدەزانی بۆ وام؟ بۆ وادەکەم جۆرێکم لێهاتبوو. نە شەڕمان بوو، نە زۆرەبانیمان بوو، تەنیا لێک هاڵابووین و دەسووڕاین و دەسووڕاین، جۆرێک بووین نە زبێد سواری من ببوو و نە من سواری ئەو ببووم نە زبێد سواری من ببوو و نەمنیش سواری ئەو ببووم. درۆ ناکەم هەرگیز ئەوەندەم خۆشی نەدیبوو. زبێد هەستاوە بە من دەڵێ.

: «کوڕە نەچی باسی ئەوە لە لای دایکت بکەی دەنا ئەمن وەدیوی دەرێ دەنێ و تۆش تازە کەرێکت نابێ سواری ببی».

من هیچم قەت بە هیچ کەسم نەکوت و هیچ ڕۆژێ نەبوو کە بە دزی لەگەڵ زبێد لە پەنایەکی کەرکەرێنێ نەکەین. ئێستا بیری ئەوەی کەسێکی وەک من بەدفەڕ پەیدا ببێ و هەموو ڕۆژێ لەگەڵ کڵفەتەکەیان کە نازێی من بێ کەر کەرێنێ بکا ئازارم دەدا.

: «عەلیلە نازێ بۆ کێ کڵفەتی دەکا؟»

: «بۆ ئەو دوو گرووبانەی[٤٧] دەماڵە هەمزە ڕووتی دا دەژین.»

: «عەلیلە خۆ ژن و کچەکانی هەمزە ڕووتی بۆ خۆیان کڵفەتی دەکەن، ئەی بۆ کڵفەتی ئەو دوو گرووبانەش ناکەن؟ چییان لە نازێ داوە؟»

: «ئەمن نازانم، ئەوەندەی بیستوومە دەڵێن پوولێکی باشی دەدەنێ. هیچ دەزانی لەو دەمەوە دایکم تووشی ئەو ژانە پشتە بووە و ناتوانێ کاری ماڵان بکا. ئەگەر خاتبەسێ نەبوایە لە برسان دەمردین خۆ کەسمان نیە ئاوڕێکمان لێ بداتەوە.»

دەڵێم: «عەلیلە! ساز بە ئێواران کە لە قوتابخانەی ڕا هاتینەوە وەرە بە یەکەوە، قالەش دەبەین، دەچین داری دەبڕینەوە و دەیفرۆشین. پووڵەکەی بدە بە دایکت با نازێ نەچێ بۆ کڵفەتی. چون ئەگەر نازێ ئاگاداری دایکت نەکا کێ دەتوانێ ئاگای لە دایکت بێ؟»

---

٤٧- گرووبان: دەرەجەیەکی سەربازییە (عەریف).

: «بۆخۆمان، من و منداڵەکانی تر، نازێش لە ماڵ دانەبێ ئێمە بۆ خۆمان پێنج منداڵین هەر جۆرێک بێ پێی ڕادەگەین.»

دەستێکم دەکەوێتە ئەم لا و دەستێکیشم دەکەوێتە ئەولا لە دڵی خۆمدا دەڵێم:

: «خۆزگە دایکم زبێدی وەدەر نابایە و نازێ هاتبا ماڵی ئێمە. تازە چش لەو کەرکەرێنەی لەگەڵ زبێد دەمانکرد.»

ئەو نیوەش زبێد داینابوو بۆ ئەو کارەی فێری ببووین و هەموو ڕۆژ دەمانکرد.

زبێد دەهات و دەیڕوانی هەرکە کەسێک دیار نەبا دەستی دەکرد بەناڵە کردن وئاخ کوتن منیش کە دەرسەکەی خۆم جوان لەبەر کردبوو دەمگوت:

: «زبێد! زبێد گیان! بۆ وا دەکەی؟ کوێت دێشێ؟»

زبێد دەیگوت: «دەتەوێ کوێم بێشێ؟ دیارە ئەو جێگەیەم دێشێ تۆ هەموو ڕۆژێ بە نەقیزە تێی دەکوتی.»

ئینجا نۆبەی من بوو کە دەبوو بڵێم: «دا کوا نیشانم بدە بزانم چی لێهاتووە؟»

: «ئەی کوڕە لاچۆ، نابێ، ناکرێ، عەیبە دایکت بزانێ هەردووکمان دەکوژێ»

: «جا دایکم چووزانێ؟ خۆ ئەتۆ پێی ناڵێی. منیش پێی ناڵێم. دەتۆخوا جێگاکەیم نیشان بدە، با بزانم چی لێهاتووە؟»

دەرپێیەکەی دادەماڵی، ئینجا نۆرەی من دەهات کە دەستی بۆ بەسەر دابێنم و ئەودەم کەرکەرێنەکەمان دەستی پێ دەکرد. هەتا ئەو دەم کە زبێد وەک تەندووری لێدەهات کەوای لێدەهات ئیدی مۆڕەی لێدەکردم: «بەسە، تەواوە، بکشێوە.»

منیش هەموو شتێکم هەر لەبەر ئەو کەرکەرێنە بە قسەی زبێد دەکرد.

: «دایە ئەرێ مانگێ چەندی دەدەی بە زبێد؟»

: «مانگێ بیست تمەنی دەدەمێ. کەوش و جلیشی بۆ دەکڕم. بۆ چییە؟ بۆ ئەو پرسیارەی دەکەی؟ تۆ چت داوە بەوەی چەندی دەدەمێ یان نایدەمێ؟»

: «دایە زبێد چاوی ڕیپۆقی کردووە. ئێستا بێزم لێی هەڵدەستێ. بۆچی کەسێکی تر ڕاناگری؟»

: « جا بە تۆ چی؟ ئەوا بە بابتم کوتووە، دەرمانە سوورەی بۆ بێنێتەوە بۆی دە چاوی دەکەین، بە چەند ڕۆژان چاک دەبێتەوە.»

: « دایە هیچ خەبەرت هەیە قەرارە نازێ کچی خات فاتێ ببێتە کلفەتی ئەو دوو گرووبانەی لە ماڵە هەمزە ڕووتی دان؟»

: « ئەیرۆ جا چۆن خات فاتێ دڵێ دێ ئەو کچە بەستەزمانەی بنێرێ بۆ کلفەتی، زۆر منداڵ و شلکە»

: «دایە ئاخر لەوەتی خات فاتێ کاری پێناکرێ ماڵە عەلیلەی هیچیان نەماوە بویە لە تاوان نازێ دەنێرنە کلفەتی و دەڵێن ئەو دوو گروبانە مانگێ پەنجا تمەنی دەدەنێ.»

: « بەڕاستی خراپ دەکەن بۆ پەنجا تمەن ئەو کچە جوانەی بەدبەخت دەکەن. دا ڕاوەستە بزانم، ئەو شتانە بە تۆ چی؟ بۆ خۆت تێهەڵدەقوتێنی؟ بڕۆ خەریکی دەرس و دەورەکەت بە، لەو قسە زەلامانە گەڕێ.»

بۆ بەیانی کە ڕۆژی هەینی‌یە بەیانی زوو دەچمە سەر شێخ مەولانا و زمانم لەخۆڵەکەی بەردرگای دەخشێنم، دەست لە کێلەکەی وەردێنم:

«یا شیخ مەولانا گیان، بە قوربانت بم، تۆ خودا ئەم شەو ئەو دوو گرووبانەی ماڵە هەمزە ڕووتێ وەک سەگ بتۆپێنە، یا شیخمەولانا بەڵێن بێ هەموو ڕۆژێ گیرفانێک قاشوولەت بۆ کۆ دەکەمەوە و لە سەر گڵکوکەت دایدەنێم. تەنیا تۆ مەهێڵە نازێ کلفەتی ئەم دوو گرووبانە بکا. یا شێخ مەولانا بە قوربانت دەبم هەرچی زووتر ئەمن گەورە بکە با بتوانم پووڵێکی زۆر پەیدا بکەم و بیدەم بە خات فاتێ با نازێ نەنێرێتە کلفەتی.

وەگریان دەکەوم، زۆرم زگ بە خۆم دەسووتێ. هەر هەنیسکان دەدەم، حاجی محەممەدی سەحێب ماڵمان بەوێدا تێدەپەڕێ.

: «کوڕە ئەوە چ دەکەی لێرە؟ بزانم ئەوە بۆ وا دەگری؟ کێ لێی‌داوی؟ دا بڵێ بە من کێ وێراویە ئەزییەتت بکا؟»

دەستم لەنێو دەستی پیاوانە و ئاسینگەرانەی خۆی دەگرێ، وەڕێ دەکەوین کە سەرم هەڵێنا و چاوم لە چاوی کرد. دوو تنۆک فرمێسکم لە گۆشەی چاوی پاڵەوان دا دیت کە قەتیس مابوو. دیار بوو ونبوونی کەریم زۆری ئازار دەدا.

***

# ٢٤

...... سۆفی گوتی: «بە قوربانت بم ئاغای دوکتور، ئەتۆشم تووشی زەحمەت کردووە. دەبا ئیزنت دابام. پەنایەک، قوژبنێکم هەر وەگیر دەکەوت. تا سبەی لێی وەردەکەوتم. ئێمەی هەژار و ڕووت و ڕەجاڵ بەو شتانە ڕاهاتووین، زۆر جاران ناچار بووین لەسەر دار بێ، بەرد بێ، دڕک و داڵ و پەین و پاڵیش بێ بۆی بنووین. بڕوام پێ بکە جێگەی خۆش و نەرمان ناهێڵێ خەو لە چاومان نزێک بێتەوە، لەوانەیە وڵاتیشت لێ پیس کەم.»

دوکتور بە فارسی دەڵێ: « عمو دیگە بعد از این کردی حرف می‌زنم ولی اگە کردیم عیب و ایرادی داشت، بهم نخندی.» ئەوە بەشێک لە کایەی دوکتور بوو لەگەڵ سۆفی‌حەسەن.

سۆفی حەسەن هەروا درێژەی بە کایەکەی خۆی دا و گوتی: «زۆر باشە بە قوربانت بم وەڵا ئەمن لە کوردی بەدەر بە ناشکوری نەبێ هیچ زمانێکی تر نازانم. بە سەرچاوان ئەوەی لە دەستم بێ لە تۆی درێخ ناکەم. هەرچەند زۆربەی لاوەکانی دێهاتی کە دەیانبردنە ئیجباری لەوێ فێری زمانی فارسی یان ترکی دەبوون. بەڵام من خۆم هەر بە دەستەوە نەدا، ماوەیەک خۆم قاچاغ کرد، پەڕیوەی ئەو دیوی بووم. لە پاشان لە شاخ و کێوان بە شوانی و گاوانی رامبوارد، هەتاکوو حەلیمم هێنا. ئینجا بوومە مجێوری مزگەوت و هەرجۆرێکی بوو وازیان لێ هێنام.»

هەڵبەت سۆفی حەسەن لە هەموو جێیەکی بۆ پێشینەی خۆی ئەو قسانەی دەگوت لەڕاستی‌دا سۆفی حەسەن هەر خەڵکی سووره چۆمێ نەبوو. بەر لەوەی حەلیمێ بێنێ، چەند جارێک ڕاگوزاری بە سووره چۆمێ‌دا تێپەریبوو.

ئەوە کە چۆن گیرساوە و چۆن حەلیمی خواست و چۆن بوو بە مجێوری مزگەوت لە کەس ئاشکرانەبوو. ئەو جۆرەی دەڵێن گوایا ڕۆژێک لەو ڕۆژانەی دەبینی چارەی کەسێک دەنووسرێ ئەویش کە بە پەنای سوورە چۆمیدا تێدەپەڕێ تووشی هەمزاغا دەبێ. هەمزاغا لێی‌دەپرسێ  کێ و چ کارەیە؟ ئەویش هەر لە خۆڕا بۆ ئەوەی تەنیا وڵامێکی دابێتەوە دەڵێ، لە دێی سێلمێ مجێوری مزگەوت بووم، فەقێیەک پێش‌نوێژی دەکرد هەرچی بڵێی هەیبوو دین و ئیمان نەبێ، قسەمان لێک هەڵبەزیەوە، لە داخان هەڵوەدا بووم. بەنیازم روو بکەمە ئەودیو. هەمزاغا پێی دەڵێ مزگەوتی سوورەچۆمێ، مجێوری نییە، وەرە ببە بە مجێوری. سۆفی حەسەن کە بە نیاز بوو ماوەیەکی کورت لەو ناوە بمێنێتەوە. بۆ هەمیشە گیرساوە. دوکتور گوتی: «هیچ پێم خۆش نەبوو لە مەتەبەکەم(عەیادە) بە زمانی کوردی بتدوێنم، پێم خۆش بوو لەگەڵ خۆمت بێنمەوە ماڵ تا تێر و پڕت قسە لەگەڵ بکەم. من ئێوارێ گوێم لێبوو باسی سوورەچۆمت کرد چونکە ماوەی دوو ساڵان لەو دەوروبەرانە خولاومەوە. خەڵکی ئەو ناوچەیە چونکە فارسییان نەدەزانی بە ناچار ئەوەندەم بە کوردییەکی سەقەت قسە کرد تا باش باش فێری بووم، بڕوا بکە دوکتورەکانی تر وەک دیلمانج منیان بانگ دەکرد قسەی نەخۆشەکانیان بۆ وەرگێڕم. هەر ئەودەم هەرکەس دەیدیتم بڕوای نەدەکرد کورد نەبم. حازر بوون دەست بە قورئان دادەن کەمن حەوت پشتم کورد بووە.»

سۆفی حەسەن چی نەمابوو دە خەیاڵیدا لە کۆشک و سەرسەرای ماڵە دوکتور دا ون بێ. لە دڵی خۆیدا دەیگوت: «خودایا گیان بە قوربانت بم هەموو کارەکانت جوانن، ئەمن و ئەو کۆشکە، لەوە دەترسام قوژبنی ماڵێکیشم وەچەنگ نەکەوێ، خودایە کەس لە حیکمەتی تۆ ناگا. داخودا ئێستا حەلیم چەندەم بۆ پەرۆشە، لەوانەیە لەبەر خۆیەوە وا بیر بکاتەوە کە ئەوە لە قەراغ شەقامێکی قەرەباڵغ بە زاری تینوو و زگی برسی غەریب و داماو کەوتوومەوە و لە خودا بەدەر کەسێک ئاوڕم لێناداتەوە، چووزانێ ڕێم کەوتۆتە کۆشک و سەرسەرایەک کە هەر مەپرسە و لە جێگایەکی خۆش و

نەرمان ئەوە خەریکم لە گەڵ دوکتورێک، لەگەڵ فریشتەیەک قسان دەکەم کە خودا بۆی ناردوومە سەر عەرزی، هەتا هەست بە نامۆیی و غەریبی و تەنیایی نەکەم. خودا بۆ خۆی، پێشتر بۆ ئەو ڕۆی من فێرە زمانی کوردی کردووە، دەجا خودایە هەزاران جار شوکرت دەکەم، تۆ هەمیشە لەگەڵم بووی.

: « سۆفی حەسەن ئەوە بۆوا لە فیکر دای؟»

: « ئەگەر ڕاستت دەوێ، هەست دەکەم خەون دەبینم. هەموو لە دێی بەمنیان دەگوت سۆفی حەسەن، تاران، دەریایە، دەتخنکێنێ، تاران جەنگەڵە ونت دەکا. تاران بێ سەر وبنە، بێ سەروبنت دەکا. دەیانگوت کەسێکی شارەزا لەگەڵ خۆت بەرە دەنا ون دەبی، هەتا بێی و خۆت ببینیەوە چەند ڕۆژان دەخایەنێ.»

پێم دەگوتن: « وا بزانن ئەمن کوێریکم، دەی لەو دنیا پان و بەرینەدا ئەو هەموو کوێرە هەیە. هەمووشیان دەگەنە ئامانجیان. دەی جا منیش کوێرێک لەو کوێرانە، بڵێی چاو ساغێکی خێرخوا پەیدا نەبێ کە لە ڕێی خودا دا دەستم بگرێ و لە ماشێنێکم باوێ و بمباتە بەر درگای دوکتور؟ ئێستا کە لێرە لە خزمەت تۆدا ڕاوەستاوم و خەریکم دووعات بۆ دەکەم. زگم بەو کەسانە دەسووتێ کە هێشتا نەیانزانیوە ڕەحم و کەرەمی خودا چەند زۆرە. چەند دوورن لە موعجیزە و تەوەکول بە خودا.»

دوکتور دەڵێ: « سۆفی حەسەن لەو قسانە واز بێنە. ڕامسپاردووە کە لە دەرێ ڕا نان و پێخۆرمان بۆ بێنن. تا دەگاتێ، برۆ لەو حەمامەی، ئاوێکی بەخۆت دابکە با هێندێک سووک بیەوە. جلوبەرگی تازە و لەبەر نەکراوم هەیە، ئەوانیش لەبەرکە با تەواوی بێیەوە سەر حاڵ. زۆرم کار پێتە. زۆر تامەزرۆی خەبەر و باسی لای خۆتانم و لەوانەیە نەهێڵم ئەمشەو بنووی.»

چی وای نەمابوو کە سۆفی حەسەن سنووری نێوان خەون و ڕاستەقینەی لێ تێک چێ چونکە بە درێژایی ژیانی خەونی وەهاخۆشی نەدیبوو. ئەو دەمی کە لاو بوو بۆ ماوەیەکی کورت خەونێکی وەها خۆشی....

زانی کە ئەوەی بەچاو دەیبینێ خەون نییە و ڕاستەقینەیە، بەڵام ڕاستەقینەیەکی دوور لە واقیع، ڕاستەقینەیەک کە بەپێی ئاڵوگۆڕێکی نادیار، ڕوخساری واقیعی گۆڕاوە و بۆتە خەونێکی خۆش. لە واقیعدا سۆفی حەسەن خەریک بوو خەونێکی خۆشی دەدیت، خەونێک کە دەیتوانی وەک درۆیەکی گەورە و خۆش لە هەموو شوێنێک دا بۆ هەر کەسێکی کە بیهەوێ وەسەر سووڕمانی بخا بگێڕێتەوە، دەریایەکیش پۆز و ئیفادە لێبدا.

حەمام وەها سۆفی حەسەنی گەشاندەوە کە هەستی دەکرد بەو پشتە کۆمەیەوە دەتوانێ سەرچۆپی کێشی گەڕی ڕەشبەڵەکێک بێ. چێشتێکی بەتام و خۆش و پیپسیەک بە دوای دا و چەند قرپێکی لە نەکاوی سۆفی حەسەن لەوانە بوو لەشک و گومانی باوێ کە بەخۆڕایی هەست دەکا ناساغە، نەیدەزانی ناوی ئەم رووداوە بنێ چی؟ بەر لە هاتن لە چ خەمێک دابوو و ئێستا لە چ خۆشییەک دا بە خۆی دەگوت: « کوڕە سۆفی حەسەن ئەگەر بۆخۆت کوڕێکی دوکتور یان برایەکی دوکتورت لە تاران هەبایە بەم جۆرە بۆت نەدەگوزەرا. ئەم دوکتۆرە بێ و نەبێ فریشتەیەکە کە خودا بۆ منی ناردووە.

هەرچی زۆرتری بیر لێدەکردەوە زۆرتر سەری سوڕ دەما. لە سوورە چۆمێ چەند بە هەناسە ساردی و بێکەسی و ژان و ئێش وئۆف بەرەو تاران وەڕێکەوتبوو. تاران دەڵێی دەریایەکە بێ سەر و شوێنت دەکا، دەڵێن هەر خانووبەرەیەک کڵاوەکەت لەسەرت دەڕفێنێ. دەڵێن دەست بە هەموو جێگەیەکت نەگری، هەموو جێگەیەکت لێ دەدزن. دەڵێن لەوێیە کە باب ناتوانێ ئاگای لە کوڕەکەی بێ. دەڵێن لەوێیە هیچ کەس ڕوحم بە هیچ کەس ناکات، دەڵێن هەر لەوێ بۆ چەند تمەن پووڵ سەری پیاوی دەبڕن. بەڵام سۆفی حەسەن کە دەهاتە سەر حیساب و کتێبان دەیدیت کە هەمووی بوختان و درۆیە. بۆ ئەوەی پێ نەنێتە تارانێ، بۆ ئەوەی چاو و گوێی هیچ کەسێک لە ناوچەی ئەوان نەکرێتەوە. دەنا ئەوە نییە خۆی بۆتە میوانی دوکتورێک کە ئێوارەکەی مونشیەکەی بە پاڕانەوەش ئیزنی نەدەدا دوکتور چاوی پێی بکەوێ.

سۆفی حەسەن سەری هەڵێناوە و کوتی: « خودایە ئەوەی تۆی لە بیر نەبێ جێگەی سەرکلێ جەحەندەمە.»

سۆفی کە ئێستا خۆی لە بەهەشتی خودا دا دەدیت وای بە خۆی سەلماند. کە ئەو خزمەتەی تا ئەورۆ لە مزگەوتێ واتا لە ماڵە خودای کردوویەتی دەبێ ئەوەندەش شاباشی هەبێ دەنا بە خۆی با ڕەنگە بیگوتبایە: « بە ناشکوری ناڵێم، بەڵام چ سامان و داهاتێکم نەبوو کە خێروخێراتی لەسەر بکەم.

لە پڕ وەبیری هاتەوە و کوتێ: « بڵێی خودا چاکەی ئەوێ ڕۆژەی من نەبێ کە دەمداتەوە. ئەودەم کە گیانی خۆم لە مەترسی هاویشت. بە خودای ئەو سەیانە بیانزانیبایە ئەوە من بووم کە ژاندرمەکانم خەبەر کردوون بێ یەک و دوو لەت و پەتیان دەکردم خۆ بە تەواوی شێت و هار ببوون. کەسێ باشاری نەدەکردن. چییان لە کوێخا برایم و کوڕەکەی کرد هەر ئەوەندەی چووبوون کاوەیسی لە ژێر دەستیان دەرێنن. خودا پێی کردم ئەگینا کەی دەموێرا ئەو کارە بکەم.»

هەڵبەت بەڕای من سۆفی حەسەن دەیهەوێ بە چەشنێکی ئەو چاکەی دوکتور دەگەڵی دەکا بە شتێکی ڕابردووی خۆیەوە گرێ بدا. دەنا من بڕوام وایە ئەو جۆرەی سۆفی حەسەنی دەناسم، ئەگەر لەت و پەتیشیان کردبایە ئەم کارەی هەر دەکرد ئیتر ئەوەی بۆ خۆی بۆچێ نایسەلمێنێ کە لە کەسایەتی ئەوەوە ئەم چەشنە کارانە دەوەشێتەوە، ڕەنگە هۆیەکی تری هەبێ.

: «ئێوارەیەکی درەنگ وەخت بوو کە لە مەزرا دەگەڕامەوە، حەلیم پارچە زەوییەکی بچووکی بەشە ماڵی بابی پێبڕابوو. دەتگوت پێی دەڵێن. بە پێچەوانەی هەمیشە ڕێگای گەڕانەوەی خۆی ناخۆش و دوورتر کردەوە. ڕووی دە کانێ کەوان کرد. لەوانەیە دەدڵی خۆشی‌دا وای دانابێ کە:« دەچم لەوێ دەستنوێژێ هەڵدەگرم و نوێژەکەم دەبەمەوە مزگەوت جارێ مامۆستا هەر لە مزگەوتییە.

دوور و نێزیکی کانی بوو دیتی کە سێ کوڕە گەورەکەی کاک وسێنی جیرانیان، کەوتوونە گیانی کاوەیسی کوڕی خات زڵەخایە و دوو کوڕی

دیکەی کاک وسێن کەوتبوونە گیانی کوێخا برایم و کوڕە شەلەکەی. سۆفی حەسەن کە زانی بۆ خۆی چی دەگەڵیان پێ ناکرێ. بە هەڵاتن هەر جۆرێک بوو خۆی گەیاندە پاسگا و داوای یارمەتی لێکردن. ژاندرمەکان دوای ئەوە کە بەڵێنیان دا بە سۆفی حەسەن کە هەرگیز ناوی سۆفی لە هیچ جێگەیەک نەهێنن. بە پەلە خۆیان گەیاندە سەرکانی کەوان. ئەو کوڕانەی کا وسێنی ئەوەندە دڕو شێت و شووربوون کە زۆر جاران ئاغاش خۆی لە قەرەیان نەدەدا. ژاندرمەکان توانیان بە نێوە گیانی کاوەیس لە ژێر دەستی کوڕەکانی کاوسێن دەرکێشن. دوو کوڕە گەورەکەی کاوسێنیان قۆڵبەست کرد و دەگەڵ خۆیان بردیاننە پاسگایە. کاوەیس و کوێخا برایم و کوڕەکەیشیان بەرێ کردە نەخۆشخانەی سەردەشتێ. کاوەیس کە لە مەترسی مردن‌دا بوو ڕایان نەگرت بەڕێ کرا. هیچ کەس لە دوای ئەوێ ڕۆژێ، تازە چاوی بە چاوی کاوەیس نەکەوتەوە. یەک دەیگوت مردووە. یەکیان دەیگوت نا نەمردووە، زیندوویە ئەویتریان دەیگوت: « دیتوویانە کە لە بەندرێ خەریکی کەسب و کارە و زۆریش وەزعی باشە. یەکێ تر دەیگوت ناوەڵڵا کاوەیس بۆتە چەتە، هەر بینا بەم زووانە بە تفەنگەوە هاتە سەر ماڵە کاوسێنی و تاقیان لێ نەهێڵێ.»

ئی واش هەبوون دەیانگوت: « بەو گۆپالانەی لەتەپڵی سەری کاوەیسیان داوە مێشکی شڵەقاوە و بە تەواوی شێت بووە ئێستا لە شێتخانەی ورمێ ڕایانگرتووە، ئەگەر لە سۆفی حەسەنت پرسیبا، پێی وابوو ئەوێ ڕۆژێ کارێکی باشی کردووە کە ژاندرمی خەبەردار کردووە و خوداش لە پاداشتی چاکەی ئەوێ ڕۆژێ، ئێستا بە ناردنی لای ئەم دوکتورە دڵسۆزە ئینسانە ئەوە بۆی قەرەبوو دەکاتەوە.

لەو دەمەدا دوکتور بە کەشەفێک چا وەژوور کەوت. سۆفی حەسەن هەر لەبەرچاوی دوکتور دەستی هەڵێنا و کوتی: «خودایا هەزاران هەزار جار شوکرت دەکەم. هەر تۆی عەلیم و خەبیر.»

***

## ٢٥

..... کەهاتی نەمدیت شتێکت بە دەستەوە بێ. ئەی ئەوەی کە چلۆنت ئاگر تێبەردام، ئێستاش هەر نەمزانیوە. من دەڵێم ئاگر، بەڵام نە ئەو ئاگرە بێکەلکەی کە تەنیا و تەنیا دەتوانێ بسووتێنێ و لە ناو بەرێ و لە ناو بچێ. نا، نا، ئەو ئاگرە، ئاگرێ نەبوو بۆ لەناو بردنم، ئاگری بووژانەوە بوو، ئاگری ئیبراهیم بوو، بۆ زیندوو کردنەوەم. زیندوو کردنەوەی من کە دەیان جار مەرگم لەبەر کردبوو، دەیان جار مردن ژیابووم، سەدان جار لەنێو دەریای بێکەسی و تەنیاییدا خنکابووم، زیندوو کردنەوەی من کەتا ئەوێ ڕۆژێ هەرگیز دەستی سوور و گەرمی هیچ خۆشەویستێک، دەستی لەرزۆک و زەردی منی نەگرتبوو و چاوی هیچ هەست و عاتیفە و ئیحساسێک، هەستی بەبوونم نەکردبوو و هیچ خەیاڵێکی سێحراوی، درگای دڵی کرچ و کاڵمی نەکوتابوو. تۆ بڵێ، کە تۆ! لە کامە سەبیارەوە هاتووی کە مەسیح ودمی گیان بەخشیی دەمی لەتۆ ئەستاند و ئەییووب مەشقی سەبری لێ وەرگرتی و منیش چلۆن هەستان و ڕابوونت لێ فێر بووم.

کە هەستامەوە، دیتم وەک هەر کەسێکی تر دەچم بە دەر لە خۆم، بۆ هەوەڵ جار بوو نامۆییم لە خۆم دەکرد. خۆم بۆ نەدەچۆوە سەر یەک، دەنگم، ڕەنگم، فیکر و هەست و عاتیفەم، تووشی ئاڵ و گۆڕێکی سەیر ببوو. دەتگوت بەپێی پیلانێکی نهێنی، بەدەستی ئیعجازێکی مەسخەرە، تەواوی ڕەگ و ڕیشە و گۆشت و ئێسک و هەست و هەناسە و هەناو و شعور و عاتیفەیان لە قالب و چوارچێوی وجوودم دەکێشاوە و دەپێست و قاڵبی بە تاڵی دیکەیان ناوە و بە ناوی من لە جیاتی من وەکایەیان خستووە.

باوەلەیەکی[٤٨] سەوداسەری سەرگەردان، باوەلەیەکی سووک و پووکی بێ پەیام و بێ مەبەست، گێژ و خۆلی دەستی هەر سووکەڵە بایەک، باوەلەیەکی بێ

---

٤٨- باوەلە/ باوەلێ: لە موکریان بە سەید دەڵێن باوەڵێ. مامۆستا ئاوات دەڵێ((.... مەسەلەی کۆنە، دەڵێن باوەلێ باوێکی بەسە)).

شوێن و بێ مەکان و بێ قەرار. کۆچەری لە هیچ کوێوە بەرەو هیچ کوێ، توێشە بەرەی ڕێگای، هەناسەی سڕوساردی. ئاخی پڕ حەسرەت و دەردی، ڕوخساری پڕ تۆز و گەردی بە ڕەنگی دۆڕاوی لیمۆیی. کە هاتی هەر ئەو دەمەی کە من سەفەری بووم، لە کاتێکی بێ کاتدا. تۆم، تۆم کە ناسییەوە، هەروەک هەمیشە نە ڕووحی هەزار ڕەنگی بەهار کە خۆی بووی، پڕاپڕ لە ڕەمزی بوون و هەڵچوون، لیپاولیپ لە پەلە و تاڵووکەی گووران و سەرهەڵدان، لێوڕێژ لە ڕووح و هەستی هەڵکشان، لە توانای ویستن بۆ سازدان و چێکردن. تۆم کە دیت گڕکانێکی وێکهاتوو و تێک پەستێوراوی، یەخسیری دەستی ڕووحێکی نائارام و سەرکێش بووی. نا ئارامێکی هەروەک شەمس، تەنیا مەولانا جەلالەدین محەممەدی بەلخی دەزانێ من دەبوو چیم بەسەر بێ. دیار بوو تۆ لە مێژ ساڵ بوو لە من دەگەڕای لە پووش و پەڵاشی زەرد هەڵگەڕاوی من کە دەمێ بوو چاوەڕوان مابوو، تەنیا بۆ ئیشارەی کۆیرە بڵیسەیەک، نا ئیتر خۆم نەناسمەوە. تۆ لەمێژ بوو لەمن دەگەڕای کە چیم بەسەر بێنی. مەگەر چی مابوو کە بە سەرم نەهێنێ؟

کایەمان دەکرد تۆ بوویە هەڵۆ و منیش نێچیرت، کە بەرزت دەکردمەوە، بۆ سەر بۆ سەرتر و سەرتر، ئەودەم سەرمەست لەوەی هاوسەفەرتم، نەمدەزانی کە نەتدەویست تەشقی ئاسمانم پیشان بدەی، کەدەتهەویست لە تەشقی ئاسمانەوە داکەوتن و پەلەقاژەم بۆ دانەکەوتم بکەیە مایەی سەرخۆشی و خۆش ڕابواردنت. بەڵام ئازیزەکەی هەمیشە ئازیزم! لەبیر نەکەی تا ئیمڕۆ هیچ ڕاوچییەک نەیتوانیوە بە گوللەی تفەنگ کەوێ کەوی بکا. بەداخەوە کەوی ئەکا، نازێ گیان ئیزنم بدە ئەم بەشە هەروا بە ناتەواوی بهێڵمەوە. ڕەنگە ڕۆژێک و ڕۆژێکی تر هەڵکەوێ کە بمهەوێ تەواوی کەم، هەرچەندە تا ئێرە زۆر منی سووک کردووە. بەڵام پێی دەڵێم «تۆ هەر جۆرێ کە پێت خۆشە هەر وابە».

***

# ٢٦

..... فاتێ هەرگیز نەیزانی هۆی دوورە پەرێزی کاوەیس چییە؟ ئەو جۆرەی کە جاران پەپوولەیەک بوو کە دایم و دەرهەم بە ڕۆژ و بە شەو لە دەوری شەمی باڵای هەڵکشاوی‌دا، دەخولاوە نەبوو، ئێستا ماوەیەک بوو کە تەنیا لە دوورەوە یان لە پەنا و پەسیوان چاوی حەسرەتباری تێدەبڕی. فاتێ لە ترس زەبروزەنگی براکانی نەیدەوێرا وەک جاران – جاران ئەگەر بە دەگمەن توانیبای بە  پێنج شەش مانگ بە قەرا دوو سێ ڕستەی کورت دەگەڵی ڕاوەستێ- دەگەڵی ڕاوەستێ و قسەی دەگەڵ بکا. فاتێ کە کاوەیسی بەم جۆرە دیت، وەک هەر کچێکی تر هەوەڵ بیری بۆ ئەوەچوو کە ڕەنگە کچێکی تر لە گۆڕێ دابێ. کاوەیس ئەوەندە جوان و لەبەر چاوان بوو کە فاتێ بخاتە وەها گومانێکەوە. بەڵام بە پێچەوانەی ڕەفتار و ئاکاری مرۆڤ لە وەها کاتێکدا کە هەوڵ دەدەن خۆ بە کەم بزانن تا ئازار بکێشن و بەم هەستە زوڵم لێکراوییە کە لە دەروونی خۆیان دا سازی دەکەن، سەرقاڵ دەبن و ئەو سووچ و تاوانە لە ملی خۆیان دادەڕنن و بە تاوانبارکردنی کەسێکی‌تر پاکانە بۆ خۆیان دەکەن، وای نەکرد، تەنیا ئەوەندەی لەبەر خۆیەوە گوت: «بێ و نەبێ لە بن سەری ئامینە شەل دایە و ئەو هەمزاغا کوێرە مەلعوونە کە ناشتۆپێ، عالەم لە چنگی بحەسێنەوە، ئەوەشی هەر لە پاش قسەکانی پێشووی بە خۆی گوت: «قەیدێ ناکا، ئاخری وەخۆ دێتەوە. دەزانم دڵی هەر لە لامە.»

زۆری خایاند ئامینە شەل توانیبووی کاوەیسی دڵنیا بکا لەوەی کە هەمزاغا فاتێی بۆ خوشکەزایەکی خۆی کە لە دەرەوەی وڵات خەریکی خوێندنی دەرسی دوکتورییە لەبەرچاو گرتووە. ئەوەشی بە کاوەیسی سەلماندبوو کە دیارە فاتێش وەک هەر کچێکی تر ئەوەندەی عەقل هەیە کە

لە خودای بویێ. ریخ و پەین وپاڵ بەجێ بهێڵێ و بڕواتە شاری فریشتان. ئەوە بوو کە کاوەیس وردە وردە خەریکی دەورەکردنی دەرسی لەبیرکردنی فاتێ بوو.

: « کوڕە کاوەیس تۆ بۆ ئەوەندە ساویلکە و سادە و گێژی، بڕوام پێبکە گاڵتەت پێدەکا. بۆ خۆت باش دەزانی کە من هەمیشە پێیەکم لە ماڵیانە. بەم گوێیانەی خۆم لێم بیستووە کە گوتی: «جا من و کوڕی خات زڵەخایان کوتووە؟»

نەمدەویست ڕاستییەکەت پێی بڵێم دەنا ئەگەر لە دڵت گران نەیە ئەوە قسەکەی بوو.

: « جا من و کوڕی زڵەخا دڵتۆقیویان کوتووە؟ بە خودای براکانم بزانن هەر ئاوڕێکم لێداوەتەوە کەوڵم دەکەن و کای تێداخنن.»

کاوەیس هەرگیز باوەڕی بە قسەکانی ئامینە شەل نەدەکرد، نیشانەیەکی خۆشەویستی هاوبەشیان هەبوو. فاتێ لەمێژ بوو بە کاوەیسی گوتبوو بە دزی براکانی، خەریکە سەرکڵاوەیەکی مەرەزی بۆ دەچنێ. نیشانەیەکی بەرچاویان لەکانێ کەوان کە ژوانگەی جاروباریان بوو هەڵبژاردبوو، بڕیار وابوو کە فاتێ ئەو نیشانەیەی وەک ڕازی نهێنی خۆشەویستان وەک نەخشێک لە سەرکڵاوەکەی دا بچنێ، تەنیا فاتێ و کاوەیس دەیانزانی ئەو نەقشە چییە؟

کەس نەیزانی ئامینە شەل کەی و چلۆن پەی بەو ڕازەی ئەوان بردبوو، ئاخر کاتێ فاتێ بە ئەوین و خۆشییەوە سەرکڵاوەکەی دەچنی و لە بن لێوی نارە ناری دەهات هەستی بە شتێک کردبوو. یان چون ئاگاداری ئەوینی ئەو دوو لاوە بوو گومانی بردبوو کە فاتێ ئەو سەرکڵاوەی بۆ کاوەیس دەچنێ. یان چۆن نەخشەکە زۆر بەرچاو و زەق بوو بە پێچەوانەی تەواوی ئەو سەرکڵاوانە بوو کە ژنانی دێ دەیانچنی، یان تەنیا ئیلهامێکی شەیتانی بوو.

ئەو ڕۆژەی کە کاوەیس سەر کڵاوەکەی خۆی بە نەخش و نیشانەکەی ناسییەوە کە بە دەس ئامینە شەلەوە بوو، بۆ ماوەیەک کش و مات بوو. کە

وەخۆ هاتەوە گوتی: «پوورئامین -هەروای  بانگ دەکرد لە زمانی فاتێوە کەوای بانگ دەکرد فێر ببوو – ئەو سەرکڵاوە بۆ بە دەست تۆیە؟؟»

: « کاوەیس ئەو سەرکڵاوەی دەڵێی؟ - بە جۆرێکی ڕوو بە کاوەیس ڕاگرتبوو کە نەخشی ئەوەینەکەیان بە عەیانی ببینێ – ئەوە دیاری فاتێیە بۆ ماڵە هەمزاغای دەبەم وەک نیشانەی ڕازی بوونی فاتێیە، دەیهەوێ بۆ خوشکەزایەکەی بنێرێ. خودا هەڵناگرێ ئەم دیارییەی فاتێ ناردوویەتی لە بەرانبەر ئەم هەموو دیارییانەی بۆ ماڵە فاتێ چووە، هەر هیچ نییە. تۆ وەرە هەر بەقام پێ مەکە، مەگین چەند وەختە ئەمن چت پێدەڵێم؟ هەر خۆت ببە بە قازی هەتا دوکتورێک، ئەویش خوشکەزایەکی هەمزاغا بێ داوای فاتێ بکا، بۆ شێت بووە لەبەر تۆ وازی لێی بێنێ؟ بابم بە خوای باوەڕم پێ بکەی یا نەکەی فاتێ گاڵتەت پێدەکا. لە خۆڕا خۆت یەخسیر کردووە.»

لە سوورەچۆم، نە تەنیا کاوەیس بەڵکوو هیچ عەبدێکی خودا نەبوو کە ددانی خێر بە ئامینە شەلدا بێنێ. خودا بەندەی وەها خەراپی تاکوو ئەوێ ڕۆژێ  ساز نەکردبوو. دوایەکەشی نازانم، ڕەنگە هەشتا لە سەدی کێشەکانی نێودێ، لە کێشەی مەلا و مجێوری ڕا بگرە هەتا شەڕی ژن و مێردان، شەڕی ژنان لەگەڵ یەک، شەڕی خوشک لەگەڵ خوشک و شەڕی دوو منداڵ لەگەڵ یەک ئەگەر بە ڕواڵەت لەسەر چەند دەنک مازووش  با، بێشک دەستی ئامینە شەلی تێدابوو. کە شەر و کێشەیەک ساز دەبوو دەتگوت ڕۆن سەگی دەقالبی هەڵدەسوون. کاری شەو و ڕۆژانی هێنان و بردنی قسە و قسەڵۆک بوو. ئەڵبەت هەمیشە کە یەکی گوێ لێدەبوو دەیکردە هەزار و داروبەرد نەبێ هەرچی جووڵاباوە قسەکانی بە گوێیاندا دەکرد.

من لێرە سوێند دەخۆم، بوختان بە ئامینە شەلێ ناکەم، ئەگەر درۆم کردبێ با خودا لاقە ڕاستەکەی منیش هەروەک لاقە ڕاستەکەی ئامینە شەلێ خێچ و خوار بکا. هیچ دوور نییە ڕۆژێک کەسێک پەیدا ببێ و لە دوای ئەوەی ئەم ڕۆمانەمی خوێندەوە، بێت و وەباڵم بۆ بکێشێ کە ئەوەی ئەمن باسم کردووە هەمووی ڕاستە. ئامین لەوێ ڕۆژێ ڕا، هەڵبەت وا نییە. نا لەوێ ڕۆژێ ڕا نا، هەر لە پێش ئەوێ ڕۆژێش دەستی کردبوو بە

چەواشەکاری. بەڵام کە ئەسەدی مێردی لاقی شکاند و لە دەستی هەڵات. ئامین ئەگەر لە خەراپەکاری‌دا دیپلۆمی هەبووبێ ئەودەم یەک جێ دووکتورای وەرگرت. ئەو دوو منداڵە هەناسە ساردەی خۆی لەدایک بێ بەش کرد و کەوتە گیانی عالەمێ.

ئەودەمیش ئەگەر سەرکڵاوەکە بە دەست ئامینە شەلەوە نەبوایە، لەوانە بوو کاوەیس نەختێک لۆکەی لەدوو کونە گوێچکەی خۆی نابایە و هەرگیز گوێی شل نەکردبایە بۆ ئەو چیرۆکەی ئامینە شەل هەڵیبەست.

بەڵام ئەم سەرکڵاوە لێرەدا دەورێکی یەکجار گرینگی گێڕا. ئەمە چەشنێک ڕاستییە، کە مرۆڤ دەبێ بسەلمێنێ، زۆر جاران، شتێک، شتێکی بی بایەخ، شتێکی بەکار نەهاتووی لەخۆڕایی. بە مەرجێکی دوو کەس بایەخ و ئەرزشێکی باڵای بدەنێ بە ڕاستی بایخدار و بە نرخ و بەها دەبن. ئەم سەرکڵاوەی باسی دەکەین. تەنیا بە هۆی ئەوەی کە نەخشێکی لە خۆشەویستی و ئەوینی دوو کەسی تێدایە واتا شاهید و گوایە لە ئەوین و خۆشەویستی لە ڕادەبەدەری نێوان دوو کەس، دەتوانێ بۆ ئەو دوو کەسە، لە هەرچی سەرکڵاوەی تری دنیایە تەنانەت ئەگەر بە هەودای زێڕیش چندرابن بەنرخ‌تربێ. چون لە چوارچێوەی کڵاوبوون تێدەپەڕێ دەبێتە بەڵگەیەک، بەڵگەیەکی مێژوویی لە مێژووی ژیانی دوو کەس‌دا کە بڕیارێکی تایبەتیان لەنێو خۆدا بڕیوەتەوە. کەم نەبوون لەم بەڵگانە کە توانیویانە تراژدیا و حەماسە و شەڕ و کێشەی گەورە بخوڵقێنن. دەسماڵەکەی دێزدێمۆنا مان لەبیر نەچێ لە شاکارەکەی شێکسپێر واتا ئۆتێللۆدا کە بوو بە هۆی مەرگی دێزدێمۆنا. یان لینگە کەوشەکەی سیندرێللا کە چەندی کارەسات لێ کەوتەوە، یان هەر ئەو ئەسباب و ئامرازە کە ڕۆژانە مایکێل جاکسۆن دەکاری دەکردن، چۆن لە هەراجە بازاڕدا دەبنە بەشێک لە کەسایەتی و هوویەتی مایکێل جاکسۆن و بە چەندە پارەی زۆر دەیکڕن و دەیفرۆشنەوە. ئەم سەرکڵاوە کە نەخشی خۆشەویستی کاوەیس و فاتێی تێدا چندرابوو و بڕیار وابوو بەزوویی‌زوو فاتێ پێشکەشی خۆشەویستەکەی بکا،

نەیهێشت ئەم نەختە لۆکەیە بچێتە نێو گوێیەکانی کاوەیس و گوێ نەداتە قسەکانی ئامینە شەل، ئەوەندەی کە من خەبەردار بم.

فاتێ تا ناوی هەمزاغا و خوشکە زایەکەی دەهات هەر دەیگوت: «هەمزە کوێر و سەگەکەی» من بۆ خۆم وای بۆ دەچم، ئەودەم کە ئامینە شەل باسی هەمزاغا و خوشکەزایەکەی لە لای فاتێ کردووە، دەبێ فاتێ زۆری لێ توورە بووبێ. لەوانەیە هەمزاغاشی تێر جنێو کردبێ. گوتبێتی: « عەیبە پوورە  ئامین چیت لە گیانی من دەوێ؟ ئەو قسانە چییە لە لای من دەیانکەی، من مێردێ ناکەم. بە خودای براکانم ئەو قسانەیان بە گوێی بگاتەوە، گۆشاوگۆش سەرم دەبڕن. لەوانەیە ئاور لەتۆش بەردەن. ئەو کوێرە گولە چی لە گیانی من دەوێ؟ پێی بڵێ بێتوو دەست هەڵنەگرێ، براکانم دەنێرمە زگی»

لەوانەیە ئامینیش لە جوابی دا گوتبێتی: « جا ئەوان چ خەتایەکیان هەیە؟ هەرچی هەیە هەر خەتای خۆتە. دەبا ئەوەندە جوان نەبای. پێت وایە کەسێک لەو ناوچەیەدا ماوە کە بە ئاوری تۆ نەسووتابێ؟ هەر لەو دێیەی خۆمان چاو لێکە، لە پیر و لاو و نەونەمامیش کەس نەماوە کە بۆت نەمێنێ، ڕەنگە تەنیا هەر ئەو هەتیوەی زڵەخا  دڵتۆقیوی بێ کە خۆی لە سەرت دەگرێ. هەڵبەت فاتێ گیان! ئەو قسەیەت لەمن نەبیستووە. دەڵێن لە بنەوە نێوانی دەگەڵ کچی کوێخا برایم ساز کردووە. مەبەستم کەژاڵە، خۆت دەزانی چەندە جوانیشە.»

لەوانەیە فاتێ بە بیستنی ناوی کەژاڵ ڕەنگێکی هێنابێت و هەمان ڕەنگیشی بردبێت.  من دەڵێم:« فاتێ سەرەڕای ئەوە کە دەیزانی و زۆر جارانیش لە زاری هەموو کەسی بیستبوو کە هیچ کەسێک لەوی جوانتر نییە. هەرکە نێوی کەژاڵ هاتە گۆڕێ بۆ ساتێک هەستی کرد زۆر لە کەژاڵ کەمترە و هەر لەو کاتە کەم و ناسکەدا بوو کە ئامینە شەل گوتی.»

: «فاتێ ڕەببی دەست و چاوت خۆش بێ بۆ ئەم کارە جوانەت تۆ بە ڕاستی پەنجە ڕەنگینی، دەکرێ ئەم سەر کڵاوەیەت تا پاشنوێژێ لێ وەرگرم. دەمهەوێ وێنەی لەبەر هەڵگرمەوە و بۆ کوڕەکەم یەک دانەی بچنم.

بۆخۆت دەزانی ئەو هەتیوەی من چ دیمەنێکی ناحەزی هەیە، ئەی بەڵکوو بە سەرکڵاوەیەکی نێوەی سەری ئەو ڕەزاگرانەی لەبەرچاوی خەڵکی بشارمەوە هەر ئێواریَ بۆت دێنمەوە.»

هەڵبەت لەوانەیە ئەو دەم بۆ فاتێش ڕوون و عەیان بووبیَ کە ڕێی تیَ ناچیَ ئەوەی ئامین دەیڵیَ ڕاست بیَ، چونکە عەقڵ نایسەلمێنیَ ئەو سەرە زلەی ڕەسوولی کوڕی ئامینە شەلیَ دە سەر کڵاوەیەکی وەها هونەری و پڕ نەخش و نیگاردا بیَ، گومان لەوەدا نابیَ کە سەری هێندە ڕەزا گرانتر و ناشیرینتری دەکا. من کە بەش بە حاڵی خۆم هیچ ئەو بیانوویەی ئامینە شەل وەک بیانوویەکی مەنتیقی و عەقڵانی لەبەر چاو ناگرم. بەڵام هیچ دوور نییە ئەودەمەی کە باسی کەژاڵ و کەینەوبەینەکەی دەگەڵ کاوەیسی بۆ کردووە، فاتیَ وەهای پیَ هەڵبەزیوەتەوە کەئاگای لە خۆی بڕابیَ، ئەو دەم دەحاڵەتێکی بیَخودی کە بە سەر فاتیَ دا هاتووە، ئامینە شەل سەرکڵاوەکەی هێدی و هێمن لیَ دزیبیَ. تا هاوکات دوو ئامانجان بپێکیَ. دووهەمیان ئەوەیە کە سەر کڵاوەکە وەک دیارییەک و بەڵگەی ڕازیبوونی فاتیَ بۆ مێردکردن بە خوشکەزایەکەی هەمزاغا بەریَ و هەوەڵ ئامانجیش ئەوەیە کە کاوەیسی سووتاو بە ئاگری ئەوینی فاتیَ، تووشی دڕدۆنگی و گومان بکا، وێدەچیَ تا ڕادەیەکی زۆر لەم پیلانەیدا سەرکەوتوو بووە. من خۆم باوەڕم هەیە تەواوی ئەو شێرو ڕێوییانەی ئامینەشەل بۆ کاوەیسی هێناوە دەربارەی ئەوە کە فاتیَ تەنیا وەک گەپچارێک چاوی لێدەکا نەوەک خۆشەویست و ئازیزێک، و زۆرتر فاتیَ چاوی لەسەروەت و سامانی ماڵە ئاغا و خوشکەزایەکەی کە ئەویش بەگزادەیە و خاوەن سامان، بڕیوە. بە قەرا نووکی دەرزییەکی شوێنی لەسەر کاوەیس دانەدەنا بەڵام ئەوەی ڕاست و باوەڕپێکراوتر لە تەواوی درۆکانی ئامینە شەل بوو ئەو سەرکڵاوە بوو کە فاتیَ بۆ ئەوی چنیبوو و پێشانی دابوو و کاوەیس چەند ڕۆژ دواتر لە سەر سەری هەمزاغای دیبوو. جا ئاخۆ ئەو کارەش دەستی بەدکاری ئامینەشەلی پێوە دیاربوویان هەمزاغاش بۆخۆی شەریکێک بوو لەم کارەساتە دیار نییە، ئەوەی دیارە ئەوەیە کە ئەم شتە بەقەرا هەموو جیهان کاوەیسی ئازاردا.

هەر لەو ساتەدا ئەوەی جندۆکە و شەیاتینی دنیایە بوون، هاتنە نێو ڕووح و ڕەوان و خەیاڵ و خەونی کاوەیسەوە و مزڵیان[٤٩] تێداکرد. ئارام و قەرار و خوردو خۆراکی لێ ئەستێندرا. ساڵەکانی دواتر کە لە ماڵە دوکتور دەژیا و لە پێش دا لە ئاوری تۆڵەدا دەسووتا. جارجارە بیرۆکەیەک، پڕیشکێک ئاوی سارد، کوتە سەهۆڵێک، بۆ ماوەیەک بۆ تەنیا مەودای هەناسەکێشانێک، دەیکردەوە بە کەسێکی‌تر و بۆ خۆی لەو کەسەی هەوەڵی پرسیار دەکرد. تۆ بۆ هەرگیز لە فاتێت نەپرسی ئەو سەرکڵاوەی چندراو بە نەخش و نیگاری ئەوینتان لەسەر سەری هەمزاغا چی دەکرد؟ بەڵام دەڕاستی‌دا بۆخۆی نەیدەویست هەرگیز وڵامی ئەم پرسیارەی خۆی بداتەوە...

❊❊❊

٤٩- مزڵ: مەنزڵ. هێلانە- شوێنی حەوانەوە.

## ٢٧

..... سۆفی بە دوکتور دەڵێ:«ماشاڵڵای خودات لەگەڵ بێ ئاغای دوکتور بەخودای ئەمن کە لەوێ دەژیم، ئاوا جوانم لەبیر نەماوە، تۆ کە هەموو خەڵکی سوورە چۆمێ بە ورد و دەرشتەوە دەناسی.»

: «سۆفی حەسەن! پێم گوتی من ماوەی دوو ساڵان، وەڵڵا دوو ساڵ و چەند مانگان لەو ناوچەیە ماومەتەوە. لە هەموو دێهاتەکانی دەوروبەرەوە دەهاتنە لام. زۆرجاران بۆ وەڕەز نەبوون و خۆخافلاندن پرسیارم لێکردن، پرسیاری سەیر سەیر، جاری وابوو نەدیو و نەناسیو لە خۆڕا بە کابرایەکی کە تازە نێوەکەییم پرسیبوو دەمکوت دەی مام ڕەسوو! بڵێ بزانم ئاخری لەگەڵ کارەکەتان چیتان کردەوە؟ بەبێ ئەوەی بزانێ ئەمن ئاگاداری شتێک هەم یاخۆ نا. دەستی پێدەکرد:

: «بە خودای ئاغای دوکتور جا چت بۆ بگێڕمەوە. کەس نەماوە نەینێرینە لایان، بەڵام هەروا لە شەڕن. حازر نین مەسڵەتێ بکەن، ماوەیەک لەمەوپێش مەلای مزگەوتی بناویلەمان بۆ ناوبژی ناردە لایان، هەرچەندە پیاوێکی پیری بە ساڵاچووی زۆر بەڕێز و حورمەتە. هێندەی نەمابوو بیکوژن. جا بڵێم چی؟ ئەوە جارێ. چاومان لە ڕوحمی خودایە.» بەم جۆرە سۆفی حەسەن! هەموو کەسم وەقسە دەخست، وردە وردەش دەمناسین. بۆ وێنە دەمزانی کە کوڕی کوێخای شەڵماشێ لە پارستان ژنی خواستووە. هەرچەندە خۆشم سەری ئەو شوێنانەم دەدا. بەڕاستی بەهەشتی خودا بوون.

« بەڵام سەرەڕای ئەو فەرمایشتانەت کە زۆر جوان و بەڕێ و جێن، ئەوەی من هێندە لەسەر ئەو کوردی گوتنەت دەدۆیم ئەوەیە کە لەمن باشتر کوردی دەڵێی.»

: « ئاخر سۆفی! چیت لێ بشارمەوە، لە ڕاستیدا دایکم کورد بووە، خەڵکی بانەی بوو، بابم کە دوکتور بوو لە شاری بانە چاوی بە دایکم کەوتبوو وەبەر دڵی هاتبوو خواستبووی، ئینجا دوای ماوەیەک لە تارانێ گیرسانەوە کە منداڵ بووم، دایکم هەر بە کوردی لە ماڵێ دەیدواندم هەرکە چوومە قوتابخانە دایک و بابم کە دەمێک بوو کێشەیان لە ناو دابوو، لێک جیا بوونەوە. من تازە لە دایکم کە گەڕابووە بانە هەڵبڕام. بەڵام ئەو دوو ساڵ و چەند مانگەی لە سەردەشت مامەوە بە تەواوی فێر بوومەوە.

: « تۆخودا دوکتور گیان! لەدڵت گران نەیە هەرچی مێشکم ڕێک دەکوشم هیچ وەبیرم نایەتەوە کەسێک وەک دوکتور پێی نابێتە سوورەچۆمێ و ماوەیەک لەوێ مابێتەوە. ئێستای ئەگەر لێ وەلا نێین لەو ڕۆژەوە کە حەلیمم خواستووە بە درێژایی تەمەنم وەبیرم نایە بۆ تاقە یەک ڕۆژێش لە سوورەچۆمێ هاتبمە دەر، تەنانەت ئەو دەمیش کە غەفوورم لەدەست چوو بۆخۆیان تەرمەکەیان بۆ هێنامەوە.»

: «غەفوور، مەگین غەفووری کوڕت چی بەسەرهات؟ کێ تەرمەکەی بۆ هێنایەوە؟» بەدەر لەجەستەی نوشتاوی سۆفی حەسەن کە هەروا لەجێی خۆی مابووە هیچ نیشانەیەک لە ڕووح و ڕەوان و هەستی سۆفی لەو دەمەدا بەدی نەدەکرا... دوکتوڕ لێی گەڕا تا....

: « حەلیم لێم تووڕە بوو، دەزانم ئێستاش هەر لێم تووڕەیە، وەڕووی خۆی ناهێنێ»

پێی دەگوتم: «تۆ کە توانیت خۆت بە دەستەوە نەدەی، دەبوو بە هەرجۆرێک بێ نەهێڵی غەفوورەکەم بەرن.»

: « کچێ عافرەت! من چم دەگەڵ ئەو دەوڵەتە پێدەکرا؟ مەگین خۆت شاهید نەبووی چەندەم پەنا بۆ ئاغای برد؟ مەگین بە ئاغام نەگوت بێتوو غەفوورم بۆ ڕزگار بکەی یاقووتت پێشکەش دەکەم؟ تۆ بەو گوێیانەی خۆت گوێت لێ نەبوو غەفوور چی گوت؟»

: « دایە گیان! بابە! ئەوە پێیان دەڵێم، یاقووتی بدەن بە ئاغای، تازە چاوتان بە من ناکەوێتەوە.»

: « حەلیم! مەگین هەرئەتۆ نەبووی کە گوتت غەفوور زۆری دڵ پێوەیە بە دەستی خۆی بەخێوی کردووە. دەڵێ تا ئەوڕۆکانە ئەسپی ئاوا ڕەسەن و نەجیب هەڵنەکەوتووە، ها! لە بیرت چۆتەوە. وا نەبوو؟ بۆ خۆت گوتت وازی لێ بێنە»

: « حەلیم! وەبیرت دێتەوە هەرکە غەفوور سواری یاقووتی دەبوو، ئارام و بێدەنگ هەر جووڵەی نەدەکرد، ئەو ئەسپە سەرکێشە ڕامی هەوساری دەستی غەفوور بوو.»

: « حەلیم دەیگوت ئەو ئەسپە بە خودای لە تاو غەفووری من سەقەت بوو. ڕاستە کە ئێمە هۆشمان نەبوو ئاووتفاقی دەبەر کەین، بەڵام کوا ئەسپی ئاوا بە سێ ڕۆژ هیچ نەخواردن پەکی دەکەوێ؟»

دوکتور دەڵێ: «سۆفی! بمبورە، هەرگیز نەمدەویست ئەو بیرەوەرییە ناخۆش و تاڵانەت بۆ زیندوو بکەمەوە.»

سۆفی بەسەر خۆی دا زاڵبۆوە. بە چەشنێک جووڵاوە کە هەر وەجووڵانەوە نەدەچوو.

: « بە قوربانت بم، خۆ لەو دەمێییەوە نەموێراوە لە ماڵێ باسی غەفوور بکەم. نازانی حەلیم چ حەشرێکی دەکا. دەنا پێم خۆشە. جارجارە وەبیر خۆمی بێنمەوە و تاوێ لەگەڵی بدوێم. لە حاڵ و ماڵی بپرسم. بەڵام لەتاو حەلیم ناتوانم. ئێستا کە «غە»م نەگوتووە کە بارانەی حەلیم دەس پێدەکا. نازانم بۆ ئەو گۆمە خوێنەی وشک نابێ؟ دەمگوت بە قوربانت بم چت بۆ بگێڕمەوە بە هەزاران چاک و پیر و نوشتە و دەوا و دەرمان دەستی یەکتریان گرتبوو تا بە قوربانی خودای بم خودا کوڕێکی داینێ. دوو دەست و دوو لاقەکەم بوو، دوو گلێنەی چاوی حەلیمیش. ئەگەر سەرجەم ژیان، خۆشییەکی تایبەتی بۆ هەر کەسێک هەبێ، بۆ ئێمە غەفوور بوو. هێند زوو گەورە بوو کە ئەمنیە دەسبەجێ گرتیان بۆ ئیجباری، جوانەمەرگ بوو، لەخۆڕا بە زایە چوو. دەڵێن تیری نابەڵەدی ئەنگاوتبووی. بە خودا ئەو دڵەی من هەرگیز داناسوکنێ. هەرچەند لەبەر خاتری حەلیم، هەر دەبێ ئەم زووخاوە لەبری هەڵڕشتن، لە دەروونی خۆمدا پەنگ بخواتەوە. غەفوور لەو

کوڕانە نەبوو، وەها بە سووک و سانایی واز لە من و حەلیم بێنێ. بە تایبەتی لە حەلیم. حەلیم لەو ڕۆژەوە نەبۆتەوە حەلیم. بە ڕواڵەت لەگەڵ منە، بەڵام ڕووحی داگیر کراوە، ئاگای لەخۆ بڕاوە، بیانووگرە، زمان شڕ بووە. هەر ئەمنم خۆمی لێ دەبوێرم، ئاخر باش دەزانم دەردومەرگی چییە. ئەگینا خودایە تۆبە، نە شێخ، نە مەلا، نە سەیید و نە پیر هیچیان کە لە لاشی نین خۆیان بۆ ناپارێزرێ. من لەو دەمەیدا بەتاقی تەنیا جێم هێشتووە و هاتوومە ئێرە، زۆر نیگەران و پەرۆشی ئەوم. هەرچەندە ڕام سپاردووە کە بووکەکانی کاک وسێن جارجارە سەری لێبدەن. چاوێکیان لێی بێ بەڵام بە خودای بۆ خۆم لە لای نەبم هەرگیز ئەرخەیان نابم.

دوکتور دەڵێ: «سۆفی گوتت کاک وسێن؟ کام کاک وسێن؟ نەکا....

سۆفی قسەی دوکتوری هەڵبڕی و گوتی: « نا. نا بە قوربانت بم ئەتۆ نایناسی. جیرانمانە، زۆر لەمێژ نییە هاتوون دەماڵێکییەوە کە پێش‌تر هی پیاوێک بوو ئەویش ناوی کاک وسێن بوو، لەوانەیە تۆ ئەوت چاو پێکەوتبێ. حەوت کوڕی شێت و شوور و نێرەکەر و زەلام و شەڕانی هەبوو ئەڵبەت ئێستا وەک بزانم هەموویان لە پەڕوپۆ کەوتوون. بە قوربانی خودای بم بە تۆڵەی بێگوناحێک، هەریەکەی بۆ لایەکی هەڵداشت، بابەکەیان لە هەموو کوڕەکانی خراپتر بوو، باوەڕ بکەن شەیتان هەرگیز ئەوەندە بەدفەڕ نەبووە. لەوەتی ئەو کاوسێنە ببوو بە جیرانمان شەیتان قەت پێی دەگەڕەکی ئێمە نەنا. گوایا گوتوویەتی: « جا ئەوەی بە کاوسێن و کوڕەکانی دەکرێ کوا لە دەستی منی کڵۆڵ و دەستەوەستان دێ! ئیختیار بە دەست خۆتانە کە بڕوام پێبکەن، هەر مرۆڤێک، ئەو ماڵەی ناسیبا بێ شک وەباڵی پیاوچاکی بۆ شەیتان دەکێشا. ئەگینا خوداگیری ڕۆژبازاڕی دنیا و قیامەتی شەیتان دەبوو، جا ئاغای دوکتور ئەوەی سەیرە، ئەوەیە هەر لەو ماڵەدا کە شەیتان نەیدەوێرا بە دەوروبەریشی‌دا تێپەڕێ، فریشتەیەکیش دەژیا، فریشتەی چی؟ حۆری بەهەشتی، خودای جوانی و دڵپاکی بوو. هیچ شەوێک نەبوو کە بە دەنگی قیژە و گریان و پاڕانەوەی ئەو قوڕبەسەرە، خۆشی نەدیدە لە خەو ڕاست نەبمەوە. حەوتوویەک لە پاش بەسەرهاتە دڵتەزێنەکەی مەلائیکەتەکەی

خات زڵەخایە. تۆ! بە قوربانت بم. بێ شک چاوت پێی نەکەوتووە، کاوەیسی دەڵێم. کە فاتێت دیتبایە نەتدەناسییەوە. کەس ناتوانێ لەماوەی حەوتوویەکدا، ئەوەندە گوشت و خۆێن و هێز و سوورایی ڕوخسار لەدەس بدا کە وریاترین کەس وە گومان بخا و فریوی بدا. فریو لە دیاریکردنی تەمەن و عومر و ساڵی کیژۆڵەیەکی پازدە ساڵە. لەو حەوت برا و بابەی بەدەر کێ دەیتوانی تەنیا لە ماوەی یەک حەوتوودا کیژۆڵەیەکی خنجیلانەی جوان و لەبەر دڵان، ناسک وەک پەڕی گوڵ، پاک وەک فریشتەی خوا، بەرز وەک چناری هەڵکشاو، بکەن بە پیرێژنێکی دۆمی بۆری وەک ئیشکەڕن، فاتێ، داچۆرا، هەڵچۆڕا، داخزی، داڕزی، داکەوت، کەسی نەبوو بیگرێتەوە. بە تۆپزی دایان بە حەمە ناحەزی قاچاقچی.

لە لای ئێمە ئەگەر ویستبایان، کچەکانیان بترسێنن پێیان دەگوتن: «بێتوو ئەو کارەمان بە قسە نەکەی سبەی دەتدەین بە حەمە قاچاقچی.»

بێ یەک و دوو کردن، ئەگەر کارەکە تەنانەت ملی خۆشکاندنیش با، ملی خۆیان دەشکاند! دەیانزانی کە لەو مامەڵەیەدا سەرکەوتوون!!

فاتێ درا بە حەمە قاچاخچی بە بێ هیچ سووچ و تاوانێک.

دوکتور ماوەیەک بوو جووڵەی لێبڕابوو، وەک داری ویشکی سەرچاکی ڕاوەستابوو، لەوێ نەبوو. گوێی لە سۆفی حەسەن نەبوو دەڵێ چی، چوو بوو بۆ شوێنێکی تر. هەرچەند لە سۆفی زۆر نیزیک و لە پەنای بوو، بەڵام نە ئەوەندە کە یەک ببینن، سۆفی یەک پشوو دەیگێڕاوە. دەتکوت بۆخۆی دەگێڕێتەوە. دەتکوت قوتابییەکە و دەرسەکەی دەورە دەکاتەوە تا لە بەری بکا. دوکتوریش یەک پشوو بە دەم خەیاڵانەوە، دەڕۆیی، دەهاتەوە، دەڕوێی و لەپڕ بە بیستنی وشەی بێسووچ و تاوان لە زاری سۆفی حەسەن دەهاتەوە. لەبەر بێدەنگ کردنی سۆفی، پرسیارێکی بۆ لای بەڕێ کرد. دوا بە دوای دا ئەوە گوێی بوو کە فەرمانی گریانی بە چاوی دەدا.

: «ئاخر بۆ بێسووچ و بێ تاوان؟»

سۆفی حەسەن وڵامی پرسیاری دوکتور ناداتەوە. خەریک بوو خۆی دەدواند. دیار بوو هێندە ئەو بەردە قورسەی سەر دڵی هەڵگرتبوو و لە

هیچ جێگەیەکی و لە لای هیچ کەسێ نەیتوانیبوو دایبنێ کە بڕستی لێبڕیبوو.

منیش لە خۆم دەپرسم: « ئاخۆ بڵێی سۆفی حەسەن بە هۆی هەڵگرتنی ئەو بەردە قورسەی سەر دڵی نەبێ وا کۆم بۆتەوە؟»

سۆفی بەخۆی دەڵێ: « جا بە ناشکوری ناڵێم بە کێم گوتبایە. کێم هەیە، تازە کار لە کاریش ترازابوو. کاوەیس کە بێ سەروشوێن چووبوو. خات زلەخاش کە دڵی تۆقیبوو. کاوسێن کە دوا بە دوای ئەو ڕووداوە دەردێکی گرت و دوایی شێت بوو، فاتێ، حەک بۆت لاڵ بم هەر بە خونچەیی هەڵوەری، حەمزاغا کە چاوەکەی تریشی وەک ئەوی تری پووچاوە. کوڕەکانی کاوسێن کە دەمیان دەجەرگی یەکنا و هەریەک ئەوی تری تاوان بار دەکرد.»

دوکتور کە خۆی گرتبۆوە گوتی: « سۆفی! سۆفی حەسەن! سۆفی! جارێکیان نەخۆشێکم هاتە لای هەروا کە پرسیارم لێکرد کە خەڵکی کوێی؟ خەڵکی سوورەچۆم بوو لە لای سنووری ئێران و عێراق هەر وەک بە تۆم گوت کە بە هەڵکەوت ڕێگەم کەوتۆتە ناوچەکەتان، ئەویش بڕوای پێنەدەکردم هەرکە ناوی دوو کەسی خەڵکی سوورە چۆمم پێکوت، دەستی بەگێڕانەوە کرد تەنانەت باسی ئەو چۆلەکانەشی بۆ کردم کە بە ئاسمانی ئەوێدا تێپەڕبوون. دەیگوت:« من کوڕی ئامینم. ئامینە شەلی پێدەڵێن.»

: «کوڕە سەر زلەکەی ئامینە شەڵیە.»

لێرەچی دەکرد؟

دوکتور کە هەر ئەو پرسیارەی سۆفی حەسەنی لێکردبوو کوتبووی لە تاران فەعلەیی دەکا. لەسەر قەرەچێوەی ڕا بەربۆتەوە خوارێ لەبەر ژانی پشتی ڕووی دە دوکتور کردووە. تازە هەرگیزیش ناگەڕێتەوە سوورەچۆمێ.

سۆفی حەسەن دەڵێ: « خودایا کارەکانت چەند جوانن. ئامینە شەل وەها خوداگیری فاتێ و کاوەیس بووە کە سەگ بە حاڵی. یەکپارچە بۆتە

کێم و چڵک و پیسایی. لە دوورەوە گوێت لە دەنگی ناڵە و ئەو تووک و دوعایە دەبێ کە لە خۆی دەکا. هەموو گیانی کرمەڕێز بووە. چەند خێرخوا نەبێ لەبەر بۆگەنیوی لەشی کەسێ ناتوانێ تخوونی کەوێ. نان و ئاوی بە کولانەدا بۆ لە ژووریّ داوێن. ئەو کوڕەی باسی دەکەی. ڕەسووڵ لە دەس دایکی ڕای کردووە. کچێکی هەبوو جوان و لەسەر دڵان. مێردەکەی بۆ ئەوەی لە دآیکی دووری بکاتەوە دەستی گرت و بردی، پەڕیوەی هەندەران بوون، بەبێ ئەوەی هەرگیز پرسیارێک لە حاڵ و ڕۆژی دایکی بکا.»

سۆفی حەسەن دەڵێ: «هەرچی کردی ئامینەشەل کردی.»

دوکتور دەڵێ: «وەک دەگێڕنەوە و ئێوەش ئاماژەتان پێ کرد کچێکێ زۆر جوان هەبوو ناوی فاتێ بوو و - هەڵبەت ئەوەی بۆچی دوکتور کردارەکە بە سیغەی کۆ دەکار دەکا و دەڵێ، دەگێڕنەوە. لە حاڵێکدا تەنیا کەسێکی لای سووره چۆمێ کە دیبێتی و نەقڵ و باسی بۆ گێڕابێتەوە، تەنیا ڕەسووڵ کوڕی ئامینە شەلە. با ئێمە ئەو مەبەستەی وەک هەڵەی زمانی دوکتور لەبەر چاو بگرین، دوکتور بە بێ ئەوەی ئەو مەبەستەی لە لاگرینگ بێ درێژە بە قسەکانی دەدا.-

ئەوەش دەگێڕنەوە هەڵەی دووهەمی دوکتور، کە کوڕێکی لاوچاکیش بە ناوی کاوەیس، فاتێی خۆش ویستووە. بۆی تێدەچێنن کە کاوەیس چۆتە زگ فاتێ و بێ سیرەتی کردووە. لە قسان فاتێش دانی بەوە داهێناوە کە ڕاستە کاوەیس چۆتە زگی و براکانی فاتێ دەچن بۆ کوشتنی کاوەیس کە ژاندرمە بە نیوەگیانی لە ژێر چنگیانی دەردەکێشن. لەو ڕۆژەوە کاوەیس بێ سەروشوێن دەبێ.

: «ئاغای دوکتور بە قوربانت بم. ئەم ڕووداوە بە دەیان شێوە گێڕدراوەتەوە.

هەڵبەت لە هەموو ئەو گێڕاوانەدا دوو ڕاستی وەبەرچاو دەکەوێ. یەکەم ئەوەیە کە براکانی فاتێ بە ڕاستی دەیانویست کاوەیس بکوژن، بەڵام کوێخا برایم و کوڕەکەی کە بە هەڵکەوت بەوێدا ڕادەبڕن، دەچن

نەهێڵن کاوەیس بکوژن، کە ئەوانیش دەکەونە ژێر پەلاماریان و بە دەستیان شل‌وکوت دەبن. ئەو بەهانا هاتن و یارمەتی‌دانی کاوەیس لە لایەن کوێخا برایم و کوڕەکەی‌یەوە بوو بەهۆی ئەوە کە فاتێ تەواو باوەڕ بە قسەکانی ئامینەشەل بێنێ کە دەیگوت کاوەیس لە بنەوە لەگەڵ کەژاڵی کچەکەی کوێخا برایم کەینەوبەینەی هەیە. دووهەم ڕاستی ئەوە بوو کە ئەوە ژاندرمەبوو کە کاوەیسیان لە چنگ براکانی فاتێ ڕزگار کرد. دوکتور گیان ئەوە بۆ هەوەڵ جار لە لای تۆ باسی دەکەم، ئەو کەسەی کە چوو ژاندرمەکانی ئاگادار کرد من بووم و تا ئێستا لە لای هیچ کەسێ بەدەر لەتۆ نەمدرکاندووە. تەنانەت لە لای حەلیمی خێزانیشم باسم نەکردووە. چونکە بە هەرحاڵ ژنە، ناتوانن قسەی زۆر دە دڵیان‌دا ڕابگرن.

دوکتور دەڵێ: «کوڕی ئەو ئامینە شەلەی باسی دەکەی دەیگوت: دایکم گوتوویەتی کە فاتێش زۆر دڵی بە کاوەیس نەدابوو. بەڵکوو زۆرتر چاوی لە هەمزاغا بوو کە بۆ خوارزایەکەی دەویست. گوایا دیاریشیان بۆ یەکتر بەڕێ دەکرد.»

: « بە خودای بە قوربانت بم. ئەم دارە زۆری لک‌وپۆپ لێ کەوتۆتەوە. هەرکەس لە زەینی خۆی‌دا چیرۆکێکی ساز کردووە. کە پێی خۆش بوو ڕووداوەکە وای ڕوودابا. لە دوایی‌دا هەرچەند بۆخۆشیان دەیانزانی کە خۆیان ئەم چیرۆکەیان ساز کردووە بەڵام سوێندیان لەسەر دەخوارد کە تەواوی ڕووداوەکە ئەم جۆرە ڕووی داوە کە چیرۆکەکەی ئەوان بەیانی دەکا. ئەی فاتێی قوڕبەسەر! ئەگەر جوانی بۆ زۆر کەسان دەبێتە مایەی بەختەوەری، بۆ فاتێ ببوو بە مایەی چارەڕەشی و هەناسە ساردی. دەڵێن خۆش بە حاڵی کاوەیس، مردوو یان زیندوو و یان هەروەک دەڵێن چەتە لە شاخان یان بازەرگان لە بەندەر. خەڵک وازی لێهێناوە. بەڵام فاتێی بێچارە و بەسەرهاتەکەی هەروا بۆتە بنێشتە خۆشکەی زاری خەڵکی ناوچە. هەر بەینابەینێک بەهۆی ڕووداوێکی تر سەر لەنوێ دەکەوێتەوە سەرزاران. ڕیوایەتێکی تازەی لێ ساز دەکەن. ئەوە چەندین ساڵ لەم ڕووداوە تێپەریوە. بەیتی بلەی براوەتەوە. بەڵام ئێستاش ئەم

باسه هەر نەبڕاوەتەوە! ڕەنگە ئەگەر ئامینەشەل لە دەست ئەو عازابەی کە دەیکێشێ ڕزگای بێت. ئەو بەسەرهاتەش، بەسەرئەنجامێک بگا.»

دوکتور دەڵێ: « سۆفی حەسەن! تۆ بەیانی دەبێ بچی بۆ ئازمایش‌دان، وا وێدەچێ سبەی شەوێش میوانی منی. من چەند پرسیارێکی ترم هەیە، کە دەبێ وڵامەکەی لەتۆ ببیسم. درەنگ وەختە بۆ نووستن. بنوو تا سبەی بزانین چۆن دەبێ؟»

دوکتور هەستا سەرپێ، وەدەرکەوت وێدەچوو لە شتێک بگەڕێ، نەیدەزانی چییە و لەکوێی داناوە.

## ٢٨

.... ئامینە شەل دەیگوت: «ئەمن پێم وابوو هەمزاغا دەزێڕم دەگرێ: چووزانم نەتەنیا لە پیاو بوون کە لە لە پیاوەتیش کەوتووە. بەو گوێیانەی خۆم گوێم لێبوو.»

: «کاک هەباس! بڕوام پێبکە لەوەتی خودا بەشەری لەسەر ڕووی زەوی داناوە لەوکچەی کاک وسێنی جوانتر درووست نەکردووە. هەرکەس سەر و ماڵیشی لە پێناویدا بدا، هێشتا هەر لە قازانجە. لەسەر چاوی کوێری دانێی، ڕوونی دەکاتەوە.»

: « کوڕە هەمزاغا! وا وێدەچێ زۆر کاری لێکردووی، دەیجا ئاغای وەک تۆ بە دەسەڵات و سەبریان نەگوتووە، دەیقۆڵی لێ هەڵماڵە. لە بیرتە چۆن خاتوونی خێزانت بە تفەنگ لە ماڵە کێ دەرکێشا؟ ئێستاش لە دیوەخانان ئەم ئازایەتییەی تۆ هەر دەگێڕنەوە.»

: « کاک هەباس! ئەوەی دەیلێی ڕاستە، بەڵام دەزانی بۆ خۆم لێ بێدەنگ کردووە؟ ئەوەی ڕاستی بێ زەمان گۆڕاوە و منیش ئەو تین‌وگوڕەی جارانم نەماوە! ئەگەر لێم بە عەیب نەگری بەخودای ئێستا سواری ئەسپ بوونیشم لەبەر گرانە و هەروەها ئەمن ئەو کچەم خۆ بۆخۆم ناوێ، بۆ خوشکە زایەکی خۆم دەس‌نیشان کردووە کە لە ئاڵمان ئەوە خوێندنی دەرسی دوکتورییەکەی تەواو دەبێ. تازە وەک بیستووشمە کچەش لەگەڵ کوڕی زڵەخایە نێوانی هەیە، خودا هەڵناگرێ ئەو جۆرەی من بزانم کوڕە لە هیچی کەم نییە.»

: « هەی لاڵ بم ڕۆژگار! لە بۆ هەمزە شێرێ، نەعرەتەی لەرزەی دەخستە گیانی هەموو کەس. لە دیوەخانێ کە دەینەڕاند. ڕەعییەت لە ماڵە خۆی میزی

بەخۆدا دەکرد. تۆخودا هەمزاغا! قسەکانم بە دڵ نەگری. وا بزانم هەر لەو شەڕەی ڕا کە چاوت وای بە سەرهات، هەرچی حەز و مەیل و خۆشیشە لێت زیز بوون.»

: « هەباس! ئەوە دەڵێی چی؟ ئەو کچە لە ڕادە بەدەر مندالّە، خۆ ئەگەر تەمەنی لەسەرتر بایە، بڕوام پێ بکە ئێستا لە ماڵمدا بوو. بەڵام ئەگەر بتوانم بۆ ئەو خوارزایەمی بستێنم ئەرکی خالێتی خۆم بەجێ گەیاندووە.»

ئەودەم کە ئامینە شەل ئەم وتوویژەی هەمزاغا و هەباس ئاغای پچڕ پچڕ لەبەر هەیوانی دیوەخانی هەمزاغای گوێ لێبوو، هاتبوو لە هەمزاغا داوا بکا کوڕە سەر زلە بێکارەکەی بە نۆکەر بگرێ. نەوسی زۆر و زگی زل و تەپلۆس و تەمبەڵ بوونی کوڕەکەی، دەگەڵ لاقی شەل و هەمیشە جێ‌ماو لە لەشی ئامین یەکیان نەدەگرتەوە، لاقە شەلەکەی خۆی کە بۆ چارەسەر نەدەکرا هاتبوو گرفتی کوڕەکەی چارە بکا. هەرچەند بە تەواوی گوێی لە هەموو قسەکانی هەمزاغا نەبوو کە بە هەباس ئاغای دەگوت. بەڵام پێی وابوو ئەگەر هەمزاغا سینگ بێنێتە پێش لە خۆشکەزایەکەی کە خودا دەزانێ کەی تەواو دەبێ و کەی دێتەوە و ئاخۆ فاتێی دەوێ یان نایهەوێ باشترە، هیچ نەبێ لە هەمزاغا زۆرتری پێدەگەیشت هەروەک ڕابردوو، ئەودەم کە ئەو بەڵایە بەسەر لاقی نەهاتبوو. ئەودەم کە بەبێ خۆ جوانکردنیش‌با دەهاتە بەرچاوان، هەروەک زۆر کەڕەت کە وەبەرچاوی هەمزاغا کەوت و هەرجار خەنی و پڕ دەگەڕاوە. بۆ ساتێک خۆی دیتەوە لە عەمباری ماڵە ئاغا کە بە پێوە ڕاوەستاوە و هەمزاغا بە سەتڵێک ئەوە خەریکە لیرە و سووڕەتی و پەهەلەوی بەسەردا دەکا.

: «تۆخوا هەمزاغا بەسە ئەوە چ دەکەی؟ خۆ من هیچ کارێکم نەکردووە.»

: «نا، نا، ئامین هێندەی لێ مەڵێ. زۆر نییە. تۆ دەزانی ئێستا چت داوە بە من؟ جارێ لە شانت ڕا تا تۆقی سەرت ماوە بە زێڕ داپپۆشم.»

ئامینە شەل تەنیا لە شانی ڕا تا تۆقی سەری مابوو کە کوان و کێم و جەڕاحەت داینەگرتبێ. مردن ئەوەندە گران بوو کە ئامینە شەل نەبۆی دەکڕدرا و نە بە ئاوات بۆی دەخوازرا. خۆ ئەگەر ئەوەندە هێز و تاقەتی

جووڵانی هەبا، خۆ ئەگەر توانیبای بەپەیژە شکاوەکەی دیواری خانووە قورماوی‌یەکە دا تاکوو سەربان هەڵگەڕێ، خۆ ئەگەر تاقەتی ئەوەندەی هەبایە تا پشتەوەی دیواری مزگەوت چووبا، ئەگەر ئەگەر هەر لەو ژوورە بچووکەدا تەنەکە نەفتێکی لێبایە، ئیتر دەیتوانی ئەو شتە گران‌بەهایە واتا ئەو مردنە، ئەو ئاواتە دوورەدەستە بکڕێ بەو هەموو زێڕانەی هەمزاغا پێی زێڕوەشان کردبوو.

: «هەمزاغا بێتوو هەواڵێکی خۆشت لە فاتێ بۆ بێنم مزگێنیم چییە؟»

: «دەس هەڵگرە ئامین! خۆت باشتر دەزانی کە من و ئەو منداڵەیان نەکوتووە من بۆ خوارزاکەم دەویست.»

: «هەمزاغا ئەوە بیانوویەکی باشە من هەر بەو بیانوویە بۆت نەرم دەکەم.»

: «ئامین کچێ وازبێنە فاتێ زۆر منداڵە.»

: «منداڵ؟ خۆتۆ لەپێشەوە چاوت پێی نەکەوتووە، ئەگەر تا ئێستا کەس فریشتەیەکی بەڕووتی نە دیووە من دیتوومە.»

: «ئامین! ئەوە ڕاستە دەڵێن حەز لە کوڕەکەی زڵەخایە دەکا؟»

: «کێ؟ کوڕەکەی زڵەخا؟ کاوەیسی دەڵێی؟ ئەم دمگولە. جا کێ حەز لەو بەرەڵڵایە دەکا؟

لە زمانی فاتێ بیستوومە کە خۆشی ناوێ و زۆرتر گاڵتەی پێدەکا. تازە خۆ کاوەیس ئەگەر خۆشی بکوژێ مەحاڵە براکانی فاتێ ڕازی بن فاتێ مێردی پێ بکا. مەگین پیاو لەسەر زەوی قات بووە؟ هەمزاغا تۆ کارت بەو شتانە نەدابێ، تۆ بڵێ مزگێنیم چ دەبێ؟ هەواڵی زۆر خۆشت بۆ بێنمەوە.»

بۆ ساتێکی هەمزاغا ئامینی وەک ئامینی جاران هاتە بەر چاو. جوان و دڵتەڕ و لەبار. ئاسکێکی ناسک و سرک. تا ڕاوی کرد و کەوی چ نەمابوو نەیکا. بەڵام ئێستاش پێی سەیر بوو ئەو ژنە بۆ وا سەیر لە پڕ داچۆڕا. دەتگوت خودا ئەوەی مەئمووری عەزابی کە هەیەتی یەکجێ ناردوویەتە سەری، مێردەکەی بە هەموو کەنەفتی و پیری و کەم تاقەتی توانیبووی لاقێک لە ئامین بستێنێ. ئەودەم کە ئاگاداری کەینەوبەینەی ئامین و هەمزاغا بوو. لە پاش ئەم ڕووداوەدا ئامین ئیتر خۆی نەگرتەوە و ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژێ زۆرتر لە کزێی دەدا. ئیتر هەمزاغاش نەیدەهێشت بەلای دیوەخان دا تێپەڕێ. تەنیا ناچاری بوو کە ئەوێ

ڕۆژێ ئامینی لێبڕاوکرد بە هەر جۆرێک بێ داوا لە هەمزاغای بکا کارێک بدا بە کوڕەکەی، کە گوێی لە قسەکانی هەمزاغا و هەباس ئاغا ڕاگرت. هەستی کرد ئیتر کاتیەتی!!!

هەمزاغا پێی دەڵێ:« ئەتۆ هەر بۆ ئەو خوشکەزایەمی ساز بکە. جا ئەوجار بخوازە ماڵی دنیایە.»

: «دایە! دایە! لێم گەڕێ ئەمن مێرد بەو پیرە سەیەی ناکەم.»

: «ڕۆڵە گیان! پێ لە بەخت و ئیقباڵی خۆت مەنێ. بێ کەس و کارە، نە سۆرەیەک و نەتۆرەیەک بۆ خۆت دەبی بە خانم و خاتوون. زۆری عەمر بە دنیاوە نەماوە، کچم ئامین! عاقڵ بە ئەو هەتیوە ناتوانێ بەختەوەرت بکا، کوا بە نانی شوانی زگت تێر دەبێ؟»

: «دایە! سەد ئەوەندەم لەبن گوێی بڵێی من دەستی لێ هەڵناگرم. بەخۆم نییە زۆرم خۆش دەوێ. بشمکوژی دەست لە مراد هەڵناگرم. ئاخری مێردی هەر پێدەکەم.»

: «کچێ! عاقڵ بە، دەس هەڵگرە، بێتوو کاکت پێ بزانێ یەکێک لەو دوانەتان هەر دەکوژێ. مەگین نازانی ئێستا دەگەڵ مراد بوونە کێردوپەنیر، گوایا چەند جار لەبەر چاوی خەڵک پێک هەڵپڕژاون. بۆچی وا دڵت بۆی تۆقیوە؟ دەڵێی پیاو لە ڕووی زەوی نەماوە!»

: « دایە گیان! بەدەستی خۆم نییە، بە خوای لە تۆشم زۆرتر خۆش دەوێ، لە گیانی خۆشم خۆشتر دەوێ.»

: «دا کچێ! دمت وێک بنێ. سەڵیتە. ئاخری سە رشۆڕمان دەکەی.»

: «دایە! هەرچی دەڵێی بیڵێ بەڵام من ناهێڵم مراد بە نسیبی کەسێکی تر بێ.»

ئامینە شەل دەڵێ: «ئەگەر بە قسەی دایکم کردبایە و مێردم بە ساڵە سەقزی کردبا، ئێستا حاڵ و وەزغم چۆن دەبوو؟»

ساڵە سەقزی بە هەموو سامان و داهاتییەوە بێکەس و کار بوو، نە دایک، نە باب، نە خوشک و نە برا، نە خاڵ و مام و پوور نە دۆست و کەس و ئاشنا. دەتکوت لە ڕۆژێک دا کە باران لە ئاسمان وەک گۆزەی سەرەوژێر دەهاتە

خوار و هیچ زیندەوەرێک نەبوو کە بن سێوبانێک و بن دارێک، بن بەردێک و ئەشکەوت و کونێک نەدۆزێتەوە و خۆی تێدا حەشار نەدا. ئەم ساڵە سەقزییە لەپڕ لەبن گوێنییەک دەرپەڕی و هاتە سەر دنیا، هەڵبەت بۆیەش پێی دەڵێن سەقزی چونکە هەرکە لە گوێنییەکە  بۆوە، ڕووی کردە شاری سەقز و لەو شارەدا هەڵیدا و خۆی گرت و پێگەیشت. هەڵبەت لە بیر نەکەین کە بە چ ڕەنج و تەقەلا و خوێنی دڵی خۆی و خەڵکی تر خواردنێک. خۆی و خودای نەبێ هیچ کەس نازانێ. کاتێک ناردیە سەر ئامین ئەو دەم شەل نەبوو و بە تەواوی ئامین بوو. ساڵە سەقزی ئەو دەم ئەوەی هەیبوو جیا لە پیاوەتی و ئەو جل و بەرگە پیاوانەیە کە لەبەری دەکرد و هەروەها سەرو ڕدێنێکی سپی و دەنگێکی هێندێک نووساو، تاحەز دەکەی سامان و داهات و باغ و مەزرا و خانووبەرە و دووکان و پارەیەکی زۆر، لە شارەکانی سەردەشت و سەقز و سابلاغ و هەروەها لە شاری نەغەدەش ملک و ماشی هەبوو. ئەگەر ئامینە شەل بە قسەی دایکی بکردایە، ئیتر ئامین نەدەبوو بە ئامینە شەل و مراد بەدەس براکەی نەدەکوژرا و براکەی ڕای نەدەکردە ئەو دیو و براژنەکەی بە چوار منداڵەوە کەڵەگای ساز نەدەکرد و بۆ خۆشی منداڵێکی لەبەر نەدەچوو و دووشی لەسەر دەستی بمێنێتەوە و ئەسەد ئەو پەندەی بەسەر نەدەهێنا و بۆی دەرچێ و فاتێ تووشی بە تووشی حەمە ناحەز نەدەهات و خات زڵەخا لە تاو کاوەیس دڵی نەدەتۆقی و کوڕەکانی کاک وسێن وا شێت و هار نەدەبوون و کچەکەی خۆی ڕەدوو نەدەکەوت و ڕێی نەدەکەوتە هەندەران و کوڕەکەی لەداخی ئەو هەڵنەدەهات و جێی نەدەهێشت و هەمزاغا تێر تێر شیرەی وجودی نەدەمشت و لە پاش تێربوونی وەک پەڕۆکۆنێک فڕێی نەدەدا و تا ئێستا بەبێ ئەوە بەڕاستی بزانێ بۆ وا دەکا دەیان هێلانەی لەناو نەدەبرد.

ژان ئامینە شەلی ڕێک دەکوشی. نەیدەزانی لە کەیەوە ئەم ژانە لەشی دۆزیبۆوە، لەبەری پێیەوە هاتبووە ژوور لەشی. هەوەڵێ زۆری گوێ نەدەدایە. دەتکوت پێی لەسەر پۆلوویەکی بچووک دادەنێ. وردە وردە، ڕۆژ دەگەڵ ڕۆژێ پۆلووەکە گەورەتر و گەورەتر بوو، نە بە باوەشێن کردنی، حەجمینی هەبوو نە بە ڕۆنە ڕەشە.

زۆری نەخایاند پۆلووەکە چووە نێو «لاقە شەلەکەی بوو بە گۆشتی لاقەکەی. ئێسکەکەی لێ دەویست، ژانەکەی زۆرتر کرد. نا، نا ژان نا. ژان شتێکی ئاساییە، ژان شتێکە هەر کەسێک بە شێوەیەک دەیچێژێ. ددانت وە ژان دەکەوێ. ئازارت دەدا. حەبێکی دەخۆی بڕێک هێدی دەبێ.  نا دەس پێدەکاتەوە. دەچێ بۆ لای دوکتور بۆت دەکێشێ و ڕزگارت دەبێ. چش لە ددانێک. نان هەر جۆرێک بێ دەجورێت و دەبێتە تڵیت. سەرت ژان دەکا. بەرە بەرە پتر دەبێ. گنجت دەخاتە نێو چاوان. تووڕەت دەکا. چ دەکەی؟ هەڵدەستی بەدەسماڵێک توند توند دەیبەستی. نەختێک ئەهوەن دەبێتەوە، بەڵام ئێستا وازی لێ نەهێناوی، بە دەست بۆت دەشێلن، هەروا جێت ناهێڵێ. دەچیە لای دوکتور. چەند حەب و دەرزییەک و چەند قسەی خۆش و دڵدانەوەت، عەلەمت لێدەبڕێ. ژان و پێچت بە زگی دادێ، هەڵدەمسی، با دەکەی. دەچیە ئاودەستان، بێ ئەدەبییە، نەختێک حەوسەلە و هێندێک خۆ ڕێککوشین و قومێک ئارەقی جاترە، نەبوو کەوچکێک شەربەتی ئالۆمینیۆم ئەم جیئیس، بڕێک باشتری؟ زۆر باشە، چێ؟ چاک نەبوویەوە؟ دەچیە لای دوکتور بە چەند حەب و دەرزی و شەربەتێک دێیەوە سەرخۆ، بەڵام ئەم پەنگرە، ئەم پۆلوویە، ئێسک دەسووتێنێ و گۆشتی دەبرژێنێ. بۆچرووکی ئێسک و بۆکڕووزی گۆشت و پێست بەناو لەشتدا، بەناو ڕەگ و دەمار و عەسەبەکانتدا هەڵدەکشن و یەک جێ خۆ بە لووتت دا دەکێشن. ماوەیەکی دوور و درێژ بوو ئەو لاقە نەعەملاوەت بە دوای خۆت دا دەکێشا، چ سەیرە لەم بستە جێگەیەدا کە تێیدا کەوتووی. چلۆن ئەم لاقە شەلەت هەموو وجودت، هەموو هەست و خەیاڵ و بیرەوەرییە تفت و تاڵ و ناخۆشەکانت بەدوای خۆیدا دەکێشێ و دەیخاتە سەر ئەم پۆلووە  گەشە کەهەر دەم زۆرتر دەگەشێتەوە و خۆتی لێ میوان دەکا.

***

## ٢٩

.... هیچ ژنێک ئەم جۆرە بە باشی مێردەکەی نەناسیوە کە حاجیژن حاجی محەممەدی دەناسی. کە بۆ چێشتانێ هاتەوە، ئاوری لێ دەبۆوە، هەرچەند حاجیژن زۆر جاران حاجی بە توورەیی دیبوو، بەڵام ئەم ئاورەی ئەم جارە لێی دەبۆوە، ئاورێکی تر بوو و ئەم حاجی محەممەدە، حاجی محەممەدێکی تر! هەر لە بەر درگای حەوشە ڕا نەعرەتەی کێشا.

: «ئەم هەتیوە حەرامزادەیەم، بۆ بانگ بکەن. لە کوێیە؟ چووە چ قەبرستانێک ئاوەدان بکا؟»

حاجیژن بە پێچەوانەی هەمیشە کە لەو کاتانەدا هەڵە و خەتایەکی کەریمی دەکردە سەد خەتا متەقی لێوە نەهات، تەنیا بە هێمنی هەرای کرد: «تووبا دا چایەکی بۆ بابت بێنە زۆر ماندوویە.»

: «حاجی ئاغا! یا ڕەببی بەخێر بێیەوە، ماندوو نەبی. خۆ زۆری ماوە بۆ نوێژی نیوەڕۆیە! بۆ وا زوو دەستت لە کار کێشاوە؟»

: «کاری چی؟ خۆ ئەو حەرامزادەیە ئەمڕۆ لە کاری خستین. کەس نەبوو کوورەکەی بدەمێنێ. هیچ کارێکمان پێ نەکرا. پێم بڵێ بزانم ئەو ناکەریمە لە چ جەهەندەمێکە؟ بۆچی نەهاتۆتە دووکانێ؟»

: «جا چت لێ بشارمەوە حاجی گیان! بەخودای بەیانی کە بۆ نوێژێ هەستام کە چووم لە خەوی هەستێنم، دیتم لە جێگەوبانیدا نەمابوو. نەمدەزانی چۆتە کوێ، هەر بۆیەش ئەو دەم چم پێ نەکوتی. کوتم بەڵکوو پەیدا بێتەوە، داخودا چۆتە کوێ؟ بەڵام تا ئێستاش هەروا گۆڕی ونە.»

حاجی لەسەر ئەو مافوورەی بۆیان ڕاخست، دانیشت بە دەم چاخواردنەوە چوو دەبیرەوە. من کە ئەو دەم هەر حەوت، هەشت ساڵانە

دەبووم. کرێگرتەی ماڵە حاجی بووین. لەبەر بێوازی و بێ حەوسەلەیی گۆشەیەکی پەردەی پەنجەرەی ژوورەکەمان کە ڕوو بە جێگایەکی بوو کە حاجی و حاجیژن لێی دانیشتبوون لادابوو لەوێڕا سەیری چاخواردنەوەی حاجیم دەکرد کە چلۆن بە قامکە ئەستوورەکانی قەندی نێو قەندانەکەی لێک دەدا و هەرجار کلۆ قەندێکی گەورەی هەڵدەبژارد دەنێو ئیسکانە کەمەر بایکەکەیدا دەخنکاند و بەر لەوەی بە تەواوی بتلیسیتەوە دەریدێنا و دەزاری دەنا و نەختێکی هەروا دەمژت ئینجا قومێکی چا بەسەر دا دەکرد. لەودەمەدا، هاوکات لەگەڵ دەنگدانی حاجیژن لە لایەن حاجی محەممەدەوە، دایکیشم منی دەنگ دا: «کوڕە بۆ چوویە بەر پەنجەرە؟ ئەو پەردەیەت بۆ هەڵداوەتەوە؟ عەیبە دایدەوە.» دایکم هەمیشە پەردەی ژوورەکەی پێ دادەداینەوە دواتر زانیم لەبەر بووکنازێیە کە بابم چاوی پێی نەکەوێ. ئیتر نەمزانی حاجی چی تری بە حاجیژن کوت و حاجیژنیش چیتری بۆ کەریم تێچاند. ئەگەر لەمن پرسیار بکەن. دەڵێم دەبێ حاجی لە حاجیژنی پرسیبێ: « ئەی عەوڵا لە کوێیە؟ هیچ پرسیارت لێکردووە، ئاخۆ هەواڵێکی لە کەریم هەیە یان نا؟»

عەوڵا خەبەری لێی نەبوو. بەو هەموو ئەزییەت و ئازارەی کە کەریم لە دەستی عەوڵای دەدیت هەرگیز هیچی بە دەستەوە نەبوو لە لای بیدرکێنێ. عەوڵا لەودەمەدا وەژوور کەوت.

: «بابە! هەر ئێستا کاک قادری خەیاتم دیت پرسیاری لێکردم کە باقی کوڕەکەیم نەدیوە؟ دەیکوت بەیانی مەلابانگدانێ وەدەر کەوتووە و هەر کەس کە پرسیارم لێکردووە چاوی  بە باقی نەکەوتووە. زۆریش نیگەران بوو.»

هەم حاجی محەممەد و هەم حاجیژن هەرکامەیان ئەو جۆرەی دەیانزانی و فێری ببوون، خۆیان دەپشکنی، دیار نەبوو لەخۆیان دەگەڕێن یان لە کەریم، لە کردەوە ناحەزەکانی خۆیان دەگەڕان یان لە سەر داخستن و هیچ نەگوتنەکانی کەریم؟ لە گاڵتە و گەمە پێکردن و جنێو پێدان و ناو ناتۆرە لێنانی، یان لە بزەلێوڕێژ لە بەستەزمانی و بێ دەسەڵاتییەکانی کەریم کەلە

سەر لێوی دەبوو بە دووپشک و پێوەی دەدا: «ڕەببی قەت چاوم بە دیداری هەڵنەیەتەوە»

: «هەمووی خەتای دایکم بوو.»

: «بڵێی چووبێتە کوێ؟ بە خودای لە کاروکاسبی دەکەوم. کوڕە عەوڵا پاش‌نوێژێ وەرە لە جێی کەریم ڕاوەستە، کارم زۆر کەوتۆتەوە سەریەک. بەڵێنم بە زۆرکەسان داوە کە زوو کارەکەیان بدەمەوە.»

: «بابە پاش‌نوێژی دەبێ بچمەوە قوتابخانە، بە خودای نەچمەوە ئاغای «قاف» دەمکوژێ. هەمیشە خودا خودایەتی یەکێک نەچێتەوە. تا لە دوایی‌دا بکەوێتە گیانی. بەخودا دەمکوژێ، ناوێرم.»

: «تۆ کارت پێی نەدابێ لەسەر من، بۆ خۆم لەگەڵت دێمەوە.»

کەریم گوتی: «نا بە خودا ناتوانم، نابێ بە کەسی بڵێم. بابم ڕای سپاردووم لەت لەتیش بکرێم لە لای کەسی نەڵێم.»

کابرا گوتی: «کەوابوو من سبەی بۆخۆم هەتا قەڵادزێ لەگەڵتان دێم. لەوێ بە کەسێکی ئەمینتان دەسپێرم.»

شەو لە شەوانی‌تر زووتر هات یانی ئەوان بە هۆی ماندوو بوونی لە ڕادەبەدەر وئەوڕووداوە ناخۆشەی بۆیان هاتبووە پێش وایان هەست کرد. شەو بەرگی یەک ڕەنگی دەبەر هەموو کەس و هەموو شتێکی کرد. شەو دادپەروەرترە لە ڕۆژ. ڕۆژ ناکۆکی پێک دێنێ، عەیبەکان وەدەر دەخات، جیاوازییەکان پێشان دەدات، چین و توێژەکان بەهەموو سەروەت و سامانەکانیان دەخاتە بەر چاو، دەرفەت بۆ سامان‌داران پێک دێنێ کە خۆیان بەچاوی هەژاران وبێ‌ئەنوایان‌دا بکێشن، فیزیان بەسەر دا لێ‌دەن، بەڵام شەو تەبایی دێنێ و عەیبەکان دەشارێتەوە. دە شەودا نە جوان جوانە و نە دزێو دزێوە، هەموو ئینسانن، ئەوە ڕۆژە لێکیان دەکا. ڕۆژ بۆی هەیە بەسەر زۆر شوێن و ماڵ و کون و ئەشکەوت و لێڕەوار و بن‌دار یەکسان تیشک ناوێژێ. ڕۆژ بۆی هەیە بە تین و تاوی بێ ئەمانی خۆی مرۆڤ ئازار بدا. ئەوانەی نیازیان بە فێنکایی‌یەک هەیە دەکەوێتە سەریان لە مەزراکان، لە کێڵگەکان. لە کوورەخانەکان، لە بێگارییەکان‌دا تاوە سووتیان دەکا. توونیان دەکا. بێ

ئاویان دەکا. بەڵام شەو بە ڕەحم و بەزەیی‌یە. بە شنەبای فێنکی، بە تاریکایی یەکدەست و خەست و خۆڵی، ئەوەی هەیە لە ئامێزی دەگری، ڕایدەژێنێ. جیاوازییەکان دەشارێتەوە، دەسەڵاتدار لەسەر تەختی دەسەڵاتی دادەبەزێنێ. و بێ دەسەڵات هەڵدەکێشێ، شەو ئەوەی هەیە و نییە لەیەک نیزیکی دەکاتەوە و لە خەوێکی خۆش و سووک کە هەروەک کفن بە ئەندازەی بەژنی هەرکەس دەیبڕێ ڕوودەکا. شەو بە جریوەی ئەستێرە بێ ئەژمارەکانی کە نیگا و سەرنجی هەر کەس تەنانەت کەریمیش لە ئێش و ئۆف و ژان وکەسەر و بێ کەسی و بێ ئەنوایی جیا دەکاتەوە و بەرەوخۆی ڕایدەکێشێ. دەستی بە هێمنی لەنێو دەستی دەگرێ و بەرەو جیهانێکی نائاشنا و ئەفسووناویی دەبا. ئەوەی دەیانبینێ لە خزم و کەس و کار و بێگانە و نائاشنا و ئاشنا ڕەنگ و ڕوخسار و بیچم و شێوەیان گۆڕاوە. داوەتێک ساز بووە ئەوسەری نادیار. دەستی بێ دۆ تەنیا ئەو دەستەیە کە خەریکە بەرمووری لە گوڵی ساز دەکرد و لە ملی کوڕ و کچی گەڕی داوەتی دەکرد. کەریم لەو کەسانەیە کە هەڵناپەڕێ. خەریکە بەرموور لە گوڵی ساز دەکا. لیزگەیەک گوڵ بە دەستەوە دەگەڕێ، دەگەڕێ، دەگەڕێ، دەگەڕێ تا لەبن دارە مێوێک حاجی‌ژنی دایکی لەگەڵ بووکهەنار دەبینێ. بۆلایان دەچێ. لیزگە گوڵەکەی دەملی دایکی دەکا.

: «دا لێم بکشێوە بێ نامووس! ئەو بەزم و ئەدایانە چییە فێریان بووی؟ برۆ لاییە ئەوە چییە دەملت کردم؟ زووکە لە ملمی بکەوە.»

کەریم پێدەکەنێ: «دایە زۆر لەمێژە بە ئاواتەوەم ماچت بکەم.»

دێت گۆنای حاجی‌ژن ماچ بکا ناهێڵێ.

: «لاچۆ هەتیوە! بەرچاوم مەگرە باچاوم لەو هەڵپەڕینە بێ. چاو بووکهەنار! چاوی لێبکە، ئەی دەسەرسەرت گەڕێم عەوڵا گیان! چەندە جوانی! بووک هەنار! وەرە عەولام ببینە بزانە چ سەرچوپی‌یەکی دەکێشی.»

کەریم بە لیزگەیەک گوڵ دەچێ بۆ لای عەوڵا لە سەرچۆپی و گوڵەکەی لە ملی دەکا عەوڵا ڕووی لێ وەردەگێڕێ. کەریم وەخۆ دێتەوە.

: «باقی ئەتۆ لە خۆڕا وەدوام کەوتی، تۆ نەدەبوو بابت بەجێ بێڵی. لە تۆ زیاتر کوڕی نییە، هیچ دەزانی چەندی دڵ بە تۆوە بوو. بە خودای لە تاوت هەر شێت دەبێ ئەگەر بە قسەی من دەکەی بەیانی زوو بگەڕێوە. بەڵام بە کەس مەڵێ کە ڕوومان لەم لایە کردووە بڵێ چوو بووینە سابڵاغێ. باقی با ڕاستییەکت لە لا بدرکێنم. ڕەنگە پێت سەیر بێ بڵێم کە زۆرم دایک و باب و خوشک و براکانم خۆش دەوێن، بە تایبەت عەولا. بە ئەرکی خۆمی دەزانم و ناچارم بچم دەنا هەرگیز جێم نەدەهێشتن، شەو نییە کە خەوی پێوە نەبینم. بۆخۆی بانگم دەکا. «مەلا» چاوەڕوانی منە.»

: «کەریم! باش دەزانم حەقتە کە لە ماڵتان هەڵێی، ئەوەی بەسەرتۆیان هێناوە بەسەر هەر کەسێکی تریان هێنابا تاکوو ئێستا حەوت کفنی دەدڕاند.»

کەریم دەڵێ: « باقی! شتێکت پێ بڵێم ڕەنگە بڕوام پێ نەکەی. بەڵام بەو هەموو ئازار و جەزرەبەی داویانمێ، ئێستاش ڕووحم هەر لەگەڵیانە، خۆشم دەوێن. ئەگەر ڕۆژێک گەڕاینەوە، خۆم دەخەمە ژێر پێیان و داوای لێبوردنیان لێدەکەم، خۆشییەک نەرم و نیان خزایە نێو لەشیان. ئەگەر شۆڕش سەرکەوێ ئەوانیش پیاوانە دەگەڕێنەوە.

***

## ٣٠

.... سۆفی حەسەن گوتی: «بەخودای کە عەلیم و خەبیرە، هەرگیز باوەڕم نەکرد. هەڵبەت بە قوربانت بم. دەبێ بمبووری کە ئەوەی دەڵێم. لەم تەمەنەدا ئەمن قەباحەتم لێدەوەشێتەوە، بەڵام لە کاوەیسی نەدەوەشاوە. پاک بوو. فریشتە بوو. نا فاتێ فریشتە بوو، کاوەیس مەلاییکە بوو، وەک ئەوان پاکداوێن و خاوێن کوا؟ حەیف و خەسارێ لەو کوڕە باشە. لەوەتی خودا بەشەری سازکردووە نا، نا ئەستەغفڕوڵڵا دەبێتە درۆ، لەوەتی ئەمن چاوم کردۆتەوە لەو کوڕەم بە ئیمان‌تر و ڕاست‌تر نەدیوە، ئەو بوختانەی بە کاوەیسیان کردبوو، شتێک نەبوو کە کەس باوەڕی پێ بکا، بەڵام ئەو بەڵایەی براکانی فاتێ بەسەر کاوەیسیان هێنا و بێ سەروشوێن چوونی کاوەیس، کە لێرە نەبوو تا بێ‌تاوانی خۆی بسەلمێنێ و ئەو درۆ هەڵبەستن و ئەو قسانەی ئامینە شەل بۆی هەڵدەبەستن وەک ئەوەی کە دەیکوت: «خۆم بەو چاوانەی خۆم دیومە کە... هێندێک خەڵکی هێنایە سەر ئەم باوەڕە کە ڕەنگە ئەم ڕووداوە ئەو جۆرە بێ کە دەیگێڕنەوە. ئێمە چوزانین دە تاریکایی داین. بە ڕاستی ئاغای دوکتور بە قوربانت بم من نازانم. بۆچی خەڵک هەتا زۆرتر ئازار دەکێشن و سووک دەکرین و ناو و ناتۆرەیان لێدەدرێ. لە بری ئەوەی ئەم دەرد و ئازارانەی کە چێشتوویانە ببێتە هۆی بەرەو پێش چوونیان و بەرەو حەوڵو تێکۆشان بۆ ڕزگارییان لە دەست دەرد و ئازارەکانیان، زۆرتر لە پلەی ئینسانییەتی خۆیان دا دەبەزن و دەکەونە گیانی ئەو کەسەی بە هەر هۆیەک باری لەنگ بووە و کۆستی کەوتووە. خۆ ئیتر وازیشی لێ ناهێنن، تەنانەت بە مردنیش لێی ڕازی نابن. سەدان جار زیندووی دەکەنەوە تا بە شێوەیەکی دڕندانەتر سەر لەنوێ بیکوژنەوە. ئەرێ بە قوربانت بم دوکتور گیان! تۆ بڵێ ئەگەر ڕۆژگار چارەڕەشێکی کە هەمیشە پێشی وێراوە لە عەرزی بدا، ئاخۆ ڕەوایە من هەل بقۆزمەوە بچم لەسەر

جەستەی داهێنراو و شەکەت و کوتراوی ئەو بێچارەیە ڕاوەستم و هەست بە مە بکەم کە گەورەتر لە جارانم. من هەست دەکەم هەروەک کەمتیارمان لێ هاتووە خوا نەکا یەکێک لە دەوروبەرمان لێی بقەومێ و بکەوێ. وەها بە کۆمەڵ دەکەوینە سەری و لە ناوی دەبەین کە هیچ گیانلەبەرێکی دڕندە ئەم کارە ناکا، من دەزانم تا کاوەیس ون بوو خەڵکی چییان بەسەر بیرەوەری کاوەیس هێنا. لە بناغەوە هەڵیان وەشاندەوە، بە راوەژوویان کردەوە. دایکە قوڕ بەسەرەکەیان لەکاوەیس خراپتر پێکرد. سەد کەڵەگایان بۆ دیتەوە، تۆمەتی بیژووهاویشتنیان لێدا هەڵبەت ئەودەم کە تازە مراد کوژرابوو، وەها ڕەفتار و ڕەوشتێکی ناحەز و نالەباریان بە کاوەیسەوە چەسپاند کە پیاو کوژ و جەردەش بە بیستنی ڕادەچەنین.

دوکتور لە سۆفی حەسەن دەپرسێ کە کاوەیس کوڕێکی چۆن بوو؟

: «چ جۆر کوڕێک بوو؟ بە ڕاستی دەتگوت مەلایکەیە، ڕەزا سووک، لاوچاک، لەسەر دڵان، پاک و بە حەیا، بە دەردومەرگی خەڵکەوە بوو، دەنگ خۆش و بە گفتولفت، حەیران بێژی ئاوا دەنگ خۆش و شارەزا هەر نەبوو، تەواو بە قەرا دە کوڕی خەڵکی بوو. نیوە شەو چووبایە شوێنی و گوتبات ئەم گرفتەم هەیە بێ یەک و دوو لەگەڵت دەهات. ماندوویەتی نەدەناسی، هەرچەند خودا زوو بابی لێ ئەستاند بەڵام ئەمن پێم وایە مەلائیکە بۆخۆیان بە خێویان کردبوو. ئێستا دوکتور گیان بە قوربانت بم تۆ بڵێ کەی لە کوڕێکی وا خەتایەکی گەورە دەوەشێتەوە. بڕوام پێبکە براکانی فاتێش باوەڕیان نەکردبوو. بەڵام هەرچی کردی ئامینە شەل کردی...»

دوکتور دەپرسێ کێ؟ ئامینە شەل؟

: «کوڕە کاوەیس ئەتۆ بۆ وا حەپەمێشخۆر و سادە و ساویلکەی، بەخودا گاڵتەت پێدەکا. تۆ لە خۆڕا خۆت بە فاتێ بەستۆتەوە. هەر بۆخۆت کڵاوت بکە بە قازی، پێم بڵێ. فاتێ جوانترە یان کەژاڵی کچی کوێخا برایم؟ کە وەختە بۆت شێت و شەیدا بێ و تۆ خەبەرت نییە، باشە بە ڕاستی کامەیان دەوڵەمەندترن؟ لەمێژە بەتەمایە ئاوڕێکی وێدەیەوە. بڕوام پێ بکە بە سەری ئەو تاقە کوڕەم بە ڕاستمە، تۆی ناوێ. خۆت باش دەزانی من چەندەیان لێ نیزیکم ئاگام لە هەموو

سرِوترِیان هەیە. کاوەیس قسەیەکت پێ دەڵێم بەڵام تۆ ئەو جوانییەی خۆت لە لای کەس نەیدرکێنی. ئەوەتائەم سەرکڵاوەی داومێ بۆ هەمزاغای بەرم تا بۆ خوشکەزاکەی بنێرێ. من هەست دەکەم فاتێ پێی ناخۆش نییە تێکەڵاوی ماڵە ئاغای بێ. دەی بۆخۆت بڵێ تا ماڵە ئاغا لەوێ بێ کوا کاوسێن فاتێ دەدا بە تۆ؟»

هەزار تیری ژاراوی بە دەست هەزار چڵکنی نادیار بەرە و دڵی کاوەیس ڕەوانە کراو، یەکێکیشان کوێرەی نەکرد و لە سەر دڵی کاوەیس نیشتن. سەر کڵاوەکەی خۆی بەدەست ئامینەوە دیت، نا سەر کڵاوەکەی خۆی بە دەست ئامینە شەلەوە دیت کە بۆ ماڵە هەمزاغا دەچوو.

: « پووره ئامین! نازانم باسی چ دەکەی؟ تکایە واز لە من بێنە.»

ئامین وازی لە کاوەیس هێنا. بەڵام کاوەیس وازی لە کاوەیس نەهێنا، سەدان کورتە چیرۆکی لەو ماوە کورتەدا نووسی. لە هیچ کامیان‌دا دەورێکی بەر چاوی وەبەر نەکەوت. لە بەرانبەر هەمزاغا و خوشکەزایەکەی خۆی بە دۆڕاو دەدیت.

سۆفی حەسەن بە دوکتوری کوت: «ئامین بە ڕاستی شەیتان بوو هەموانی وەجووڵە و کایە خستبوو، کە سەرکڵاوەکەی فاتێی بۆ هەمزاغا برد، هەمزاغا هیچ گومانێکی نەمابۆوە کە ئامینە شەل بۆی لەخشتە بردووە. کە سەر کڵاوەکەی پێشانی کاوەیس دا، گەرای شک و گومانی دەدڵ هاویشت. بە تایبەتی پێشتر ئەوەندەی دووزمانی لە لای براکانی فاتێ کردبوو، کەئیزنی چوونە سەر کانییان نەدەدا بە فاتێ و تا دەگەیشتنە کاوەیسی بەمۆڕە دەیانبزاوت. کاوەیس کە تامەزرۆی دیداری فاتێ بوو ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژێ کەم چیکڵدانە تر و بێ وازتر دەبوو. کە دەهاتە ماڵێ فاتێ بەر لە هەرشت باسی ژوانی بە دزی کەژاڵ و کاوەیسی بۆ ماڵێ دەگێڕاوە و ئاوری دە هەناوی‌دا دەکردەوە.

هەرکە دەنگۆ بڵاو بۆوە کچی کاوسێن خۆی دۆڕاندووە کەس بڕوای نەدەکرد کچێکی تا ئەم ڕادەیە جوان و بە حەیا، کە لە بەند و حەپسی حەوت برایان دابوو و هەرگیز نەبوو بە بێ ئیزنی ئەوان قامک دەئاوێ بنێ، توانیبێتی تووشی ئەم هەڵە گەورەیە بووبێ خەڵک دەیانکوت: «کەی؟ لەکوێ؟ لەگەڵ کێ؟»

ئامینە شەل چووبوو داوای لە براکانی فاتێ کردبوو یەکدا بە دوو باسی دەست درێژی کاوەیس بۆ ئەو ئەکەن، ئەگینا زوو حاشای لێدەکا، وا باشترە بە ڕووی خۆش لێی بپرسن کە دڵی داوە بە کێ. دڵنیای بکەن کە ئەگەر ڕاستییەکەی بڵێ نە تەنیا کاریان پێی نەداوە بەڵکوو ئەگەر ئەو کەسە داواکاری بێ، بە ڕووی خۆشەوە وەری دەگرن. لە ڕێگەی ئەم فرت و فێڵەوە بوو کە ناوی کاوەیس لە زاری فاتێ هاتە دەر هەڵبەت هەر وەک خۆشەویستێکی ئازیز نەوەک دڕندەیەکی کە ئامینە شەل بە براکانی فاتێی ناساندبوو، دوکتور ئەم پرسیارەی لە سۆفی حەسەن دەکرد: «سۆفی حەسەن بەڕاستی لەنێوان فاتێ و هەمزاغا یان خوشکەزایەکەی کەینە و بەینەیەک هەبوو؟»

: «بە قوربانت بم دوکتور گیان. هەر ئەودەمی هەمزاغا لە شێستی تێپەڕاندبوو. ناحەزی وەک خۆی نەبوو. وەک دەگێڕنەوە و لە زمانی ئامینە شەلیشم بیست فاتێ هەرگیز نەیدەگوت هەمزاغا هەر پێی دەگوت هەمزەکوێر، مەحاڵە شتێکی وا هەبووبێ، هەمزاغا بە تەمەن وەک باپیری فاتێ دەبوو، ئەوانە هەروەک لە دوایەدا زانیم هەمووی لەبن سەری ئامینە شەل دابوو، من گومانم لەوەش هەیە کە هەمزاغا فاتێی بۆ خۆشکەزایەکەی ویستبێ، تازە ئەگەر لەوانە واز بێنین، هەمزاغا بۆخۆی ئەوەندە گیروگرفتی هەبوو کە ئەگەر ئامینە شەل سێ سەرەی لەسەر هەمزاغا هەڵنەگرتبا. هەر نەیدەزانی فاتێیەکیش هەیە، کە سەر کڵاوەکەی دابوویە دەست هەمزاغا پێی کوتبو: «خەنی لە خۆت هەمزاغا، ئەوە دیاری فاتێیە بۆ تۆ، بە تایبەتی بۆ تۆی چنیوە، چاوەڕوانە هەرچی زووتر بێت و قەرەواشی تۆ بکا.»

هەمزاغا پێی گوتبوو: «کچێ ئامین دەس هەڵگرە، لەکۆڵ بەوە. من و ئەو منداڵەیان نەکوتووە، چت دەوێ بتدەمێ و دەست لەو سەرە کەچەڵەی من هەڵگرە.»

: «نا، ئاغا بەسەرت درۆت عەرز ناکەم. چاوەڕوانە، بڕوام پێبکە بێتە لات دەبییەوە لاوی حەفدە ساڵە. بە چەشنێکی بۆخۆت خۆت ناناسیوە. تۆ کارت بەوەنەدابێ. تۆ وەک من ژنان ناناسی، مەگین حەز دەکەی ئەو دەسکەگوڵە بە

نەسیبی هەتیوی زڵەخا دڵتۆقیوی بێ شەو ڕۆژ پاشملە باست دەکا  و گەپت پێدەدا.»

: «ئامین کچێ لە خودای بترسێ ئەوەندە بوختان بە خەڵکی مەکە.»

: «جا ئاغا بڕۆ بۆخۆت پرسیار بکە ئەگەر وانەبوو وەرە هەزار شەپ دەمن هەڵدە.»

سۆفی حەسەن بە دوکتوری گوت: «خۆ بە ڕاستی وا نەبوو ئامین دوایە بە منی کوت بۆ خۆم ئەو درۆیەم بۆ هەڵبەست. کاوەیس هەرگیز قسەی سووک و ناحەزی بە سەر زاری دا نەدەهات.»

دوکتور دەڵێ: «سۆفی حەسەن بە ڕاستی ئەو قسەیە ڕاست بوو کە فاتێ داوێنی پیس ببوو؟»

: «بەخودای نازانم چۆن بوو ئەودەم زۆربەی خەڵک باوەڕی بەمە هێنابوو. بەتایبەت براکانی فاتێ هەربۆیە ئەگەر ژاندرمەکانم ئاگادار نەکردبا، هە رئەودەم چەند خوێن دەڕژا، من بە دووشتان باوەڕی تەواوم هەبوو. هەوەڵیان پاکی و بێ تاوانی کاوەیس بوو دووهەمیش پاکی و بێتاوانی فاتێ بوو. ئەم ڕاستیەشم چەند ساڵ دواتر کەهیچ سەروسۆراغێک لە کاوەیس نەمابوو زانی و فاتێ کە هەرگیز دەستی هەمزاغا و خوشکەزایەکەی پێی ڕانەگەیبوو لە بری کاوەیس و هەمزاغا و خوشکەزاکەی بە نسیبی حەمە ناحەز بوو، حەمە ناحەزی قاچاخچی. فاتێی قوڕبەسەریش هەر شەوەی لێ بوو بە هەزار شەو. کە حەمەی قاچاخچی کوژرا، هەرچەند تەمەنی فاتێ ئەودەم بیست و چەندساڵێک بوو. دەتگوت ژنە دۆمێکی پەنجا ساڵانەیە. وەها تێک شکا مەگین خودا بزانێ. ئەو جۆرەی لەم دواییانەدا بیستوومە، غەفوورەگێڕ پشتی تێکشکاندووە و لە دەستوپێی کەوتووە. ئەگەر دەوروبەرەکەی بەزارێوە نەکەن لەبرسان دەمرێ. سەد حەیف و خەسارێ لەو هەموو جوانییە کە لەخۆڕا هەڵوەری.»

دوکتور چووە بەر پەنجەرە و ڕاوەستا. ماوەیەک بوو کاری ئەوە بوو کە شەوانە ئاسمانی پڕ لە ئەستێرەی دەپشکنی.

***

# ٣١

... دڵم نەدەچوو، ناردیانم، ئێستاش کە بیری لێدەکەمەوە. دەبینم کە هەمیشە ناردوویانم بەبێ ئەوەی هەرگیز دڵم بۆی چووبێ. تەنیا، غەریب، تاساو، بێدڵ، مێردی پوورم ئەفسەر بوو. ماڵیان لە تەورێز.  بۆ کاری ئیداری بەڕێ کرابووە شوێنێکی تر. منیان ناردبووە ماڵە پوورم تا لەو ماوەیەدا ئاگام لە خۆی و منداڵەکانی بێ. هەرگیز هیچ دوورییەکم هێندەی ئەم دوورییە پێ دوور نەبووە. کەسێک کە نەمدەزانی کێیە؟ دڵمی بە هیچ و خۆڕایی ئەستاندبوو. خۆشی لێ بە سەحێب نەدەکرد. نە ناوێکم بە دەستەوەبوو، نەئادرەس و شوێنێک و نە خەیاڵێکی وێنەکێشی هونەرمەند تا لەسەر بوومی زەینم وێنەیەکی ئەوم بۆ بکێشێتەوە، کە پێی سەرقاڵ بم. نارەفیقترین کەسی من خەونەکانی منن، کەچی؟ نیزیکترین دۆستی مەترسیەکان، ئازارەکان، جەزرەبەکان و دوژمنەکانی منن. کە چاوەکانم سەر بەخۆ دەبوون و ئیختیاریان لە دەس دەردەهێنام و وێک دەهاتن، ئەوەی نەتەویم بوو، ئەوەی نەیار و دوژمنم  بوو، ئەوەی نەخۆشی و ترس و خورپە و دڵەڕاوکە و مۆتە و دەرد و ئازار بوو ڕێچکەیان دەبەست تا بەیان دەنگوت. ئەوەندە لەسەر داگیرکردنی من شەڕ و کێشەیان دەبوو کە خۆم سەرەڕای ئەوەی کە هەمیشە زگم بە خۆم دەسووتا زگم بەوانیش دەسووتا، بەستەزمانانە هەرگیز ئاگاداری ئەم ڕاستیە نەبوون. کە تاڵان کردنی کەسێکی پێشتر تاڵان کرابێ. هیچ دەستکەوتێکی بۆئەوان تێدا نابێ. بەڵام هەرکە ڕۆژ دادەهات کێشەکە ئاوەژوو دەبۆوە، من سوار و ئەوەی خێو و پیاوی شەڕە پیادە بە کووچە و کۆڵان و شەقامەکانی نائاشنای تەورێز دا

ڕادەبردم چ خانوو بەرەیەکی خۆش نەبوو کە بە گیرفانی بەتاڵ نەیکڕم هەر بە خۆڕایی و مفت.

: «دایە: ئەو خانوویەت پێ چۆنە. پێم وایە ئەگەر بۆخۆت لەم دیوە گەورەیەدا دابنیشی باشترە، تاوی زۆر تێدەکا. ئەوە ڕاشم سپاردوە قەرەواشێک هەمیشە بە دەور و بەرتەوە بێ. ئیتر پێویست ناکا لەمە بەدوا خۆت ئەوەندە ماندوو بکەی، نیازت بە هەرشتێک بوو قامک لەسەر ئەو زەنگەی دابنێ. دەسبەجێ. شۆفێر و ماشێن لەبەر درگا چاوەڕوانتن.»

: «ڕەببی ڕۆڵە گیان! خودا ئاگادارت بێ ئەوەندە خۆت دە زەحمەت ماوێ.»

: «ئەرێ کاکە! بۆ پێمان ناڵێی ئاوا بە پەلە بەرەوکوێ دەچین؟»

: «ڕۆڵە! تۆ چت پێداوە؟ دیارە دەچینە شوێنێک. پاشان بۆخۆت دەزانی.»

خوشکم دەنگم دەدا: «کاکە گیان! چاو لەو باخە بکە دەڵێی بەهەشتە، ماشاڵڵا چەندەش گەورەیە.»

پوورم دەیگوت: «پێم وایە دارێک لە دنیادا نییە کە لەم باخەدا نەبێ.»

دایکم دەڵێ: «ئاخۆ بڵێی ئیزنمان بدەن ڕۆژێک بۆ سەیرکردنی بچینە ناو باخەکەوە؟»

دەگەینە بەر درگای باخەکە، ماشێنەکەم ڕادەگرم، دێمە خوار. لەپڕ دوو نیگابان و باخەوانێکی لاو لە دیوەکەی بەر درگا دەردەپەڕن و بۆلام دێن. لەبەرم دووقەد دەنووشتێنەوە. بەدەوروبەرم دا دێن. کلکە سووتەم لەبەر دەکەن دایکم، پوورم و خوشکەکان و براکەم واقیان وڕماوە.

: «ئاغا فەرموون، هەر ئەو جۆرەی ئەمرتان کردبوو، هەمووشت ئامادەیە، ڕەژی گەشاوەتەوە، کاوڕەکە کەوڵ کراوە، تا چاییەکی دەخۆنەوە، گۆشتەکە دەبرژێ.»

ناچینە ژوورێ، گۆشتە برژاوەکەی ناخۆین، ناچینە سەیری باخەکەش. ئەوێ بەجێ دێڵین. بە قەلەمبازێکی گەورە دیانگەیەنمە ئەو کارگایەی تازە سازم کردووە. هەوەڵ بەرهەمی کارگاکە خەریکە لە ماشێن دەدرێ و بەڕێ دەکرێتە بازاڕ. شیرینی بڵاو دەکرێتەوە، کرێکارەکانم لە خۆشیان ماشێنەکەم

گوڵباران دەکەن. بۆ پاشنوێژێ بە تەنیایی لە ماڵە پوورم وەدەر دەکەوم. دەچمە دیتنی فیلمی ئەژدیها دێتە ژوورەوە، من دەبمە برۆسلی. بەڵام نا ئەوە برۆسلییە کە دەبێ بە من، یان چ دەقەومێ؟ با من و برۆسلی هەرتک یەک بین. ئای نازنی چ دەکا و چ ناکەم. ئەو لەکێ دەدا و من لە کێ؟ ئەو پارێزگاری لەکێ دەکا و من لە کێ؟ ئەو دڵ دەداتە دەستی کێ و من دڵم داوە بە کێ، هەر لێرەیە کە رزمەی شکانی شووشەی بەتاڵی خەیاڵم دێتە گوێ. بە یەکجاری بەتاڵ دەبم. لە هەرچی هێز و گوڕو تاقەت و جوانی و سەروەت و سامان و دەسەڵاتە. کوڕێکی تەنیای غەریبی بێ دڵم کەهەرچی دەکەم و دەکرێنم وێنەی کیژۆڵەیەکم بۆ ناخرێتە نێو چوارچێوەی هەڵبەستی خەیاڵم. بە شەقامە قەرەباڵغەکانی شاری تەورێزدا ڕادەبرم. تا بەڵکوو وێنەی دڵخوازم لە ڕوخساری کیژێکی ڕاگوزاری تەورێزی بچێ و من دەزەینمدا وێنەیەکی لەم کیژە هەڵگرم. بەڵام ئەو وەکوو هیچیان ناچێ. نا، نا، نا، ببوورن. هیچیان ناتوانن وەک ئەو بچن.

جارێکی تر وەک هەزاران جاری دیکە لەو ماوە کورتە سێ مانگەدا یان دروستر ئەگەر بڵێم لەو دوو مانگ و بیست و نۆڕۆژ و هەشت ساعەتەدا وەبیر خۆمی دێنمەوە لە کوێدا بووم؟ بەڵێ لێرەدابووم. هەبوو نەبوو، ڕۆژێک بوو وەک هەموو ڕۆژانی تر، نا، وەک هیچ ڕۆژەکانی تر نەبوو، من نەچووبوومەوە مەدرەسە، مەدرەسە دانەخرابوو، من خۆم دزیبۆوە. وا هەبوو کە جار جارە خۆم بدزمەوە. زۆرتر ئەو کاتانە بوو کە لەگەڵ سولەیمان و عەبە و هەمزە و سەلاح دەچووینە سینەما ئومید. دەبوو یەکی تمەنێکمان پێبوایە. هەرکاممان ڕێگایەکمان دۆزیبۆوە بۆ وەدەست هێنانی ئەم پووڵە. عەبە کاری لە ئێمە سادەتر بوو. دایکی چاوی کوێر بوو. عەبە دەیزانی دایکی پووڵەکانی لە کوێ و لەبن کوێ و لەنێو چی دا دەشارێتەوە هەموو جارێ بێ ئینسافی نەدەکرد. تەنیا پازدە قڕانی لێ هەڵدەگرت. تمەنێک بۆ کڕینی بلێت و پێنج قڕانیش بۆ کڕینی تۆوی گوڵەبەڕۆژە و سنجوو و قاوت و کولێرەی شاپەسەند و بەشی هەمووومانی دەدا، خودا ڕووحی عەبە شاد بکا زوو مرد. هەرچەند دایکی هەستی دەکرد پووڵەکانی کەم دەکەن

بەڵام عەبە ئەوەندەی بەم لاو بەولادا دەبرد و ئەوەندەی حیساب لەگەڵ دەکرد تا خاترجەم دەبوو کەبۆخۆی پووڵەکەی خەرج کردووە و لەبیری نەماوە، دایکی عەبە سواڵکەر بوو. سەلاحی کوڕە پوورم هەموو ڕۆژێ لەبەری بەیانەوە تا پاش نوێژێ دوو کەشەفی مەشکەفی دەفرۆشت، سێ تمەنی خێر بوو بە دوو تمەن ئیجازەی سینەما چوونی لەدایکی دەکڕی و تەمنێکیش بلێتی پێ دەکڕی، کاری ئەویش ڕاحەت بوو. هەمزە چی پێ نەدەکرا، هەمیشە لە چەند جاران، جارێکی دەهاتە سینەمایە. سولەیمانیش کە قڕانەکەی ڕۆژانەی دەپزووی دەرپێکەی‌دا پاشەکەوت دەکرد هەمیشە پوڵی هەبوو. بەڵام من بە سەگ مەرگی پووڵەکەی خۆم پەیدا دەکرد پیرەژنێکم دەناسی  کە گڵەسەریان هەبوو، بە خەڵکیان دەفرۆشت. هەر توورەکە نایلۆنەی پێنج قڕان بوو. دەیدامێ بۆی بفرۆشم. هەر توورەکەی کە فرۆشتبام قڕانێکی وەبەر من دەکەوت، دەبوو تەواوی گەڕەکەکانی شار بەو بارە قورسەمەوە بتەقێنمەوە تازە دەبوو پێشتر لە مەدرەسە خۆم بدزمەوە و هەموو جارێ ئاکامی ئەو خۆ دزینەوەم لێدانێکی تێر و پڕ بوو کە وێم دەکەوت بەڵام بە باوەڕی ئەودەم و ئێستاشم سینەماچوونێک ئەوەندە لێدانەی دەهێنا. ئەڵبەت دەبێ بڵێم بۆ فرۆشتنی ئەو گڵەسەرە دەبوو ئەوەندە بخولێمەوە و ئەوەندە هەراکەم کە دوایی نە لاق و نە دەنگ و نە ڕەنگێکم بۆ نەدەماوە، هەموو جارێ پیرێژن کە خودا لەویش خۆش بێ کە ئاوا بەکەساسی دەیدیتم. زگی پێم دەسووتا و دوو قڕانی زیادی دەدامێ کە ئەوانەی قڕانی ئەو دەمیان خەرج کردبێ دەزانن پیرێژن چەندە سەخی بووە.

من دەڵێم خۆزگە ئەو ڕۆژەش لەو ڕۆژانە بوایە کە دەچووینە سینەما. بەڵام خۆم لە مەدرەسەی دزیبۆوە تەنیا لە بەر ئەوەی لە جیاتی شەڕەگەڕەک بە بەرد و دار و گۆپاڵ و باربەندی تێل لەگەڵ گەڕەکەکەی ئەو بەرمان، بڕیاری کێ بەرکێی دار و هەلووکمان دابوو و ڕەنگە هەر لەو کاتەش‌دا ئەو دوو کیژۆڵە تازە پێگەیشتووانە بڕیاری چوونە جێگایەکیان دابێ. من زۆر کوڕی هاوتەمەنی خۆم بگرە گەورەتریش دیوە کاتێک دەکەونە ژێر بارانی جنێو و تەوس و لەقەمی کچان، زۆریان کەیف پێی ساز

بووە. شانازی بە خۆیانەوە دەکەن، وەک بەڵگەی سەلماندنی خۆیان، چەسپاندنی کەسایەتی خۆیان، چاوی لێدەکەن. کەچی من پێی ڕووخام. من لەوەتی بووم و وەبیرم دێ هەر ڕووخاوم و هەستاومەوە. ڕووخاندبوویانمەوە، سەرم هەڵدابۆوە. بەڵام ئەم ڕووخاندنە، شتێکی تر بوو. وەک ئەوەی کارەساتێکت بەسەر هاتبێ، کە لە دواییدا بە هۆی ئەو کارەساتە خۆت لێ ون بووبێ. بە ماڵە خۆت نەزانیەوە، نەشزانی دەبێ ڕوو لە کوێ بکەی. نامۆیی لە ئازای لەشت بکەی. ئاڵوگۆڕێکی سەیریان بەسەر دا هاتبێ بە چەشنێکی بە مەیل و ویستی تۆ نەجووڵێنەوە. پێکەنینت، گریانت، هەناسەکێشانت، ئازارکێشانت، دەستت، پێت، چاوت، دەم وگوێ، لە ڕاستی دا تۆ دەتوانی هەر کەسێکی تر بی بە دەر لە خۆت. تەنیا ئەوەندە دەزانی کە کەسێک هەیە کە ناسنامەی ڕاستەقینەی تۆی لە لایە. ئەو کەسەی کە یەکێکی تر بە هەلووک لە پشتی ئاواڵەکەی دەدا، بەڵام خۆی لە جیاتی ئاواڵەکەی ڕوو لە تۆ دەکا، ئەو دەم کە دە دووچاویدا ون بووی، تەنیا لەبەر ئەوەی کە دەست بەسەر ناسنامەکەی تۆ داگرێ. پێت دەڵێ: «بێ تەربییەت» و هەر لەو کاتە ناسکەدایە کە ئەم گوڕانە دەروونییە ڕوو دەدا و تۆ ئیتر وەک خۆت نامێنی.

***

## ٣٢

.... ماوەیەک بوو بەڕێوەبووین. وێدەچوو ئەم ڕێگایە هەرگیز بە تەواوی نەبڕێتەوە، ئەوەندەمان ڕکێف کوتابوو، شەکەت ببووین. عەلیلە وەک هەمیشە وەپێش کەوتبوو. لە تۆزوخۆڵی ڕێگا دا خنکابووین. عەلیلە ئاوڕی داوە و گوتی:

: «وابزانم ئەم جارەش درۆیان لەگەڵ کردووین، بە کەریان زانیوین ئەگینا لە کوێن؟ ئەی بۆ هیچ پەلامارمان نادەن؟»

قالە هەر لەسەر ئەسپەکەی ڕا هەڵیدایە و گوتی: «بۆخۆیان هەواڵیان دا بە من، تازە عەلیلە دڵم نەهاتووە هەموو قسەکانت بۆ بگێڕمەوە. دەنا سەد قسەی سووک و ناجایزیان پێ گوتی.»

: «قالە پێم بڵێ چییان بە من گوتووە کە تووشیان هاتین بتوانم پێیان بڵێمەوە.»

: «هەر وەدوای مەکەوە، بۆ گێڕانەوە نابێ.»

من کە لە بەرخاتری نازێ هەرچی عەلیلە بیگوتبایە هەر ئەوم پێ هەو بوو، هاتم بە قالەی بڵێم: «دەی خوێڕی بەتۆش دەڵێن ئاواڵ. چۆن لەبەر چاوت سەد قسەی سووکیان بە عەلیلە گوتووە. لەسەری وەجواب نەهاتووی و هەر بێدەنگ ماویەوە» بەڵام ئەو قسەیەم هەرچەند ئامادە کردبوو کە بیلێم نەمگوت تەنیا گوتم: «قالە عەلیلە ڕاست دەکا. بۆ جنێوی پێ بدەن و دەنگ نەکا و وەک حیزان سەرداخات. ئەوە خوێڕیگەرییە ئیتر، تۆ پێت خۆشە نازێ خوشکی تۆ بایە و خەڵکی قسەی ناحەزیان پێ گوتبا؟»

: «ئەتۆ دەڵێی چی؟ کێ گوتوویەتی قسەی ناحەزیان بە نازێ گوتووە؟»

: «دەی دیارە قسەی پیس یان بە دایکی ئینسان دەڵێن یان بە ژنی یان بە خوشکی. خۆ عەلیلە ژنی نییە تا جنێوی پێ بدەن، دەمێنێتەوە خات فاتێ و نازێ، بۆخۆت دەزانی کە خات فاتێ ئەوە دەجێیدا کەوتووە. بۆ جنێو نابێ دەی جا هەر نازێ دەمێنێتەوە. بۆ ئەو هەتیوانە بوێرن جنێو بە نازێ بدەن؟»

قالە هەر لەسەر ئەسپەکەی ڕا مۆڕەیەکی لەمن کرد و گوتی:

: «چاو چاو ئەوە لەخۆڕا خۆی دەشتان هەڵدەقوتێنێ، ئەتۆ چی عەلیلەی، قسان دەکەی؟ جنێویان بە عەلیلە داوە نەک بە تۆ، ئیدی ئەتۆ دەڵێی چی؟»

:«چون بەمن چی؟ عەلیلە ڕەفیقمانە دەبێ لەسەری وەجواب بێین، مەگین ئەو کەم لەسەر ئێمە وەجواب هاتووە و وێی کەوتووە؟»

عەلیلە دەڵێ: «واوێدەچێ گەپمان پێدەدەن دەنا ئەوە لە گردی دارەتووش ئاوا بووین، ئەدی ئەو ترسەنۆکانە لە کوێ خۆیان حەشار داوە؟»

قالە ڕووی لە من کرد بەڵام ئێستا زاری نەکردبۆوە کە ئەو شتەم پێ بڵێ کە ئێستاش نازانم چ بوو کە لە سێلاوە بەردەباران کراین. بە پەلە لە ئەسپەکەمان دابەزین و هەوساری ئەسپەکانمان بەدەستەوە گرت و هەر یەکەی خۆمان لەبن بەردێکی گەورە حەشار دا.

عەلیلە هەر لەبن بەردەکەی دا گوڕاندی: «دایکتان دەگێین ئەگەر ناترسن بەرد مەهاوێن وەرن لە پێشەوە بەشەڕ دێین.»

کەسێک کە بە دەنگیڕا ناسیمەوە و زانیم مچە کوێرە گوتی: «دایکیشتان دەگێین ئەگەر بۆخۆتان ڕاست دەکەن لەبن ئەو بەردانە وەرنە دەرێ.»

قالە یەک بە خۆی گوتی: «مچە کوێر! هەتیوە! مەگین بۆخۆت نەتگوت هەر بەشەپ و مست بەشەڕ دێین؟ ئەی ئەو بەرد هاویشتنەتان لە چییە؟»

عەلیلە هەرای کرد: «هەتیوە حەرامزادەیە! مچەکوێر! لەبیرت چۆتەوە ئەوێ جارێ چەندم تێهەڵدای، بە چەند کەسان ژێر نەدەبوویەوە. ئێستاش قەیدی نییە، ئێوە پێنج کەسن. بەڵام ئێمە تەنیا سێ کەسین، وەرنە دەرێ ئێمەش بەردان ناوێین. ئەمن کەمێک سامم کردبوو. قالەش لە ڕەنگی ڕوخسارێوە دیار بوو لەمنیش پتر ترساوە. هەرچەند زۆر کەڵەگەت و درێژ

بوو. بەڵام هەر لاقت گرتبایە دەسبەجێ فسی دەخوارد و دەکەوتە عەرزی. عەلیلە بە منی گوت:

: «تۆ هیچ مەکە تەنیا ئاگات لە قالەی بێ لە عەرزی نەدەن، دەنا دۆڕاوین چونکە زوو وەگریان دەکەوێ.»

سەرەڕای ئەوە کە بڕێک سامم کردبوو بەڵام کە لەگەڵ عەلیلە دەبووم وەغیرەت دەکەوتم و لەهیچ نەدەپرینگامەوە.

مچەکوێر هەر لە دوورەوە هەرای لێکردین: «دا دەستتان هەڵێنن با بزانم بەردتان لەدەستی دا نییە؟»

عەلیلە گوتی: «مچەکوێر ئێوەش دەستتان وەدەرخەن.»

عەلیلە ڕووی کردە من و قالە، گوتی: «ئەسپەکانتان لەو پشتەی بشارنەوە هەتا شەڕەکەمان تەواو دەبێ. با مچە کوێر و دارودەستەکەی نەیانبینن و لێمان نەدزن.»

مچە کوێر گوتی: «عەلیلە چ کەڵەکێکت هەیە؟ ئەوە بە دزی چیان پێ دەڵێی؟»

عەلیلە گوتی: «هیچ ئەوە پێیان دەڵێم چاک دایکی مچە کوێر و دارودەستەکەیان بە کەران بگێن.»

: «دایکی خۆتان بە کەران دەگێین. بزانم ئەوی ڕۆژێ لە مەدرەسەی کە براکەم ئاوی دەخواردەوە، تۆ بۆچی ئاوت لە پشت ملی کردبوو؟»

: «پێم خۆش بوو دەستم خۆش بێ.»

: «دەستت شکێ، گو دەخۆی پێت خۆش دەبێ.»

عەلیلە بە توورەییەوەگوتی: «بابی بابت بێجێ دەکا، زۆریشم پێ خۆش بوو. ئەدی بۆ ئەو توخمە سەگەی برات ئاو دەپشت ملی مندالە چکۆڵەکانی مەدرەسەی دەکا و ئازاریان دەدا؟ دەنا ئەو جارەش ئاو بخواتەوە هەروای بەسەر دێنم.»

مچە کوێر دەستی درێژ کرد و یەخەی عەلیلەی گرت و عەلیلەش هەروای کرد. یۆسف کە هەمیشە لەگەڵ مچە کوێر دەخولاوە هاتە پێش و گوتی

: «یەخەی یەکتری بەردەن. وا نابێ، یەک بە یەک بە مست و شەپ بە شەڕ دێین، هەرکەس لە هەر دەستەیەکی زووتر گریا ئەوان دۆڕاون.»

عەلیلە پەسەندی کرد، ڕووی لە من کرد: «بڕۆ پێشێ بزانم چ دەکەی؟ لێیان نەترسی زۆر خوێڕین. کوڕە بشتکوژن نەگریی.»

گوتم: «نازێ بزانە لەسەر تۆ چ دەکەم، لەت لەتیش بم مەحاڵە بگریم. ئەمن پیاوم.» یۆسف کە زانی ئەمن دێمە مەیدانێ بە مچە کوێری گوت: «مچە! لێم گەڕێ ئەمن بچمە شەڕی، زوو وەگریانی دەخەم.»

یۆسف دوو ساڵ لەمن بەتەمەن‌تر بوو هێندەونیوێکی من دەبوو. یۆسف لە گەڕەکدا تەنیا بە عەلیلە نەدەوێرا. بۆخۆم بە چاوی خۆم دیتبووم کە عەلیلە دەیان جاریش وەگریانی خستبوو، وەک سەگ لە عەلیلەی دەترسا. هەر بۆیە پێی خۆش بوو لەگەڵ من بەشەڕ بێ تا تووشی بە تووشی عەلیلە نەبێ. لە ڕاستی دا یۆسف زۆری پێخۆش بوو بێتە نێو دەستەی ئێمەوە. بەڵام قەت لەگەڵ قالە دانوویان پێکەوە نەدەکوڵی و هەمیشە وەک کێردوپەنیر بوون. دەتوانم بڵێم زۆرتری ئەو شەڕانەی عەلیلە لەگەڵ یۆسف کردبووی، هەمووی لەسەر قالە بوو، یۆسف هەمیشە ئەمنی لە عەرزێ دەدا، ئاخر زۆر لە من بەخۆوەتر و بە تاقەت تر بوو، ئەوێ ڕۆژێ عەلیلە تیرەکەی خۆی دایە دەستم کە بەوی لە یۆسفی بدەم عەلیلە ئەو تیرەی بۆخۆی دروست کردبوو لە دارەگوێزی، دەمستی دا جێی دەبووە بەڵام ئەودەم سەری تیرەکە بە قەرا قامکێک وەدەر دەکەوت نووکی تیژ کردبوو هەرووەک تیری ڕاستی، تیرەکەی عەلیلە هەربستێک دەبوو و نەدەبوو، بەڕاستی وە هەرکەس کەوتبایە دەسبەجێ وەگریان دەکەوت. ئەگەر عەلیلە تیرەکەی دە مستی‌دا بایە بە دە منداڵیش باشاریان نەدەکرد. یۆسف ئەوێ ڕۆژێ هەرگیز نەیدەزانی ئەمن بۆ نازێ شەڕم دەکرد! کە هاتمە نێو مەیدان یۆسف تەواو لەسەر جێگەی خۆی ڕاوەنەستابوو کە خۆم بە جووت لاقی دادا و لەپڕ کێشامن، بە قوون بەربۆوە و سەر عەرزی. مچە کوێرگوتی

: «ئاوا نابێ، ئەوە نامەردییە.»

عەلیلە گوتی: «حەک بژی. جا چاکی بکوتە.»

بە هەموو هێز و دەمای خۆم بە تیرەکەی عەلیلە کە دەمستم دابوو کەلەکەی یۆسفم داگرت. هەوەڵێ پێی عەیب بوو بگری لەپڕ هاواری بەرز بۆوە، مۆڵەتم نەدا تۆڵەی جارانیشم لێ کردەوە، چەند جاران لە خۆڕا پێشی پێگرتبووم و لێیدابووم. بە تەواوی کەوتبوە ژێر چنگم. لەسەر سینگی دانیشتبووم هەر تێم دەکوتا و دەمگوت: «دەیجا ئێستا دەڵێی چی؟»

«ئەو زەلامە وەها دەگریا چۆن؟»

مچەکوێر گوتی: «ئەوە نامەردییە بە تیر لێی دەدا.»

عەلیلە گوتی: «خۆ لەپێش‌دا توانیبووی لە عەرزێی بدا، قەبووڵتە دۆڕاوە یان هەر بیکوتێ؟»

مچە کوێر بە نابەدڵی گوتی: «باشە قەبووڵمە، بەسیەتی.»

دەڵێم: «نازێ گیان پێت چۆن بوو؟ ڕۆژێکیش ئەوەندە لەو دوو گروبانەی دەدەم کە کاریان بۆ دەکەی هەر نەبێتەوە. نازانم چیان کردووە بەڵام هیچ خۆشم ناوێن.»

: «بەڵام بۆ ئێمە زۆر باشن، زۆریان ئاگا لێمانە.»

: «من کارم بەوە نەداوە. هیچ پێم خۆش نییە بچیە ماڵیان و کاریان بۆ بکەی»

نازێ ئەزییەتم دەکا « ئای حەسوود! حەسوود! چ حەسوودە!!»

دەڵێم:«ئەرێ نازێ! بۆ لەجیات زبێد تۆ نایەی کارێ بۆ ماڵە ئێمە بکەی واز لەو دوو گرووبانەی بێتە.»

نازێ دەڵێ: «ئای فێڵەزان زۆرت پێخۆشە بێمە ماڵی ئێوە و کارتان بۆ بکەم.»

دەڵێم «ئەرێ زۆر زۆرم پێخۆشە، ئاخر خۆشم لە هەموو کارێک دا یارمەتیت دەدەم.»

پێدەکەنێ: «ڕاستم پێ بڵێ پێت خۆشە هەر بێم کارتان بۆ بکەم یان وەک ئەوێ جارێ لە کادێنێ خۆمان بشارینەوە؟»

هەستی خۆشییەکەی ئەوێ جارم بۆ نەشاردراوە، سووری هەڵگەڕاندم و لە جێی من هەرچی هەبوو بە نازێی کوت.

نازێ دەڵێ: «ئای فیڵەزان! دەزانم چت لە من دەوێ.»

ئەوەی ئەمن لێم دەویست ئەوە بوو کە نەمدەویست گرووبانەکان لێیان بوێ.

دەڵێم: «عەلیلە! خۆ نازێ گەورە بووە. مەهێڵە بچێ کار بۆ ئەو دوو زەلامەی بکا.»

عەلیلە پێی خۆش نییە بچێ، تەنانەت خات فاتێش پێی خۆش نییە. تەنیا لەبەر ئەو پەنجا تمەنەیە کە زۆریان نیاز پێیەتی.

عەلیلە زۆرتر خەریکە خۆی دڵنیا دەکا ئەو دەم کە بە من دەڵێ: «قسەیان لەگەڵ کردوون بڕیار وایە ئەو دەمانەی گرووبانەکان لە ماڵ نابن بچێ کاریان بۆ بکا.»

دەڵێم: «عەلیلە ئەگەر بە قسەی من بکەی هەموو جارێ بۆ خۆشت لەگەڵی بچۆ.»

عەلیلە هیچ ناڵێ و دەڕواتە ژوورخۆیەوە.

نازێ! ئەوە یۆسفم بۆ وەگریان خستی. هەر لەبەر خاتری تۆ، چونکە جنێوی پیسیان پێداوی، ئاخری ڕۆژێک مچە کوێریش وەگریان دەخەم.

عەلیلە پێم دەڵێ: «ئەگەر لە شەڕێ ماندوو بووی بکشێوە هەتا قالە بچێ بە شەڕ بێ.»

: «عەلیلە! ئەمن ماندوو نیم دەمهەوێ لە مچە کوێریش بدەم.»

: «ئەتۆ! لە من دەدەی، بڕۆ ڕۆڵە! بڕۆ جارێ بۆنی شیری خاوت لە زاری دێ. بڕو ڕاوەستە با سەردەستەکەت بۆ وەگریان بخەم جا ئەتۆ تێر تێر لە تاوانی بگری.»

هەرگیز خۆم ئاوا ئازا و بەدڵ و جەرگ نەدیبوو، سەد خۆزگە کە نازێ لەوێ بوایە و دیتبامی کە چلۆن لەسەر سینگی یۆسف هەستام و گوتم «جا مچە کوێر ئەگەر دەوێری وەرە مەیدانێ.»

مچه کوێر له داخان وەختە بتەقێ. دەڵێ: «تۆ خودا وەرن چاو لەو ڕۆژە ڕەشەی ئێمە بکەن منداڵە ورکەی دوێنێ، حەریفی[٥٠] دەوێ. هەتیوە خۆێڕییە یۆسف! هەمووی خەتای تۆیە لەبەر ئەو منداڵەی گریای.»
ڕووی کردە عەلیلە و گوتی: «عەلیلە بۆ دەترسی؟ ئەو منداڵەی لە مەیدان بێنەدەر، ئەگەر پیاوی بۆخۆت وەرە، دوایی شتێکی لێ بێ لە چنگ دایک و بابی ڕزگارمان نابێ. گوتم: بۆخۆت منداڵیدوێنێی، بە خۆت و بە تاقە چاوێکەوە قسانیش دەکەی، چت لە عەلیلە داوە. ئەگەر مەردی وەرە پێش بزانە ئەو چاوەشت کوێر دەکەم یا نا؟»
عەلیلە بێدەنگ ڕامابوو. تێیڕا نەدەدیتم ئاوا ڕووداری و مەیدانداری بکەم.
ئەگەر ڕاستتان دەوێ لە عەلیلە و مچە کوێر و ئەوانی تریش زۆرتر، خۆم پێم سەیر بوو من و ئەو هەموو غیرەت و ئازایەتییە، ڕەنگە وڵامەکەی هەر لە لای نازێ بێ.
عەلیلە لە قسەکەی مچەکوێر هێندێک نیگەران ببوو کە لەوانەیە بە دەستی بریندار ببم و دایک و بابم شکایەتی لێ بکەن هەر ئەوە بوو گوتی: «ئەتۆ بەستە، هەربژی، کاری خۆت بە باشی کردووە ئینجا نۆرەی قالەیە.»
گوتم: «عەلیلە! لێمگەڕێ، بشکوژرێم تا مچە کوێری وەگریان نەخەم نایەمەدەر.»
مچە کوێر دەڵێ: «ئاخر ڕۆڵەگیان! ئەمن زگم بەدایک و بابت دەسووتێ. ئەو هەموو زەحمەتەیان دەگەڵ کێشاوی تا گەورەیان کردووی. دەنا بەرگەی مستێکی من ناگری.»
قامکە گەورەکەم بۆ ڕاداشت و گوتم: «ئەوەتا، ها بیگرە.»
بلەڕووت کە برای مچەکوێری بوو و دوو ساڵ لە مچەی چکۆڵەتر گوتی : «کاکە ئەمن بچم نەختێکی تێهەڵدم؟»

---

٥٠- حەریف: خەنیم.

گوتم: «بلەڕووت! مچەکوێری کاکت نابینی کە لە ترسان وەختە خۆی پیس کا، تۆی دمسەگ دەڵێی چی؟»

لەپڕ بلەڕووت هێرشی بۆهێنام دەسبەجێ خۆم لێلادا و هەر گەیشتە پەنام بە تیرەکەی عەلیلە کە هەروا دەدەستم دابوو وەهام لەتیغەرەی پشتیی کوتا کە هاواری گەیشتە ئاسمان، مچە خۆی بۆ ڕانەگیرا هەر لەدوورەوە پێلاقەیەکی پێدادام. ئاگام لە خۆم نەبوو کەوتم، عەلیلە خۆی بە مچە کوێری دادا، ئەوەندەی بڵێی یەکودوو دەبن خۆی نا. هەرای کردم: تیرەکەم بۆ باوێ، بۆم نەهاویشت خۆم گەیاندە مچە کوێر لە بن عەلیلەدا هەر لنگە فرتەی دەکرد، بە تەواوی هێزوتوانستی خۆم بە تیرەکەی عەلیلە وەری گەڕامێ، ناڵەی بەرز بۆوە، تیرەکەم داوە بە عەلیلە کە مچەی پێ بکوتێ. هەرکەسەی خۆی بە کەسێک دادا. شەڕێک ساز ببوو کەس بەزەیی بەکەس دا نەدەهات. هەمووومان دەمانوەشاند بە مست و شەپ و پێلاقە، کەس با ئەوەی زۆریشی وێکەوتبا نەیدەوێرا بگری. من شەپێک وە دمم کەوت. زارم پڕ بوو لە خوێن، ئاو بە چاوم دا هاتە خوار. عەلیلە دیتمی. گوتی: «کوڕە! وریا بە، بە دەنگ نەگری دەنا ڕەنج بە خەسار دەبین و دەیدۆڕێنین. ژانەکەم سەر لەنوێ لە چاوانمەوە گواستەوە بۆ نێو زارم. شەڕ قورس ببوو ئاخری من بلەڕووتم وەگریان خست. عەلیلەش ئەوەندەی بە تیرەکەی دە مچە کوێری کوتابوو کە لەمێژ بوو وەگریان کەوتبوو بەڵام دەنگی دەرنەدەهات، لەپڕ لە پڕمەی گریانیدا، بردمانەوە، بە بەردان ڕەپێمان نان. هەڵدەهاتن و جنێوی پیس پیسیان پێدەداین، بەڵام دوای ئەو سەرکەوتنەمان هیچ ئەو جنێوانە بەلامانەوە گرینگ نەبوو. یۆسف لە دوورەوە هەڕەشەی لەمن دەکرد:« هەتیوە مەگین بەتەنێ تووشت نەبم.»

عەلیلە پێم دەڵێ: «بژی، چاک بەشەڕ هاتی.» لە دڵی خۆمدا دەڵێم «خۆزگە کە دەچێتەوە ماڵ، هیچ نەبێ بۆ نازێی بگێڕێتەوە کە من چۆن بەشەر هاتووم.»

عەلیلە گوتی: «کوڕینە ئەسپەکانتان لەبیر نەچێ سواری بن با ڕێیان کەوین.»

سواری ئەسپەکانمان بووین، عەلیلە لە پێشەوە دەڕۆیی، بە منی گوت: «ئەتۆ بە دوای من‌دا وەرە با قالەش بە دوای تۆدا بێ.»

لەم شەڕەدا من قالەم بەجێ هێشتبوو، بە تەقڵەکوت بەرەوماڵ بووینەوە لە حالێک‌دا وەها تۆز و خۆڵێکم وەحەوا خستبوو کە عەلیلە بەو ئەسپە نەجیب و چاکەی لە ژێر پێی دابوو، نەیتوانیبوو سازی بکا.

❊❊❊

## ٣٣

: «بە ناشکوری نالێم، کوا لە دەوروبەری ئێمە، ئەودەم دوکتور و مامان و شتیوا هەبوو؟ خەڵکی ئێمرۆ چاو و گوێیان زۆر کراوەتەوە. وانەماوە یەکێک بەستەیەکی بۆ کەسێک ساز بکا و ئیتر خەڵکی بیکەنە بنێشتە خۆشکەی زاریان و هەر بیجوون و هەر بیجوونەوە، دایک و باب و براکانیش باشتر بوون، ئەوان سەردەمان ئەگەر کەسێک هاتبا و لە قاوی دابا. کە خەڵکینە مامۆستا چۆتە زگ ژنی فلانە کەس، هیچ کەس نەبوو باوەڕ نەکا. بەڵام ئێستا زەمانە گۆڕاوە. ئێستا هیچ کەس لەخۆڕا تا بەڵگەی باوەڕپێکراوی بەدەستەوە نەبێ باوەڕ بە هیچ مەبەستی ئاوا ناهێنێ. ئێستا کە ئەگەر شتێکی ئاوا ڕووبدا، بەر لەهەر شت دەیبەنە لای دوکتور و حەکیمان، ئازمایشتیان لەسەر دەکەن. تەنانەت ئەگەر قەباحەتی واش قەومابێ تووەکەیان ئازمایشت دەکەن تا لە خۆڕایی بێتاوانێک خەتابار نەبێ. دەک کوێر بم بۆ کاوەیس و فاتێ، بۆ ئەو دوو فریشتە پاک و بێ گوناحەی لە هیچ و خۆڕایی لەناو چوون.

: «سۆفی حەسەن! بۆ فاتێش هەروەک کاوەیس بێ سەروشوێن چوو؟»

: «جا بە قوربانت بم، کەسێکی تازە ناوی نەمێنێ و ناوی لەسەر زەوی بسڕنەوە، هەربێ سەروشوێن چوون نییە؟ کەسێ کە چارە ڕەش و سیابەخت دەبێ هەر بێ سەر و شوێن چوون نییە؟ دەمکوت بڕوام پێبکە دوکتور گیان! ئەگەر خودا لەسەر ڕووی زەوی فریشتەی دروست کردبێ بێ شک یەکیان کاوەیس دەبوو و ئەویتریان فاتێ. بەڵام ئەو پەندەی ئامینە شەل بە سەر کاوەیسی هێنا لە چیرۆکانیشدا نەهاتووە، چوون هەرگیز هیچ ئازار و قسە و ئاکارێکی کە بڵێن بۆتە هۆی تووڕە بونی ئامینە شەل لە کاوەیس ڕووی نەداوە، ئەو کوڕە کە خۆم لەنیزیکەوە دەمناسی نە تەنیا ئازاری بە کەس نەگەیبوو بەڵکوو زۆریش بە دەرد و مەرگی خەڵکەوە بوو، لەگەڵ ئەو

ئامینە شەلەش هەمیشە بەڕێز و حورمەتەوە دەدوا. نازانم ئەو چ سەرو زمانێک بوو خودا دابووی بە ئامینە شەل بڕوام پێبکە دوکتور گیان! لەگەڵ ئەسحابی پێغەمبەریش قسەی کردبا، لەخشتەی دەبردن، من نازانم چۆنی بە کاوەیس سەلماندبوو کە فاتێ ئەوی خۆش ناوێ و خەریکە پیلانێک دەگێڕێ کە لەوانەیە کاوەیس گیانیشی تێدا بچێ، وا باشە  هەرچی زووتر لە سوورە چۆمێ بڕوا. لەو لاشەوە فاتێ بە بیانووی ئەوە کە کاوەیس دەیهەوێ دڵنیای بکا کە هیچ شتێک لە نێوانی ئەو و کەژاڵی کوێخا برایمدا نییە دەنێرێتە ماڵە کاوەیسی. ئەوجار کە دەزانێ براکانی فاتێ و کاوسێن هاتوونەتەوە ماڵ، خۆی بە ماڵە کاوسێن‌دا کربوو. هەنگامەیەکی ساز کردبوو کە عالەم نەیدیبوو.

: «ئەی قوڕم بە سەری، ئاخری زەمانە، پیاوەتیش نەماوە. قەت بووە شتی وا ڕووبدا؟ بە حەوت زەلامان نەتوانن ئاگایان لە تاقە خوشکێک بێ. بە خودای پیاو بچێ، بەرەللای هەندەران بێ  باشترە لەوەی لەم گەوادخانەیە دا ژیان بەرێتە سەر، بە خودای ئابڕووی منیش تازە دەچێ، ئەو ماوەیەی هاتووچۆی ئێرەم کردووە. ئاگام لەو حەیاتکاوەی بوو. کە لێی وەدەنگ دێن. «کچێ ئامین شێت بووی؟ تۆ ئاگات لە زمانت نییە؟»

لێیان تووڕە دەبێ بە گریانەوە: «ئا، ئا، شێت بووم، بۆ ئاگاتان لە ناموستان بڕاوە؟»

: «مەبەستت کێیە؟ فاتێ؟ بە خودای شتێک ڕووی دابێ سەری گۆشاوگۆش دەبڕین:«کێ؟ کاوەیسی زڵەخایە؟ بە خودای ئەتکی دەکەین هەنجن هەنجنی دەکەین، ئاوری لە ماڵێ بەردەدەین. بێ سەروشوێنی دەکەین ئەگە ڕاستت گوتبێ.»

: «چی لە کوێیە؟ لە ماڵە زڵەخایە؟ دەباڵ ئەو هەتیوە حەرامزادەی دایە؟»

: «نا، نا ئەم جۆرە پێتان نالێ. دەزانێ ڕاست بلێ لە ناوی دەبەن، مەگین لە پێش‌دا بە ڕووی خۆش بیدۆنین، ئینجا لێی بپرسن کە نێوانی لەگەڵ کا وەیس هەیە و خۆشی دەوێ یان نا؟»

: «فاتێ پێم بڵێ ئاخر چۆن توانیت ئەو کارە لەگەڵ من بکەی؟ کێ فریوی دای؟ ئەی ئەو هەموو سوێند و بەڵێنی و قەول و قەرارەمان چی بەسەر هات؟»

:«کاوەیس وەرە بۆخاتری خودای وەدەرکەوە. خۆ براکانم هەر ببیستنەوە هاتوویە ئێرە. لەت و پەتت دەکەن.»

: «بۆ وا ڕەنگت پەڕیوە؟ چ قەوماوە؟»

: «چ قەوماوە؟ بۆچی بۆخۆت پێم نالێی کە چ قەوماوە؟»

: «کاوەیس! تۆ باسی چ دەکەی؟ کێ چی بە تۆ گوتووە؟»

: «فاتێ من هەرگیز بیرم نەدەکردەوە تا ئەو ڕادەیە گاڵتەم پێبکەی. من کە نەمدەویست بە زۆری منت خۆش بوێ. بەڕاستی زگم بە خۆم دەسووتێ کە ئەوەندە ساویلکە بووم کە باوەڕم بەتۆ و ئەوینی پاکی تۆ هێنابوو و ئێستا زۆرم زگ بە تۆ دەسووتێ کە جوانی و بەختی خۆت خەریکی بە پارە دەگۆڕییەوە.»

: «کاوەیس تۆ شێت بووی؟ پارەی چی؟ بۆچی ئاگادارم ناکەی کە چ قەوماوە؟ «پێم بڵێ با منیش ئاگاداربم.»

: «چ قەوماوە؟ باسی ئەو شتە دەکەم کە بۆ دیاری بەڕێت کردۆتە ماڵەهەمزاغا.»

: «ئەمن؟ ئەمن دیاریم بەڕێ کردۆتە ماڵە هەمزاغا؟ دە پێم بڵێ بزانم چیم بەڕێ کردوە کە خۆشم ئاگاداری نیم؟»

: «فاتێ! من ئەوە ڕۆیشتم، خۆت بڕۆ لەو کەسەی بپرسە کە پێت دا بەڕێ کردووە، بڕۆ لە پوورە ئامین بپرسە.»

فاتێ بیر لە هەر شتی دەکاتەوە کە لە دەستی دەهات وەک دیارییەک بینێرێتە ماڵە هەمزاغا بەڵام سەرکڵاوەکەی لەریزی ئەو شتانەدا نەبوو کە بیری لێدەکردنەوە.

ئەم وتوویژەی سەرەوە دەبوو کاوەیس لەگەڵ فاتێ بیکردایە کە نەیکرد و ڕۆژێک سەیر پەژیوان ببۆوە کە بۆچی پرسیاری لە فاتێ نەکرد.

ئامینه شەل دەڵێ: «بۆ خۆتان باش دەزانن کەمن چەندە جامینی ئێوەم دەویێ، ئەگەر بە قسەی من دەکەن هەروەکوو پێشتر کوتم، بێتوو لە پێش‌دا توند و تیژی لەگەڵ فاتێ بکەن لە ترسان ئەوەی هەشبێ دەیشارێتەوە. بەر لەهەر شت بە ڕووی خۆشەوە دڵنیای بکەن کە بەگژی‌دا ناچن و لێی تووڕە نابن ئەگەر دانی بەوەدا هێنا کە نێوانی لەگەڵ کاوەیس هەبووە ئەودەم باوەڕ بە ڕاستی قسەکانی من بێنن دەنا وەرن دوو تفی لە نێوچاوانی من بکەن، ئیتر چی دەکەن و چی ناکەن بۆخۆتان دەزانن.

: «وابزانم براکانی فاتێ زۆر درەنگ، درەنگتر لە هەموو کەس زانیبوویان کە ئامینه شەل درۆی دەگەڵ کردوون. ئەودەمیش کەزانیان تازەکار لە کارێ ترازابوو و تەواوی ڕووداوەکە بە باری خۆی داکەوتبوو و تازە پێش هیچ شتێکی نەدەگیرا، وەک گاشە بەردێکی کە لە هەوراز ترازابێ و بە کەس پێشی ناگیرێ تا بۆخۆی ڕادەوەستێ. ئەودەم کە زانیان تەواوی ئەو ڕووداوە موقەددەرێک بوو کە ئامینه شەل بۆی نووسیبوون چییان لەگەڵ ئەویش پێ نەدەکرا چوونکوو ئامینه شەل بەوەها حاڵ و ڕۆژێک دوچار ببوو کە کوشتنی ئەو دەیتوانی گەورەترین خزمەتێک بێ کە پێی دەکرا و براکانی فاتێ لێی بەڕق داچووبوون و لە ئاکام‌دا هەر خۆیان تێ‌نەگەیاند. ئامینەشەلیش زۆر زوو زانی دەربارەی هەمزاغا سەهووی کردووە. کە سەر کڵاوەکەی بۆ هەمزاغا برد و ئەویش چی لە مستی نەنا.

هەباس ئاغا پێی گوت:«ئامین دڵنیا بە، ئەو هەمزاغایە، هەمزاغای جارانی تۆ نییە کە دەتناسی، سەردەمێکە لە کار کەوتووە و لە قسەوفشە زیاتر چی بە دەستەوە نەماوە.»

هەڵبەت هیچ گومان لەوە داننییە کە ئامینه شەل هەمزاغاشی هەر وەک کەرەسەیەک لەبەرچاو گرتبوو بۆ گەیشتن بەو ئامانجەی هەیبوو. دەنا بۆخۆی لە هەباس ئاغا باشتر دەیزانی کە هەمزاغا زۆر دوور کەوتۆتەوە لەو ڕۆژە خۆشانەی لەگەڵ ئامین دەنگی قاقایان وەک ژارێک دەچوو دە قاپە چێشتی ژن و منداڵەکانی‌یەوە.

دوکتور دەڵێ: «باشە سۆفی! پرسیارێکم هەیە، وەک بزانی لە پاش ئەو بەڵایەی براکانی فاتێ بە سەر کاوەیسیان هێنا. فاتێ چی بەسەر هات؟»

: «من کە بەپەلە ژاندرمەکانم ئاگادار کرد. خۆم ئاشکرا نەکرد. ئەودەم کە کاوەیسیان بە نیوەگیانی و کوێخا برایم و کوڕەکەیان بە شەکەتی و شەلاڵی خوێن بەڕێ دەکردە سەردەشتێ. دوو برا چکۆڵەکەی فاتێ -هەڵبەت هەردووکیشیان لە فاتێ بەتەمەن‌تر بوون – کە دەیانزانی لە پاش کاوەیس براکانی دەچن و فاتێ دەکوژن، گوایا زگیان پێی سووتابوو چووبوون ئاگاداریان کردبوو کە لەماڵدا نەمێنێ و هەڵێ بەڵام ئەوەی من بەڕاستی بزانم ئەوەیە کە فاتێ لەکاتی ڕاکردن‌دا دەکەوێتە بەر پەلاماری سێ برای. بە هەر حاڵێک دەبێ بە یارمەتی دوو برا چکۆڵەکەی کە زۆریشیان وێدەکەوێ بە سەری ڕووت و پێی پێخاوس خۆ دەماڵە مەلای داوێ هەتا دوایی بە تکای مەلا و هەمزاغا و چەند کەسی‌تر لەکوشتنی چاوپۆشی دەکەن. بەڵام لەو بەینەدا تەنیا ئامینە شەل بوو کە دەستی هەڵنەدەگرت سوێندی بۆ براکان و کاک وسێن دەخوارد کە چەند کەس بە چاوی خۆیان دیتوویانن کە دەباڵ یەکتری دابوون بەڵام کە داوایان لێدەکرد ناوی ئەو کەسانە بەرێ.

دەیگوت: «ئەگەر سەریشم ببڕن چونکە سوێندم بۆ خواردوون ناویان ناهێنم.»

هەر ئەو بوو یەک پشوو تینی دەدان.

: «ئێوە! لە گوێی گادا نووستوون. تاقە خوشکێکتان هەبوو. بە حەوت کەسان نەتانتوانی چاوەدێری لێ بکەن، کێ مابوو لە دێ‌دا کە فاتێ لەگەڵی نێوانی نەبووبێ. برۆن لە دێ‌دا بگەڕێن ئەگەر بوێرن ڕاستتان پێی بڵێن بزانن دیاری ناردووە بۆ چەند کەسان؟»

دوو دڵی براکانی فاتێ و کاوسێنی بابی و هەروەها سوێندخواردن و شاهیدی‌دانی مەلا و چەند پیاوی ماقووڵی نێودێ و داواکاری هەمزاغا لە کاوسێن و براکانی گیانی فاتێی بەو مەرجە پاراست کە دەبێ چارەی لە چارەی حەمە ناحەزی قاچاخچی بنووسرێ.»

حەمە ناحەز هەمیشە دەیکوت: «جا ئەمن ژنم بۆ چییە؟ پارووە نانێک و چۆرە ئاوێک ئەوە ناهێنێ بیست و چوار ساعەتی شەوڕۆژ ئاگا و هۆشت لە خۆ ببڕێ.»

بەڵام هەر کە فاتییان لەباڵ کرد[٥١]. تازە زانیبووی تەواوەتی ئەو دەرد و مەینەت و چەرمەسەرییەی لەبەر ڕوخساری ناحەز و دیمەنی ناشیرین و ڕەزای گرانی بە درێژایی تەمەنی چێشتبووی و ئەو هەستی خۆ بە کەم زانینەی هانی دەدا تەنیا لە بەر ئەوەی هامووشۆ لەگەڵ خەڵک نەکا. بەشەو و ڕۆژ خەریکی کاری قاچاخ و ئاودیوبوونی سنوور بوو، نە سەرما و نەگەرما، نە کەمینی عەسکەری عێراق و ئەمنیەی ئێران، هیچیان نەیاندەتوانی ڕێگەی لێببەستن لەبەر ئەوە بوو کەخوداوەندی میری مەزن وای بۆ موقەددەر کردبوو کە هەر لەو دونیایەدا بە هۆی ئەو ئازار و جەزرەبانە کە دیتوویەتی ئەو حۆریەی بەهەشتی‌یە کە بڕیار وابوو لە قیامەت دا بیداتێ، ناخافڵ لەم دنیادا بە نەسیبی کردبوو! بە دوای دیتنی فاتێ و جوانییە بێ وێنەکەی بوو کە حەمە بە ڕاستی هەستی بە بوونی ترس کرد و دەس‌ودڵی بۆ کار نەدەچوو، پێی خۆش بوو هەرگیز بۆ هیچ کارێ لە ماڵ نەچێتە دەر و دایم و دەرهەم لە سووچێکی ماڵ دابنیشێ و بڕوانێتە بەژن و باڵا و لارولەنجەی فاتێ. حەمە هەستی دەکرد کە ئەوە ژیانی خۆی نییە کە دەیباتە سەر، بەڵکوو تەنیا خەونێکی خۆشە کە هەرگیز پێش‌تر سەری لەو نەدابوو. لەوانەیە لە پڕ وەخەبەر بێ. حەمە توانی تەنیا ماوەی شەش ساڵ لەم خەونە خۆشەی دا بمێنێتەوە. شەش منداڵیشی هەم بۆ کوێرەوەری پتر و هەم بۆ ئەوەی بۆ هەمیشە بیبستێتەوە خستە سەر دەستی فاتێ و ئاخری خۆی بە دەس ژاندرمان بە کوشت دا. سۆفی هەروەها دەڵێ:«بەسەری تۆ ئاغای دوکتور لەوەتی ئەو کچە قوڕبەسەرە لە دایکی بووە. وێناچێ هەرگیز ئاهی خۆش دە دڵی گەڕابێ. یەک ساڵانە بوو کە دایکی مرد. ئیتر خودا دەزانێ تا

---

٥١- لەباڵ کردن: دەربڕینێکی موکریانیانەیە. واتە لەپاڵ کردن. خستنەپاڵ. کە یەکێك (ژنێك) بۆ پیاوێك دەنێرنە ژوورەوە.

گەورە بوو بە باب و حەوت برای شێت و شوورەوە چ شەپ شەپێنێکیان پێدەکرد. بەڵام سەیر ئەوە بوو. دەتکوت ئازار و ئەشکەنجەی پێدەکەوت هەرچی زۆرتر ئازار دەدرا، زۆرتر باڵای دەکرد و دەگەشاوە. لە ڕاستی دا هەرخودا دەزانێ کاران بکا. لەو لای لە جیرانەتێیان دا کاوەیسی کوڕی خات زڵەخا هاوتای خۆی بوو. جوان چاک و عاقڵ و بەئەدەب، با لەبیر نەکەم دەنگ خۆش و لە کار دەرهاتوو، بە دەردومەرگی هەموو کەسەوە بوو. نیوەشەوان کارت پێی بوایە، ئیتر لە هەموو گیروگرفتی خۆی چاوپۆشی دەکرد و دوای کارت دەکەوت لە پاش ئەو ڕووداوە کە بۆ فاتێ هاتە پێش، کێشە و ناخۆشیش کەوتە نێو سوورە چۆمێ، خەڵکی وێ ببوونە دوو دەستە؛ دەستەیەکیان پاکانەیان بۆ کاوەیس و فاتێ دەکرد و بە بێ تاوانیان دەناسین و دەستەیەکیش وەباڵیان بۆ تاوانبار بوونیان دەکێشا، دەیانگوت هەرگیز نەبووە کەسێک یەکێکی بەدڵ ویستبێ و لە پاشان دەسدرێژی بۆ کردبێ و داوێنپیسی لەگەڵ کردبێ. تف و لەعنەتیان کاوەیسی دەکرد. گۆیا کە براکانی فاتێ ئەو جۆرەی ئامینە شەل داوای لێکردبوون زۆر بە هێمنی و بە ڕووی خۆشەوە لە فاتێیان پرسیار کردبوو فاتێ باوەڕیان پێ دێنێ و پەردەی حەیا لادەدا.

: «ئەرێ ڕاستە، خۆشم دەوێ، من کاوەیسم لە گیانی خۆشم خۆشتر دەوێ و پێم بڵێ بمرە، بۆی دەمرم.»

هەر ئەو قسانەی فاتێ بوو بە هۆی ئەوە کە باوەڕیان بە قسەی ئامینە شەل هێنا و بۆ سڕینەوەی ئەو بێ ئابڕوویی‌یە و بۆ ئەوەی کە نێو بانگیان بە بێناموسی و حیزی و سەر شۆڕی دەرنەچێ لێدەبڕن کاوەیس لە ناو بەرن. هەڵبەت هەر وەک بۆم باس کردی من بوومە هۆی ئەوە کە نەتوانن ئەودەم کاوەیس بکوژن ئەودەم کە گەیاندبوویانە نەخۆشخانەی سەردەشتێ زیندوو بوو هەرچەند کەسێ تا ئێستا نەیزانی ئاخر کاوەیس زیندوویە یان مردووە؟ ماوەیەک کە لەم ڕووداوە تێپەریبوو، ئامینە شەل کە هیچی لە هەمزاغا وەگیر نەکەوتبوو لە هێندێک شوێن گوتبووی کە کاوەیس بێ تاوان بووە، ئەوە هەمزاغا بوو کە بۆ ئەوەی دەستی کاوەیس لە گەیشتن بە فاتێ

کورت بکاتەوە ئەم پیلانەی گیراوە و هەڕەشەشی لێکردووە بێتوو بیدرکێنێ. لە چوار پەلان هەر گوێی ساغ دەمێنێ.»

من لە گێڕانەوەی سۆفی حەسەن پرسیارێکم بۆ ساز بووە ئەو بەو جۆرەی باسی کرد ئامینە شەل لای چێشتانێ فاتێ بەڕێ دەکاتە ماڵە خات زلەخا تا کاوەیس دڵنیای بکا لە نێوان ئەو و کەژاڵی کوێخا برایم هیچ شتێک نەبووە و نابێ. هەروەها لە هەمان کاتدا باسی دەسدرێژی کاوەیس بۆ فاتێ لە لای باب و براکانی‌یەوە دەکا. لەو لاوە سۆفی حەسەن دەڵێ ئێوارە درەنگ وەخت بوو کە براکانی فاتێ کەوتنە سەر کاوەیس تا بیکوژن لێرە ئەم پرسیارەم بۆ هاتۆتە پێش. چۆنە لە مەودای چێشتانێ تاکوو درەنگ وەختی ئێوارێ، ئەو برایانە کە بە نیاز بوون هەم کاوەیس و هەمیش فاتێ بکوژن، خۆیان دە فاتێ نەگەیاندبوو تاکوو ئەو بەڵایەیان بەسەر کاوەیس هێنا ئینجا گەڕانەوە ماڵ کە فاتێ لەناو بەرن؟ بڵێی لەبەر چی بێ؟ من لە جیات دوکتور بام بێ‌شک ئەم پرسیارەم لە سۆفی حەسەن دەکرد و هەروەها من ئەگەر لەجیات سۆفی حەسەنیش بام ئەم وڵامەم دەداوە بە دوکتور کە لەبەر ئەوەی لەپێش‌دا خۆیان دەفاتێ نەگەیاندبوو کە ئامینە شەل پێی گوتبوون بێتوو لە پێش‌دا خۆ دە فاتێ بگەێنن لەوانەیە بەو قیژە و هەرایەی ساز دەبێ کاوەیس شک بکا و بۆی دەرچێ و تازە دەستتان پێی ڕانەگا وا باشترە کاری ئەو هەتیوەی تەواو بکەن. فاتێ کە بێ پایە لەبەر دەستی خۆتان دایە، من نازانم دوکتور بەو وڵامەی من جوابی پرسیارەکەی وەرگرتۆتەوە یان نا من عەقڵم هەر بە وەندە دەشکێ.

***

## ٣٤

.... ئاخ كە چەندە بێژم لە خەونەكانم هەڵدەستێ، هیچ كامیان وەكوو خەونی من ناچن، دەڵێی لەجیاتی خەڵك من خەون دەبینم، هیچ شتێكی ئەو خەونانەی كە دەیانبینم فرِیان بە منەوە نییە. هەتا منداڵ بووم هیچ دێوودرنج و دێوەزمە و ڕمووزنە و جندۆكەیەك نەبوو كە ماڵە خەونەكانی من بە ماڵە خۆیان نەزانن و بە بێ لە درگادان و ئیزن وەرگرتن، بە بێ هیچ چەشنە ئاشنایەتییەك، بە بێ هیچ شەرم و شوورەیی‌یەك لە خەونەكەم وەژوور نەكەون. ئەوەی هەرگیز لەبەر چاویان نەدەگرت و بەلایانەوە هەر گرینگ نەبوو، من بووم. هەموو وجوودی ناكامڵ و نابالغی من، هەموو ڕووح و ڕەوانی بێ ئەزموون و منداڵانەی من دەبوو بە مەیدانی ڕمبازێنی ئەو بە زۆر میوانانە و ئاداریان بەسەر پادارەوە نەدەهێشت. تا سنووری زراو تۆقێنم، تا مەرزی شێت‌بوونم، تا بن درگای میز بەخۆ داكردن دەیانبردم. ئاخ هەركە هەوەڵین چرای شەو هەڵدەكرا، ئازار و دەرد و ترس و بێ‌كەسی وەك هەڵمێكی ڕەش وردە وردە لە ئامێزی شێ‌داری خۆی دەگرتم و لەخۆی‌دا دەیشاردمەوە. نە دایك، نە باب، نە خوشك، نە برا، كەس نەیدەزانی چەندە ڕەش داگیرساوم، چەندە لە ناكاو تاساوم. چەندە لە هەر شتێك ترساوم، چەندە كەوتوومەتە بەر چەپۆكی بێ بەزەیی‌یانەی خێڵی شەو. دەڵێن خەونەكانی مرۆڤ كاردانەوە و ڕەنگ دانەوەی هەموو ئەو شتانەن كە مرۆڤێك بە درێژایی تەمەن یان بە درێژایی ژیانی ڕۆژانەی كە دەتوانێ بە قەرا تەمەنێك ناخۆش بێ، شوێنی لەسەر دادەنێن و لە بەشی نابەئاگای ڕەوانی‌دا تۆمار دەكرێ و هەر دەم بە هۆیەكی ئاشكرا و شاراوە دێنەوە بەرچاوی، شانۆیەك پێك دێنن، چیرۆكێك ساز دەكەن، تراژیدییایەك

دەخولقێنن، گاڵتە و گەمەیەک دەنێنەوە. تۆ کە زۆر حەزت لە شیرینییە و کەمت وەدەس دەکەوێ. لەپڕ لە خەوەکەتدا دەبینی لە شیرینیخانەیەکی پڕ لە شیرینی بەتام و هەمە ڕەنگیان هاویشتووی، ساحێب شیرینیخانە خۆی دە خەو کردووە، تا تۆ شەرم نەتگرێ و تێر زگی نەوسنت شیرینی بخۆی. تۆ کە بە درێژایی عومرت لە ساتێکی وا دەگەڕای، بەڵام بەداخەوە دەبینی زارت بەستراوە، بۆت ناکرێتەوە، هەرچی دەکەی و دەکرێنی شەویلکەت لێک نابێتەوە خەمی تێرخواردنت هەر ئەودەم ئاڵ وگۆڕی بەسەر دادێ، دەبێتە خەمێکی تر، خەمی پەلەقاژە بۆ هیچ. تەنیا حەولت ئەوە دەبێ کە بتوانی زارت لێک بکەیەوە. یان دەبینی بە پێچەوانەی هەمیشە کە ئاغای «قاف» بە شوڵکی تەڕ خەریکە لەئینسانییەتی خۆت بەتاڵ دەکا و ناوەرۆکەکەت بە چوارپێیەک یان ئاژەڵێک پڕ دەکاتەوە، ئەوجار ئەوە ئاغای «قاف»ە کە دەستی ڕاگرتووە، تۆش بە تەواوی هێز و توانای خۆت بە شوڵکە تەڕەکانی خۆی خەریکی لە بەردەستی دەدەی و عەلیلە و قالەش لە خۆشیان، هەڵدەبەزن و گەمەی پێدەکەن.

: «پێت خۆشە؟ وێکەوتن خۆشە ئاغای «قاف»؟ کەیفت ساز بووە؟ پێم بڵێ بزانم بۆ سەد هەزار جار لە ڕووی ئەو دەرسەت نەنووسیوەتەوە؟ دا پشتی دەستتم نیشان بدە بزانم ئای ئای لەو هەموو چڵک و چەپەرە؟ ئەدی ئەو نینۆکانەت بۆ دەڵێی نینۆکی شەیتانین؟ لە بیرتە چەندەت ئاوا دەکوتاین؟»

یان بەری بەیانی ڕۆژی جێژنی ڕەمەزانە و تۆ و براکەت بەر لەوەی مەلای مزگەوت ئیمانی وەبیر بێتەوە ئێوە جل و بەرگە تازەکەتان کە بۆیان کڕیون وەبیر دێتەوە.

سرت و خورتتانە. هەر ئەتۆ دەڵێی: «تۆ لە خەو ڕاستی کەوە»

ئەو دەڵێ: «نا، تۆ لەمن گەورەتری.»

تۆ دەڵێی: «تۆ چکۆڵەتری بۆ تۆ هیچ ناڵێی»

براکەت ڕازی نابێ، تا بە قڕانێک کێشەکەی دەبڕیەوە دەنگی دەدا:«دایە؟ دایە.»

: «ئا چ باسە بەو بەری بەیانییە؟ چت دەوێ؟»

: «دایە خۆ هێندەی نەماوە تاو هەڵێ، ئەورۆ جێژنە، جلوبەرگە تازەکانانمان بدەیە لەبەری کەین.»

: «هەی سندان لێدراوینە هەر لەبەر ئەوەی لەو خەوە خۆشە ڕاستتان کردمەوە؟ مەگین بەیانی هەڵنەستم بزانە چ جێژنانەیەکتان لەسەر بەری دەستی دادەنێم.»

براکەت ڕوو لە تۆ دەکا: «هەموو خەتای تۆ بوو گوتت وەخەبەری بێنم.»

: «بۆ خەتای من بوو؟ بۆخۆت بۆ قڕانێکی وەخەبەرت هێنا ئێستا کە وابوو سبەی من ئەو قرانەشت نادەمێ.»

: «چۆن نامدەیەی؟ خەتای تۆ بوو فریوت دام پێت گوتم ئەتۆ چکۆڵەتری بۆ تۆ دەنگ ناکا.»

دە تاریکایی بەرە بەیانی جێژنی ڕەمەزاندا تۆ و برا چکۆڵەکەت بە مستەکۆڵە دەکەونە گیانی یەکتر.

بەڵام خەونەکانی من ئەم جۆرە نین. هیچیان باسی ڕاستی‌یەکی خۆش یان ناخۆشی ژیانی من ناکەن، دەڵێی ئەو شتانە لە وجوود و دەروونی کەسێکی تردا ڕووی داوەو و تۆمار دەبن، هەرکە شەوداهات بە دزی خاوەنەکانیان دێنە نێو دنیای خەونی من، بڕوام پێبکەن. کە هەرگیز هیچ کامیان ناناسمەوە. هەمیشە لە خەونەکانمدا گوێ قوڵاغم ئەی بەڵکوو ئاماژەیەک، ئیشارەیەک، نیشانەیەک، پەیامێک، ڕازێک، سەمبۆلێک، ئیهامێک، ئیستعارەیەک، ڕەمزێک لەو شتانەی هەمیشە بە شوێنیان دا عەودالم بدۆزمەوە بەڵام ئەوەی دە خەوندا دەیانبینم هەموویان نامۆ و نائاشنان، وەک ئەوەی دەچێ کە هەمیشە من بۆ خەون دیتن ببەنە وڵاتی ماچین. ماچین هەمیشە لەگەڵ چین دەهات. من پێم وایە دەبێ لە چینێ گەلێ سەیر و سەمەرەتر بێ. نە زمانی خەڵکەکەی وەزمانان دەچێ و نە ڕوخساریان وە ڕوخساری مرۆڤی‌تر دەچێ و نە خواردن و خەویان. خەونەکانی من هەروەک چوون بۆ سەفەری «ماچین»ە تەنیا لەبەر ئەوە وێدەچێ خەون ببینم کە بڕوام بەوە بێ کە خۆم، خۆم نیم. تەنیا یەک جار توانیم باوەڕ بێنم

کە خۆمم. ئەو دەم کە هەموو لەش وئازا و وجود و هەست و نەست و شعوور و ڕووح و ڕەوانم ببوون بە خواز و ویست و مەیل و نیاز و حەز و ئارەزوو بۆ دیتنی دووبارەی ئەو کیژۆڵەیە کە بە جنێو منی دەس‌نیشان کرد. بۆ ئەوە کە هەرگیز نەبمەوە بە خۆم. شەوانە کەدەنوستم لە ماڵە پوورم لە شاری تەورێز وەک هەمیشەی جاران، ئەوە خەونەکانی من نەبوون کە بیانبینم. ئەوە خەونەکانی خەڵکی‌تر بوون کە دەیاندیتم. تا ئەوێ شەوێ کە بڕیار وابوو بۆ سبەی مێردی پوورم لە سەفەر بگەڕێتەوە، نازانم چۆن بوو بۆ یەکەم جار خەونی خۆم دیت. تەنیا خەونی ژیانم، کە فرِی بەمنەوە بوو. خەونێک کە پەیامی تێدا بوو. پەیامێکی خۆشی شاراوە، شاراوە وەک تامی ماچ کە دەلێودا شاراوەیە. وەک تامی سووری سێو کە فریوی پێ دەخۆن و پێی هەڵدەخلیسکێن.

گوتم: ئەمجارە بوو خەونی خۆم دیت. خەونێکی خۆش، خۆش وەک هەموو ئەو شتانەی چێژم لێوەر دەگرتن. هەرچەندە دەژیانم دا زۆر کەم و بە دەگمەن بوون، نازانم لە چ شوێنێکی بوو کە ئەوە هەر بەلامەوە گرینگ نییە، نازانم کەی بوو ئەویش دەکرێ لەبەر چاو نەگیرێ. نازانم چ ورەزێک بوو؟ لە خۆم دەپرسم، چ فەرق دەکا چ وەرزێک بوو؟ نازانم... لە ڕاستی‌دا ئەگەر لەوە بپرسی دەتوانم بڵێم هەر هیچ شتێک گرینگ نییە. تەنیا ئەوە نەبێ کە کورسییەک ڕازاوەتەوە. لە بەرێکی من دانیشتووم بە هەموو ئەو خوێنەی لە دەمارەکانم دا نە بە کاوەخۆ وەک هەمیشە بەڵکوو بە پەلە لە هات‌وچۆ دایە و هەروەها بە هەموو ئەو هەست و ئیحساس و خەیاڵانەی بەبێ ئەوەی بتوانم تەنیا بۆ ساتێک بەرگرییان لێبکەم و بە کەیفی خۆیان دێن و دەچن و ئەوەی هەرگیز لە بەرچاوی ناگرن و ئاوڕی لێنادەنەوە  منم، و ڕوو بە ڕووی من یانی لایەکەی تری کورسییەکە هەمان کیژۆڵە شۆخ و شەنگ و نازدار و نەشمیلانەکە دانیشتبوو. من چاوم تێبڕیبوو هێندێک بە ترسەوە، ترس لەوە کە نەکا دەرهەڵبێ[٥٢] و پێم بڵێتەوە «بێ تەربییەت» بۆ وا چاوم

٥٢- دەرهەڵبوون: تووڕەبوونی لەناکاو. بەگژداهاتن.

تێدەبڕی؟ کەچی وانەبوو، وای نەکوت. نا، نا، نا، هەر قسەمان نەدەکرد بە بزە دەیدواندم. بە بزە گیانی وەبەر دەنام، بە بزە خەونە ناخۆشەکانی خەڵکیتر کە دەمدیتن و هەرگیز وازیان لێ نەدەهێنام بۆی دەتاراندم و خەیاڵ و خەونی خۆشی خۆی ئاوێتەی دەمارەکانم دەکرد. لێی نەدەترسام. هەموو وجوودی خۆم کۆ کردەوە، بوو بە پرسیارێک. «دیار نی؟»

: «زۆرت چاوەڕوان بووم.»

لە دڵەخۆمدا گوتم: «ئەی گیان کە وابوو منی خۆش دەوێ.»

کە لە خەو ڕاپەڕیم ئیتر خۆم نەگرتەوە، پوورم بەو نیوە شەوە لەخەو ڕاست کردەوە.

: «پووری ئەمن بەر لە تاوهەڵات دەڕۆمەوە ماڵە خۆمان.»

ترسا: «ئەی ڕۆڵە مەگین خەونی ناخۆشت دیوە، چ قەوماوە؟ تۆخودا شتێک ڕووی داوە؟ دڵت خەبەرێکی پێ داوی؟»

پوورە بەستەزمانەکەی من هەرگیز بیری بۆ ئەوە نەدەچوو کە ڕووداوێکی خۆش بۆ من ڕووی دابوو من بۆ هەوەڵ جار بوو خەونی خۆم دەدیت. خەونی خۆشی خۆم.

***

## ٣٥

..... مەلا برایم بەئانقەست لای دا و ڕووی لە ئاسنگەرییەکەی حاجی محەممەد کرد.

: «بەخۆی، نا، ناتوانم نەیڵێم، هەرگیز کاری وا سەهو لە حاجی محەممەد ناوەشێتەوە. دەبێ بزانم بۆ ئەو هەڵەیەی کردووە.»

کە وەژوور کەوت بە هۆی تیشکی هەتاو کە لە پشتەوە وە مەلا برایم کەوتبوو حاجی محەممەد جوانی نەدەدیت، نەیناسییەوە.

: «سڵاو حاجی‌ئاغا، ماندوو نەبی، وادیارە ئەوەندە خۆشی ڕادەبوێری کە برادەری خۆت ناناسییەوە.»

حاجی محەممەد کە بە دەنگی ڕا ناسیبوویەوە گوتی: «مەلا برایم ئەوە ئەتۆی؟ ئەتۆچی و ئێرە چی؟ دا وەرە پەنام دانیشە. بە خودای زۆرم ئارەزوو دەکردی، بڕوام پێبکە لەم حەفتەی ڕابردوودا هەر لەخۆڕا چەند جار بەزەینمدا هاتی، وەرە مەردی خودا بە و هێندێک قسە و باسی ئەودیوم بۆ پکە.»

: «حاجی ئاغا ئەگەر ڕاستت بوێ بۆ کارێکی زۆر بە پەلە هاتبووم، پێویستە زۆر زووش بگەڕێمەوە. تەنیا لەبەر ئەوەی هاتبوومە لات کە پرسیارێکت لێبکەم. دەنا ناتوانم زۆر لە لات بمێنمەوە.»

حاجی گوتی: «کوڕە پیاوی چاک بە مەلا برایم، هەروەک کوێران لەبێ خەبەری دا ماومەوە. هێندێکم باسی شۆرش بۆ بکە، «مەلا» لە چ حاڵ دایە؟ تۆخودا لە پێش‌دا پێم بڵێ ئێمە لە پێشین یا نا؟»

: «حاجی ئاغا بەختەوەرانە تاکوو ئێستا کە لات دانیشتووم ئێمە زۆر لەپێشین. لە زۆربەی بەرەکانی شەڕ دا سەرکەوتووین. هەڵبەت هەروا

یارمەتیش دەدرێین. حاجی ئاغا نازانی چ هێزێکی گەورەمان هاتۆتە مەیدان، لە زۆر شوێنان بەعسیان ڕادآوە. تا ئێستا چەند وەفدیان ناردۆتە لای «مەلا» بۆ وتوویژ.

: «ئەلحەمدولیلا، خودایە هەزاران بار شوکرت دەکەم. ئەرێ مەلا برایم هیچ بەم زوانە چاوت بە حەسەنی برام کەوتووە؟ هیچ هەواڵێکت لێی هەیە. ماوەیەکی زۆرە لێی بێخەبەرم.»

: «حاجی ئاغا ئەگەر راستیت دەوێ منیش هەر لە بەر ئەوە لام دا و هاتوومە لات کە بڵێم لە جەنابت زۆر بە دوورە منداڵێکی بەستەزمان و بێ تەجروبە بەم جۆرە دە مەترسی باوێی. هەواڵت بۆ ناردبام دەسبەجێ هەواڵم بۆ دەناردیەوە.»

حاجی محەممەد کە لە قسەکەی مەلا برایم نەگەیبوو کوتی: «مەلا برایم باسی چ دەکەی؟ منداڵی چی و هەواڵی چی؟»

: «چلۆن باسی چ دەکەم حاجی ئاغا باسی کەریمی کوڕت دەکەم. باوەڕم پێبکە ئەگەر بە هەڵکەوت تووشیان نەهاتبام ئێستا تۆ لە پرسە و سەرەخۆشی دابووی.»

چی نەمابوو لەگەڵ ئەو کوڕەی لەگەڵی بوو بە گوللەی ژاندرمان دابێژ دابێژ بن.»

: «مەلا برایم تۆ مەبەستت کەریمی کوڕمە، بڵێ بزانم لە کوێ چاوت پێی کەوتووە، بۆم بگێڕەوە. مەلا برایم بۆی گێڕاوە کە بۆ کارێکی نهێنی دەبوو لە سنوور بپەڕێتەوە. لە سەر سنوور لەپڕ گوێی لە تەققەی تفەنگان دەبێ. بۆ ئەوەی لە کەمین نەکەوێ، بە ماتە ماتە خۆ دەگەیەنێتە بەستێنی چۆمی سەر سنوور، کە دەبینێ ژاندرمەکانی پاسگای مەرز تەققە لە دوو مێرمنداڵ دەکەن. بە هەر جۆرێکی بێ لەو ئاورەی دەربازیان دەکا. کە لە نیزیکەوە دەیانبینێ و دەیاندوێنێ. یەکیان کەریم کوڕی حاجی محەممەد و ئەویتریان باقی کوڕی وەستاقادری خەیات دەبێ. کەریم کوڕی حاجی محەممەد بە قسەی خۆی پەیامێکی زۆر گرینگ و نهێنی بابی پێیە کە دەبێ هەرچی زووتر بیگەیەنێتە دەستی مامە حەسەنی کە لە شۆڕش دایە و هەر چەندە

مەلا برایم حەولی لەگەڵ دەدا کەریم پەیامەکەی بابی ناداتێ تا بۆی بگەیەنێ. هەرچەند دڵنیای کردبوو کە حاجی محەممەد بە باشی دەناسێ و دۆستایەتی لەگەڵ هەیە.

حاجی بۆی دژوار بوو وەخۆ بێتەوە، ڕەنگە لە ماوەی ئەو پازدە ڕۆژەی کەریم هەڵاتبوو، بیری بۆ هەموو جێگەیەک چووبوو بە دەر لەوە کە کەریم ڕوو لەو دیو بکا.

ئەوە نەفەس نەبوو کە حاجی دەیکێشا بەڵکوو زۆرتر ئەوە پیش بوو دەیخواردەوە. دەڵێن مرۆڤ لە سەرەمەرگی‌دا، ئەوەی بە درێژایی ژیانی چاوی پێکەوتبێ وەک فیلمی سینەمایی تەنیا لە ماوەی یەک چرکەدا، هەمووی بە بەرچاوی دا دێتەوە کە وابوو دەبێ حاجی وادەی مردنی هاتبێ. ئەگینا چلۆن تەنیا لە ماوەی یەک چرکەدا ژیانێک دەبینێ. کەریم لە دەست ئازارەکانیان، جنێوەکانیان، لە دەس بێ بابی و بێ دایکی رای کردووە، گوتنی ئەم ڕاستییە لە لای مەلا برایم شتێکی زۆر ئاسان و خۆش نەبوو. ئاخر حاجی محەممەد، حاجی محەممەد بوو، کێ بوو لەو ناوچەیە نەیناسێ. حاجی محەممەد لەمێژ ساڵ بوو تابلۆیەکی بە دوای خۆی‌دا دەکێشا کە لێی نووسرابوو بەخەتێکی زۆر درشت حاجی محەممەد بەرانبەرە لەگەڵ پیاوەتی، غیرەت، مەردئازایەتی و دلاوایی و دەهندەیی و لەسەرەخۆ بوون و لەخۆ بردوویی. هەڵبەت لە جیات وشەی بەرانبەر لەم نیشانەیە«=» کەڵکی وەرگرتبوو کە مانا بیرکارییەکەی دەبێتە هاوتا یان بەرانبەر و یان بەقەڕا یەک. حاجی ئاغا دەیان جار ئەم تابلۆیەی بە شێوەی چوونەسەردانی نەخۆش، کڕینی گەسک بۆ مزگەوت، خێر و خێرات کردن، پێشانی مەلا برایم و زۆر کەسی تریشی دابوو، تەنانەت بۆئەوەی خەڵکی بە باشی ئەو تابلۆیەی کە هەمیشە بە خۆی هەڵاوەسیبوو بە جوانی بخوێننەوە و باشی تێبگەن. ئەم چوارینەی مامۆستا هەژاریشی دابوو بە خەتێکی درشت لەسەر مقەبایەکی سپی بۆی بنووسن و لە دووکان هەڵیاوەسیبوو، بە جۆرێک کەس نەبوو کە ئەم چوارینە بخوێنێتەوە و بیری نەچێتە سەر حاجی محەممەد.

جا حاجی کە دەیهەویست درەنگ وەخۆ بێتەوە، زۆرتر لەبەر ئەوە بوو کەنەیدەتوانی بڵێ: «بە پێچەوانەی ئەم چوارینەی هەژار کە هەمیشە لە ژیانم دا باوەڕم پێی هەبوو. بە داخەوە من و حاجیژنی خێزانم ئەوەندەمان کەریم ئازار داوە کە لە دەست زوڵم و زۆری ئێمە ڕای کردووە، چوارینەکەی مامۆستا هەژار ئەوە بوو:

ڕابوێرە بە سەربەرزی بە نان و ئاوێک   سەر دامەنوێنە بۆ هەموو ناپیاوێک
لەم ژینە کە هەر دەمێکە دێت و دەڕوا   مەردایەتی مەفرۆشە لە پێناو تاوێک

بەڵام حاجی هەرچی هەیە، ئەوەندەش نابازاڕی نییە کە تابلۆیەکی ئاوا بەقیمەت کە بە درێژایی تەمەنی خولڨاندوویەتی، تەنیا لەبەر بێ عەقڵی منداڵێکی ساویلکە و نەفام با هێندێکیش ئازاری چێشتبێ بگرێ دە ئاوری باوێ.

دەڵێ: «بەڵێ. بەڵێ مەلا برایم! خۆشم بێزم لەو کارەی خۆم هەڵدەستێ بەڵام ئەودەم چ چارەیەکیترم نەبوو. کارەکە ئەوەندە گرینگ بوو کە نەدەکرا لێی ڕابوەستی. پێم وابوو ئەگەر کەریم بچی بە هۆی کەم تەمەنییەوە کەس لێی وەشک ناکەوێ:»

: «وەڵڵاهی حاجی ئاغا! تۆ خۆت ساحێب ئیختیاری، ئەوە ڕاستە کە ئێستا لە پێشین، بەڵام دیارنییە سبەی چلۆن دەبێ، بۆ یەکی وەک کەریم کە ناشارەزایە جێی مەترسییە.»

حاجی کوتی: «مەلا برایم! زۆر مەڕوانە چکۆڵەیی کەریم، زۆر زیت و وریایە. دەزانێ  چۆن بەرەی خۆی لە ئاوێ دەرکێشێ.»

مەلا برایم زۆری پێخۆش بوو بڵێ: «حاجی ئاغا ئەگەر دە وەختیخۆیدا وەفریای کەریم و ئاواڵەکەی نە دەکەوتم، ئێستا من و تۆ لەوتوێژێکی تر دا بووین.»

بەڵام جوابی دڵی خۆی نەداوە و چی نەگوت.

حاجی کوتی: «ئەرێ مەلا برایم! زوو دەگەڕێیەوە؟»

: «لەوانەیە هەر ئەم شەو وەڕێ کەومەوە»

: «کە وابوو کاغەزێکت دەدەمێ ئەگەر بۆت نابێتە زەحمەت، بیدە بە حەسەنی برام.»

: «لەسەر هەرتک چاومی دادەنێم حاجی ئاغا، ئامادەی بکە لە دوای نوێژی خەوتنان دێم لێت وەردەگرم.»

من ئێستاش ڕووخساری پیاوانەی ئەم مەلا برایمەم لە زەین‌دا ماوە، چونکە ئەوێ شەوێ کە لە ئاودەست دەگەڕامەوە کە لە درگای حەوشەیان دا ئەو مەلا برایمە بوو کە پرسیاری کرد: «کوڕم حاجی ئاغا لە ماڵە؟»

: «خەبەرم نییە ئەمن کوڕی کرێگرتەکەیانم. فەرموونە ژووری.»

: «زۆر سپاس، ئەگەر دەکرێ حاجی ئاغام بۆ بانگ بکە.»

: «بڵێم کێ کاری پێیەتی؟»

: «مەلا برایم. هەر بڵێ مەلا برایم بۆخۆی دەزانێ.»

هەر ئەو چەند ڕستە کورتانە وەهای لە کەسایەتی مەلا برایم نیزیک کردمەوە کە بە بیستنی شەهیدبوونی، وەها وەگریان کەوتبووم کە بە کەس ژێر نەدەبوومەوە. تا نازێ دەستی گرتم. ئەودەم دە ساڵانە بووم و هەر لەبەر خاتری نازێ دەمهەویست زوو گەورە ببم.

❊❊❊

# ٣٦

: «ئەوە عومرم گەیشتۆتە ئەو تەمەنەی. بە ڕاشکاوی دەتوانم بڵێم ئێستا لە سەر زەوی کەسم لە ئامینە شەل بەدفەڕتر و خراپتر و نائینسانتر نەدیوە.»

ئەوە قسەیەک بوو کە سۆفی حەسەن بە دوکتوری گوت و هەر کە دیتی دوکتور بێ دەنگ گوێی ڕاگرتووە، درێژەی پێدا: «وەبیرم دێ کە کچۆڵەیەک بوو زۆر لەسەر دڵان و بە حەیا و شەرم بوو، کە گەورەتر بوو ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژێ جوانتر دەبوو. داواکاری زۆر بوون بەڵام مەگین هەر دەیزانی پیاو چییە؟ کەس بە باشی ڕوخساری ئامینی چاوپێنەکەوتبوو. کە لەگەڵ کچان دەچوو بۆ گەڵبڕینێ ئەو سەرەی کە بەری دەداوە هەتا نەهاتباوە ماڵ هەڵی نەدەهێناوە. کەس نەیزانی چی بەسەرهات کە هەرچی حەیا و ئابڕووی هەیبوو یەک جێ بەهەرزان و تاڵانی دا. بە دوای ئەوەدا کە مێردی کرد. ئامین یەک سەر بوو بەدێوەزمە. کە لاقی وای لێهات، خراپتر بوو. هەرچی شەلتر دەبوو بەدفەڕتریش دەبوو دەتگوت ئەوەی خودای شەڕ و خراپە و دزێوییە ماڵی دەنێو لاقە شەلەکەی ئامین دا کردووە، قورسیان کردبوو  کە بەو دژوارییە بەدوای خۆیدا دەیکێشا. ئەو کەسانە ئامینیان بە کچی دیتبوو. سەد سوێند و قوڕئانیان دەخوارد کە بێ ونەبێ ئامین یان دەرمانداو کراوە و یان دۆعا و نوشتەیان لێ کردووە. ڕەنگە مێشکی قشقەڵەیان دابێتێ. لە ماوەیەکی کورتدا کە پێموایەساڵێکی نەخایاند ئەو ئامینەی خەڵک بە ئاواتەوە بوون بە هەڵکەوت چاویان بە چاوی بکەوێ لەم دێیەدا کەس نەمابوو کە فشە و جەفەنگی لەگەڵ نەکا. هیچ پەردەی شەرم و حەیا نەمابوو کە ئامین بێ ترس هەڵینەداتەوە و نەیدڕێنێ. هەرچی زۆرتر دەلەنگی. ڕوو

هەڵماڵاوتر و بێ حەیاتر دەبوو. هیچ قسە و باس و گێرە و کێشەیەک نەبوو کە لاقە شەلەکەی ئامینی تێدا نەبێ.

هەرکە سۆزەی کردبا[53] ژنێک بە ئاستەم لەگەڵ مێردەکەی ناکۆکی هەیە، دەچوو دەبنیەوە وەهای لە خشتە دەبرد  ئیتر هەرگیز خۆی نەدەگرتەوە. دەلاڵی بۆ پیاوان دەکرد. زۆر هاتوچۆی ماڵە کاوسێنی دەکرد. ئەو کاوسێنەی پێش‌تر بۆم باس کردی گوتم کە حەوت کوڕی شێت و شووری هەبوو، لەگەڵ  دەنکە هەنارێک، خەڵک دەیانکوت. بێ و نەبێ، کەین و بەینێکی لەگەڵ یەکێک لە کوڕەکانی ساز کردووە کە ئەوەندە هاتوچۆیان دەکا. بەڵام خۆی گوتبووی لە دایکەوەرا خزمایەتیان هەیە. هەموو خەڵک چاوەڕوان بوون کە ڕۆژێک ئامین پەندێک بەسەر فاتێ بێنێ. بێ لەمەش زۆر هاتوچۆی هەمزاغای دەکرد. دەیانگوت: - خودایە ئەتۆ لە منی نەگری – کە مێردی کرد ئەوە هەمزاغا بوو کە ئامینی بەم دەردە برد. کێ چووزانێ؟ خودایە، تۆبە سەهووم کرد وەباڵ بە ئەستۆی ئەوانەی دەیانگوت، کەم نین ئەوانەی دەڵێن ئامین ئەو کوڕە و کچەکەشی کە مێردی کردووە ئی هەمزاغان. دەڵێن هەمزاغا هەمیشە وەک منداڵەکانی خۆی ئاگای لەو دوو منداڵەش بووە. تەنانەت دەڵێن هەمزاغا کچەکەی ئامینی بە مێرد داوە، هەرچەند ئامین ڕازی نەبووە بەڕێی کاتە هەندەران. ئەوەی بۆ هەموو کەس سەیرە و جێی پرسیارە ئەوەیە، ئەودەم کە ئامین لەوپەڕی جوانیی خۆی دابوو و داواکاری باش باشی هەبوو چۆن ڕازی بوو مێرد بە غەفوورەگێڕ بکا کە تەمەنێکی ڕابواردبوو نە دیمەنێکی جوانی هەبوو نە سامان و داهاتێک. هەموو کەس دەڵێ ئەو کابرا سەردەشتییە تەلیسمی کردووە کە ئامین بەڵێی بۆ گوتووە. بە هەرحاڵ گوایا هەمزاغا زۆر زوو لە ئامین تێر بوو. کەس نەمابوو لە کەینە و بەینەی ئەم جووتە نەگا، دەڵێن غەفوورەگێڕ کە گوایا غەفوورەگێڕ شکستەبەند بوو لەداخان نیوە شەوێک دەخەوێدا چۆتە زگ لاقی ئامین و ئەو بەلایەی بەسەر لاقی هێناوە هەر بەو نیوە

---

٥٣- سۆزەی کردبا: سۆسەی کردبا: شك و گومانی کردبا:

شەوەی بە گێڕەگێڕ دەگەڕێتەوە سەردەشتێ واز لە ئامین دێنێ. هەر ئەو نیوەشەوە کە بە هاوار و گریان و قیژەی ئامین تەواوی خەڵکی دێ لە خەو ڕاست بوونەوە. هیچ کەس نەیزانی غەفوورەگێڕ چ بەڵایەکی بەسەر لاقی ئامین هێناوە کە ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژێ لە ئامینێ زیزتر دەبوو و لە دووی نەدەهات، ئامینی تەپ و قورس کردبوو. یەک دەیگوت، ڕەنگە دووپشکی ڕەشی پێوە نابێ. یەکی تر دەیگوت، لەوانەیە دەرزییەکی پیسی دە لاقی کوتابێ، ئەویتریان پێی وابوو دەبێ بە ژار  وای بەسەر هێنابێ. هەرچی بوو خەڵک حەقیان دا بە غەفوورەگێڕ. هەرکە ئامین بوو بە ئامینە شەل، هەمزاغاش چاوێکی تەواو پووچا بۆوە و لە ئامین تێر ببوو. هەڵبەت هەمزاغا سەرەڕای ئەوە کە دوو ژن و هەشت کوڕ و کچی گەورەی هەبوو، خۆشی تین و گوڕی جارانی نەمابوو. ئامین لەبەر ئەوە کە ڕێزی جارانی لە لای هەبێ. دەیهەویست ئێستا کە زوو زوو دەچوو بۆ ماڵی کاوسێن زۆرتریش باسی فاتێ لە لای هەمزاغا بکا.

دوکتور لە دوای ئەو هەموو بێدەنگییە کە هەموو گیانی بوو بە گوێ و گوێشی ببوو بە زەوییەکی ئیشک و قاقڕوبێ ئاو و توونی کە قسەکانی سۆفی حەسەنی وەک ئاوی ڕەوان هەڵدەمشت.

: «ڕەنگە بەو جۆرەی تۆ دەیگێڕییەوە ئامین خۆی لە فاتێ دا دیبێتەوە.»

سۆفی حەسەن دەڵێ: «وەڵڵا بۆخۆم جوان لە بیرمە ئەو دەم کە ئامین کیژۆڵەیەک بوو تای نەبوو. کەم لاو هەبوو تەنانەت لە دێیەکانی دەوروبەریش کە چاوی لە دووی ئامین نەبێ. بەڵام ئەگەر ڕاستت بوێ فاتێ شتێکی دیکەبوو. فاتێ فریشتەبوو، فریشتەی خودا. پاک و خاوێن و جوان. نە جوانێکی ئاسایی، جوانییەکی تایبەت، بێ وێنە، پەرییەکی ئاسمانی بوو کە خودا لەسەر زەوی خوڵقاندبووی. بێ گومان ئەگەر هەمزاغا پیر نەبووایە. لەوانە بوو چارەنووسی فاتێ لە چارە نووسی ئامین خراپتر بوایە. هەرچەند بەستەزمانە فاتێ چ چارەنووسێکیشی نەبوو.»

: «سۆفی حەسەن ئێستا هیچ چەشنە ئاگادارییەکت لە ژیانی فاتێ هەیە کە لە کوێیە و لە چ حاڵ و وەزعێک دا دەژی؟»

: «بە قوربانت بم، تا ئەو جێگەیەی من خەبەرم هەبێ تا مێردەکەی مابوو، هەر لە لای خۆمان لە سوورەچۆمێ بوو. براکانی جار جارە سەروسۆراغێکیان لێدەگرت بەڵام هەرکە حەمە کوژرا، وەک ئەوەی فاتێش کوژرابێ، کەس خۆی تێنەگەیاند. بۆ ماوەیەک دواتر، ئێوارەی پاییزێکی نا وەخت، فاتێ شەش منداڵ و ماڵەکەی تێکەوە دەپێچێ و بار دەکا بۆ سەردەشت، دەڵێن لەوێ خەریک بوو بە کاری ماڵان و ئارەقەی نێوچاوانی، منداڵەکانی بەخێو دەکرد. هەڵبەت ئەوەشم بیست دەڵێن ئەو شۆخە ناسک و نازدارە وەک داری بێ ئاو ویشک هەڵاتووە. ئەو فاتێ جوانە بۆتە پیرێژنێک. ئای دوکتور! نازانی ئەو کچە چ بوو؟ ئای لەو دەنکی هەنارەی، ئای لەو هەموو جوانی و خانومانییەی! ئای لەو هەموو کابانی و ماڵدارییەی. وەک ئەودەم کە باسیان دەکرد.»

: «ئەدی سۆفی باب و براکانی فاتێ چیان بەسەرهات؟ چۆنن؟ ماون؟»

: «بە دوای ئەو بەڵایەی بەسەر کاوەیس و فاتێیان هێنا، زۆر سەیر بوو، هیچیان خۆیان نەگرتەوە. کاوسێن کە بەپیری عەقڵی گۆڕابوو. شێت بوو، ماوەیەک لە شێتخانەی ورمێیان کرد، ئاخریش هەر لەوێ سەری نایەوە. ئەو حەوت کوڕەشی دوو کوڕە چکۆڵەکەی نەبێ کە دەستیان لەو کارەساتەدا نەبوو ئەوانی تر لەو ڕۆژەوە ئەو کارە ساتەیان قەوماند، هەرگیز ئاوی خۆش بە گەروویاندا نەچۆتە خوارێ. بەڵا لە دوای بەڵا، موسیبەت لە دوای موسیبەت. بەربینگیان پێ دەگرێ. جارێکی خۆبەخۆ لە مەزرایە شەڕیان لێ پەیدا بوو، تا خەڵک گەیشت و لێکیان کردنەوە یەکیان کوژرابوو. دوانیان بە تاوانی قەتڵ گیران، ئەو بەینانە بەربوون کەس نایانناسێتەوە. دەڵێی پیری سەد ساڵەن، زگت پێیان دەسووتێ دوکتور قسەکەی سۆفیی بڕی: «سۆفی حەسەن! ئەمن هەرگیز زگم بە ئینسانی وا ناسووتێ.»

سۆفی حەسەن گوتی: «بە قوربانت بم دوکتور گیان! مەبەستم تۆ نەبووی دەزانم نە ئەوانت دیوە و نە دەیانناسی بەڵێ دوای شەڕەکەیان، ئەوەی هەیانبوو لە مووچە و مەزرا و ڕەزەکەیان هەموویان بە با دا. یەکێک لە براکان فێری قومار ببوو هەر زۆر زوو بەشی خۆی لەسەر دانا. دەڵێن

ئێستا لە دێیەکی لای جەڵدیان بە سەپانی ڕایدەبوێرێ. ئەوانی تریش وەک خەبەرم هەبێ چ وەزع و حاڵێکی باشیان نییە.

: «سۆفی حەسەن! هەمزاغا چی بە سەرهات؟ لەوی چ خەبەر؟ ماوە یان مردووە؟»

: «چەند ساڵێکە مردووە. لەو دوایانەی ژیانیدا زەلیل ببوو، هەرتک چاویشی کوێر بوون. زۆر کەس دەیانگوت:

: «خوداگیری ئامینێ بوو»

: «ئامینی فریو دابوو ئەودەم کە ژنی غەفوورەگێڕی بوو، لەپێش دا غەفوورەگێڕ هەر وەڕووی خۆی نەدەهێنا. هەموو کەس ئاگاداری کەینە و بەینەی دەگەڵ هەمزاغا ببوو. بەڵام دەتگوت غەفوورەگێڕ نایزانێ یان بە ئانقەست نایبینێ تا ئەوی شەوێ کە ئەو بەڵایەی بەسەر ئامین هێنا. وێدەچوو هەمزاغاش هەر تا ئەوی شەوێ دەیهەویست، چونکە بۆ بەیانی دەنگی دابوو کە چیتر نەچێ بەلایدا. هەڵبەت ئەوەم لە زاری ئامین بیست. هەر ئەوەش بوو کە ئامین تازە نەیتوانی خۆ بگرێتەوە. لە ڕاستیدا لە ڕۆژێکدا لە دوو لا پیسی وێکەوتبوو. ئامین وەک بۆی باس کردم پێی وابوو هەمزاغا بەڕاستی بۆ هێنانێ لەگەڵێتی، بەڵام وانەبوو، ئەودەم کە ئامین زانی لە هەموو دینێک بووە ئیتر کەس باشاری نەکرد، کەوتە تۆڵە ئەستاندن لەهەر کەسێکی کە تەنانەت نەشیناسیبا.»

: «سۆفی حەسەن! کاوەیس چ خراپەیەکی لەگەڵ ئامین کردبوو یان دایکی کاوەیس؟ کوتت ناوی چ بوو؟ ئەها وەبیرم هاتەوە. زڵەخا، بەڵێ وا بزانم گوتت ناوی زڵەخایە؟»

: «بە قوربانت بم. منیش سەردەمێکی زۆر بیرم لەوە دەکردەوە، دەمدیت کە ئامین کاری بە چاکە و خراپە و چاک و خراپ نەدابوو، ئەو چونکە لەهەموو لایەک لەبەر چاوان کەوتبوو پێم وابوو هەر لەبەر ئەوەی هەست بە بوونی خۆی بکا ئەو ئاکارە دزیوو ناحەزانەی لەخۆی نیشان دەدا. هەروەک براکەی حاتەمیتایی کە ئەو بێ حورمەتییەی بەماڵە خودا کرد، وای دابنێ، کەسێک لە شوێنێک بژی کە لە مندالی سەر لانکەوە بگرە هەتا پیری زورهان

و کەفتەکار لووتی لێبادەن و بە هێندی نەگرن. وەک بەشەرانی نەبینن. هەرکە چاویان پێی کەوت، ڕووی لێوەرگێڕن. تەنیا کاوسێن و کوڕەکانی دەیاندواند و هاتوچۆی ئەوانی دەکرد ئاخریش وەک مار پێوەی دان و تۆڵەی هەموو کەسی لەوان کردەوە. دەیجا بۆ یەکی وەک ئامینە شەل کە پێشتر لەبەر داواکاری زۆر، درگایماڵیان لە ڕەسمە دەرهاتبوو. بگاتە ئەو ئاستەی کە بە سەگیشی دانەنێن چ دەمێنێتەوە جگە لە شەیتانی و دوو زمانی؟  قسەی ناخۆشی ئەم وئەو بۆ یەکتری و بۆ ئەو و ئەم بردن، بوختان پێ کردن. کێشە و ئاژاوە نانەوە و دەلاڵی کردن بۆ ژن و پیاو و کچ و کوڕان.»

دوکتور دەربارەی کاوەیس پرسیاری لێ دەکرد.

: «بە خودای پاش ڕووداوەکە خەبەری کاوەیس بە مردوویی هاتەوە خەریک بوو پرسەی بۆ دابنێن کە هەواڵ هاتەوە نەمردووە. بەڵام هێند بێلەززەت بووە کەوەک دەیانگوت. نە لە سەردەشت، نە لە سابڵاغ، نە لە ورمێ دوکتوران چێیان لەگەڵی پێنەکراوە. هەر ئەوە بوو کە دەڵێن لە ورمێ بەڕێکراوەتە تەورێزێ یان تارانێ.  ئەوەی ڕاست بێ زۆری وەدوا کەوتوون تەنانەت خاڵیشی کە لە کاتی کارەساتەکەدا لە سەفەر بوو زۆری بە شوێنێوە بوو بەڵام دەتگوت یا عەرز قووتی داوە یا ئاسمان هەڵیکێشاوە. لەو دەمەوە تا ئێستا نە سەری هەبووە و نە سۆراغ.

هێندێک پێیان وایە، کاتێک دەیانبردە نەخۆشخانەی تاران هەر لە ڕێگایە تەواو دەبێ و لەو ناوە دەینێژن. گوایە لە لای قەزوینێ نێژراوە، کوڕی سەید بایز کە بۆ خشتبڕین چووبووە  ئەو ناوچەیە، دەیگوت بۆخۆم بەو دوو چاوانەم گۆڕەکەییم دیوە. ماوەیەک دواتریش کوڕەکەی ئامینە شەل کەلە دەس دایکی ڕای کردبوو بۆ تاران، دەیگوت بە چاوی خۆم کاوەیسم بە زیندوویی دیوە و قسەشم لەگەڵی کردووە. بەڵام چۆن کوڕی ئامین بوو کەس بڕوای پێ نەدەکرد. ماوەیەک دواتر دەنگۆ کەوت کە کاوەیس چەکی دەس داوەتێ و چۆتە شاخ.

دەیانگوت دەیهەوێ بێتە سەر ماڵە کاوسێنی بۆ تۆڵە ئەستاندن. هەڵبەت خۆم ئەوەم پێ درۆ بوو، چونکە ئەودەم ماڵە کاوسێنی کەسیان لە سوورەچۆمێ نەمابۆوە، دەڵێن بەو قسەیە ئامینە شەل زۆر ترسابوو. بەڵام بە باوەڕی خۆم کاوەیس پاش چاکبوونەوەی چون دایکی نەمابوو و فاتێشیان بە زۆری بەمێرد دابوو، ئیتر هیچ دڵخۆشییەکی لە سوورەچۆمێ نەمابوو، ڕەگەڵ شۆڕشەکەی ئەودیوی کەوت. هەڵبەت زۆر کەسی تریش وا بیر دەکەنەوە هەروەها دەڵێن نێوی خۆی گوڕیوە و ئێستا سەرکردەیەکی گەورە و ئازایە.»

: «ئەدی سۆفی! ئەو قسەیە ڕاست بوو کە گوایا فاتێ لە لای براکانی دانی بەوە داهێناوە کە کاوەیس بێ سیرەتی کردووە؟»

خوێنەری بەڕێز دەبێ زۆر بمبوورن خۆم بۆ ڕانەگیرا من پێشتریش پێم وابوو هەم دوکتور و هەم سۆفی حەسەن دەگەڵ یەک کایە دەکەن. ئەو هەموو زانیارییەی دوکتور لە کاتی پرسیارەکانی دەیخاتە ئاراوە شک و گومانم پتر دەکەن، وێدەچێ بەپێی بڕیارێکی نهێنی نێوان خۆیان قسەی یەکتریان بەلاوە سەیر نەبێ، زۆرتر وەئەوە دەچێ کە خەریک بن زەمانێک و کاتێک بفەوتێنن یان شەوێکی بەسەرکەنەوە. با بزانین وڵامی سۆفی چ بوو؟

: «بە قوربانت بم دەڵێن هەر ئەو قسەیە بوو بەهۆی ئەوە کە براکانی فاتێ قەستەسەری کاوەیس بکەن. زۆر دواتر من لە زاری برا چکۆڵەکەی فاتێ بیستم کە فاتێ هەرگیز ئەم قسەیەی نەکردووە، تەنیا لە سەرخۆش ویستنی کاوەیس پێداگری کردووە. دەیگوت ئەوە ئامین بووە کە بۆ براکانی دەستی بە قوڕئان داداوە کە ئەو خەتایە ڕووی داوە، بە خودای دوکتور گیان! من لەوێ نەبووم بەڵام وەک ڕۆژی ڕووناک دەزانم کە درۆیە. کەس نەبوو نەزانێ فاتێ بە گیان و دڵ کاوەیسی خۆش دەویست، هەر دەیپەرست. ئەگەر لەمن بپرسن. دەڵێم براکانی فاتێش دەیانزانی ئەودوانە یەکتریان خۆش دەوێ بەڕووی خۆیان نەدەهێنا. بەڕاستی کاوەیس بێ وێنە بوو. تەواوی ئەو ئاورە لە گۆڕی ئامینە شەل هەڵدەستا. هەر بۆیە سزاکەشی بە تەواوی دیت.

ماوەیەک لەم ڕووداوە تێپەڕیبوو. ڕەنگە دە، دوازدە ساڵێک دەبوو. چونکە ئەودەم کە ڕووداوەکە قەوما کاوەیس لەوێ نەبوو حاشای لێ کا و شاهیدی بۆ بێتاوان بوونی خۆی بدا. زۆرێک لە خەڵکی دێ باوەڕیان هێنابوو کە لەوانەیە کاوەیس ئەوکارەی کردبێ، هەر بۆیە نەگەڕاوەتەوە دێ. ئاخر لە شوێنێکی دواکەوتوو و دوورەدەستی وەک سوورەچۆم، ئەگەر ئەم قسە و باسانەش نەبن. خەڵکی لە بێ کاری و وەڕەزی دڵیان دەتۆقی!! هەر بۆیە ئەم ڕووداوە لەناو دێدا بوو بە سەد ڕووداو هەرکەس بە مەیل و ویستی دڵی خۆی چیرۆکێکی لێ دروست کرد و هەرکەسی خۆش ویستبا، دەیکردە قارەمانی چیرۆکەکەی خۆی وهەرکەسێکی ناخۆشی ویستبا دەیکردە بەکرە شۆفار. حەولیشی تەواوی دەدا بە سوێند خواردن و بەڵگەی جۆراجۆر و عەجیب و غەریب هێنانەوە چیرۆکەکەی خۆی وەڕاست بگەڕێنێ. ئیتر کێشە لەسەر تاوانباربوون یان تاوانبارنەبوونی کاوەیس و فاتێ، یان ئامینە شەل و هەمزاغا و براکانی نەبوو بەڵکوو کێشە ببوو بە کێشەی دروستی ڕای خەڵکی، هەرکەس بەو جۆرەی پێی خۆش بوو ئاڵوگۆڕی بەسەر چیرۆکەکەدا دێنا، وەهای لێهاتبوو کە لەدێهاتی دەوروبەریش و تەنانەت دێیە دوورەکانیش ڕەوایەت گەلی جۆراوجۆرە و چیرۆکی بەتام و چێژتریشی لێ ساز بوو. هێندێک بەیتبێژی بە زەوق بەشێک لە بەیتەکانیشان ئاوێتەی چیرۆکی کاوەیس و فاتێ کردبوو، خۆم لە چەند کەسم بیست کە دەیانگوت بەیتبێژێک لە لای ئاڵواتان هەیە کە بەیتی کاوەیس و فاتێ دەڵێ و ئاور لە پیاوی بەردەدا. دەتوانم بڵێم ئێستاش گێڕانەوەی ئەم چیرۆکە هەر نەبڕاوەتەوە. ئەوەتا لێرە لە تارانێ کێ بیری دەکردەوە بەم چیرۆکەدا بێنەوە. تۆی دوکتور و منی سۆفی حەسەنی مجێور، بەسەرهاتێکی کە ساڵانێکی دوور و درێژی بەسەردا تێپەڕیوە ئێستا بە یەکەوە خەریکین لێی دەدوێن،

: «بەنیاز بووم ئەوەت بۆ بگێڕمەوە منیش زۆرم لەو ڕووداوە نەدەزانی. وەنەبێ نەزانم، وەک خەڵکی، هەرچی کوترابا بە گوێی منیش دەگەیشتەوە مەبەستم لە حەقیقەت و بەشی شاراوەی ڕووداوەکە بوو کە دەسینگی ئامینە شەلدا قەتیس مابوو. ئێوارەیەکی درەنگ وەختی ئاخر و ئۆخری پاییز بوو.

دار خۆیان لەکۆڵ گەڵا کردبۆوە. تەنیا قرەی قەل بوو لە مووچە و مەزراکان مابۆوە. ژووری مزگەوتم خاوێن کردەبۆوە و خەریکی ئاودەستەکان بووم. هەستم کرد کەسێک بە پڕتاو خۆی دەژووری مزگەوت کوتا. بەخۆم گوت دەبێ کێ بێ هاتووە، نوێژەکانی دواکەوتووی بە قەڵا بگێڕێتەوە؟ خۆم تێنەگەیاند. تا لەپڕ گوێم لە دەنگی گریانێکی لە کوڵی ژنێک بوو. لە پەنجەرەی حەوشەی مزگەوت کە ڕوانیمە ژوورەوە، هەرچەندە ژوورەکە تاریکیش بوو زانیم کە ژنە کە لە پێش مێحرابی مزگەوت کەتبووە سەر چۆک هەر هەنیسکی دەدا. دەگریا وەک تاوی بارانێ، چۆن گریانێک؟ دارو بەرد ئاوری تێبەردەبوو. دەپاڕاوە چ پاڕاوەنەیەک! دەینالاند، چ نالاندنێک! لێکدا لێکدا سەری خۆی لەعەرزی دەکوتا، کەفی هەڵدەخڕاند کفری دەکرد. هاواری دەکرد. من مات و سەر لێشێواو ڕاوەستابووم، نەمدەزانی دەبێ چ بکەم، ئەی خودایە ئەوە کێیە؟ چی دەوێ؟ چی بەسەر هاتووە؟ گوێم لێی بوو.

: «خودایە! خودایە! بەسمە، بەس، چی دیکە ئازارم مەدە. هیچی دیکەم تاقەت نەماوە، خودایە زووتر بمکوژە با نەجاتیم بێ لە دەست ئەو هەموو ژان و دەردە. خودایە هەزاران جار گووم پێ خورا، من خراپ بووم، خراپەم کرد، کچێ فاتێ لە هەر جێیەکی بەدڵت دابێ وەرە مەحز بۆخاتری خودای بمبەخشە، ڕوحمێکم پێبکە. کاوەیس تۆش چی نەما بەسەرت نەهێنم لەکنە خۆ تۆ دەبوو کوڕی من بای. دەزانم قەت قەت نامبەخشی، خودایە هاوارت دەکەمێ، تۆ لە تۆڵەی ئەوان بمکوژە با ڕزگاریم بێ. ئەم قسانەم کە گوێ لێبوو زانیم ئامینە شەلە. لێی وەژوور کەوتم.»

: «ئامین! کچێ! ئەو حەشرە چییە دەیگێڕی؟ چ قەوماوە بڵێ بزانم؟»

: «سۆفی حەسەن! بە قوربانی بنی کەوشەکانت بم، ئەتۆ ڕوحمێکم پێبکە. ئەتۆ لە ماڵە خودای دای، پیاوچاکی، وەرە بۆم لە خودا بپاڕێوە بەڵکوو زوو بمکوژێ و لەو هەموو مەینەت و ژان و ئازارە نەجاتم بێ. سۆفی هیچ دەزانی کەس لە من خراپتر و چارە ڕەشتر نییە. کەس بەقەرا من دەرحەق خەڵک خراپەی نەکردووە. بەخۆم دەڵێم دەچمە گەردن ئازایی. بەڵام ناوێرم، لەدەستم نایە، کەس نەماوە بە چەشنێ ئازارم نەدابێ. سۆفی حەسەن! تۆ

خودا لێم گەڕێ با نەختێک لە لای تۆ کوڵی دڵی لەت لەتم هەڵبڕێژم، هەروەک شێتانم لێهاتووە. با لانی کەم تۆ بزانی ئەمن چ دێوێک بووم! چ ئەژدیهایەک بووم! ئەوە ڕاستیەکەی بەتۆ دەڵێم. ئە بەو خودایەی کە دەزانم خەڵقی کردووم و تازە منی ناوێ، کەس لە کاوەیس و فاتێ بێتاوان‌تر نەبوو، وەک ئاوی شەوێ پاک بوون، مەزلووم و بێ تاوان، ئەمن بەو دەردەم بردن، کاوەیسم بە کوشت دا، فاتێم بە تاڵان‌دا و دڵی زوڵەخاشم تۆقاند و خۆم، خۆم نازانم لە کەیەوە و بۆچێ ئەوەندە خراپ بووم. هەر دەهات و کەیفم بە چارە ڕەشی و لێقەوماوی خەڵک پتر دەبوو. ئاخر من خۆ کەسیشم بۆنەمابۆوە. تەنانەت منداڵەکەی خۆشم، منی نەویست و جێی هێشتم. بەدوای ئەوە کە هەمزاغا بە قسە و بە دەهۆ فریوی دام و داوێنی لەکەدار کردم بەڵام، نا، نا با ئەوەی بڵێم پێشتر لە هەمزاغا بۆ خۆم خۆم فریودا. بەخۆم دەڵێم ئەوانە هەمووی موقەددەر بوو. بەڵام وانییە، موقەددەر نەبوو. من دەمتوانی خۆم لە هەموویان ببوێرم، نەمکرد، کە وەدوای هەمزە کوێرێ کەوتم. ئەوەیە کە خەریکم خۆ فریو دەدەم. وەک ئەو کەسەم لێهاتبوو کە خەریک بوو خوێنی بە خوێنی دەشۆردەوە. هەر خراپەیەکم بە خراپەیەکی تر لە بیر دەبردەوە. تۆ منت بە کچی دیبوو، وابووم؟ گریا و گریا و گریا، بە سەرهاتەکەی خۆی لە نووکەوە بۆ گێڕامەوە. هەمووی لەبن سەری خۆی دابوو. دەیهەویست تۆڵە لە هەمزاغا بکاتەوە ویستی ئەوە بوو فاتێی بۆ نەرم بکا ئینجا لە لایەکی حەوت برا شێت و شوورەکەی فاتێ و لەولاش دووژن و هەشت منداڵەکەی هەمزاغای بەگژ داکا، بەڵام ئامینە شەل بە هەڵە چووبوو هەمزاغای جاران نەبوو، سەردەمێک بوو لێکەوتبوو.

لەلایەکی‌تر دەیهەویست تۆڵە لە کەسێکی تر بکاتەوە. ئامین پەتەی کەوتبوە سەرئاو. هەتا خەریکی خراپە و بوختان و درۆ ودەلەسە و ماڵ وێران‌کردن بوو. گوایا عەلەمی لێنەبوو، بەڵام هەرکە بەخۆیدا هاتۆتەوە و زانیوێتی چی کردووە و ویستبووی دەس هەڵگرێ و خراپەکانی قەرەبوو بکاتەوە. لەپڕ ژان و ئێش و ئازار لەشی داگیر کردبوو. مەڵەغانیان بە لەشی داگێڕابوو. بە ئێش سەری نابۆوە و بە ژان سەری هەڵێنابۆوە. سەرت

دێشێنم دوکتورگیان! ئامین ئەوەی کردبووی لە خراپە، لە ماڵ ویرانکردن، لە دووزمانی کردن، لەنێوان ناخۆشی سازکردن، لە دووبەرەکایەتی نانەوە. لە دڵپیس کردنی ژن و مێردان و لەسەر یەک، ئازاردانی ئەوەی جووڵاباوە. هەمووی بۆ گێڕامەوە. لەو دەمەوە ئیتر ژیر نەبۆتەوە ئێستاش شەو ڕۆژ هەر دەگریێ و دەناڵێنێ. دە دیویکی دا کەوتووە کەس ناتوانێ لێی نیزیک ببێتەوە. ئازای لەشی کرمە ڕێز بووە. بۆتە چیلکەیەک و فڕێ دراوە لەسەر ئەو هەموو خراپەیڕا پیاو بەخۆی نییە کە حاڵی دەبینێ زگی پێی دەسووتێ.»

دوکتور گوتی: «سۆفی حەسەن! کەوابوو فاتێ بە ڕاستی کاوەیسی خۆش دەویست و ڕووحی خەبەردار نەبوو کە براکانی لەسەرچی ئەو بەڵایەیان بەسەر کاوەیس هێناوە؟»

: «ئەو جۆرەی ئامین بۆی گێڕامەوە. بۆخۆی هەمزاغای ڕاسپاردبوو بە بیانوویەک کاوەیس بنێرێتە سەر کانی و خۆشی بەدەهۆ پێی گوتبوو لای تاوپەڕان بچێتە سەر کانی کەوان، فاتێ دێتە سەرکانی و بە زمانی خۆی پێی دەڵێ کە هەرگیز کاوەیسی نەویستووە و هەرگیز نایهەوێ. بەڵکوو بەنیازە مێرد بە خوشکەزایەکەی هەمزاغا بکا. ئەوەی کە کاوەیس چۆنی فاتێ ناسیوە کە بە قسەکانی ئامینەشەل لێی وەشک دەکەوێ بۆخۆی جێی پرسیار و گومانە. ئاخر ئەگەر کاوەیس نەمردبێ ئەوەی کە هەرگیز نەهاتۆتەوە تا بزانێ چ بەسەر فاتێ دا هاتووە. هێندێک لە خەڵکی دێی هێنابووە سەر ئەم باوەڕە کە گوایە کاوەیس بەدرۆ دەگەڵ فاتێ بووە. ئامینە شەل بە براکانی فاتێ دەڵێ: ئەگەر پیاون، کەلەگاکەی فاتێ ئەوە لەسەر کانی کەوان چاوەڕوانتانە.»

دوکتور دەڵێ: «چ سەیرە! ئەو هەموو تەقەلایەی ئامینەشەلێ تەنیا لەبەر هیچ و خۆڕاییی؟»

❋❋❋

# ٣٧

..... بۆ یەکێکی وەکوو من کە بەشێک لەم ڕووداوانە بووم، بۆی هەبوو هەمیشە پرسیارێک لێم ببێتە مێشی پایز. هەرلێم بنیشێ و هەر دەریکەم و هەر لێم بنیشێتەوە و هەر دەریکەمەوە و هەر واز نەهێنێ و هەر گوێی نەدەمێ. بێگومان تا ئێستا دەبێ ئەم پرسیارە بووبێتە پرسیاری تۆش، ئامینە شەل کێ بوو؟ بۆ وای دەکرد؟ دەزانم دایکی بە زۆری بە مێردی دابوو. من لەگەڵ خۆمە. دەیجا زۆر باشە زۆر کەس بە زۆری بەشوو دەدرێ. بەڵام هەرگیز بەو ڕێگەیە دا ناڕۆن کە ئامین پێیدا ڕۆیشت. ئامین دەرحەق بە هەموو کەس خراپەی دەکرد. بەڵایەکی ئینسانی بوو کە کەوتبووە گیانی سوورەچۆمێ. کتکە نەفتینەیەک بوو بە لای هەر ماڵێکدا تێپەڕیبا ئاگری تێبەردەدا. ئەوی لە دەستی هات و پێی کرا و کردی دەرحەق بە فاتێ و کاوەیس، هیچ کەس دەرحەق بە هیچ کەسێ تری ناکا. نە کاوەیس نە فاتێ، نە ئێستا و نە ئەودەم، هیچ کامیان نەیاندەزانی بۆچی ئامینە شەل بەو دەردەی بردن، هەڵبەت ئەوە پرسیاری منە، ئەگینا نە فاتێ و نە کاوەیس بڕوا ناکەم بە هۆی ئەم سەرەنگرێ بوونەیان هیچ دەرفەتی ئەم پرسیارەیان پەیداکردبێ. کاوەیس نەیدەزانی براکانی فاتێ بۆچی دەیانویست لە ناوی بەرن. بەخۆی دەگوت «خۆشەویستییەکی خاوێن و ئاسمانی هەرگیز نابێ ئەوە سزای بێ.»

نەیزانیبوو کە براکانی فاتێ لایان وایە داوێنی فاتێی پیس کردووە. فاتێش کە حەوت براکانی -هەڵبەت ئەوە بڵێن، زۆرتر پێنج برای ئەو بەلایانەیان بەسەر فاتێ دەهێنا بەڵام چونکە هەر لە هەوەڵەوە گوتبوومان حەوت برای شێت و شوور قەیدێ ناکا با دڵی ئەو دوو برا

چکۆڵەی فاتێ لە ئێمە بێشێ ئێستاش هەر دەڵێم حەوت برای شێتوشوور- بەڵێ حەوت برا شێتوشوورەکانی بۆ ساتێکیش ئیزنیان نەدا کە پرسیار بکا، کەی و لە کوێ ڕەوا بووە بۆ خۆشەویستیی‌یەکی ئاسایی کە هەموو کوڕ و کچێک لەناودێدا ئەزموونی دەکەن، دەبێ بەمردن سزا بدرێن. هەڵبەت فاتێ نەگەڕانەوەی کاوەیسی وەک مردنی ئەو بەخۆی قەبڵاندبوو و دەربارەی ژیانی خۆشی بڕوای وابوو مردن ڕاحەت‌تر بوو لەو ژیانەی ئەو بەسەری بردبوو- هەرچەندە براکانی تا لە زاری فاتێیان دەرکێشا کە دڵی داوە بە کاوەیس و خۆشەویستییەکی ڕاستەقینە و پاک و ئاسمانی لە بەینیان دایە، زۆر بە ڕووی خۆش و بەڵێنی دڵخۆشکەر دواندبوویان.

ڕەنگە ئەودەم چ کاوەیس و چ فاتێ ئەگەر بیانزانیبایە کە چ بوختانێکیان پێ کراوە جۆرێکی تر جووڵابانەوە. من لە لای خۆم خەریک بووم بۆ هۆی خراپەکاری ئامینە شەل بەڵگەی پەسەند کراوم دەدۆزێوە. بە خۆم دەگوت: «بۆی هەیە ئامینە شەل، کاوەیسی پێ کۆڕێکی باش بووبێت. ویستبێتی لە دەست فاتێی دەرکێشێ و کچی خۆی بداتێ بەڵام دیتم بە هەڵە چووم چونکە ئەودەم کچەکەی ئامینە شەل مێردی کردبوو خۆ کچەکەی مێردیشی نەکردبایە چۆن دەگۆنجێ کەسێک کوڕێک بۆ کچەکەی خۆی هەڵبژێرێ  دوایەش بە پیلانێک بە کوشتی بدا. نا، وا نابێ من سەیر لاڕێ ڕۆیشتبووم. دوایی هاتمە سەر ئەم ڕایەی کە ڕەنگە ئامین ویستبێتی کاوەیس لە ناو بەرێ تا پاشان فاتێ بە هەر فێڵ و تەڵەکەیەک بێ بۆ کوڕە سەر زلەکەی خۆی فریو بدا. بەڵام کەلێی ورد بوومەوە دیتم کە ئەم بۆچوونەشم ڕێی تێ نەدەچوو، دیارە سازکردنی چیرۆکێکی وا کە کاوەیس بە کوشت بدا. لە هەمان کاتیش‌دا، دەیتوانی فاتێش بە کوشت‌بدا. هەرچی مێشکی خۆم ڕێک دەکوشی. عەقڵم دەستی نەدەگرتم لەم بێ‌خەبەرییە ڕزگارم بکا، من تەنیا بە بیستنی چیرۆکی کاوەیس و فاتێ تازە خۆشم ببوومە بەشێک لە چیرۆکەکە. من لێرەدا ئەوە دەبێ بڵێم مافی ئەوە دەدەم بەخۆم کە هەرگیز بە هیچ کەس نەڵێم

کە ئەم ڕووداوەم لەزمانی کێ بیستوە: هەرچەند بە بیستنی ڕووداوەکە لە زمان ئەو کەسەی کە نامهەوێ هەرگیز ناوی بێنم. زۆر پرسیارم بۆ ساز بوو کە دەکرا و دەمتوانی لێی بپرسم و نەمپرسی. بەڵام ئەوەی بە لای من گرینگ بوو ئەوە بوو کە هەستم دەکرد ئەم چیرۆک و بەسەرهاتە بە شێوەیەک پێوەندی لەگەڵ نازێ هەیە. من هەروا لە تەمومژی ئەم چیرۆکەدا مابوومەوە کە لەپڕ ماڵە عەلیلە ون بوون. بەیانییەکەی ئەوێ ڕۆژێ لەگەڵ عەلیلە بە یەکەوە لە مەدرەسە گەڕاینەوە. پەناباتێکم بە قەرز لێوەرگرت کە تا ئێستا پێی قەرزدارم. هیوادارم ڕۆژێک وەدوای کۆنە قەرزەکانی بکەوێ. ئەوەندە لە ناکاو ڕۆیبوون کە من هەستم دەکرد هەر نەڕۆیون. وەک ئەوەیە یەک تەکان کاغەزێک لە ژێر کاسەیەک ئاو دەرکێشی  و کاسە ئاوەکە هیچ لە جێگەی خۆی نەبزوێ. ئەوانیش وەها لە ناکاو ڕۆیشتبوون کەئاڵوگۆڕێکیان لەمن بەدەر لە هیچ شتێک و لەسەر هیچ زەینێک بەدی نەهێنا، دەتکوت هەرگیز لەسەردەشت نەژیاون. تەنیا قالە وەک من گێژ ببوو من و قالە هاودەرد بووین، ئەو زۆری لە عەلیلە هەبوو و کەم لە نازێ و من زۆرترم لە نازێ هەبوو  و کەم لە عەلیلە، وەک یەک دەهاتینەوە ئەگەر جۆری ژان و ئازارەکانمان لەبەر چاو نەگرتبایە. من بە ناچار ماوەیەک دەگەڵ قاڵە خولامەوە بەڵام کوا قالەی ئیشکەڕن بە سەلاحەددینی زەرکووب یان حیسامەددینی جەڵەبی[٥٤] دەشیا. ببوومە مەولانایەک کە لەبەر عیشقی شەمسی تەورێزییەکەم دەسووتام و بۆسۆم دەهات بەڵام لە دەوروبەرم کەسم نەبوو کە جێی نازێ و عەلیلەم بۆ پڕ بکاتەوە. ئەگەر ئەوان دەمان من شێعرەکانی مێهدی ئەخەوان سالیسم خوێندباوە شێعری «دوو دەربیجەم» لەهەموو شێعرەکانی پێ خۆشتر دەبوو بێشک لەبەرم دەکرد و هەر دەمگوت و دەمگوتەوە ودەمگوتەوە بەتایبەتی ئەم بەیتەی کە دەڵێ:

---

٥٤- دوو قوتابیەکەی مەولانا جەلالەدینی رۆمی.

نه مهر فسون نه ماه جادو کرد  نفرین به سفر که هرچه کرد او کرد

جارێکیتر تەنیا تەنیا مامەوە. هەر ئەودەم بوو کە ئەو مێشە پاییزییەم لێ پەیدا بوو و منیش کە هیچم لەگەڵی بۆ نەدەکرا لێی گەڕام کە بە کەیفی خۆی لەسەرم هەڵنیشێ و هەڵفڕێ و هەڵنیشێتەوە و هەڵفڕێتەوە. چەند مانگ لە رۆیشتنی ماڵە عەلیلەی تێوەرنەسووڕابوو کە بەپێی حوکمێکی ئیداری بابم بە پەیڕەوی لەو ئێمەش بەڕێ کراینە ساییندقەڵا. تەنیا ساڵێک لەوێ ماینەوە. ئینجا بە یەکجاری هاتینەوە بۆ سابڵاغ. کە تەنیاتر لە جاران بمێنمەوە. بۆمن سەردەشت بەهەشتی خودا بوو. ئەو جێگەیەی کە پەپوولەکانیش لەجیاتی ئەوەی بەباڵ بفڕن ئەوەندە هەستیان بە هێمنایەتی دەکرد کە بە پێیان دەڕۆیشتن. من ئەو بەهەشتەم زۆر لە پڕدا لەکیس چوو سەرباری دەردی لە دەسدانی نازێ و عەلیلە، ئیتر نازانم لەمە بەدوا چۆن دەگوزەرێ؟

***

## ٣٨

.... کاوەیس واز لە خەیاڵی فاتیٚ ناهیٚنیٚ. کە فاتیٚ چکۆڵە بوو، ئەودەمەی براکانی دەچوونە کار، هەرکە کەس لەماڵ نەدەما، دەچووە بن درگای حەوشەی خۆیان، درگای دەکردەوە و لەویٚ ڕا جۆریٚک ڕوو بە حەوشەی ماڵە کاوەیس ڕادەوەستا کە هەموو جاریٚ کە خات زڵەخا ئەم بەر ئەوبەری حەوشەی کردبایە، فاتیێ چاو پیٚدەکەوت کە چاوی لە حەوشەی ئەوان بڕیوە. خات زڵەخا تا ئەو جیٚیەی توانیبای و پیٚی کرابا ئاوڕی لیٚدەداوە و دەیدواند.

: «کچم! فاتیٚ گیان! بۆ تاویٚکی نایەی بۆ لای من؟»

: «ئاخر کەسمان لە ماڵ نییە ئاگای لە وڵاتیٚ بیٚ.»

: «کەسی ناویٚ کچی خۆم! بۆخۆمان هەر لیٚرە ڕا چاو لەویٚش دەکەین. بەردیٚک وەبەر درگاکە بدە با لیٚت دانەخریٚ. هەستە وەرە ئیٚمە درگای خۆمان داناخەین.»

هەموو جاریٚ فاتیٚ بە باریٚک شەرمی سووری منداڵانەوە دەچوو بۆ لای خات زڵەخا ئەویش هەر جارەی بابۆڵەیەکی بۆ دروست دەکرد و لەگەڵ ئەوەی کە دە دەستی دەنا دەیگوت: «فاتیٚ هەر دەبیٚ ببی بە بووکی خۆم.»

ڕەنگە ئەودەم فاتیٚ نەیزانیبیٚ مەبەست لە بووک بوون چ بوو بیٚ. بەڵام هەر کەئەم قسەیەی لە زاری خات زڵەخا دەبیست، شڵپەی دوو سەتڵ خویٚن دەهات کە بەرخوڕ دەڕژا. سەتڵیٚکیان کە لە دوو کوڵمە کانی فاتیٚدا گۆمیلکەیان دەبەست و سەتڵە خویٚنەکەیتر دەڕژایە نیٚو خویٚنی دەمارەکانی کاوەیس، کە لەبەر پەنجەرەی ژوورەکەیان گویٚی لە قسەکانی دایکی دەبوو. کاوەیس دوو ساڵ لە فاتیٚ گەورەتر بوو. کاوەیس هەر جارەی بە بیانوویەک دەهاتە حەوشە و هەر

جارەش سڵاوێکی لەدایکی دەکرد. کەدەیدیت کاوەیس سوور هەڵگەڕاوە. دەی گوت:

: «ڕۆڵە گیان! خۆ هیچ جیّیەکت نایەشیّ؟ بۆ وا داگیرساویّ؟»

کاوەیس دایکی دڵنیا دەکا کە هیچ جێگەیەکی لەشی ژان ناکا، کاوەیس و فاتیّ ئەودەم منداڵانە لە یەکتریان دەڕوانی. ڕەنگە مەشقی دڵدارییان بوو، چاویان لەسەر یەک هەڵنەدەگرت و ئەوەش شتێک نەبوو کە خات زڵەخا نەیبینیّ. ئەو دەم زۆر زوو بوو کە کاوەیس تێبگا کە ڕۆژێک دادیّ لە سەر فاتیّ، هەر لەسەر ئەو چاوە گەشە جوانانە، زۆر جێگەی لەشی دەبیّ بێشیّ. پێنج ساڵ لە پاش ئەوەی کە براکانی فاتیّ نیوەگیانیان کردبوو، هەر ئەودەم کە وازی لە هەموو شتێک هێنابوو، تەنانەت لە خۆشی، وەک کاوەیس، ئەودەم کەلەبەر دەست دوکتور کاری دەکرد و بە پێشنیاری دوکتور لە ماڵیّ دەرسی دەخوێند و زۆریش لە خوێندن دا سەرکەوتوو بوو، ڕۆژێکیان کە لە خوێندن ماندوو ببوو. چاییەکی بۆ خۆی تێکردبوو کە لە پاش خواردنەوە و حەسانەوە دەس بکاتەوە بە خوێندن. بە پێچەوانەی هەمیشە کە ڕادیۆکەی سەرمێزی ئاشپەزخانەی نەدەدیت. ئەم جارە چاوی پێکەوت و هەڵیکرد. بەردێک لەپڕ کەوتە نێو گۆمی مەند و قووڵ و بیّبنی زەینێک. دەنگی ئاشنای شوکروڵڵا بابان کە بەسۆزەوە شێعرێکی «کەماڵی» دەخوێندەوە ئیختیاری لیّ ئەستاند و لەگەڵ خۆی ڕایکێشا.

ئەوا جێژنە و هەموو کەس دەس لە مل یارە بە مەسرووری

بە تەنیا یارەکەی بیّڕەحمەکەم دەستم لە مل ناکا

ئاگرێک لەناو ڕادیۆکە هاتە دەر و کەوتە هەناوی کاوەیس. زۆری پیّخۆش بوو فاتیّ بدوێنیّ، شەرمی دەکرد، ئەوەندە لە خۆڕا چووبووە ژوور و لە خۆڕاتر هاتبووە دەر، دایکی وەدەنگ هێنا.

: «ڕۆڵە کاوەیس! ئەوە چت لیّ ون بووە نایدۆزییەوە؟ نە لە ژووریّدا و نە لە حەوشەدا.»

کاوەیس ئەودەم نەیدەزانی چی لیّ ون بووە، بەڵام ئێستا لە شاری غەریب لە دوای تێپەڕبوونی ساڵانێکی دوور ودرێژ، دەزانیّ چی لیّ ون بووە.

کاوەیس هەموو هێز و توانای خۆی کۆ کردەوە تا بە زەحمەت توانی گۆشەیەک لە پەردەی حەیا و شەرمی خۆی لابدا و بە فاتێ بڵێ.

: «تۆ ناترسی لەوەی هەمیشە تەنیای؟»

: «خۆ من هەمیشە تەنیا نیم. زۆر جار پوورە ئامین دێتە ماڵمان. جاروباریش بە تەنێ دەمێنمەوە.»

وشەی ئامین وەک دڕکێک لە پێی دڵی چەقی، داهاتەوە دەری‌هێنا و هەر چاوی لێنەکرد وەلای نا.»

: «فاتێ ئەوجار ئەگەر تەنیا مایەوە زوو وەرە بۆ ماڵی ئێمە.»

فاتێ زوو سەری داخست تا کاوەیس تەواوی بزەکەی نەبینێ، هەرچەند تەواوتری بینیبوو. خات زڵەخا کە وەدیار کەوت کاوەیس بە پەلە خۆی لە ژووری هاویشتەوە و لە گۆشەی پەنجەرەوە چاوی دەفاتێ بڕی کە خەریک بوو، تاریکی ژوورەکەیانی بۆ دیتنی کاوەیس دەپشکنی. کاوەیس هەروا بە پێوە ڕاوەستابوو. وازی لە خەیاڵی فاتێ نەدەهێنا.

هەر ئێستا کە لەو بەشەی بەرنامەکەمان‌دا گوێی دڵمان بۆ دەنگی بە سۆزی هونەرمەندی دەنگ خۆش کاک خەلیل سەدیقی ڕادەدێرین کە بە ئاهەنگێکی خۆش میوانمان دەکا.

ئۆخەی ئۆخەی شۆڕەژن با لەسەرتۆ بمکوژن
دەس لە باڵای تۆ هەڵناگرم حەوت منداڵ مەمکت بمژن

کاوەیس ئاورێکی لەخۆی داوە. بێزی لەخۆی هەستا، هەمیشە لەگەڵ خۆی لە شەڕوکێشە دابوو. هەرکات کە خەیاڵی فاتێ هاتبووە لای درگای لێ داخستوو. لە خۆی پرسیاری کرد: «ئەرێ بە ڕاستی من بە ڕاستیم بوو کە فاتێم لە گیانی خۆم خۆش‌تر دەویست؟ من کە بە لێدانێک لەسەر باڵای فاتێ وازم لە خۆی و خەیاڵی هێنابوو.»

هەڵبەت کاوەیس ڕاستی نەدەکرد. بە درێژایی ئەو پێنج ساڵە، ساتێک نەبوو کە شتێک نەکاتە بیانوویەک بۆ یاد کردن لە فاتێ. ڕۆژەکانی هەوەڵ کە لە تاو و یاوی نەخۆشی دا گڕ گڕ دەسووتا. ئاورێکی گەلێ بەتین‌تر کاوەیس و گڕ و تاوە

کەی بە یەکەوە دەسووتاند. لە جەستە و ڕووح و ڕەوانی‌دا، دە تەنییەوە و هەردەم بڵێسەی بەرزتر دەبوو. هەرچەند کاوەیس پێی خۆش نەبوو ناوێک لەم ئاگروگڕە بەتینە بنێ بەڵام وشەی تۆڵە بۆ ساتێک لە زەینی کاوەیس نەدەڕەوییەوە. جار جار کە لەگەڵ خۆی ڕاستگۆ دەبوو. پرسیاری لە خۆی دەکرد. تۆڵە لە کێ؟ ئێستاکەش لێی روون نەبوو چی بە چییە؟ تەواوی ئەو ڕۆژ و شەوانەی بە نابەدڵی چووبوو دەئامێزی سارد و سڕی تەختی نەخۆشخانەوە و هیچ کارێکی لە دەست نەهاتبوو بەدەر لەوەی کە دەیان و دەیان جار ڕابردووی خۆی بپشکنێ تا بەڵکوو هۆیەکی مەنتیقی و وێچووی بۆ بدۆزێتەوە کە ئەوی ناچار بکا بەم شێوەیە بەم تەختەوە بنووسێ. هیچ بەڵگە و هۆیەکی نەدەدۆزییەوە بۆ ئەوەی کە بە حەوت کەسان بکەونە سەری تا لە ناوی بەرن. کاوەیس وەها لەپڕ کەوتبووە ژێر پەلاماری براکانی فاتێ کە نەیدەزانی تەنیا سێ برای لەویان دەدا لای وابوو بە هەر حەوت برا دەیکوتن. دەبوو هۆیەکی زۆر گرینگی هەبووبێ و چون هەرچی خۆی دەپشکنی چی وەگیر نەدەکەوت بیری تۆڵە ئەستاندنی پێ منداڵانە بوو.

دەیگوت:«دەی باشە تۆڵە لە کێ؟ لە فاتێ؟ لە هەمزاغا؟ لە براکانی فاتێ؟ لە ئامینە شەلێ؟ کاتێک دەیدیت لە تاریکایی دایە، بیری تۆڵە وەک مژێک بە گەرمای ئاگایی و بێ خەبەری وی لەپڕ دەڕەوییەوە. جار جارەش سەری لە کاری خۆی سوڕ دەما لە خۆی دەپرسی: «دەی باشە چۆن بوو؟ هەر کە دوکتور کوتی وا باشترە تازە نەگەڕێیەوە وڵاتی خۆت، وەرە لێرە بمێنەوە، وە بزانە هەر لەهەوەڵەوە من بابت بووم، بێ‌یەک و دوو پەسەندی کرد. ئاخۆ پێی وابوو لە نێوان ئەو و فاتێ دا وەها کەلێنێک پەیدابووە کە بەهیچ شتێ پڕ نابێتەوە؟ ئاخۆ دەترسا کە براکانی فاتێ جارێکی تریش بکەونە گیانی و لە ناوی بەرن؟ یان ئەوەی دایکی لە تاوی ئەو گیانی لە دەست داوە و هیچ دڵخۆشکەرییەکی لەو شوێنە بۆ نەماوە کە بۆ خاتری ئەو بگەڕێتەوە سووره چۆمێ.

کاوەیس لە دڵی خۆی‌دا دەڵێ: «ڕەنگە ئەو هۆیانە هەموویان لە گۆڕێ بن و ڕەنگە هیچکامیشیان نەبێ. تەنیا شتێکی کە ڕاستە ئەوەیە کە من لێرە گیرساومەوە.»

هەرچەندە کاوەیس ببوو بە کەسێکی تر و تەواوی بەشەکانی وجوودی پەیرەوییان لەعەقڵ و ئاوەزوشعووری کاوەیس دەکرد. بەڵام یەکێ لە ئەندامەکانی کاوەیس سەربزێوی دەکرد و ئیختیاری خۆی لە چنگی دەرکێشابوو. بە کەیفی خۆی هەڵسوکەوتی دەکرد. هەر دەم کە پێی خۆش با لە کاتی نێوەشەوڕا بگرە هەتا بەری بەیانی. هەتاکوو قاوەڵتوونێ تاکوو چێشتەنگاوێ. وەختی تاوپەڕان وێنەی فاتێی بە عالەم ئاشکرا لە ئارشیڤی بیرەوەرییەکانی کاوەیس دەردەکێشا. نازانی چەندەی چەواشەکاری دەکرد. هەرچی پەروەندە و پووشەی بیرەوەرییەکانی بوو لێی تێکەڵ و پێکەڵ دەکرد. کاوەیسی بەستەزمان جا وەرە لە پاشان چ زەجرێکی دەبوو بکێشێ تا جێگاکانی تایبەتی ئەوانی دە دۆزییەوە و لەسەر جێی خۆی دادەنانەوە. ئەم ڕەفتارە نارێکەی ئەو بەشە سەربەخۆیەی وجوودی کاوەیس باعیس ببوو هەرچەندە هەوڵ و تەقەللای دەدا بەتەواوی ببێتە کەسێکی تر. هەرواشی ئیدیعا دەکرد و واشی نیشان دەدا، بەڵام لەوەی کە ببێتە کەسێکیتر سەرنەکەوێ. کاوەیس هەر هەمان کاوەیسەکەی جاران بوو. بیری فاتێ کۆترە باریکەیەکی سەر لێشێواو و سەرگەردان بوو کە تاو نا تاوێک خۆی بە شووشەی پەنجەرەی بیرەوەرییەکانی کاوەیسدا دەدا و ناچاری دەکرد سەر لە نوێ لەناو ئەم پرسیارە بێ وەڵامانەدا خۆی لێ ون بێ.

: «بڵێی ئێستا فاتێ لە چ حالێک دابێ؟ ئاخۆ بەختەوەرە یان نا؟ تۆ بڵێی ئێستاش منی هەر لە یاد مابێ؟ باشە براکانی فاتێ بۆ ویستیان لەناوم بەرن؟ داخودا فاتێ ئاگاداری ئەوە بووە کە براکانی دەیانویست بمکوژن؟ بڵێی ڕۆژێک هەڵبکەوێ ئێمە جارێکیتر چاومان بە چاوی یەک بکەوێتەوە؟

کاوەیس لە شاری تاران، لە ماڵە دوکتور کەماڵی، لەنێو کۆشک و سەرسەرایەکی خوش، خەریکی خوێندن بوو کە چایی خواردنەوەیەکی بێ وادە و دەنگی شوکروڵلای بابان لە ئێزگەی ڕادیۆ کرمانشانەوە لە یەک چرکەدا هەڵیداشتە سوورەچۆمێ، تا لەو سەفەرە لەناکاوە گەڕاوە ببوو بە کاوەیسێکیتر.

***

## ٣٩

...... وەک من بزانم، بەشێک لە خوێنەری ئیمڕۆی ڕۆمان، چیرۆک و بابەتگەلی تری ئەدەبی، وەک خوێنەرێکی ئاسایی و سوننەتی نەماون کە زۆرتر مەبەستیان چێژ وەرگرتن لە ڕیوایەتێک یان گێڕانەوە و بەسەرهاتێک بێ. ئەوان زۆرتر وەک پشکنەرێکی کارامەو و بە ئەزموونی پۆلیس دەجوولێنەوە. لەکاتی خۆێندنەوەدا بێ گومان لە لاشیان نیم بەڵام دەزانم بە دەستێکیان مووکێشێکیان گرتووە و بە دەستەکەی تریان دەوربییەک یان پێشدەستییەکیان گرتووە بە چاویلکەیەکی زەڕڕەبینی کە لە چاویان داوە خەریکن  پەیتا، پەیتا مووی سپی لە دیزەڵە ماستەکە دەردەکێشن. بڕوام پێ بکەن دەمهەویست لەجیات ئەم وشەی چاویلکە، وەشەی عەینەک دابنێم بەڵام لە ترسی ئەوان نەموێرا. دەڵێم خۆزگە بە خوێنەری سەردەمی پێشوو. ئەگەر لە حیکایەت یا چیرۆکەکەتدا فس فس پاڵەوانت ناردبایە شەڕی دێوان و بە هەڵمەتێک  پەنجای لە چل و پێنجیان کوشتبایە، خوێنەر وەک ڕاستەقینەیەک لێی دەسەلماندی و بە ڕووی‌دا نەدەدایەوە، ئاخر ئەو وەدوای چێژی تایبەتی خۆی کەوتبوو نەک ڕاستبوون یان ناڕاست بوونی ڕووداوەکە، ئەوان خوێنەر هەر حیکایەت و چیرۆکێکیان وەک واقیع و ڕاستەقینەیەکی داستانی لەبەر چاو دەگرت. بەڵام ئێستا خوێنەری بەڕێزی وامان هەیە کە ئیزنی هیچ شتێک نادەن بەتۆ. دەبێ کۆلکەی ناسنامەی قارەمانەکانی چیرۆکەکەت لە ئیدارەی ئامار و سەبتی ئەحوال واتا هەمان سجیلی دوێنێ وەرگری و بیچەسپێنی بە چیرۆکەکەت.  بۆ دڵنیایی زۆرتری ئەم بەڕێزانە. دەڵێم ئاخر گەورەم! کاتێک بابی ئیسحاق نیۆتۆن سێ مانگ بەر لە دایکبوونی ئیسحاق کۆچی دوایی دەکا، چ پێویست دەکا ژیاننامە و ڕیشە و ڕەگەزی ئەو خوالێخۆشبووە هەڵتەکێنم لەحاڵێک دا، بە قەرا نووکە دەرزییەک شوێن

لەسەر ڕەوتی گێڕانەوەکە دانانێ. من بەو خوێنەرە خۆشەویست و بەڕێزەم دەڵێم:«چاوەکەم مافی ئەوە بدە بە من کاتێک بەهۆگەلێکی شەخسی زۆر باسی کەسایەتییکی ڕۆمانەکەم ناکەم نەیکەم، زۆر تایبەتی ئەوە بە تۆی دەڵێم، ڕەنگە زانیاریم دەربارەی ئەو کەسایەتییە زۆر نەبێ، کە هەر واشە، چ حەوجێ بە درۆ کردنی خۆڕاییە؟ بەهەر حاڵ کاوەیس ئاگاداری چۆنیەتیی مردنی دایکی نەبوو بەڵێ کاوەیس نەیدەزانی دایکی چۆن مردووە. هەر بەو جۆرەی هەرگیز نەیدەزانی بابی چۆن سەری ناوەتەوە. ئەوەی لە منداڵییەوە تا ئەوێ ڕۆژێ دەربارەی بابی وەدەستی کەوتبوو، ئەوەبوو، بابی ئەودەم کە کاوەیس لەسەر پشتی لانکەی دەبێ بۆ کار چۆتە غەریبایەتی و ئیتر نەگەڕاوەتەوە. زڵەخاش کە دەیزانی مرادیان کوشتووە، نەیدەزانی چلۆن و بە دەس کێ کوژراوە. ئەودەم کە تەرمەکەیان هێناوە ماڵ و خۆی بە سەردا کێشا، زانی کە پێکراوە. هێندێک قسە و باس کەوتە سەر زاران کە بایز کوشتوویەتی. هەر لەبەر ئەوەش ونە. هێندێک دەیانگوت کاری بایز نییە، چونکە بایز زۆر لەمێژ بوو پێوەندی لەگەڵ شۆڕش گرتبوو و بە ئاوات بوو تێکەڵیان بێ. تەنیا من و تۆ کە ئێستا پێتی دەڵێم و ئامینە شەل و بایز و لە دوایی دا سۆفی حەسەنیش لە کاتی پاڕانەوەی ئامینە شەل لە مزگەوت کە قسەکانی ئامینە شەلی گوێ لێبوو دەزانین ڕووداوەکە چۆن و چ بۆوە.

سۆفی حەسەن بە دوکتور دەڵێ: «بە قوربانت بم دوکتور گیان! چیت لێ وەشارم، هەرچی زۆرتر دەگوزەرێ زۆرتر شکم لێ پەیدا دەبێ. ئەوەی تۆ لە سوورە چۆم و خەڵکی سوورە چۆم دەیزانی و ئەو تامەزرۆییە بۆ بیستنی بەسەرهاتی خەڵکەکەی لەخۆتی نیشان دەدەی ناکرێ تەنیا بەساڵێک و دوو ساڵ مانەوە لەو شوێنە بۆ کەسێک پەیدا ببێ، ئەرێ بڵێی من نەتناسم؟»

دوکتور دەڵێ: «سۆفی حەسەن بۆ وا دڕدۆنگی؟ دەزانی کاری دوکتوران پشکنینی خەڵکە بۆ ئەوەی نەخۆشییەکانیان بدۆزنەوە، ئەو پشکنینە پێی بچووکترین شتێک کە پێوەندی بە تاکەوە هەبێ دەگرێتەوە. جاری وایە ناوێکی ناخۆش کە منداڵەکانمانی پێ بانگ دەکەین. دەتوانێ زۆر گیروگرفتی

ڕووحی و ڕەوانی لە مرۆڤ دا پێک بێنێ  بە چەشنێکی وا کە داهاتوویەکی تاڵ و ناخۆش بۆ بنیادەم پێک بێنێ.

یان هەروەها زۆر نەخۆشی هەیە کە فرێ بە لەشی مرۆڤەوە نییە. تەنیا نیشانەی ئەو نەخۆشییە لە لەشدا خۆی نیشان دەدا. جا هەر لەبەر ئەوەیە دەبینی، بیرەوەرییەک، یاد  و تەوسێک، پێهەڵاگوتن و تاریفی کەسێک کردن یان شێوەی پێوەندی گرتن لەگەڵ دەوروبەر هەموویان دەتوانن لە دیاریکردنی نەخۆشییەکە یان خاشەبڕ کردنی  دەورێکی گرینگیان هەبێ و بەڕاستی یارمەتی دانی دوکتورە بۆ ناسینی ناسازییەکەی و چارەسەر کردنی — ئەوەش کایەی دوکتور و سۆفی حەسەن — کە وابوو ئەودەم کەنەخۆش دەهاتن بۆ لامان، بە تەواوی دەمان پشکنین و قسەی وامان لێ ڕادەکێشان  کە بۆخۆیان پێیان سەیر بوو.»

سۆفی حەسەن گوتی: « جا قوربان چیتان عەرز بکەم، ئامینە شەل کە لە زلەخا وەژوور کەوت، وەک ئامینە شەل نەچووە ژووری. بەڵکوو لە ڕواڵەتی دێوەزمەیەکدا چووبوو کە شووشەی لە سەد جێگە چرژاوی دڵی زلەخا لەبەر چاوی خۆی بە یەکجاری لەبەردێک بدا و وردوخاشی بکات. زلەخا هەرچی حەولی دەدا بە ڕووی خۆشەوە ئامین بدوێنێ، بەڵام شتێک کە خۆشی نەیدەزانی چییە نەیدەهێشت بەدڵەوەی بنووسێ. تا ئەوی شەوێ کە ئاخرین شەوی ژیانی بوو. ئەودەم بوو کە زانی ئەو شتە چییە، هەڵبەت خۆی پەیدای نەکرد کە چییە. ئەوە ئامینەشەل بوو تێیگەیاند. هەرچەند تازە چیشی پێنەدەکرا. ئامین کەلێی وەژوور کەوت ئەو جۆرەی کە لە زمانی خۆییم گوێ لێبوو لە زلەخای پرسیوە: «زلەخا پێم بڵێ بزانم لەگەڵ ئەم ڕۆژگارە چۆنی؟»

زلەخا چی بۆ گوتن پێ نەبوو، لە دوای ڕۆیشتنی کاوەیس؟ ئیتر هیچ شتێک شیاوی گوتن نەبوو- ئەگەر هەر لێرەدا کەوانەیەک بکەینەوە [من دەڵێم ئامین لە خراپترین کاتدا چۆتە لای زلەخا. کاری ئامین هیچ سەرکەوتنێکی بۆ ئەو تێدا نەبوو، ئامین لە ڕاستیدا بە هەڵە چوو، چون لەو کایە یەک کەسییەی دەگەڵ خۆی دەیکرد دۆڕاندبووی، سەر نەکەوتبوو. ئاخر ئێوە بڵێن ئازاردان و تەنانەت کوشتنی کەسێکی کەپێشتر مردبێ یان مردن بە ئاوات دەخوازێ چ سەرکەوتنێک و شانازییەکی تێدایە. چونکە هەروەک ئەوەی دەچێ لە مردوویەکی بدەی و

هەست بە قارەمانییەتی بکەی، هەڵبەت ئەمە بۆ چوونی منە و فڕی بە سۆفی حەسەنەوە نییە، ڕەنگە قەت شتیوا بەزەینیشی دا تێنەپەڕێ] تەنیا چاوە سیسەکانی لەئامین بڕی. کەس بیری نەدەکردەوە تەنیا لە ماوەی سێ مانگ یانی نەوەد شەوی تاریک و تنووک و بە دوایاندا نەوەد ڕۆژی دڵتەنگ و ناخۆش کەسێک بتوانێ هەرچی خوێنی لەشە، ئەوەی گەشایی پێست و لەشە لە گەڕانێکی خۆڕایی زەین و خەیاڵ دا لێی بدزن و دەنگ هەڵنەبڕێ.

: «زڵەخا! ئەودەم کە تەرمی مرادیان بۆهێنایەوە. پێم وابوو زۆرت خۆش دەوێ و لە تاوانی دوو ڕۆژان خۆت ڕاناگری، چاوەڕوان بووم کە ڕۆژی سێهەم بێن و بڵێن زڵەخا لەتاو مراد دڵی تۆقی، کەچی نە تەنیا ڕۆژی سێهەم چت بەسەر نەهات بەڵکوو ئەوە هەژدە ساڵە دڵەت هەر لەسەر جێی خۆیەتی و هەر دەکوتێ. لەپێشدا لام وابوو تۆ بێ ڕوحمی بەڵام زوو زانیم بەهەڵە چووم. تۆ مرادت هەر لەلا بوو تۆ مرادت لەناو دڵتدا چاندبوو. هێزی دەدایەی، تینوگوڕی وەبەر دەنای بڕواتی بە دوا ڕۆژ پتەو کردبوو، ورەت بەرنەدەدا، لەگەڵ کێشەکان بە کێشە دەهاتی. تا کاوەیست گەورە بوو. بەڵێ پێم سەیرە، دیوتە زڵەخا! هەرگیز هیچ کەس ئەوەندە وە هیچ کەس نەچووە ئەوەندەی کاوەیست، وەمردات دەچوو. مراد هی تۆ نەبوو نە دەبوو کاوەیسیش هیتۆ بێ، تۆ دەزانی ئەودەم کە مرادت لە چنگ من دەرکێشا لە کاوەیسی ئێستا لێک نەدەکرانەوە. تۆ، تۆ. هەرگیز نازانی خۆشەویستی یانی چی، تۆ نازانی دڵشکان چەند ناخۆشە، تۆ هەرگیز بە بیرتدا نەهاتووە کە شەوانە سەری ناهۆمێدی نانەوە چ تامێکی تفت و تاڵی هەیە، تۆ نازانی تەرمی خەون و خەیاڵ و حەز و مەیل و ئارەزوو بە تافی لاوی لە گۆڕنان چەندە دڵتەزێن و ناخۆشە. تۆ نازانی کاتێ کەسێ دەبێتە هەموو کەست. هەموو ژیانت، ئایینت، بڕوا و ئیمانت، کەعبە و خودات ئەودەم یەکێ لەپڕ پەیدا دەبێ و ئەوەی تۆ بە درێژایی شەوانی درێژ و ساردی زستان، بە درێژایی ڕۆژانی گەرم و تاقەت پڕووکێنی هاوین لە دڵتدا دەیچێنی، ئاودێری دەکەی. چاوەدێری دەکەی، بەبێ ئەوەی وەڕووی خۆشی بێنێ. هەمووی دەکاتە ئی خۆی. هەروا سووک و سانا بۆی دەگوزەرێ؟ تۆ خەڵکی ئێرە نەبووی، تۆ نەتدەزانی مراد تەنیا دەیتوانی هی من بێ؟

که بۆ من نەبوو نەمهێشت نە بۆخۆی بێت و نەبۆ تۆ، بەڵێ من مرادم کوشت، دەزانی چۆنم کوشت؟ نا، تۆ لە تاریکی دای، تۆ نازانی چۆنم کوشت، کەس نازانێ. هەڵبەت ئێستا بەتۆی دەڵێم، تۆ حەقتە بزانی. ئاخر مراد مێردت بوو، بابی منداڵەکەت بوو، بابی ئەو کاوەیست کە دەتگوت مرادە. دەزانم ئێستاش نەتتوانیوە بە کاوەیس بڵێی بابی کوژراوە. دڵت بەرایی نەداوە، دەترسی کاوەیسیشت هەروەک مراد لەدەس بدەی. وەبیر تۆڵە بکەوێ؟ ئیتر نەسرەوێ. کاوەیسیش هەروەک مراد، مەرد و ڕەندە، دەزانم بەخۆوەیە، ناحەقی قەبووڵ ناکا. بۆ ڕاستییەکەت پێ نەدەگوت؟ بڵێ چۆن دڵت هات، درۆی لەگەڵ بکەی؟ بۆ پێت گوت بابت بۆ کارکردن چۆتە غەریبایەتی و نەگەڕاوەتەوە؟ دەمتوانی وەدرۆت بخەمەوە و ڕاستیەکەی پێ بڵێم. بەڵام نەمگوت، دەترسام لەدەستم بڕوا و نەتوانم جارێکی تر تۆڵەی ئەوینی خۆم و چارە ڕەشی خۆمت لێ بکەمەوە. من ئەودەم کە مرادم لەناو برد، هەڵەیەکی گەورەم کرد، دەبوو هەر ئەودەم تۆش لەناو بەرم. بەو هەڵەیەی کە کردم خۆم لەناو برد. دەمدیت کە وردە وردە لەگەڵ گەورەبوونی کاوەیس، خەمی لە دەس‌دانی مرادت لەبیر دەکرد و هەستت بە بەختەوەری دەکرد. مراد لەبەر چاوانت وردە وردە زیندووتر، گەشاوەتر، هەڵکشاوەتر و جوانتر دەبوو، هەرچی کاوەیس زۆرتری هەڵدەدا. بەختەوەرییەکی زۆرترم لە چاوانتدا دەخوێندەوە. بەڵام من چی؟ بە پێچەوانەی تۆ، وردە، وردە، ڕۆدەچووم، دەکوژرام بە دەستی خۆم بە دەستی گەوجی و نەفامی خۆم، کە چلۆن تۆم نەکوشت و ئیزنم دای لەبەرچاوی من کە سەیر هەڵەنگوتبووم، کەڕۆچووبوومە خوار. کە داچۆڕابووم کە هەر دەهات و لە کەمی و کزیم دەدا، تۆ بگەشێیەوە، مرادم لەتۆئەستاند. من کوشتم، بە دەست کاکەبایزم بە کوشتنمدا. سوێندم بۆ کاکم خوارد کە مراد ناجوامێرانە داوێنی پیس کردووم. لە لای کاکم سەروقژی خۆم تێک کردەوە، هەموو ڕوومەتی خۆم بریندار کرد. لە پاش مراد نەمدەویست بژیم، بەڵام نەمدەتوانی بێ تۆڵە ئەستاندن بمرم. دەمگوت کە مراد بۆ من نەبوو، نابێ بۆ هیچ کەسی تریش بێ. قورئانم هێنا و لە لای کاکم دەستم پێدادا.

: «کوڕە سۆفی حەسەن لەبەر بنی کەوشەکانت مرم، چیم لێدەکەی؟ هەر ئەو قورئانەی بەدرۆ خواردم منی گرتووە، دەزانم.»

دەمقیژاند، چووم کێردێکی گەورەم هێنا و لەسەر زگی خۆم دانا. گوتم کاکە تۆخودا وەرە بە دەستی خۆت بمکوژە، با تۆ سەرت نەوی نەبێ، ئینجا گوتم دەزانی چی؟ تۆی بە بێغیرەت دەناسی، بۆ خۆی لە کاتی دەسدرێژیدا پێیگوتم: «جا ئەو کاکە بێشەرەفەت بزانم چی لە دەس دێ؟» دەگریام و هاوارم دەکرد ئەی خودایە بۆ خۆت پاکم کەوە. تازە من چۆن دەتوانم سەر هەڵێنم. کاکم کێردەکەی لەدەست ئەستاندم. پێشتر دەمزانی وا دەکا، ئاخر کاکیشم هەروەکوو مراد بەغیرەت و بە شەرەف بوو، پێشتر ئاواڵی گیانی بە گیانی بوون، ڕووحێک بوون لە دوو جەستەدا. من لێکم کردن لەبەر خۆشەویستی، لەبەر ئەوین. ئەوین و خۆشەویستی وەک چەقۆی تیژە، هەم دەتوانێ گیان ببەخشێ و هەمیش دەتوانێ گیان بستێنێ. ئەوین دەتوانێ ببێتە هۆی بەشکۆ بوون و سەرهەڵدانی مرۆڤ و هەمیش دەتوانێ مرۆڤ کوێر و نابینا بکا. ئەم خۆشەویستییە منی کوێر کردبوو. من مرادم خۆش دەویست، خۆشتر لە گیانی خۆم.

عیشقی مراد کوێری کردبووم، ئەویش منی خۆش دەویست، ڕووی دەدامێ. ئەودەم کە بە تەواوی لە داوی عیشقی کەوتبووم، ئەودەم کە ئیتر لەتوانای مندا نەبوو کە دەستی لێهەڵگرم ئەودەم کە بە تەواوی هاتبووە نێو ڕووح و گیانی من و لە من هیچ نیشانە و شوێنێک نەمابۆوە، ئەوەی هەبوو و نەبوو لە وجوودی مندا هەموو ببوو بە مراد و هاواری مرادی دەکرد.

پێی گوتم منی زۆر زۆر خۆش دەوێ. بەڵام من ئەو خۆشەویستییەم نەدەویست، پێم ناخۆش بوو، بێزم لێی هەڵدەستا، کە گوتی تۆ خوشکی منی، وەک خوشکێکی خۆشەویست هەمیشە لەنێو دڵم دای.... تیرێ بوو لە دڵ و جەرگ و هەناوی دام من ئەوانەم پێ ناخۆش بوو، من هیچ پێم خۆش نەبوو ببم بە خوشکی مراد، دەمهەویست خوشەویستی مراد بم، حەز و دەزگیرانی مراد بم، دەمزانی چەندە مەرد و ڕەندە، دەمزانی چەندە پیاوە و چەندە وێچوویە. دووزمانیم لێکرد.

: «ئەرێ کاکە بایز! کەس نەمابوو دەگەڵی ببی بە ئاواڵ؟ ئەوە چییە لەگەڵی بوویە دۆست؟»

: «ئامین گیان! ئەوە چ قسەیەکە دەیکەی کێ لە مراد پیاوترە؟»

: «نازانم کاکە! بڵێم چی؟ جۆرێکە. سەیرم چاو لێدەکا، هیچ خۆشم لێی نایە، بەڕای تۆ کەمێک چاوحیز نییە؟»

: «ئامین! زمانت گرێدە، کچێ دەزانی باسی کێ دەکەی؟ خۆزگە ئاوی شەویش دەیتوانی ئەوەندە پاک بێ.»

: «زۆر باشە کاکە! با هەرچی تۆ دەڵێی هەر وابێ. بەڵام دواڕۆژ لەبیرت بمێنێتەوە من چم پێگوتی، تازە ئەگەر ئەو جارێکیتر پێی لە ماڵە ئێمە بنێ من لە ماڵ نابم دەچمە ماڵە پوورم پێم خۆش نییە ئەو چاوە حیزانەی لەمن ببڕێ.»

: «کچی! دمت وێک بنێ، ئەو قسە قۆڕانە چییە دەیکەی؟ جارێکیتر بەم جۆرە سەبارەت بە مراد قسان بکەی بەڵایەکت بەسەر دێنم نەبێتەوە. شەرمێ بکە.»

شەرمم نەکرد. هێندم گوت و هێندم گوت تا کاکم لە خشتە برد. بوونە کێرد و پەنیر بەڵام من بەدزی هەر دەچوومە لای مراد. لێی دەپاڕامەوە. خۆم لە لای دەهێنایە خوار، هەر چەشنە سووکایەتییەکم لێ پەسەند دەکرد. بەڵام تەنیا قسەیەکی لێم بیست ئەوە بوو کە گوتی: «پێشتر کچێکم بۆهاوسەری خۆم دەسنیشان کردووە.»

: «سۆفی حەسەن چوومە ژوور چاوە سیسەکانی زڵەخا و پێم گوت. ئەودەم کە مراد ناوی تۆی هێنا و گوتی زڵەخام خۆش دەوێ. هەموومانی یەکجێ بە کوشتدا، ئاورم گرت. سووتام. پێم خۆش بوو هەرچی زووتر دیمەنی تۆ ببینم تا بە چاوی خۆم ببینم کە چەندە لەمن جوانتر و لەسەرتری؟ تۆ دەزانی زۆر کەس داواکاری من بوو؟ هیچ دەزانی زۆر کەس ئامادە بوو دەس لە ژن و منداڵی هەڵگرێ بە مەرجێکی ئاوڕێکی لێبدەمەوە؟ بەڵام مراد منی تێک شکاند. ئەوەی دەرفەتی ژیانێکی خۆش بوو لێی ئەستاندم، تەنیا لەبەر خاتری تۆ. پێم خۆش بوو بزانم چیت لەمن زۆرترە کە توانیوتە مراد لە دەست من دەرکێشی. تۆ چ لەمن زیاتر نەبووی. من لە تۆ جوانتر بووم، هەرکەس کە من و تۆی بە یەکەوە دیتبا.

دانی بەم ڕاستییە دادەگرت. لەتۆ باڵا بەرزتر بووم. جوانتر بووم. شۆختر بووم. بەڵام سەرەڕای ئەوانە مراد تۆی هەڵبژارد.

: «کاکە! ئەمن ئەوە لەبەرخاتری تۆ، لەبەر ئابڕووی تۆ خۆم دەکوژم. بەڵام تۆ ئەو خودا گەورەیە تۆڵەی من لە مراد بستێنەوە. کاکە ڕەببی قەت گەردنت ئازا نەبێ ئەگەر ئەوکارەی نەکەی.»

: «خوشکێ گیان! ئامین بەڵێنیت پێدەدەم تۆڵەی تۆی لێبکەمەوە، تۆ دەست ڕاگرە هیچ مەکە تا بە چاوی خۆت ببینی چی بەسەر دێنم.»

: «کاکە گیان! بمبوورە، بەخۆمەوە ئەتۆشم بەدبەخت و هەڵوەدا کرد.»

: «ئەرێ بایز! ئەوە چ باسە چەند ڕۆژە لەگەڵ ئەو کچەتیوە بابان وێڕانە هەر سرت و خورتتانە بۆ بەمنی ناڵێن؟»

: «دایە گیان! هیچت لێ ناشارینەوە، باسێکی خۆمانە بوو وەک خوشک و برا دەمان کرد.»

: «کچەتیوەیە ئامین! بڵێ بزانم چت دەبن سەری دایە؟بۆ وا شەو و ڕۆژ سەری بایزیت گرتووە؟»

: «دایە! هیچ نییە، باسی یەکێکم بۆ کاکم دەکرد، کە داوای کچی خات هەناری دەکا. گوتم بزانم دەیناسی.»

: «دە جا شتی وا بۆ شاردنەوە دەبێ. بۆ لە پەنا و پەسیوان قسان دەکەن، ئاشکرا بیڵێ.»

: «باشە دایە گیان! لەوە بە دوا بە ئاشکرایی قسان دەکەین.»

کاکە بایزم ئەودەمیش بە هیچ جۆرێ نەیدەتوانی باوەڕ بکا مراد ئەو کارەی لەگەڵ کردووم، چەند جار هات لەو بڕیارەی گرتبووی پاشگەز ببێتەوە.

: «کچێ! ئامین گیان! وەرە مەحز بۆ خاتری خودا پێم بڵێ درۆت کردووە. بڵێ بوختانت پێ کردووە، تەنیا بڵێ هەڵەم کردووە. بڵێ فڵان ملائیکە ئەو بەڵایەی بەسەر هێناوی. باوەڕ دەکەم. بەڵام ئەوەی ئەتۆ دەڵێی، مراد و ئەو چەشنە نامەردی‌یە....»

دیسان گریام بە دەنگ و سەڵا، دەمزانی دایکم وەدەر کەوتووە ئەگینا لە ترسی وی نەمدەتوانی ئاوا دەنگ هەڵبڕم، سینگم دەکوتا، قورئانم بە دەستەوە گرتبوو دەستم بۆی پێدا دەدا.

وەی دەبەرت مرم سۆفی حەسەن! تۆ خودا تکام بۆ بکە تۆ پیاوی خودای با خودا زووتر بمکوژێ و ڕزگاریم بێ. دەزانم ئەو قورئانەی لە سینگی خۆمم دەکوتا گرتوومی، ئەی خودایە وەڕەز بووم، بەسە، نەجاتم بدە. دەزانم زۆر خراپم، خراپم، خراپم، بۆخۆت ڕوحمم پێبکە.»

: «هەڕەشەم لە کاکم کرد. کاکە ئەوە دەچمە پاسگایە شکایەت لەو نامەردەی دەکەم. ناهێڵم ناپیاوەتی بکا و بۆی دەرچێ، هەمو عالەمێ تێدەگەیەنم.»

: «کچێ! بۆخاتری خودا. پشووت لەسەر خۆ بێ، با بزانم چ دەکەین. هەر شکایەتێ بکەی ئابڕوومان دەچێ. تازە مرادیشمان لە چنگ دەردێنن، ئیتر دەستمان پێی ڕاناگا لەسەرەخۆ بە، چەند ڕۆژێکم مۆڵەت بدەیە.»

گوتی:«ئەم جۆرە داخم لەسەر دڵی زڵەخا دانا.»

: «تۆ تازە هاتبوویە باڵ مراد. هێشتاش دەستم لێ هەڵنەگرتبوو. بەدەس خۆم نەبوو مراد چی بۆ من نەهێشتبۆوە کە لە ژیاندا دڵی پێ خۆش بکەم، کە خەمی لێ بخۆم، جاڕز بووم، حازر ببووم گیانم لە دەس بدەم بەڵام تۆ و مراد بە بەختەوەری نەبینم، پێم بڵێ بزانم ئێوە بۆ لێرە کۆچتان نەدەکرد؟ بۆ هەموو ڕۆژێ بەختەوەری خۆتان بە چاوی منda دەدا. منی عاشق و سووتاو، منی دڵشکاوی تەنیا، من کە مراد تێکی شکاندبووم و کاتێ کە دەیدیتم هەر وەڕووی خۆشی نەدەهێنا. دەتکوت هەر هیچ شتێک ڕووی نەداوە. تۆ هیچ ئەودەمی خۆت وەبیر دێتەوە کە دەهاتی بۆ سەر کانی، پێشتر چۆن خۆت دەڕازاندەوە؟ چلۆن هەرگیز بزە لەسەر لێوت بزر نەدەبوو. چۆن گەردنت هەڵدێنا تاکوو هەموو ژنەکانیتر، ئەو ملوانکەی کەدەبوو لەملی منda بوایە لە ملتی دا ببینن. هەر ئەوێ ڕۆژێ کە تۆ هەواڵی زگ پڕبوونی خۆت دا بە مراد من ئەودەمیش دەستم لە یەخەی هەڵنەگرتبوو، هەر بەو هەویایە بووم ڕووی لەتۆ وەرگێڕێ و ڕوو لە من بکا.

: «کچێ ئامین گیان! خوشکی عەزیزم! دەست هەڵگرە، زلەخا زگی پڕە، تازە من بۆ تۆ نابم واز بێنە. ئابڕوومان دەچێ، لە فیکری ئابڕووی کاکت دابە.»

: «ئابڕوو؟ مەگین تۆ تۆسقاڵێکت ئابڕوو بۆ من هێشتۆتەوە؟ کێ لەو دونیایەدا هەبووە بە ڕادەی من سووک کرابێ؟ تۆ هەرگیز ئاوڕێکت لەمن داوە؟ جا من لە پاش وەی تۆم نەبێ ئابڕووم بۆ چییە؟»

: «چاوەکەم! ئامین گیان! تۆ بۆ من هەمیشە لە خوشکم فەڕزتر بووی، من نەمدەتوانی ئاواڵی کاکت بم و حەز لە خوشکەکەی بکەم. تکات لێدەکەم دەست هەڵگرە، وازم لێ بێنە.»

: «دەستم هەڵنەگرت. وازم لێنەهێنا تا بە دەس بایز بە کوشتم دا. کاکم کە هەواڵەکەی دامێ، لە پێشدا تاسام» پێی گوتم: «کچێ نەچی خۆت بکوژی. دەنا شکیان دەچێتە سەر ئێمە. من ماوەیەک بەجێتان دێڵم. دەڵێم ئەوە بۆ کارکردن دەچمە تاران. بەڵام ناچمە وێ دەچمە شوێنێکی‌تر. لەوانەیە بەم زووانە چاومان بە یەکتری نەکەوێ. من قەت نەمدەویست خۆم بکوژم، درۆم بە کاکم دەگوت، دەمهەویست تەنیا ژیانی مراد بکوژم. پێم وابوو، بێتوو مراد بمرێ، ئاگری تۆڵەی منیش دادەمرکێ. بەڵام بەهەڵە چووبووم. مراد نە کوژرابوو، تەنیا چکۆڵە ببۆوە و چووبووە نێو گیان و دڵی زلەخایە. خۆم نەکوشت، یانی هەرگیز بەنیاز نەبووم خۆم لەناو بەرم، ڕقەکەم لەسەر مراد گوێزابووە سەر زلەخا. سۆفی حەسەن! تۆ پێم بڵێ ئەمن دەبێ چ بکەم تا لەو ژان و دەردە رزگارم بێ؟ تۆ نازانی ئەودەم کە ئەو قسانەم بە زلەخایە دەکوت. زلەخا نەمابوو، تەنیا دوو چاوی سیس و پرووشم دەدیتن کە لەسەر خاڵێکی سەر دیواری ژوورەکە گیرسابوونەوە. نەمدەزانی چی چاو پێکەوتبوو، مراد یان کاوەیس یان هیچیان.»

: «ئاغای دوکتور! بە قوربانت بم دەزانم زۆرم سەر ئێشاندی. چۆن بڵێم؟ ئامین یەک پشوو، دەگریا و دەیناڵاند و قسەی دەکرد. هەستم کرد تازە ئەوە سەرەتای قسەکانی بوو. دیار بوو دڵی زۆر پڕە.» سۆفی ڕووی کردەوە دوکتور، دوکتور ڕووی لە سۆفی وەرگێڕا. بەڵام نە زووتر لەوەی کە سۆفی فرمێسکی چاوانی نەبینێ.

***

## ٤٠

..... بەرلەوەی ئەم فەسڵە وەک فەسڵی چلی  ئەم ڕۆمانە خۆی دەس پێبکا یان بچەسپێنێ، من لای خۆم وای دادەنێم ئەگەر هاتبام ئیزنم لەئێوەی خوێنەری بەڕێز وەرگرتبایە کە چەند وتەیەک وەک ڕوونکردنەوەیەک بۆ خۆم بخەمەروو، بێ هیچ شک و گومانێک ئیزنتان دەدام. دەی باشە ئەوە ئیزنم لێ وەرگرتن. دەمویست ئەوە بڵێم. دوو کەس کە خاوەنی دوو چەشنە فەرهەنگی جیاوازن، کاتێ بە هۆی ناچارییەک دەکەونە ئاخافتن و پێوەند گرتن لەگەڵ یەک. ئەم ناچارییە پاڵیان پێوە دەنێ کەهەر کام لە ئاستی فەرهەنگی خۆیان بترازێن واتا ئەوەی ئاستی فەرهەنگی لەسەرێیە دەبێ هێندێک داکشێ و ئەوەی لە خوار ڕاوەستاوە دەبێ خۆی هەڵکێشێ، ئەگینا هیچ چەشنە پێوەندییەک لەنێوانیان دا پێک نایە، قسەی دووهەمم ئەوەیە تا بەڵگەیەکی باوەڕ پێکراویان بە دەستەوە نەبێ ناکرێ بە ڕاشکاوی بڵێن ئەوەی لە چین و توێژی خوارووی کۆمەڵ هەستاوە بە ناچار دەبێ ئاستی فەرهەنگ و زانستیشی لە خوار بێ و ئەوەی لە چین و توێژی سەرووی کۆمەڵ بێ ئەشێ ئاستی فەرهەنگ و زانستی لە بان بێ.

قسەی سێهەم، وەئەبێ من وەک نووسەری ئەم ڕۆمانە نەزانم سۆفی و دوکتور خەریکی چ کایەیەکن. سۆفی بۆچ هێندە خۆی گێژ دەکا و دوکتور بۆ دەمامک لە ڕوو لانادا. چونکە دەزانم هەم سۆفی حەسەن و هەم دوکتور کەیفیان بەم کایە و گەمەیە کە دەگەڵ یەکتری دەکەن سازە و بەم چەشنە لەکاتی قسە کردن‌دا زۆرتر هەست بە ئاسوودەیی دەکەن و هەروەها چونکە لەوانەیە کاتێک یەکتری جۆرێکی تر ببینن و بناسن، قسە و باسەکەیان سەر لە جێگایەکی تر دەرێنێ کەنە بە قازانجی منە و نە بە قازانجی تۆ و نە بە

قازانجی سۆفی حەسەن و دوکتوریش، خوداش هیچ پێی خۆش نییە، کاتێک دوو کەس بە کایەیەک سەرقاڵن و هەرتک ڕازین، ئێمە لە خۆڕا خۆی تێیهەڵقوتێنین و بە پێچەوانەی مەیل و ویستیان وادار بە کارێکی تریان بکەین. هەرچەندە هێندێک قسەی تریش هەبوو بەڵام لەبەر ئەوە وازی لێدێنم کە دیتم سۆفی حەسەن زۆر بێ حەوسەلە بووە تا بە دوکتور بڵێ:

: «بە قوربانت بم خۆ من لەبەر ژانی پشتم شەوانە هەر خەوم نییە، بەڵام دوێ شەو ئاگام لێبوو، لەمن خراپتر هەر نەنووستی.»

: «سۆفی حەسەن! جار جارە منیش بێخەو دەبم.»

: «دوکتور گیان! دەبێ بمبەخشی چەند شتم پێ سەیرە، ئەگەر گوتم دڵت نەیەشێ.»

: «سۆفی حەسەن! ڕاست و ڕەوان هەرچی پێت خۆشە بیڵێ. وا بزانە ئەمنیش کوڕی خۆتم.»

: «بەگێڕانەوەی بەسەرهاتەکەی دوێ شەو چەند پرسیارێکم بۆ هاتۆتە پێش کە ڕایدەگرم بۆ شەوێ.»

: «پێم وایە ئەگەر دەست نەبزێوین وەدرەنگی دەکەوین. من ڕامسپاردووە کەسێک دێتە لات و هاوڕێت دەبێ تا تاقیکاری و باقی کارەکانت ئەنجام دەدەی. منیش هەم دەبێ بە نەخۆشەکانم ڕابگەم. هەم دوو کەسانیش دەبێ عەمەلی جەڕڕاحی بکەم. ئەو کەسەی کە دێتە لات تا ڕادەیەکی لە زمانت دەگا و تا شەو لە لات دەمێنێتەوە، ئەسپاردوومە لە دوای ئەوە کە لە دەرەوە نانتان خوارد تۆ بهێنێتەوە ماڵ. تا من دەگەڕێمەوە تۆ باش بحەسێوە، دەنێرم جوابی ئازمایشەکانت وەربگرنەوە. ئەودەم پرسیارەکانت لێ بپرسە.»

سۆفی حەسەن دەڵێ: «بە سەرچاوان. بە قوربانت بم یەکێ لەو شتانەی کە زۆرم پێ سەیرە ئەوەیە کە بۆچی ئەوەندەم چاکە لەگەڵ دەکەی؟ کێ هەبووە نەدیو ونەناسیاو ئەوەندە دەرحەق بە کەسێکی تر چاکەی بکا؟ نەمدیوە کوڕیش ئەوەندە خاتری بابی بگرێ.»

: «سۆفی حەسەن! لەو قسانە گەڕێ. ئەمن دوکتورم. سوێندم بۆ کارەکەم خواردووە. هەموو دوکتورێک ئەرکی سەرشانییەتی ئەوەی کە لە دەستی دێ دەرحەق بە نەخۆشەکەی بیکا. هەر بۆیە چون تۆ غەریب و ناشارەزای. هەروەها زمانی فارسیش نازانی و لەهەمووان گرینگ‌تر لەو ناوچەیە ڕا هاتووی کە زۆرم بیرەوەری خۆش لێی هەیە، دەجا هەم وەک ئینسانێک و هەم  وەک دوکتورێک پێویستە ئەوەی لە دەستم دێ بۆ خزمەت بە تۆ و بۆ چاک بوونەوەت بە ئەنجامی بگەیەنم.»

وێدەچوو سۆفی حەسەن قسەکانی دوکتوری نەسەلماندبێ کاتێک گوتی:

: «چووزانم دوکتور گیان! هەر جۆرێک تۆ بفەرمووی هەر وا دەبێ. یاڕەببی خودا دەست بە عومرو ماڵت بگرێ.»

شەو کە دوکتور هاتەوە هەر لە بەر درگا هەرای کرد: «سۆفی حەسەن! زۆر شوکور ئازمایشەکانت هەمووی باشن. هیچ کۆسپ و تەگەرەیەکمان لەسەر ڕێ نییە بۆ ئەوەی عەمەلت بکەم. دەزانم نەهاتبووی ئێستا خۆت عەمەل بکەی منیش بەنیازی ئەو کارە نیم، وەختت دەدەمێ بۆ مانگێکی تر. تۆ نیگەرانی هیچ شتێک مەبە. بڕوام پێبکە وات ساغ دەکەمەوە، هەروەک گوێزی ئازات لێ بێ. وابێ لە داوەتدا ئیتر دەسرەی سەرچۆپی نەدەی بە کەسێکی تر!»

سۆفی حەسەن هەر بۆ ئەوەی دوکتور بێ وڵام نەهێڵێتەوە دەڵێ: «بزانین خودا بۆخۆی چمان بە نەسیب دەکا.»

دوکتور کە جلوبەرگی ژووریی دەبەر کرد، ئاوی بۆ چا وەسەر نا و هاتە لای سۆفی حەسەن.

: «دەی سۆفی ئەوجار فەرموو پرسیارەکانی ترت.»

: «بە قوربانت بم دوکتور گیان! لە دڵت گران نەیە. هەرچی دەکەم و دەکرێنم، ئەوەی بە چاو دەیبینم. بۆم ناچنەوە سەر یەک. بەر لەهەر شت هەروەک بەیانی عەرزم کردی ئەو چاکەیانەی دەرحەق بەمنت کردووە، منێکی نەدیوونەناسیو، ئەو کۆشک و سەرسەرا گەورەیە کە ژن و منداڵ و کابانی تێدا نییە. ئەو ڕاوێژەی تۆ کە دەڵێی لە دایک و بابێکی کورد بووی.

دەجا دوکتور گیان! با دڵم تۆزێک بحەسێتەوە، ڕاستییەکەم پێ بڵێ تۆ کێی؟ و پێم بڵێ مانای ڕاستەقینەی ئەوانەی بۆم بوونە پرسیار چییە؟»

دوکتور گوتی: «سۆفی حەسەن! ئەوەندە بیر لەو شتانە مەکەوە، هیچم لێ نەشاردوویەوە، هەروەکی پێشتر باسم کرد. ماوەیەکی زۆر لە لای ئێوە ماومەتەوە، گەلێکم چاکە و ڕووی خۆش لە خەڵکی ئەو ناوچەیە دیوە، بە ئەرکی خۆمی دەزانم منیش ئەوەی لە دەستم دێ دریغی لێ نەکەم. جا ئەوە خودا تۆی ناردۆتە لای من، تەنیا لەبەر ئەوەی بتوانم گۆشەیەک لە چاکە و ئەو دۆستایەتییەی لەگەڵ منیان کردووە قەرەبوو بکەمەوە. ئەوەی کە دەپرسی ئەو ماڵە گەورەیە بۆ کابان و ژن و منداڵی تێدا نییە. هیچ جوابێکم نییە. ڕاستییەکەی ئەوەیە هەوەڵێ لەبەر دەرس خوێندن و خۆ پێ گەیاندن قەتم بیر لەژن و زەماوەند نەکردۆتەوە. دواییش وەها بە تەنیایی خووم گرتووە کە دەترسێم ئەگەر کەسێک ڕێ بدەم کە پێی بنێتە نێو ژیانم، تازە خۆم نەگرمەوە و ئەو سەربەخۆیی‌یەی هەمە لە کیسی بدەم. لەهەمووان گرینگتر ڕەنگە ئەوە بێ کە تا ئێستا خودا نەینووسیوە. جارێ ئەوا بە سەڵتی و ڕەبەنی  ژیان دەبەمە سەر. پێم ناخۆش نییە، گرفتێکی ئەوتۆم بۆ نەهاتۆتە پێش.»

: «دوکتور گیان! دەزانم ئەوانەی فەرمووت هەموو ڕاستن، بەڵام نازانم بۆ هەست دەکەم شتێکی تریش لە ئارادایە، دەڵێی پێشتر....»

دوکتور نەیهێشت سۆفی حەسەن قسەی تەواو کا. کوتی: «سۆفی با واز لەوانە بێنین بچینەوە سەر باسەکەی دوێشەو. باوەڕم پێبکە تا بەیان هەروا لەنێو جێدا جینگڵم داوە. بیرم هەر لە لای قسەکانت بوو، تەنانەت ئەمڕۆش وازی لێنەدەهێنام. ئەو بەسەرهاتەی کە دوێشەو بۆت گێڕامەوە، لە سەرم زۆر کاریگەر بووە. هێندێکم شت بۆ نەدەچۆوە سەریەک. نازانم ئامین کە مرادی بە کوشتن دابوو، دیار بوو بۆ وای کردووە چونکە پێی خۆش نەبوو بەختەوەری ئەو و زلەخایە بە چاو ببینێ. دەی باشە ئەی فاتێی چارە ڕەش چ خۆڵێکی لە دۆی ئامین کردبوو؟ کاوەیسیش خۆ هیچ ئازارێکی بە ئامینە شەل نەگەیاندبوو.»

سۆفی دەڵێ: «ئەگەر لە ڕاست بپرسی. بەر لەوەی ئامینە شەل خۆی لە مزگەوتی باوێ و لەبەر خودا بپاڕێتەوە کە بە مەرگ لە کۆڵی ببێتەوە و تکای لە ڕووحانەتی فاتێ و کاوەیس دەکرد کە لێی خۆش بن. من هەر ئەودەم کەمراد کوژرا زەینم بۆ لای ئامینە شەل چوو، چونکە ئەودەم هەر من نا، زۆر کەسی تریش دەیزانی کە ئامین حەز لە مراد دەکا و مراد جوابی ناداتەوە.»

دوکتور قسەی سۆفی حەسەنی بڕی و کوتی: «چت گوت سۆفی حەسەن تۆ دەڵێی ئامین حەزی لە بابی کاوەیس دەکرد؟ هەر ئەو ئامینەی پێیان دەگوت ئامینە شەل؟

: «ئەی بە قوربانت بم دوکتور گیان! خۆ من دوێشەو تەواوی بەسەرهاتەکەم لە نووکەوە بۆ گێڕایەوە. چۆن پرسیاری وا دەکەی؟»

دوکتور ڕەنگێک دێنێ و دەبا.

: «گێڕاتەوە؟ تۆ دوێشەو هەموو بەسەرهاتەکەت گێڕاوەتەوە؟»

: «دوکتور گیان! پێم سەیرە. گوێت لێ نەبووە چیم گوتووە، وا بزانم تۆ ئەوەندە ماندوو بووی ڕەنگە هۆشت لەمن نەبووبێ، بەڵێ، ئەودەم ئامینە شەل، شەل نەبوو کیژێکی یەکجار جوانی لەبەر دڵان بوو. کوڕانی ناودێ و تەنانەت دێیەکانی دەوروو‌بەریش کە نێوبانگی جوانی و ڕووح سووکی ئامینیان بیستبوو هەموو بە ئاواتی بوون، بەڵام ئامین وەها دڵی دابوو بە مراد بابی کاوەیس، کە دۆستی هەرە نیزیکی بایز بوو. نانیان بێ یەکتر بۆ نەدەخورا. کەس نازانێ ئامین بۆ وا ئاوری خۆشەویستی مراد لە دڵی دا بلێسەی سەند. بەڵام مراد بە حەققی ئەو نان و نمەکەی دەگەڵ بایز خواردبووی جوابی دڵی ئامینی نەدەداوە. ئەم کارەی دوور لە جوامێری و پیاوەتی دەزانی.

: «خوشکی ئاواڵەکەم خوشکی منیشە. هەرگیز خەیانەت بە نامووسی برای خۆم ناکەم» مراد ئەوەی لە دایکی خۆی بیستبوو کە شیری خۆی داوە بە ئامین ئەودەم کە منداڵ بوو مراد بەم هۆیەشەوە ئامینی هەروەک خوشکی خۆی چاو لێدەکرد. بەڵام ئامین بەم جۆرە نەیدەڕوانی. بۆ ئامین

هەموو جیهان و هەستی تەنیا مراد بوو لەگەڵ خۆشەویستی لەڕآدەبەدەری مراد. مراد شەرمی دەکرد ئەو مەبەستەی لەگەڵ بایز باس بکا، ناچار پەنای بردە لای مەلای دێ کە ڕێگە چارەیەکی بۆ بدۆزێتەوە. مەلا پێی کوت تا ئەو دەمەی تۆ سەڵت و ڕەبەن بمێنیەوە ئامین وازت لێ ناهێنێ و هەر بە تەمات دەبێ، واباشترە کە هەرچی زووتر ژن بێنی. مراد کە پێشتر لە دێیەکەی دراوسێیان کچێکی کەوتبووە بەردڵی بە نێوی زڵەخا. هەر ئەو زڵەخایەی دواتر کاوەیسی لێبوو. خواستی. ئامین لە داخان وەک شێتانی لێهات. ئیتر شەرم و حەیای وەلانا. نازانم چۆنی بایز دواندبوو کە لەگەڵ مراد بوونە کێردوپەنیر. چەند جارێک لەنێو دێدا پێک هەڵپڕژابوون. هەموو کەس پێی سەیر بوو، ئاخر پێشتر موویان دەبەرەوە نەدەچوو. مراد کوڕێکی یەکجار لەسەرەخۆ و لەبەر دڵان بوو. ئەوەندە ڕاست و دروست بوو کە تەواوی خەڵکی دێ سوێندیان بەسەری دەخوارد. چەند مانگ لە زەماوەندی تێپەڕیبوو کە ڕۆژێک تەرمی مرادیان هێناوە. دوکتور وەها لە پڕ کوتی: «چی؟»

کە سۆفی حەسەن یەک بە خۆی ڕاچەنی. بۆ چەند چرکە تێکڕامان، دوکتور هاتەوە سەر خۆ و گوتی: «سۆفی حەسەن! بمبوورە، بە دەس خۆم نەبوو ئەو جۆرەی تۆ تاریفی مرادت کرد و لەپڕ کوتت بە کوژراوی هێنایانەوە. پێم سەیر بوو دەتوانم بڵێم زۆرم پێ ناخۆش بوو.»

دوکتور لەبەر چاوی سۆفی حەسەن بە چەشنێکی تر خۆی دەنواند. سۆفی بە تەواوی لێی وەسەر شک گەڕا. – درێژەی کایەکەیان –

دوکتور دەڵێ: «سۆفی! ئەگەر ڕاستت بوێ لەبەر ئەوەی وا هەڵبەزیمەوە کە هەست دەکەم منیش مرادم لە نیزیکەوە دیتبێ. هەروەکی گێڕامەوە ئەودەم کە لە سوورە چۆم بانگهێشتن کراین هەست دەکەم کەسێکم بەو تایبەتمەندییانەی باسیان دەکەی چاو پێکەوتبێ سۆفی حەسەن دەزانێ تەمەنی دوکتور بۆ وەی نابێ چاوی بە مراد کەوتبێ. ئەو ڕووداوەی سۆفی حەسەن دەیگێڕێتەوە پتر لە چل ساڵی بە سەر داتێپەڕیوە ئەوەی دوکتور باسی دەکا دەبێ هی بیست یان لانی زۆر بیست و پێنج ساڵ لەمەوبەر بێ.

بەڵام سۆفی حەسەن بەڕواڵەت قسەکەی دوکتوری قەبووڵ  دەکا کە دەڵێ لەسەر ڕێگای چوونمان بۆ سوورە چۆمێ چاومان بە لاوێکی وێچوو کەوت شوان بوو. داوای ئاومان لێکرد. ناوی مراد بوو. وێدەچێ هەر ئەو مرادە بێ کە باسی کردووە.

سۆفی حەسەن دەڵێ: «ڕاستە بۆ خۆیەتی. ماڵی مراد هەرچەند خاوەن ڕەزومەزرا و باخ بوون بەڵام مراد شوانێتی دەکرد، گوتبووی هەتا دەژیم هەر شوان دەبم.»

دوکتور دەڵێ: «سۆفی حەسەن! هەر لەبەر ئەوە بوو بە بیستنی هەواڵی مەرگی مراد خۆم بۆ ڕانەگیرا.»

سۆفی حەسەن دەستی پێکردەوە: «کەس نەیدیبوو کێ کوشتوویەتی. هەرچەند دوای کوشتنی مراد، بایزیش لەسنوور پەڕییەوە و تا ئێستاش نەگەڕاوەتەوە بەڵام، وا لە قاو درا کە کاری بایز نییە چونکە بایز پێشتر باسی کردبوو کە هەر ئەو ڕۆژانەیە بڕواتە ئەودیو. بە سەرت درۆت عەرز ناکەم ئەمن هەر ئەودەمیش بەو خۆشەویستییە کوێرانەی ئامین هەیبوو سەبارەت بە مراد شکم هەر بۆ لای ئەوان دەچوو. هەتا ئەو شەوەی کە ئامین خۆی لە مزگەوت کوتا.

دوکتور پرسیاری کرد: «کە وابوو ئەو مرادەی باسی دەکەین هەرگیز نەچۆتە غەریبایەتی بۆ کەسپ و کار و نەگەڕابێتەوە؟»

سۆفی حەسەن چاوێکی ماناداری لێکرد و گوتی: «سەد حەیف و خەسارێ بۆ مراد، بەستەزمانە هەرگیز پێی لە هیچ شارێکی بەدەر لە سەردەشتێ نەناوە.»

دوکتور پرسیاری لێدەکا: «دەی دوایی بەسەرهاتەکە بەرەوکوێ چوو؟ زلەخا چی بەسەر هات؟»

: «قوڕ بە سەرە هەرگیز خۆشی نەدیت. پاش کوژرانی مراد، براکەی هات کە بیباتەوە دێیەکەی خۆیان. بەڵام هەرچی کردی هەر پێی داگرت کە لە گڵکۆی  مراد دوور ناکەومەوە، کوتبووی، ئەمانەتی مرادم لە لایە. دەبێ هەر لە لای خۆی بمێنمەوە و هەر لە ماڵە مرادی پێی بگەیەنم. چەندی چەرمە

سەری دیت تا کاوەیسی پێگەیاند، شێرە ژن بوو، زۆر داواکاری هەبوون، کەسی بە پیاو دانەدەنا، ئەویش بە کچی حەزی لە مراد کردبوو. مرادیش بە دڵ خۆشی دەویست تا ئەوێ شەوێ کە ئامین لە مزگەوت بەڕوودا، کەوتبوو. دەیناڵاند و ڕوومەتی خۆی دەپچڕی و سەروقژی دەڕنیەوە. من نازانم چۆن بوو ئەم پرسیارەم لێکرد.

: «ئامین! وەرە ڕاستم پێ بڵێ بەڵکوو لەم دواییەدا خودا لێت خۆش بێ. تۆ دەزانی کێ مرادی کوشتووە؟»

بە بیستنی ئەم پرسیارە یەک بە خۆی قیژاندی و هاواری بەرز بۆوە و سەری پەیتا پەیتا لە عەرزی دەکوتا. دەمکوت ئەلعان نا ئەلعان مێشکی سەری بڵاو دەبێ.

گوتم:« بەسە ئامین، وامەکە، جوابم مەدەوە، خۆت کوشت. بەدبەختی چارە ڕەش. بەسە دەست هەڵگرە.»

: «نا، نا، سۆفی! تۆ نازانی، من تازە بە مردنیش چارەم ناکرێ. من شەیتانم، بەرازم، دێوم، درنجم، پیسم، گڵاوم، پیسم، پیس.»

: «کچێ ئامین! لە ڕێگای خودا دا وامەکە، لەجیاتی ئەو خۆڕنین و خۆ کوشتنە دوعایە بکە، لەبەر خودای بپاڕێوە. لە گوناحت خۆش بێ. بەڵکوو سەبووری دایەی.»

: «نا، سۆفی فریوم مەدە، دەزانم خودا هەرگیز من نابەخشێ. من شیاوی بەخشین نیم. خودا نەبێ کەس نازانێ من چیم کردووە. سۆفی تازە چت لێ بشارمەوە. مراد بە دەستی من کوژرا، نا، بەدەستی خۆم نا، بە پیلانی من، بەدرۆ و بە بوختانی من کوژرا. بایزی برام شاربەدەر کرد. ئاخر چۆن بڵێم. مراد خەتای خۆی بوو. بۆ خۆی وای کرد. زوڵمی لێکردم. خۆشم دەویست نەک ویستێکی ئاسایی، نە ئەو جۆرەی یەکێک یەکێکی خۆش دەوێ. نا، بەڵکوو ئەو جۆرەی کە مەخلووقێک، خالقەکەی خۆش دەوێ. بەڵام لە جیاتی ئەوەی ئاوڕ لە من بداتەوە. کوشتمی. بە نەدیتنی من، بە نەدواندنی من، بە خوشکم خوشکم کوتنی، ئەمن خوشکی نەبووم و نەمدەویست هەرگیز خوشکی ببم. درۆی دەکرد. دەمهەویست لە ئامێزیدا ئارام بگرم. سۆفی!

مراد، نەیدەدیتم، تۆ بڵێ من چیم کردبایە؟ خۆ من درۆم نەکردبوو، بەڕاستی و بە دڵ خۆشم دەویست، نە ئەو جۆرەی کەنەیبینم لە بیری بکەم، هەرچی زۆرترم خۆش دەویست و لێی دەچووومە پێش زۆرتری دەشکاندم. دەری دەکردم، ناخۆشترین وشەیەکی کە هەرگیز پێم خۆش نەبوو لە زاری مرادی ببیستم پێی دەکوتم. دەزانی پێی دەکوتم چی؟ سوفی حەسەن! پێی دەکوتم: ئامین! ئەتۆ خوشکی منی. ئەمن بەڵێنیم بە دڵم دابوو، ئەمن سوێندم خواردبوو یا مەرگ یان مراد. نەمدەتوانی ببینم کە کەسێکی تری دەوێ، نەمدەتوانی ئیزن بدەم لەبەر چاوی من کەسێکی‌تر بەختەوەر بکا. بە کاکە بایزم کوت بە قیژە و هات‌وهاوارەوە. کاکە چەندەم پێ کوتی ئەو ئاواڵەی تۆ ناپیاو و نامەردە. کاکە ئەودەم بۆ جوابت نەدەدامەوە. شاڵاوی بۆ هێنام. ئەودەم کە هیچتان لە ماڵ نەبوون. خۆی مات کردبوو تا هەمووتان وەدەر کەون، ببوو بە گورگ، گورگێکی برسی و دڕندە. دەمەویست بقیژێنم و دەروجیرانان ئاگادار بکەم وای دەست لەسەر دەمم دانابوو وەخت بوو بخنکێم. ئەی خودایە هەرچی زووتر بمکوژە. ئەوە چ پەندێک بوو بەسەرم هات. کاکە بە قوربانت بم. ئەمن تازە ڕووم نییە چاو دەچاوت برم. سەرم نەوی کردی. ئەو ناپیاوە ئەتکی کردم. ئەی خودایە هاوار. جا سۆفی حەسەن! چت بۆ بگێڕمەوە.

کاکم بە سەر چۆک داکەوت. لەبەرم دەپاڕاوە، سوێندی دەدام. هەرچەند ماوەیەک بوو کە مرادی نەدەدواند. چەند جارێکیش بەشەڕ هاتبوون. ئەوکارەی لەمراد بە دوور دەزانی تا ئاخری ناچارم کرد باوەڕم پێ بێنێ. بایز مرادی کوشت وەک بۆی گێڕامەوە لە ناکاو ئەنگاوتبووی. بەڵام سەیر ئەوە بوو ئاوری تۆڵەی من بەمردنی مراد دانەمرکا. هەرچی کاوەیسی کوڕی گەورەتر دەبوو زۆرتر دەبوو بە مراد و زۆرترم ڕق لێی هەڵدەستا. سۆفی حەسەن دیتبووت کە چەندە وە بابی دەچوو؟

دوو لەتە سێو ئەوەندە وێک نەدەچوون. لەمێژ بوو لە دەرفەتێک دەگەڕام ئاخر لە پاش مردنی مراد، منیش خۆم نەگرتەوە. ئەو بوختانەی بۆ خۆم بە خۆمم کرد داوێنی گرتم. تازە کەس لەوانەی پێشوو داواکارم بوون بەلامەوە

نەدەهاتن. تاکوو دایکم بەزۆری بەخشیمی بە غەفوورەگێڕی. هەموو ئاواتە جوانەکانم مردبوون. کاکەبایزم کە لە گۆڕێ نەمابوو، بە تەواوی بەرەڵڵا بووم، هەڵخلیسکام، ئیتر خۆم نەگرتەوە. لاقم کە لە دەس دا. بوومە کتکەنەفتینە، ڕووم لە هەر شوێنێ دەکرد ئاگرم دەدا. ببوومە کوندە بوو، لە هەر شوێنێ دەمخوێند ویرانم دەکرد. ڕقی من لە بن نەدەهات. تا کاوەیس گەورەتر دەبوو. دەگەشاوە، هەڵدەکشا. گەشەی دەکرد. ئاگری ڕک و کینی من زۆرتر دەبوو. گڕی دەگەیشتە تەشقی ئاسمان. ببوو بە گڕکان تاکوو لە ئاخری‌دا توانیم هەرتکیان لەناو بەرم.»

: «کچێ ئامین! وڕێنە دەکەی؟ ئەو قسانە چییە؟ هەڵیان دەبەستی. زڵەخا لەتاوی کاوەیسی کوڕی دڵی تۆقی.»

: «نا، نا، نا، وانییە، سۆفی حەسەن! تۆ بە هەڵە چووی، هەمووتان بە هەڵە چوون دەزانم زڵەخا ئاخری و عاقیبەت لەتاو کاوەیس دڵی هەر دەتۆقی. بەڵام من وادەکەییم بۆ نیزیک کردەوە، بە قسەکانم کوشتم. نەمهێشت مردن بە کاوەخۆ بچێ بۆ لای، لەگەڵ خۆم بە دیاری بۆم برد، بە گژم داکرد. ئێوارەیەکی درەنگ وەخت هەروەک ئیزرائیل لێی وەژوور کەوتم. ئەوەی هەبوو، نەبوو لە نووکەوە بۆم گێڕاوە. زەق زەق چاوم لەچاوە سیسەکانی بڕی. دەمویست لە چاوانی‌دا چارەڕەشی، نەهامەتی، کلۆڵی و داماوی بخوێنمەوە. بەڵام بەهۆی گریانی زۆری بۆ کاوەیس، چاوەکانی وەک چاو نەدەچوون، سیس و ژاکاو و بێ ئاو، ببوون بە دوو گۆمیلکەی خوێن. چۆنیەتی کوژرانی مرادم بۆ گێڕاوە. ئەو پیلانەی بۆ کاوەیسم گێڕابوو. هیچی نەدەکوت. وەک ئیشکەڵێکی پایزی لێهاتبوو. چاوی لەسەر دیواری گوێزتبووە سەر پەنجەرەی ژوورێ و بێ مەبەست چاوی تێبڕیبوو لە دەرەوە تەنیا تاریکایەکی خەستوخۆڵ وەبەر چاو دەهات کە ئەوەی هەبوو، نەبوو لە خۆی دا حەشار دابوو. نازانم ئەودەم زڵەخا کێی دەدیت کەوا تێی ڕامابوو، نە ئاخێک و نە ئۆخێک، دەمەوڕوو کەوت. بۆلای نەچووم. هەر چاویشم لێی نەکرد تا بزانم ماوە یان مردووە؟ کوتم بە من چی. من تۆڵەی خۆمم لێ کردۆتەوە و ئەوەی کە دەبوو بیکەم کردم، لە ماڵەکەی وەدەر کەوتم. لە

تەواوی ژیانمدا ئەوەندە ئارام و لەسەرەخۆ نەبووم چوومەوە ماڵ و نوستم، خەوێکی خۆش و ئارام. بەیانی کە لە خەو هەستام. بیستم کە گوتیان دوێشەو زڵەخا لە تاو کاوەیس دڵی تۆقیوە. دیانکوت دەمانزانی ئەو بەڵایەی هەر بەسەر دێ. سۆفی حەسەن! بە بابەوە بە قوربانت بم. تا ئەودەمەی کە لەبیری تۆڵە ئەستاندن دابووم هیچ عەلەمی خودام لێ نەبوو. بەڵام ماوەیەک دوای مردنی، زڵەخا لەخۆڕا وردە وردە دەرد و ئازاریش کەوتۆتە گیانم هەر کارێکی دەمکرد بە باری خراپیدا نەبایە لە دەستم نەدەهات، بەدەست خۆم نەبوو، ببوومە عیفریتێکی نەخۆش کە حەزی لە خراپە و چەواشەکارییە. عیفرتێکی پەتیارەی بەڕەڵڵا. دێوەزمەیەک کە بە دیتنی خۆشی و بەختەوەری هەر کەسێک شێت و هارتر دەبوو. ژان و دەرد کە ماڵی لەشمی بەکرێ گرت، ئەمن شێت بووم، ئەوە دەڵێم چی؟ ژان و دەرد کە لەشمی داگیر کرد. ئەو گۆڕ بە گۆڕبابەش کە لاقمی لێ ئەستاندم. هەمزە کوێریش کەئەوەی بۆم مابووە لێی داگیر کردم. ئیتر خۆم نەگرتەوە، شەو و ڕۆژم بۆ نەماوە، ژان و ئێشێک دەکێشم کە لە تاقەت و توانای کەس دا نییە سۆفی! وەرە پیاوی خودای بە و پێم بڵێ چ بکەم کە ڕزگارم بێ، خۆم دەزانم ئەوەی تا ئیمڕۆ لێم وەشاوەتەوە بۆ بەخشین و چاوپۆشی نابێ. بڕوام پێبکە مردن بەکڕین بایە تا ئێستا لەمێژ بوو مردبووم.»

: «ئامین بۆ ناچی خۆت بە پاسگایە بناسێنی. بڵێ ئەو کارانەت کردوون، یان بڕۆ خۆت دەماڵە ئەو کەسانە باوێ کە خراپەت لەگەڵ کردوون. داوای لێبوردنیان لێ بکە بەڵکوو زگیان پێت سووتا و گەردنت ئازا کەن. لانی کەم ئەوەندە ئازاری ڕووحی نەکێشی.

: «سۆفی! ئەم کارە چۆن دەکرێ، نازانی مراد! کاوەیس و زڵەخا هیچ کامیان نەماون؟ مەگین لە دنیای دیکەدا بیانبینمەوە کەهەر وەک ڕۆژ دەزانم هەرسێیانم ناردۆتە بەهەشت. بەڵام من، منی بابان وێرانی سەرلێشیواو، جێگەم نێوەڕاستی جەهەننەمە. تەنیا فاتێ زیندوویە. ئەو قوڕ بەسەرەش وەک بیستوومە وەها دەرد و ژانێک لە تیغەرەی پشتی چەقیوە، مەگین خودا

بۆخۆی بزانێ. تازە لە کوێی ببینمەوە وەک دەڵێن لە سەردەشت نەماوە و خودا نەبێ کەس نازانێ ڕووی لە کوێ کردووە.»

دوکتور دیسان وەک جاری پێشوو لەپڕ قسەی سۆفی بڕی و کوتی: «چی؟»

سۆفی بەو پرسیارە لە نەکاوەی دوکتور دیسان هەڵبەزییەوە.

: «دوکتور گیان چ بوو؟»

: «هیچ سۆفی، ببوورە.»

بە دەس خۆی نەبوو. ڕووداوەکەی پێ دڵتەزێن بوو.

سۆفی کە چاوی لە چاوی دوکتور دەبڕێ، دەبینێ دوو تنۆک فرمێسک لە گۆشەی چاوی دوکتوردا بەرگی شەرمیان داماڵیوە و هەر لەبەر چاوی سۆفی حەسەن ڕژانە سەر گۆنای.

سۆفی دەڵێ: «دوکتور گیان! بە قوربانتبم، بمبوورە. من نازانم بۆ خەریکم بە گێڕانەوەی ئەم بەسەرهاتە کەهیچ پێوەندی بە جەنابتەوە نییە سەرت دێشێنم و ئازارت دەدەم بمبوورە ئەم شەوم لێ تاڵ کردی.»

دوکتور سۆفی دڵنیا دەکا کە ناڕاحەت نەبووە، زۆریشی پێی خۆشە کە ئاخر و ئۆخری ئەم ڕووداوانە بزانێ. دوکتور ڕابردووی خۆی وەبیر هاتۆتەوە و هێندێک دڵی گیراوە، ئەویش پێی هیچ نییە و سۆفی نابێ خۆی بە شەرمەزار بزانێ و خۆی ئازار بدا سۆفی تێمابوو چ بە دوکتور بڵێ.

کوتی: «سۆفی! ببوورە هەر ئێستا دەگەڕێمەوە.»

لە پلیکانەکانی نهۆمی دووهەم وەسەر کەوت و خۆی لە ژوورێکی کوتا چوو بۆ لای پەنجەرە و پەردەکەی لادا و پەنجەرەی کردەوە. چاوی لە ئاسمانی تاریکی شەو بڕی. بێ هەست و خوست، تنۆک تنۆک فرمێسک لە چاوی دەڕژا، هیچ حەوڵی نەدەدا پێشیان بگرێ یا چاوی بسڕێتەوە. ئاسمان پڕ پڕ بوو لە ئەستێرەی گەش، دوکتور بە چاوە تەڕەکانی ئاسمانی دەپشکنی. ڕەنگە لە چەند ئەستێرەی ئاشنا دەگەڕا....

***

# ٤١

..... وڵات هەروا تاریک و خامۆشە کە لە ماڵە پوورم لە شەقامی شاناز لە شاری تەورێز وەدەر دەکەوم. ماڵەکەیان سێ شەقام ئەولاتری شوێنێکی مێژوویی‌یە بە نێوی «ئەرکی عەلی‌شا». بەپێیان ڕێم گرتە بەر. ماڵئاواییم لە کەس نەکرد کە دڵنیا بووم هەر ئەوێ ڕۆژێ مێردی پوورم لە سەفەر دەگەڕێتەوە و ئیتر حەوجێی بەوە نەبوو من لەوێ بم. لەو ماوەیەدا کە بەنابەدڵی لە تەورێز مابوومەوە هێندە خەیاڵی سەیر و سەمەرەم کردبوو. ئەوەندە چووبووم دەپێست و قالبی کەسی ترەوە. چی وا نەمابوو خۆم بۆ هەمیشە لێ ون ببێ و ئیتر خۆم نەناسمەوە، لە بڕوس‌لی ڕا بگرە لە فەردین لە بیک‌ئیمان‌وێردی لە جێیمز باند. لە ئۆناسیس لە تارزان، لە پلە، لە سەتتار، کلێی، مارلۆن براینێر تایوول بڕاینێر ئەو کەچەڵەش، کەس نەمابوون کە نەچم دەپێستیانەوە و بە پووڵ و تاقەت و جوانی ڕوخساریان خۆم نەڕازێنمەوە وهیچ کیژۆڵەیەکی جوان لەم دنیا پان و پۆڕەدا نەمابوو کە چاوم پێی بکەوتبایە و ئەو شێت و شەیدام نەبوایە. بە پارەکەی ئۆناسیسی بیمارستان و زانستگام دروست دەکردن و وەقفم دەکردن، چ ڕێزێکم لە خەڵکی هەژار دەگرت. چەند هەتیوخانە و مزگەوتم دروست کرد و بە نێوی بابم کرد کە زۆرم خۆش دەویست. ئەی نازانن بۆ براکانم چم دەکرد و بۆ خوشکەکانم چی‌ترا! دۆست و ئاواڵەکانم هەموو وەسەر کار خستبوو و لە هەژاری و دەسکورتی ڕزگارم کردبوون. ئەم چەشنە بەخشین و دڵاوایی و چاوەدێریکردنی خەڵکی هەژار و لێقەوماو و پاڵەوان بازی کاری ئاسایی و هەر سات و کاتێکم بوو تا دوێ‌شەو ئەو هات و لە تەشقی ئاسمان ڕایکێشامە سەر زەوی و لەسەر کورسیلەیەک ڕووبە خۆی لەوبەر میزێک

داینیشاندم. بەر لە هەرشت ئەوەی بە خەیاڵ وەسەرم نابوو لێی ڕشتم. لە پێست و قالبەکانیتری دەرکێشام. سەر لەنوێ کردمیەوە بە خۆم. «خۆم»ێکی، کە لە بێ خەبەری و گێژاییی‌یەکی مزردا ون ببوو. لەنێو خولیا و خۆزگەکانی خۆی و دەورو بەریدا، خۆزگەکانی عەلیلە، عەلیلە زۆر لەمێژە لێی بێ خەبەرم. ئەودەم کە بەیەکەوە بووین، قورسایی لەسەر زەین و ڕەوان و کەسایەتیم ئەوەندە زۆر بوو. هەرکە لێم ون بوو منیش ون بووم. نازێ، ڕاستی بڵێی نازێ لە چ حاڵ دابێ؟ پرسیارێکی کە بێ ئیزن هەرکات پێی خۆش بایە خۆی لە ژووری دڵی من دەکوتا و هەروەک چۆلەکەیەکی حاسێ لە ژووردا خۆی بەتەواوی هێز و توانای بە دەرودیواری ژووری زەین و دەڕوون و بیرەوەرییەکانمدا دەدا. من دەڵێم پرسیار. بۆیە پرسیارە کە لە وەڵامێکی تایبەت دەگەڕێ تا بە دەستەملان بوون لەگەڵ یەکتر ڕاستییەک بەرز بکەنەوە. بەڵام هێندێک پرسیار هەن بە شوێنی هیچ وڵامێک دا عەوداڵ نین. بەڵکوو تەنیا پرسیارێکن و بەس، تەنیا بۆ ئازاردان، بۆ جەزرەبەدان، بۆ ئەوە پرسیارن کە کەسێک وەگومان بخەن. گومان لەبوونیان، گومان لە خۆیان، گومان لە هەست و نەستیان، گومان لە دوێنێیان، گومان لە ئەمڕۆ و سبەینێیان، پرسیارێک نە بۆ ئەوەی ڕووناکترت بکاتەوە. بەڵکوو پرسیارێک بۆ ئەوەی بتخاتە تاریکایی گومانەوە، پرسیارێک بۆ ئەوەی هەمیشە وەک پرسیارێک لەلات بمێنێتەوە. ئەرێ نازێش بەڕاستی منی خۆش دەویست؟ هەر ئەم پرسیارە دەیبردمەوە سەردەشت، کۆڵان بە کۆڵان و جادە بە جادە دەیگێڕام کە هەرا بکەم نەشمیلەی چاو مەست! پەچەکەت لادە، پەچەت لادە شەرمی پێناوێ پەچەکەت لادە پەچەت لادە.

گوتم: «ڕووبەڕووی ئەو لەسەر مێزێک دانیشتبووم.»

گوتم: «تا ئەودەم خۆم بە باشی بۆ نەدەناسییەوە.»

گوتم: «سەردەمانێکی دوور و درێژ بوو ون ببووم. تۆ لات وایە سالێک و دوان و سێیان؟ تۆ لات وایە دەیەیەک و سەدەیەک و هەزارەیەکە؟ نا، نا، نا، بە هەڵە چووی، من بە درێژایی ژیانی مرۆڤ لەسەر ئەو زەوییە ون

بووم، هەریەک لە ئێمە بەشێکی وجوودمان لەناو وجوودی مرۆڤەکانی‌تر دا تواوەتەوە کە واتا من بەشێکم لە تەواوی مرۆڤەکانی سەر زەوی، کاتێک من ون دەبم، هەموو کەس ون دەبێ و هەرکات من خۆم دەدۆزمەوە. ئەوە مرۆڤەکانی‌ترە کە دەیاندۆزمەوە. من کە ون ببووم دەنێو لابیرێنتی بێ خۆمی‌دا. لەنێو دەمامکی جۆراجۆردا کە ناچار بووم هەر دەم بۆ ڕزگاریم لە دەست بیرەوەری ئازاریکی تاڵ و نەویستە هەروەک چەل‌ومل بە دەم‌وچاومی دا بسەپێنم. ون بووم لە نێو ئەو بۆشایی‌یانەی شکڵی مرۆڤیان بە خۆوە گرتبوو. بە هەر هیچ و لە هیچ هیچ‌ترێک هەڵدەمسان هەروەک ڕەشکەکا. ون ببووم لەنێو ئەو سووکەڵە باوەلانەی بە هەر پووکە بایەک لە سەر خۆیان دەچوون و ئیتر هەروەخۆیان نەدەچوون. ون ببووم لەنێو ئەو داوەڵە پواوانەی ئیتر قڕەی قەل لە پەردەی گوێچکەی نەدەدان و قەلە ڕەشەکان لەسەر جەستەی بێ جەستەیان بێ شەرمیان دەکرد.

بووڵێل بوو، ویستم تا دەگەمە کارێژ، شەوی ڕابردووم زیندوو کەمەوە. بەڵێ هەر وابوو وەک شەوانی ڕابردووم. بە ڕواڵەت چوومە دەست بە ئاو لە مبالەکەی نێو حەوشە. زۆرتر بۆ بەدزی سیغارکێشان کە تازە فێر ببووم. ئەودەم پێم وابوو مەشقی گەورە بوون و ئەوینە، دووکەڵەکەم بە با دەکرد و هەر جار وێنەی ئەوم لە دووکەڵەکەی دا بەدی دەکرد. لە دووکەڵی سیغارەکەم‌دا دۆزیمەوە، بۆ دیتن دەبوو بەڵام بۆ دواندن نەدەبوو هەروەک من کە چووبووم تا ئاگام لە پوورم و منداڵەکانی بێ بەڵام زۆرتر ئەوە پوورم بوو ئاگاداری لە من دەکرد- کایەی مرۆڤەکان دەگەڵ یەکتر زۆر سەیرە هەر ئەوکات بوو سەرنجم کەوتە سەر کایەی (دایکم و پوورم) گێڕامەوە کە دایکم لەتە دڵەکانی من و براکەم کە هەمان دەمانچە پلاستیکەکانمان بوو کە حاجی محەممەدی ساحیب ماڵمان بە دیاری لە حەج بۆ ئێمەی هێنا و دایکم بۆ ئەوەی خوشکێکی باش بێ با ئەوەی من و براکەم ڕووحمان لەسەری بوو دای بە دوو کوڕەکەی ئەم پوورەم و ئێستاش ئەم پوورەم بۆ ئەوەی چاکەی دایکم قەرەبوو بکاتەوە وای نیشان دەدا کە بەقەرا دوو کوڕەکەی خۆی منی خۆش دەوێ و هەر کاریشی بەوە نەدابوو کە

هەرگیز ئەوەم وەک ڕاستییەک نەسەلماندووە – زۆر مانەوەم لە مەبال[55] دەیکێشایە نێو حەوشە، :«ڕۆڵە! تۆخودا پێم بڵێ ناڕاحەت نی؟ هیچ کوێت نایەشێ، وەرەسەر لیوانێک ئارەقی جاترە بخۆوە و تاوێک بۆی بنوو بەرت دەدا.»

نەمتوانی بیدوێنم، گەڕامەوە ژوور و لە جێگەوبانم خزام. چاوم لە میچ بڕی هیچ ئاڵوودار بە دیارەوە نییە بیانژمێرم. هیچ خۆشیشم لەمەڕ بژاردن نایە زوو زوو لێم تێکەڵ دەبن، هەر خوزگەم بەماڵەکەی خۆمان کەهەر وەک ئاوخواردنەوە بە حەبی ئاڵووداردن هەر بڵێی یەک ودوو بێخەوترین کەسیش خرپەی ڕۆژەڕێیەک دەڕۆیی! ناچار پەنا دەبەم بۆ دیازپامی خەیاڵ. دەمباتە دنیای ئارام و بێدەنگ و هەستی خەو، خەوم لێدەکەوێ، بەوە دەزانم خەوم لێکەوتووە کە خەونم دیوە، هەر خەونێک بۆی هەیە لەبیرت بەرێتەوە. بەڵام ئەو خەونەی من دیتم وەبیری هێنامەوە، دەستی گرتم، بەو بەیانییە زوویە، ئەوە قۆڵکێشم دەکا بەرەو سابلاغ، ئەو کچەی دوێشەو لە خەونمدا بەرانبەر بە من لەسەر مێزێک دانیشتبوو، هەر ئەو کچە بوو کە پێشتر دیتبووم. ئەو کچەی منی دەسنیشان کردبوو بۆ ئازاردانم، بۆ بێوادە گەورە کردنم، بۆ وادار کردنی من بۆ دیتنی تەواوەتی ئەو بە ئانقەست نەدیتنەکانی پێشووم. هەمان کچ بوو کە هەلووکێکی گێژی سەرلێشێواو بیانووی دایە دەستی، کە سەر لەمن بشێوێنێ و ئەودەم کە من هیچ گوناح و تاوانێکم نەبوو و هیچم لە خۆمدا شک نەدەبرد. لە ناکاو کەوتمە بەر هێرشی تیری چاوی، نا، نا تیری چاوی نەبوو و تەنیا سەیر چاوی تێبڕیبووم، دەتکوت شتێکی بەقیمەتی لێ ون بووە و بەنیازە لە ڕوخساری مندا بیدۆزێتەوە، من بە جۆرێک زمانم بەسترابوو کە نەتوانم تەنانەت پێی بڵێم بە هەڵە چووی. خۆ من نەبووم. ئەو هەر لە هەوەڵەوە بڕیاری خۆی دابوو کە دەبێ هەر من بم «بێ تەربییەت» هەڵبەت زۆر وەک جنێو ناچێ. زۆرتر دەنگدانێکی توند و تیژە بۆ ناچارکردنی کەسێک بۆ ئەوەی لەپڕ ئاوڕ لە شتێکی بداتەوە کە بە

---

٥٥- مەبال: ئاودەست.

بێ موبالاتییەوە نەیویستووە ببیینێ. چەشنێک ئاگادارکردن و وشیار کردنەوەیە. بەڵام ئێمە لە خەونم دا سەیر یەکترمان دەناسی. ئاشنا ئاشنا، مەودای نێوان تەورێز تا ساباڵغ بەو ئوتووبۆسە تەنگە شکاوانە، هەرگیز کۆتایی نایە. بەڵام بێتوو کەسێکی وەک من شەوی پێشتر، خەونێکی خۆش خۆشی دیتبێ، هەر خودا خودایەتی قەت کۆتایی نەیە. چونکە گەرەکتە ئەم ڕێگایە نەبڕێتەوە تا دەرفەتی ئەوەت هەبێ دەیان جار بە خەونەکەتدا بێیەوە. تا چاو لەسەر یەک دادەینی.

: «ئاغایان! خانمانی بەڕێز! فەرموون دابەزن، گەیشتینە ساباڵغ.»

بەڕای من مەودای نێوان شتەکان پێوەندی بە چاوەڕوانی ئێمەوە هەیە. هەرچی زۆرترت پێخۆش بێ شتێک یان کەسێک لێت نیزیکتر بێ کە لێی دەڕوانی لە دوور و دوورتری دەبینی و بە پێچەوانەوە هەر کە ویستت شتێک یان کەسێک نەبینی بە بیانوو یان بێ بیانوو لەبەرچاوت قوت دەبێتەوە، سەیر ئەوەیە ئەوانەی ناتهەوێن هەمیشە بە دووتەوەن و ئەوانەی بە شوێنیاندا عەودالی وەک نیسێت هەر لەبەرت هەڵدێن و هەر نایگەیەی.»

دەبینی جاری وایە بۆ نەدیتنی کەسێک لاڕێ ڕۆیشتووی، کۆڵانێکی چۆل و بێ هات و چۆت هەڵبژاردووە و سەری خۆت بەرداوەتەوە و بە پەلە دەڕۆی، لەپڕ لووتت لەگەڵ لووتی کابرای گۆرین تێک هەڵدەنگوێن. لە حالێکدا دڵنیای ئەگەر وەشوێن ئەو کەسە کەوتبای لە ماڵەکەی خۆشیدا نەتدەدۆزییەوە.

من هەرگیز نەمزانیوە کێیە؟ کە ئەوەندەی حەز لە گەمە و کایە و گاڵتە و فشەیە. ئەم هەموو نەخش ونیگار و وێنەی دژ بە یەکە پێک دێنێ، ئەوشتە کە گەرەکت نیە و نیازت هەرگیز پێی نییە و پێی نابێ دەبینی ئەوا لەبەر درگای ماڵەکەت چاوەڕوانیت دەکا. لە حاڵێکدا، ئەوەی سوێت بۆی بۆتەوە و شەو و ڕۆژ بە شوێنیدا عەودالی وا لە کێوی «قاف»ە و کێوی «قاف»یش تەنیا لەنێو حەکایەتەکاندا بۆی هەیە کەسێک بیگاتێ. تۆش کە هەرگیز ئیزنی چوونت نادەنێ.

گەیشتمەوە سابلاغ. نەچوومەوە ماڵ. خەونێک دەستی دڵمی بەرنەدەدا. هەروا بێ مەبەست و سەوداسەر بە شەقامەکانی شاردا دەخولامەوە. چاوم سەیر دەگێڕا. من لە شوێنێ دەگەڕام کە شەوی ڕابردوو لە خەونمدا دیتبووم، شوێنەکەم دۆزییەوە. بەردرگای ماڵەکەیان بوو کە لەسەر شەقام هەڵکەوتبوو، خوار درگاکەیان کتێبفرۆشێکی گەورە بوو و سەرەوەی درگاکەیان بەستنیفرۆشێک بوو کە مێزێکی لەگەڵ چەند کورسیلە لەبەر درگای دووکانەکەی دانابوو ڕاست ڕاست بۆخۆی بوو هەر ئەو کورسیلەی من لەسەری دانیشتبووم، نیشانەم کردبوو نیشانەی خۆم نەبوو من دۆزیبوومەوە، گۆشەیەک لە دەسکەکەی بەئاگری سیغاری لاوێکی ناڕازی لە ژیان و خۆی سووتابوو، لەو نیشانانەی لە وڵاتی ئێمەدا لەسەر زۆر شتانی دەبینی. خۆم بۆ ڕانەگیرا، ئەوەی لە خەونەکەمدا بینیبووم. ئاشکرا موو بە موو هاتە بەر چاوم. تەنیا جیاوازێکی خەون و بێداریم هەیبوو ئەوە بوو کە دە خەونەکەمدا لە مابەینی کتێبفرۆشەکە و بەستنیفرۆشەکەدا هیچ درگایەکی لێنەبوو یان لەوانەیە لێیبووبێ، بەڵام من ئەوەندە مەحوی تەماشای ئەو بووم کە ئاگام لە زەوی و زەمان بڕابوو. عەبەسانی من لەبەر درگای بەستنیفرۆشەکە ناچاری کرد بڵێ.

: «کاکە چت بۆ بێنم؟»

نەیدەزانی کە هەرگیز ناتوانێ ئەوەی من دەمهەوێ بۆم بێنێ. هەر بەناچاری داوای ئەو شتەم لێکرد کە دەیتوانی بۆم بێنێ.

: «بێزەحمەت بەستەنییەکم بۆ بێنە.»

نیوەم نەخواردبوو کە لەبەر چاوانی هەمیشە چاوەڕوانم لەپڕ درگای ڕووبەڕووم کراوە و ئەو کچە بێتەربییەتە. نا من پەلەم کرد و بەهەڵە چووم ئەو کیژۆڵە شۆخەی بە منی گوتبوو «بێتەربییەت» لە درگا وەدەرکەوت. بۆ کورتە ماوەیەکی نەمزانی ئاخۆ ئەوە ڕاستەقینەی ژیانی منە کەدەبێتە خەون یان خەونی ڕاستەقینەی ئەوە کە دەبێتە ژیان و خەیاڵی من؟ ڕوخسار و ئەو جلوبەرگەی دەبەریدا بوو لەگەڵ دوێ شەو کە چاوم پێی کەوتبوو هیچ جیاوازییەکی نەبوو. ئەو کڵۆ بەستەنییەی لە تاوان خستبوومەنێو زارم وەها

بەئاگری دەروونم توابووەوە، یەکجێ بۆم قوت نەدەرا. چی وای نەمابوو بە لێو و لیچمدا شۆڕ بێتەوە و کچە لەپڕ لێم وەدەنگ بێ.

: «من پێشتریش دەمزانی تۆ هەروا «بێتەربییەتی» بەڵام هیچ دەزانی کە زۆریش پیسکێری؟!» دەڵێن بەرزترین پلەی گەرمای لەشی مرۆڤ چلودوو دەرەجەیە و بێتوو گەرمای لەش لەو ئاستە تێپەڕێ. ئیتر ناژیت. من ئەودەم زانیم ئەم ڕاستییە جێی شک و گومانە. پێتان خۆشە بڕوام پێ مەکەن. ئەوە مافی خۆتانە بەڵام خۆم لانی کەم باوەڕم بەخۆم هەیە. من دەڵێم ئەودەم کە چاوم دووبارە بە کیژۆڵەکە کەوت پلەی گەرمای لەشم لە پەنجاوشێستیش تێپەڕیبوو! بەڵگەت دەوێ ئەو بەستەنییەی بەردەمم کە لە پڕتواوە و بوو بە ئاو هەڵبەت بەگەرمای دەستم کە پیاڵەکەییم پێ گرتبوو. چاوی بەمن کەوت، ئەودەم کە حەیام قووت دابوو زەق چاوم تێبڕیبوو. ئەوەندە لەمن دوور نەبوو کە هەست نەکەم هەرگیز کەسێکم تا ئەو ڕادەیە لەخۆم نیزیک‌تر نەدیوە. نازانم بۆچ ماوەیەک بوو زەمان بۆ من ڕاوەستابوو، نە کەسێکم لە شەقامدا دەدیت و نە هەستم بە هیچ شتێک دەکرد. تەنیا ئەوەم دەدیت کە داگەڕابووە خوارێ و نەرم و نیان هەنگاوی هەڵدێناوە. من هەروا کش‌ومات لە جێی خۆم مابوومەوە. بەڵام چاوەکانم بەبێ من وەدوای کەوتبوون. وەخۆ هاتمەوە بە خۆم کوت: «هیچ کام لەوشوێنانەی لە دوێنێڕا تا ئیمڕۆ چاوم پێی کەوتووە بێ حیکمەت نییە. تا دەگاتە سەری ئەو کۆڵانەی بەرانبەرم لەجێی خۆم نابزووم، ئەگەر هات و ئاوڕی لێدامەوە ئێستا ڕستەکەم لە دڵمدا تەواو نەکردبوو کەئاوڕێکی لێدامەوە. بە پێچەوانەی مامۆستا حەسەن زیرەک من هەر لێی نەپاڕامەوە. هەرچەندە « ئەو ئاوڕەی لێیدامەوە کەوتم هەڵنەستامەوە» وەسەر شک گەڕام. بڵێی من بەهەڵە نەچووبێتم ڕەنگە لە کەسێکی‌تری ئاوڕ دابێتەوە. من لە خۆڕا دڵی خۆم خۆش کردووە. بەڵام نا وا بیر نەکەمەوە باشترە. وا چاکە چاوەڕوانی ئاوڕێکی تری بم. دەگاتە سەری کۆڵانەکە لەپڕ سەر لەنوێ ڕاوەستا، لە دووڕا ڕاست بە چاو ئەنگاوتمی، نەمدەزانی دەبێ لەودەمەدا چ بکەم. ئەگەر دنیای ئەودەم وەک ئیمڕۆ بایە لە زاراوەیەکی ئێستایی کەڵکم وەردەگرت و دەمکوت هەنگم کردبوو. بۆ هەڵاتن

لە دەست ئەم وەزعەی تووشی هاتبووم. وەشوێنی کەوتم، لە ڕاستیدا ئەودەم نەمدەزانی چم لێی دەویست، کیژۆڵەیەکی منداڵکارە، بە هەڵکەوت ڕۆژێک بە ناحەق قسەیەکی ناخۆشت پێدەڵێ، دەیکوا ئەوە بەوە دەشێ کە وەها پێی هەڵبتەکێی کە خۆت نەناسییەوە، قەرە بە قەرەی دەڕۆیشتم، سەد ڕستەی جوانی شاعیرانەم دروست کرد. بە کەیفم نەبوون. لە ئاوەڕۆکەی قەراغ شەقامم داویشتن.

: «جوانێ گیان! بۆ وا هێندە بە خۆت دەنازی؟»

: «چاو جوان! پێم دەڵێی ناوت چییە؟»

: «کچی چاک! هیچ دەزانی لە فریشتەکانی ئاسمان جوانتری»

: «کچێ! مەهێڵە گوڵ بتبینێ دەنا بەخۆیدا دەشکێتەوە»

هەرکە نەختێک لێی نیزیک دەبوومەوە دەست و پێم لێ تێکەڵ دەبوو، زمانم لە گۆ دەچوو، کاڵەم دەدڕا و چم پێ نەدەما. لەپڕ لەبەر درگای ماڵێک ڕاوەستا، سەری خستە خوار و لەبنەوە بە سیلەی چاو دەیڕوانییە من کە بزانێ هەر بە دوویەوەم؟ منیش لەبەر درگای دووکانێک ڕاوەستام. بەچەشنێکی ئەوم لە ژێر چاوەدێری دابێ. نەمدەزانی بۆچی وەدووی کەوتووم. چونکە نەمدەزانی دەبێ چی پێ بڵێم. ئەو قسانەی لە سەرەوە دەمگوت تەنیا بۆ کورت کردنەوەی زمان بوو ئەگینا نەمدەوێرا یەکیشیانی پێ بڵێم. ئەی ئەگەر هات و لەپڕ جنێوێکی پێدام لەت و کوتە شکاوەکانی خۆم چلۆن کۆ کردبایە و چلۆنم خستبایەوە سەریەک و چلۆنم کردباوە بە خۆم و چلۆنم وەڕێ خستباوە؟ دەی جا چۆنە پێی بڵێم ببوورە وەختو دەگرم، خانم گیان! ئەگەر لەیادتان مابێ، شەش مانگ لەمەوبەر کە لەگەڵ ئاواڵەکەت بە کۆڵانەکەی ئیمەدا تێدەپەرین لەپڕ هەلووکێک وەپشتی ئاواڵەکەت کەوت. کاری من نەبوو، خەتای کوڕە پوورەکەم بوو بەڵام تۆ ئەودەم بەمنت کوت «بێتەربییەت» لە بری ئەوەی بەو کەسە بڵێی کە هەلووکەکەی وەشاند. دەی ئەگەر هاتوو ئەو ڕووداوەی هەر لەبیر نەمابوو چی؟ شەش مانگ دەتوانێ زۆر شتی بێکەڵک و ئاسایی لەبیری مرۆڤ بسڕێتەوە. بەڵام خۆ ئەوە مەبەستێکی ئاسایی نەبوو. کەسێک بەبێ ئەوەی

تۆ تاوانێکت هەبووبێ بێتوو سووکایەتیت پێبکا. ئەرێ بەڕاستی کەسێک دەتوانێ یارمەتیم بدا و پێم بڵێ من بۆ شەش مانگە ئارام و قەرارم لێهەڵگیراوە.

نازێ دەڵێ: «تۆ بۆ لە کاتی قسە کردن‌دا سوور هەڵدەگەڕێی؟»

من خۆم نابینم کە سوور دەبم یان نا، بەڵام هەموو جارێ وەختە ئاور بگرم.

نازێ دەڵێ: «تۆ بۆ وا سەیر چاوم لێدەکەی ناتوانی قسەیەک بکەی؟»

ئاخر من پێی بڵێم «ئەودەم کە لە چاوی نازێ‌دا ون دەبووم. تەواوی ئەندامم لەجێی خۆیان نەدەمان، هەڵدەکشان بەرەوسەر، هەموو دەبوون بە چاو و یارمەتی چاومیان دەدا، زمانێکم بۆ نەدەماوە کە بگەڕێ.»

درگای ماڵەکە کراوە. ئاواڵەکەی هاتەدەر. بە یەکەوە وەڕێ کەوتن. بە بیانووی نیشان دانی کەسێکی خەیاڵی، ئاوڕیان لە دواوەداوە. شکم نەمابوو کە بێ و نەبێ منی نیشان داوە. لە مابەینی ئەوەی بگەڕێمەوە و یان هەروا بە دوایەوە بم، هەر ئەوم هەڵبژارد کە هەرکەسێکی تریش بایە هەر ئەوی هەڵدەبژارد. وەدوای کەوتمەوە. چ شتێک لەم کچەدا هەیە کە واز لەمن و لە سەرنجم ناهێنێ؟ هەڵبەت ئەوە پرسیاری ئەو دەمم نەبوو هی زۆر دواتر بوو، هەروا بەم لاو ئەولام دادەکێشێ. ڕوخساری یەک‌دەم لەبەر چاوم ون نابێ، دەتوانم بڵێم لە ماوەی ئەو شەش مانگەی ڕابردوودا هیچ کەسێک یان هیچ شتێک ئەوەندە منی بە خۆوە خەریک نەکردووە. نیگایەکی ئەوەندە ئاشنای هەیە. دەڵێی لە ڕابردوویەکی زۆر دوور و کەوناراوە ئێمە بە یەکەوە ژیاوین و بە یەکەوە گەورە بووین و سەرمان هەڵداوە. ناوێرم بپەڕمەوە ئەوبەر شەقام و لێی نیزیک ببمەوە. هەمیشە ترسێک منی گرمۆڵە کردووە و دە هەناوی‌دا حەشاری داوم، ترسی ئەوە کەنەکا بمتارێنێ. بمتۆرێنێ. نەیهەوێ بمدوێنێ. هەر لەبەر ئەو ترسە ناوێرم زۆر لێی نیزیک ببمەوە. دەترسم لەپڕ دەنگ هەڵێنێ.

:«ئەرێ هەتیوە بەڕەڵڵایە، چت لە گیانی من دەوێ؟ بۆ وازم لێی ناهێنی؟»

و ئەو کەسانەی کە لە دەوروبەری ئێمە نوقمی خەیاڵاتی خۆیانن لەپڕ ببنەوە بە خۆیان و ئاوڕمان لێبدەنەوە. لەوانەیە زۆریشیان من بناسن. بنەماڵەکەم بناسن. ئەودەم ئیتر من لە شەرمان دەبمە قەترەیەک ئاو و لە چارەڕەشی من لەوانەیە زەویش قوتم نەدا و هەموو ئەو کەسانەی ئاوڕیان لە من داوەتەوە دەتوانن کلۆڵی و سەرلێشێواوی قەترە ئاوێک کە زەویش بە هێندی ناگرێ و قوتی نادا بە چاوی خۆیان ببینن. کە وابوو من ناپەڕمەوە ئەو بەرشەقام و مەودای نێوان خۆم و خۆی کورت ناکەمەوە.

بەخۆم گوت: «ئەگەر مەبەستی من بووبێ. ئیشارەتێک، نیشانەیەک هەر بەڕێ دەکا.»

ئاواڵەکەی بە ئاشکرایی ئاوڕی لەمن داوە. وام لێک داوە کە ئەو پێی گوتووە چاوم لێبکا. جوانی بۆ چووبووم کەوابوو منی دیوە، وێدەچوو پێی ناخۆش نییە کەوەدوای کەوتووم کەوتمەوە بیری خەونەکەی شەوی پێشووم، ئاخۆ چەشنێک بانگهێشتن بوو لە لایەن ئەم کچە جوانەوە؟ ئەم خەونەم دەستی منی گرت و لە تەورێزڕا تا هەر ئێستا کە هیچ چارەیەکم نەماوە و دەبێ لە شەقام بپەڕمەوە کێشاومی. چونکە لەگەڵ ئاواڵەکەی ڕوویان لە کووچەیەکی کرد. منیش بە پەلە دەپەڕمەوە و بە دوایاندا خۆم بە کووچەکەدا کرد. چەند هەنگاوێک نەڕۆیبووم کە ئەوان گەڕانەوە بۆ لای شەقام، چم بەسەرهات بە تەواوی ناتوانم بەیانی بکەم. بە پەنام دا تێپەڕین. بە دژواری لەسەر پێیان ڕاوەستابووم. بە نیگاهێک ئەوەندە هێزەشی لێ ئەستاندم. بەڕاستی خودا دەست و دیواری هەر لەبەر وەها ڕۆژێک داوە بە مرۆڤ کە وەک من دەست بە دیوار بگرن تا نەکەونە سەر عەرزی. بەهەر گیانەڵڵایەک بوو نەمهێشت بەر ببمەوە، بەڵام لاقەکانم وەها دەلەرزین دەتگوت دەمبەنە بەر سێدارە.

هەرچی هەبوو و هەرچی نەبوو لە نیگاهی‌دا حەشار درابوو. شتێکی یەکجار سەیر بوو ئەمن پێم بەیان ناکرێ. بەڵام دەمتوانی هەستی پێبکەم، زۆر شەرمەزار بووم. لەبەر خۆمەوە کوتم: «با چی دیکە بە دوویاندا نەڕۆم.»

نەمتوانی، لە خۆم ڕا نەدەدیت. وەدوای نەکەومەوە، من کە تازە مردبووم. لە مردن نەدەترسام، پێویست بوو زیندوو ببمەوە. لە ودمی هەناسەی مەسیحێک دەگەڕام، لە زیندوو کەرەوەیەک دەگەڕام. چەند هەنگاو لەپێش من دەڕۆیشت و منی بە دوای خۆی دا دەکێشا، بەرەو چارەنووسێکی نادیار و تازە، منیش لە کووچەکە هاتمەوە دەر و کەوتمەوە شوێنیان. یەک، دووجاران ئاواڵەکەی ئاوڕی لێدامەوە دەمزانی کە هەر ئێستا پێی دەڵێ.

: «ئا، ئا، کچێ ئەوە هەر بەدوامانەوەیە!»

ئەودەم بە دڵی خۆم مزگێنی دا، دیاربوو بۆی گرینگ بوو کەهەر بە دوایانەوەم یان لام داوە. چوون دەکۆلانێکی ترەوە. لە ترسی گەڕانەوەی دووبارەیان و تەریق بوونەوەی دووبارەی من، هێندێکم سەبر کرد. دەترسام دیسان تاقیم بکەنەوە و ئەوجار دەستم بە دیوار ڕانەگا، ماوەیەک کە ڕاوەستام و دیتم نەهاتنەوە دەر، خۆم بە کووچەکە داکرد. ون ببوون. ئای خودایە چ هەڵەیەکی گەوجانەم کرد. جا تازە چۆنیان بدۆزمەوە. کوا تازە دەرفەتی وا باش بۆ من هەڵدەکەوێتەوە هەنگاوم توندتر کرد. نا، هەڵدەهاتم. زۆر توند هەڵدەهاتم، لەپڕ لە سەر پێچی کووچەکەی تر کە دەبوو لێی بهاڵێم. یەکجێ لەبەرچاوم شین بوون. من وە هەناسەبڕکە کەوتبووم و ئەوان شاگەشکەی پێکەنین کە کایەکەیان دەسکەوتی هەبوو. زۆر سەیر و ناخافلانە لە داویان کەوتم. هەرگیز تا ئەو ڕادەیە لە نیزیکەوە چاوم بە چاوی نەکەوتبوو.

تەنانەت دوێ شەو لە خەونەکەشمدا ئاوا لە نیزیکم نەدیتبوو، هەناسەم کەوتبووە ژمارە. تەنیا نیو میترێکمان مەودا هەبوو کە چاومان تێک ئاڵقا لە پڕ شێت بووم دەستم بە دیوار گرت، دەمزانی ئەم جارە هەر دەکەوم. خودایا چی دەبینم، بۆ خۆیەتی بۆ خۆیەتی، بۆ خۆی.

من گێژ و سەرلێشێواو هاوارم کرد «نازێ، نازێ، ئەوە تۆی؟»

***

# ٤٢

.....: «باقی دەزانی بیر لە چ دەکەمەوە؟»

باقی نەیدەزانی کەریم بیر لەچی دەکاتەوە.

: «بیر لەوە دەکەمەوە ئەگەر هات و ڕایان نەگرتین، ئەودەم ئێمە دەبێ چ بکەین؟ خۆ لەت لەتیش بکرێم ناگەڕێمەوە ماڵە خۆمان.»

باقی کە وەک کەریم بیری نەدەکردەوە. سەرکۆنەی کرد. «بۆ وا بیر دەکەیەوە. لەبەرچی لات وایە ڕامان ناگرن. ئەو جۆرەی تۆ دەتکوت شۆڕشێکی ئاوا گەورە و بەربڵاو، نیازی بە هەموو کەس هەیە. هیچ هەر نەبێ دەچین کەوشان جووت دەکەین کەوشی «مەلا» و میوانەکانیان، دەنا چایی دەگێڕین، کارێکیش هەر دەدەن بە ئێمە.»

بزەیەک لێوەکانی کەریمی کە وێک هاتبوون لێک کردەوە:«بەرخی بابم، ئەوە دەڵێی چی؟ کەوش جووتکردنی چی؟ ئەوە مەیدانی شەڕە، لات وایە ئێستا «مەلا» و سەرکردەکانی ئەوە لە دیوەخانێک دانیشتوون و خەریکی جۆرابێنن؟ بۆ ئەوە هاتووم کە بچمە ڕێزی پێشمەرگەکانەوە، پێم خۆشە چەک هەڵگرم. پێم خۆشە لەپەنای «مەلا» و شان بە شانی بەشەڕ بێم. نازانی بابم و بابت و ئاوەڵەکانیان چۆن باسی ئازایەتی «مەلا» دەکەن. دەڵێن هەرگیز لە ناو کوردان‌دا قارەمانێکی وا هەڵنەکەوتووە، دەڵێن عەسکەری عێڕاقی بە بیستنی ناوی مەلا مستەفا زراویان دەڕژێ، قسەی خۆمان بێ دەڵێن هەموو جارێ خۆشیان پیس دەکەن.»

: «دەی جا کەریم! ئەگەر وابێ هەرگیز ئیجازە نادەن ئێمە بچینە لای «مەلا»، خۆ منداڵ بازاڕی نییە. کەریم! تۆ زۆر کورتەڵەی. من دەترسم بەهۆی کورتی باڵای تۆ، بە منداڵمان بزانن و ڕامان نەگرن.»

: «باقی! ئەو قسە قۆڕانە چییە دەیکەی؟ شەڕکردن چی داوە بە قەدوباڵای ئینسان؟ تەنیا غیرەتی دەویٚ ئەمیش هەمە، زۆریشم هەیە، زۆرتریشم دەبیٚ، »

باقی کە زانی کەریم زۆر تووڕەیە کوتی:«باشە، باشە، کەریم بۆ وا تووڕە دەبی، ئەمن دەڵێم، جا ئەوان بەچی ڕا بزانن کە تۆ ئینسانێکی بەغیرەتی، خۆ لەنێوچاوانت هەڵنەکەندراوە؟»

: «وایە ئەم قسەیەت زۆر ڕاستە، بەڵام دەتوانم داوایان لێبکەم. تاقیم بکەنەوە. با ئەرکێکی یەکجار دژوارم پیٚ بسپێرن. ئەگەر سەرکەوتم و توانیم بە ئەنجامی بگەیەنم دیارە ئەودەم باوەڕیشم پێدێنن.»

: «دەڵێم کەریم! بۆ بەقسەی من ناکەی؟ وەرە لە جیاتی ئەوە کە خۆمان لە مەترسی باوێین، یەک سەر بچینە لای مامت. بەڵکوو یارمەتیمان بدا و کارێکمان بۆ بکا کە لە ڕێزی پێشمەرگەدا ڕامان بگرن.»

: «کوڕە باقی! ئەوە دەڵێی چی؟ بە خودای مامم لێرەم ببینیٚ دەمگریٚ و دەست و لاقم دەبەستێتەوە و دە تێڕێکم داویٚ و بە پشتی گوێدرێژیٚ ڕاست دەمباتەوە بەر دەرگای ماڵی خۆمان، هەڵبەت ئەگەر بە شەپان نەمکوژیٚ. ئامان باقی لە هیچ شوێنیٚ تازە نابیٚ ناوی مامم بهێنی.»

باقی دڵنیای کرد: «باشە کەریم ئەوا قەڵاقوپ! لەزمانی من کەسیٚ نابیسیٚ مامت کێیە و ئەتۆش چی مامتی. بەڵام کەریم! ئێستا ئێمە بەکویٚدا و چلۆن خۆمان بگەیەنینە لای «مەلا».

کەریم بە باقی دەسەلمێنیٚ کە هیچ چارەیەکی نییە. دەبیٚ باوەڕ بە گەورەیی خوا بێنیٚ چون گەورەیە و بە بەزە، ڕێگایەکی باشیان بۆ دەکێشیٚ، بەڵام ئەوانیش پێویستە لەم و لەو پرسیار بکەن تا ڕێگای خۆیان دەدۆزنەوە.

: «کەریم! وەک دەڵێن لێرەش نابیٚ لە خۆڕا متمانە بە هەرکەسێک بکەین. دەڵێن هێندێک خەڵک هەن هاوکاری دوژمنیان دەکەن. لێرە پێیان دەڵێن جاش ئەمن ڕۆژێکی گوێم لێبوو کابرایێک کە لەم دیوەڕا هاتبووە سەردەشت بە بابمی دەگوت. ئیمەش وا باشترە خۆمان ئاشکرا نەکەین. دەبیٚ درۆیەک

هەڵبەستین کە زوو باوەڕمان پێبکەن. دەبێ زۆر وریا بین کە وەچەنگ بەعسیان نەکەوین دەنا ئیتر کارمان تەواوە.»

مەلا برایم گوتی: «حاجی ئاغا! ئێستاش هەر لەسەر قسەی خۆمم! دەڵێم هیچ کارێکی باشتان نەکردووە ئەو دوو منداڵەت دە ئاورێ هاویشتووە. تۆ نازانی ئێستا لای ئێمە وەزع چەند شێواوە. چاوەڕوانی هەرچەشنە ڕووداوێکی نالەبار و نابەهەنگام دەکرێ. دوو منداڵی نابەڵەدی، ناشارەزا، لەنێو وەها ئاورێک هاویشتن لە جەنابتان ناوەشێتەوە. خۆ زۆریشم شێر و ڕێوی بۆ هێنانەوە کە پەیامەکەی تۆم بدەنێ. بە یەکێکی ئەمین‌دا بۆ کاک حەسەنی بەڕێ بکەم، ڕازی نەبوون و نەبوون. کەریم دەیکوت: «بابم ڕایسپاردووم بێتوو لەت لەتیشت بکەن، پەیامەکەی لە مامت بەدەر نەدەی بە دەس هیچ کەسێک. یەکجار کوڕێکی بەدڵ و جەرگم هاتە بەرچاو. بەڵام حاجی ئاغا ئەم جۆرە کارانە لەقەدەر قەلافەت و ئەندازەی ئەو نییە. دەبوو کەسێکی‌ترت ناردبایە. بە هەرحال خۆتان باشتر دەزانن من ئەمرەکەت لەسەر چاوم دادەنێم. دڵنیا بە بەرلەوەی کارەکانی خۆم بە ئەنجام بگەیەنم. نامەکەی جەنابت دەدەمە دەست کاک حەسەن. ئێستاش ئەگەر ئەمرێکی ترت نییە ئیزنتان لێ دەخوازم. خودا ئاگادارتان بێ.»

حاجی محەممەد، مەلا برایمی بەڕێ کرد و لە دڵە خۆی‌دا دەستی کرد بە دوعا کردن. تەواوی ڕووداوەکەی بۆ حەسەن نووسیبوو بە دەر لەو بەشە کە خۆی وحاجی‌ژن چەندە ئەو منداڵە بێ گوناحەیان ئازار داوە، بۆی نووسیبوو لە ماڵ ڕای کردووە و باوەڕ بە هیچ قسەیەکی نەکا. ئەوەی بیڵێ درۆیە و خۆی هەڵیبەستووە و هەروەها باقی کوڕی کاک قادری خەیاتی فریو داوە و لەگەڵ خۆی بردوویەتی. دایک و بابی ئەو کوڕە لە چاوی ئەوانی دەزانن. ئێستاش بە هەر شێوەیەک بێ دەبێ بیاندۆزێتەوە و بەڕێیان بکاتەوە ئەو دیو سنوور و هەروەها بۆی نووسیبوو کەڕاستیەکەی بە مەلا برایم نەکوتووە، پێی عەیب بووە کە بڵێ کوڕەکەی ڕای کردووە، بە مەلا برایمی کوتبوو کە بۆخۆم کەریمم بەڕێ کردۆتە لای مامی تا پەیامێکی نهێنی بۆی بەرێ، داوای لێکردبوو لە لای مەلا برایم وە درۆی نەخاتەوە.

بەر لەوەی مەلا برایم بچێتە سەردەشتێ، کەریم و باقی لەگەڵ خۆی تا قەڵادزێ بردبوو و بە ئاشنایەکی خۆی ئەسپاردبوون، ڕایسپارد تا گەڕانەوەی لە سەردەشتێ هەر لەو ماڵەدا بمێننەوە، تا لە پاش گەڕانەوەی بۆخۆی بیانباتە لای مامی کەریم. بەڵام ئەمە ئەو شتە نەبوو کە بە دڵی کەریم بێ. چونکە نەیدەویست مامی ئاگاداری هاتنی بێ بە ناچار خۆیان لەو ماڵە دەرباز کرد و پرسیار بە پرسیار وەڕێ کەوتن، ئەو جۆرەی پرسیبوویان، ئەگەر وەشوێن وڵامی پرسیارەکەیان کەوتبان دەبوو بەرەو ناوچەی بارزان بچن. هیچ ئاگاداری ڕێگا و بان نەبوون. تەنانەت نەیدەزانی دەبێ چەندە بڕۆن تا دەگەنە ناوچەی بارزان، لایان وابوو دەبێ مەودای قەلادزێ هەتا ناوچەی بارزان هەر بە قەرا مەودای سەردەشت و ڕەبەت بێ. شەڕ و کێشە و پێکدادان لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان بەردەوام بوو. لەهەر لایەک دەنگی چەکی قورس و گرمەی تۆپ و تانک بەرز بوو. ئاسمان ساتێک لە دەنگی فڕۆکە و هیلیکۆپتر کە دایم و دەرهەم بارانی ئاگر و گوللەیان بەسەر دار و بەرد و دەشت و دەوەن و گیاندار و بێ گیان دادەکرد ڕزگاری نەدەهات. لە وەها بارودۆخێکی ئەستەم دا کەریم و باقی ماوەیەکی زۆر بوو ناشارەزایانە ڕێگەیان دەبڕی. لەڕاستیدا نەیدەزانی ڕوویان لە کوێیە. برسێتی و توونیەتی وەهای شاڵاوی بۆ هێنابوون کە لە زمان و لە پێی خستبوون، شاخێکی زۆر هەڵەمووت و ئەستەم پێش ڕێگەی لێگرتبوون. هیچ چارەیەکیان نەمابوو، یان دەبوو بەو ڕێگایەیدا کە هاتبوون بگەڕێنەوە شوێنی خۆیان کە بەو ماندوویەتی و شەکەتی و برسیایەتی کە ئەو ڕێگا دوورو درێژەیان بڕیبوو مەحال بوو و یان بە ناچار دەبوو بە شاخەکەدا هەڵگەڕێن. بەڵام ئەوەندە لەپێ کەوتبوون کە هێزی جووڵانەوەشیان نەبوو. لەبەر نیسێی تاوێرە بەردێک دانیشتن، تا وچانێک بدەن. هیچ کامیان هێزی قسە کردنیان نەبوو. باقی چاوی پڕ بوو لە ئاو: «کەریم! هیچ دەزانی هەست دەکەم لێرە دەمرم. تازە هیچ کەس بە هاوارمان ناگا.»

: «باقی! ئەوە دەڵێی چی؟ خۆ تۆ پیاوی پێت لەم ڕێگایە ناوە، ورە بەرمەدە. لەبیرت چۆتەوە بۆچی هاتووین؟ مەگین نەماندەزانی کە پێشمەرگایەتی ئەرکێکی هێندە سووک و سانا نییە؟ مەگین پێکەوە بڕیارمان نەدا کە گیانی خۆمان پێشکەشی ئەم خەباتە بکەین؟ بۆ وا وەک پیاوی خوێڕی و ترسەنۆک قسان دەکەی. دەزانم تۆ هەم برسی و هەم توونی و هەم ماندووی بۆیە ئەم قسەیەی دەکەی. خۆت مەدۆڕێنە خودا ئەگەر مەیلی لەسەر با کە ئێمە بمرین هەر لە سەر سنوور بەو هەموو گوللەیەی دەباڵیان کردین دەمردین، کەوابوو مەترسە. دڵنیام هیچت لێ نایە. با هێندێک هەتاو بێ هێزتر بێ. هێدی هێدی لەو کێوە ئاوا دەبین. دە دڵم چەقیوە هەر لەو شاخەی بەردەممان ئاوا بین تووشی ئاواییەک دەبین. دەزانم هەرکە توونیایەتیمان شکا و پارووە نانێکمان خوارد. هەموو ئەم ناخۆشییانەمان لەبیر دەچێتەوە.»

باقی گوتی: «کەریم! خۆ ئەمن ناترسم، خەمی خۆشم نییە، زگم بە دایکم دەسووتێ. تاقە کوڕێکی هەیە، نازانی چەندە خۆشی دەویستم. دەزانم لە تاوی من شەوڕۆژ خەریکە دەگری و دەناڵێنێ.»

: «باقی! ئەو قسانە وەلانێ، چونکە هێز و تاقەتت کەم دەکاتەوە. با دوو ڕۆژی دیکە شۆڕش سەر بکەوێ. ئەودەم دایک و بابت شانازیت پێ دەکەن، بەخۆیان دەخوڕن کە کوڕی وەک تۆیان هەیە. ئەودەم خۆت ببینە چۆن خەڵک دێنە پێشوازیت. جا هەر ئەودەم دایکت ببینە چلۆنت پێ هەڵدەڵێ.»

باقی دەگریا و قسەی بۆ نەدەهات بەدەم گریانەوە گوتی:«کەریم جا من و تۆ زۆرمان فەرق هەیە، دایکی تۆ هەموو ڕۆژێ تێروپڕ دەیکوتای حەقت بوو لە دەستیان ڕابکەی بەڵام دایکی من شەوێک لە ماڵ نەبام خەوی لێنەدەکەوت.»

: «باقی! پێت وانەبێ من لەبەر لێدان هەڵاتووم. نا، تۆ بە هەڵە چووی من تەنیا و تەنیا لەبەر مەلا مستەفا هاتووم. مەگین چەندم بە تۆ گوت وەدوام مەکەوە. پێم نەکوتی جارێ ئەتۆ منداڵی، ئەم کارە دژوارانەت لێ ناوەشێتەوە. مەگین پێم نەکوتی ئەم کارە مەترسی زۆرە، لەوانەیە بکوژرێین.

تۆ گوتت کەریم! من هەرگیز بەجێت ناهێڵم. حازرم، لەگەڵت دێم جا چ بکوژرێن و چ نەکوژرێن هەر دەبین بە قارەمان.»

باقی زاری کردەوە وڵامی کەریم بداتەوە لەپڕ دەنگێکی بەسامی پڕ بە دۆڵەکە هەڵیبەزاندنەوە.

: «لەجێی خۆتان مەبزوون. بڵێ بزانم ئێوە کێن و لێرە چ دەکەن؟ هەستنە سەرپێ. هەرچی بە دەستانەوەیە داینێنە سەر عەرزی. دەستتان لەسەر تەپڵی سەرتان دابنێن. هەستن وەرنە دەر. لەبیرتان بێ بێتوو بە ئاستەم پەل ببزێون، تازە نانی زیندووان ناخۆن.»

کەریم و باقی دەستیان خستە سەرسەریان و بەبێ هێزی لەبن بەردەکە وەدەرکەوتن هەمان دەنگ دەنگیدانەوە: «ڕاست داگەڕین بەرەو خوار.»

لە پڕ دەنگەکە هاواری کردەوە: « خۆتان بخەنە سەر عەرزی و بە هەرتک دەستان سەرتان بگرن، سەرتان لە زەوی بەرز نەکەنەوە. هەر لەودەمەدا دەنگی گرمەیەک دۆڵ و کێوی وەلەرزە خست. چی نەمابوو کەڕ بن. بەدوای‌دا دەنگی گوللە و گرمە و خرمە گوێی ئاسمانی کەڕ کرد، باقی بە دەنگ و سەڵا دەگریا، هەمان دەنگ وەخۆی هێنانەوە: «گوێتان لێبێ لەگەڵ هەرتکتانمە. بەبێ ئەوەی بە قەرا سەرە موویەک لە زەوی جیا ببنەوە. بە سینگە خشکە داگەڕێنە ئەو تەنیشتەی، کوڕە هەر سەرتان هەڵێنن ئیتر کارتان کراوە.»

هات وهاوار و جنێو و تەقە و گرمە جەهەندمێکیان ساز کردبوو کە بۆ ماوەیەکی کەریم و باقی لە جیهانی ترس و دڵە ڕاوەکەدا ون کرد. کە وەخۆ هاتنەوە ئەوە باقی بوو بە کەریمی دەکوت: «کەریم! هەموو خەتای تۆ بوو ئەمنت لەو جەهەندەمەی هاویشت بە خودای دەزانم تازە هەرگیز نەجاتیمان نابێ.»

کەریم لێی تووڕە بوو: «کوڕە! شەرمێ بکە. بۆ وادەکەی. خۆ چ نەقەوماوە جارێ ددان بە جەرگت داگرە و دوعایە بکە.

❊❊❊

## ٤٣

..... هۆی نازێ، نازێ، نازێ هۆی نازێ، گەردن قازێ
هۆی نازی نازا مەکە مالا من خرا مەکە

بووک نازێ ژنی غەفوورەگێڕ بوو، هەر ئەو غەفوورەگێڕەی پێشتر ئامینەشەل ژنی بوو. ئەوەی لە نێوان ئەو غەفوورەگێڕە و ئامینە شەل دا هات و ڕابرد خۆی. ڕیوایەتێکی زستان بەرە. ئەوەی لەم ڕیوایەتەدا کەس نییە نەیزانێ، ئەوەیە کە دەڵێن ئەسەد لە دۆزینەوەی ژنی جوان و فریودانیان‌دا وەستایەکی کارامە و بێ وێنە بوو، دەڵێن جگە گورگیش لە بەرانبەر سیحری دەمی غەفوورەگێڕ بە خۆی‌دا دەشکاوە. کەدەستی دەکرد بە پاڕانەوە و بە قوربان و سەدەقەبوون، بەردیشی نەرم دەکرد. دەڵێن پێش ئامینە شەل دوو ژنی یەکجار جوانی تری هەبوو. لە قسان لاقی لەسەر یەکێک لەو دوو ژنە گێڕبووە، بەڵام خودا هەڵناگرێ غەفوورەگێڕ دەتگوت ژنی بۆ خەڵکی‌تر دێنێ، ئامین کە بە نەسیبی هەمزاغا ببوو، دوو ژنەکانی پێشووشی کە گوایا لە جوانی و ڕێکوتەرز و لەباری‌دا بێ وێنە بوون ئاخری لە لای دانەنیشتن و هەرکام فڕینە سەربانێکی‌تر. ئەو جۆرەی دەگێڕنەوە ئەو دوو ژنەی پێش ئامینە شەل ئەوەندە جوان بوون کە دەڵێن ئەگەر زوو لە داوی غەفوورەگێڕی نەکەوتبایەن، بێ‌گومان دەبوونە ژنی شازادان. ئەسەد کە لە کەینەوبەینەی ئامین و هەمزاغا گەیی، کەس نازانێ چ بەڵایەکی بەسەر ئامین هێنابوو کە بۆ هەمیشە شەل بوو – شەل بوون تەنیا ئەوەنییە کە لاقت وەک لاقی مرۆڤی تر ناچێ. یان جوان و لەبار نابی، یان چەت دەرەوتت دەکەوێ. شەل بوون یانی لە عومر و ژیانت کەم بوونەوە. یانی سەبرتر لە ڕابردووت دەڕوێ، دەجا زەمانێکی زۆرتری عومرت دەبێ

ده ڕێگا دابێ و چون له لای ئێمه له ڕێگا دابوون یانی خه‌سارکردنی عومر، ده‌ی مرۆڤی شه‌ل که ده‌بێ زۆرتر له‌ڕێگا دابێ زۆرتر عومر خه‌سار ده‌کا. زۆر عومر خه‌سارکردن یانی ته‌مه‌ن کورت بوونه‌وه ده‌جا غه‌فووره‌گێڕ که لاقی ئامینی شه‌ل کرد به‌ر له هه‌رشت له عومری وی که‌م کرده‌وه. غه‌فووره‌گێڕ خه‌ڵکی سووره‌چۆم نه‌بوو. له ڕاستی‌دا، هیچ که‌س نه‌یده‌زانی خه‌ڵکی کوێ بووه؟ بۆ خۆشی نه‌یده‌زانی له کوێ هه‌ڵقوڵیوه. که‌م تا کورتێک سه‌ری له‌جێ هێنانه‌وه‌ی ئێسکی له‌جێ ده‌رچوو و شکاو ده‌رده‌چوو. به‌سه‌رقه‌ڵه‌مانه‌ی خه‌ڵکی ده‌ژیا. هه‌روه‌ک شاعیر ده‌یگوت:

ده‌ستم به دۆعایه خه‌ڵکی بمرن      تا نانێ بخۆم له تازیه‌داری

ئه‌سه‌دیش شه‌وڕۆژ دۆعای ئه‌وه بوو خه‌ڵک له‌سه‌ر دار و بان و دیوار و شاخ و ڕاسته ڕێگاش به‌رببنه‌وه وه‌یان وه‌به‌ر لوشکی گوێدرێژ و ئێستر و ئه‌سپ بکه‌ون، ئه‌ی به‌ڵکوو نانی ڕۆژانه‌ی بگا. خوداش هه‌ڵناگرێ له‌هه‌ر سێ، چوار ده‌ست و لاقێکی هه‌ڵیده‌به‌سته‌وه یه‌ک یا دوان خۆی ده‌گرته‌وه، ده‌نا به‌ڵایه‌کی وه‌های به‌سه‌ر دێنان تازه به دوکتوره‌کانی شاریش چاریان نه‌ده‌کرا، شتێکی تریش که ده‌توانم بڵێم که که‌س نایزانێ ئه‌وه‌یه که له که‌س دیار و عه‌یان نییه له‌سه‌ر ئه‌و هه‌موو خوازبێنی چاک و باشه‌ی ئامین هه‌یبوو بۆ دایکی به زۆری دای به ئه‌سه‌د، وا وێده‌چێ ئه‌وجاره‌یان نوشته‌ی غه‌فووره‌گێڕی له‌سه‌ر دایکی ئامینی کاری کردووه. به‌هه‌ر حاڵ هه‌رچی هه‌یه دوای ئه‌و به‌ڵایه‌ی ئامین و هه‌مزاغا به‌سه‌ر ئه‌ویان هێنا و ئه‌و به‌ڵایه‌ی ئه‌سه‌د به‌سه‌ر ئامینی هێنا. که هه‌ڵات له سه‌رده‌شتێ گیرساوه و نازێی وه‌گیر که‌وت. هه‌رکه ئه‌سه‌د هێنای نێوبانگی به بووک نازێ ده‌رچوو. ئه‌وشته‌ی که بێ گومان لێی دڵنیام ئه‌وه‌یه ئه‌گه‌ر په‌یکه‌ر تاشه‌که‌ی ڤێنووسی داتاشی چاوی به بووک نازێ بکه‌وتبایه، په‌شیمان ده‌بۆوه له‌و ڕه‌نجه‌ی به خۆڕایی کێشاویێتی و وه‌ک ڕۆژی ڕووناک لێم عه‌یانه ئه‌گه‌ر میکێڵانژ بووک نازێی بدیتبایه له حالێکدا، گۆزه‌ی ئاوی له‌سه‌ر شان داناوه، ئێمرۆ له جیهانی هونه‌ردا بێ‌گومان که‌س نه‌بوو په‌یکه‌رێک به‌نێوی بووک نازێ

نەناسیٚ و گومان نابەم لە پەیکەرەکەی مووسا ناودارتر نەبوایە و هەروەها دەتوانم بە ڕاشکاوی بڵێم لەوانە بوو فرۆید و یۆنگ و ئادلێر و کاڕن هۆڕنای و دەیان دەروون ناسی‌تر سەدان لێکدانەوەیان لەسەری هەبوایە و لەسەر کارتێکردنی جوانیی بووک نازیٚ لەسەر شاکارەکانی میکێڵانژ و گریمانە ڕووحییەکانی بابەتی تێروتەسەلیان بڵاو کردبآوە، هەروەک ئەو کارەی فرۆید لە سەر لیئۆناردۆداوینچی و کارەکانی بەتایبەت مۆنالیزاکەی نووسی.

جا کەوابوو خۆتان قازی بن، بزانن جیرانەکانی بووک نازیٚ کە یەکیان ئێمە بووین بەتایبەت بابم دەبیٚ بە دیتنی هەرجارەی بووک نازیٚ چی بەسەر هاتبیٚ لەکاتێکدا دەستیشی بە هیچ کویٚ ڕانەدەگەیی.

تازە ببوومە پۆلی سیٚ. هەمیشە پێم خۆش بوو لە بابم نیزیک ببام، هەستم بە ئارامی دەکرد. کە لە پەنای دادەنیشتم یان دەست دەنێو دەستی دەگرتم، هەرچەند قەت بۆم نەلوا کە ئارام بگرم. بابەکان دیارە بەپێی سوننەتێکی نەگوتراوی نەنووسراو، مافی ئەوەیان نەبوو زۆر ڕوو بدەن بە منداڵەکانیان، ئەوە من دەڵێم زۆر، ئەگینا نەیاندەتوانی کەمیشیان ڕوو بدەنیٚ. کەم نەبوون ئەو بابانەی کە لایان شوورەیی بوو منداڵی خۆیان لە باوەش بگرن. یان ماچی بکەن. بە تایبەت لەبەر چاوی خەڵکی تر. ئیتر قەباحەت بوو، هەستیان بە سووکبوون دەکرد. منیش کە بە دەست خۆم نەبوو، ئەوەندەم بابم خۆش دەویست کە هەمیشە لیی نیزیک دەبوومەوە، بابم هەمیشە لەو وەتاغەی‌دا دانیشت کە پەنجەرەکەی ڕوو بە پەنجەرەی ماڵە غەفوورەگێڕی بوو. هەڵبەت هەر من دەڵێم ماڵە غەفوورەگێڕی، ئەگینا ئەودەم لە منداڵی سەرلانکەشت پرسیبا، پرسیاری لێدەکردییەوە، کوێت دەویٚ؟ ماڵە بووک نازێت دەویٚ؟ و بیٚ شک تۆش ئەوێت دەویست.

گوتم: پەنجەرەی ماڵە بووک نازیٚ و پەنجەرەی ماڵە ئێمە یان واباشترە بڵێم پەنجەرەی دیوە تایبەتیەکەی بابم زەق چاویان تێک بڕیبوو. پەنجەرەی ماڵی ئەوان هیچ شتێکی بەنێوی پەردە پێوە نەبوو. هەر ئەو شتە ئاسایی‌یە دایکمی هان دەدا سەدان‌جار گەردنە بڵێند و جوانەکەی بووک نازیٚ بە

شکان‌بدا. ئەویش بەدەس کێ، بەدەس ئەڕحەمەڕاحەمینی کە بۆخۆی بووک نازێی خەڵق کردبوو و هەر بۆخۆشی فەرمووبووی «فەتەبارەکەڵڵاهوو ئەحسەنەلخالقین» بەڵام دایکم کە ژنێکی بەزیبکوزاکوون بوو بۆ قەرەبووکردنەوەی کەمتەرخەمی بووک نازێ لە جیاتی پەردە، لە وەتاغەکەی بابمدا بەڕەیەکی ئەستووری هەڵاوەسیبوو. دەیکوت ئەوە یادگاری خاڵمە تا دەچینەوە سابلاغێ ڕایناخەم لێم عەدم دەبێ. هەڵبەت ئەوەش بڵێم کە ئەو بەنێو پەردەیە تا ئەو کاتەی هەڵاوەسرابوو کە بابم لە ماڵ بایە، ئەگینا هەرکە بابم لە سووچی کۆڵان ئاوا دەبوو دایکم بە پەلە بەڕەکەی لێدەکردەوە و لوولەی دەکرد و لە سووچێکی ژوورەکە هەڵیدەپەسارد. هەتا بابی بەستەزمانم لەماڵ دەبوو، ماڵێکی تاریک و تنووکمان هەبوو، بەڵام کە بابم لەماڵ نەدەبوو، تازە ئەودەم هەتاو بە هەموو جەستە و گەرما و ڕووناکی خۆیەوە بە بێ شەرمی خۆی لە ژوورێ دەخزاند. بابم دەستووری دابوو – ئەڵبەت من دەڵێم دەستوور!! ڕەنگە لەبەر ئێمە منداڵەکان بڕیاری نێوان خۆیان بووبێ دەنا با هەر لێی گەڕێم!!– کە دۆشەگەڵەیەکی لەپەنای پەنجەرە بۆ ڕابخەن، دووسەنیری[٥٦] گەورەش کە باسکی ماندووی باوێتە سەریان تا بە خەیاڵی خۆی و دایکم بحەسێتەوە. کەدەهاتەوە هەمیشە یەکەم قسەی ئەوە بوو:

: «ئافرەت خۆ ئەورۆ منداڵەکان بەدفەڕیان نەکردووە؟»

دایکیشم بەپێی ئەوەی بە وتەی خۆی زۆری کار کردبێ کە هەرگیز زۆری کار نەدەکرد، یان کەمی کار کردبایە کە هەمیشەش کەمی کار دەکرد چون لە چێشت لێنان بەدەر ئەوەی کاری تری نێو ماڵ بایە کڵفەت و قەرەواش و کچی دەروجیرانان یا ئەو خزم و کەسەی بۆ سەردان دەهاتنە لامان دەیانکرد. ئێمەی منداڵی یان بە لێدان یان بە جنێودان یان بە هەڕەشە دەدا. هەر لەبەر ئەوەش بوو هەمیشە نیو ساعەت بەر لەوەی بابمان بێتەوە

---

٥٦- سەنیر: سەرین.

من و خوشک و براکانمان وەک سەفحەی خراپی گڕامافۆن یەکبین دووپاتمان دەکردەوە.

: «دایە! ئەوڕۆ کوڕی چاک بووم؟»

: «دایە! ئەوڕۆ کچی چاک بووم؟»

: «دایە! ئەوڕۆ خۆ ئەزییەتم نەکردووی؟»

: «دایە! دایە دانم بۆ مریشکەکانیش ڕۆ کرد.»

: «دایە! حەساریٚ ئاوپڕژێن بکەم؟»

: «دایە! چی دیکەت ئاو ناویٚ بۆت لە چاڵاویٚ هەڵێنجم؟»

ئەم ڕستانە هەموو ڕۆژیٚ و پەیتا پەیتا دووپات دەبوونەوە. زۆرجار لە کاتی دووپات کردنەوەی هێند بە پەلە دەمانکوتن کەلێمان تێک دەچوون.

: «دایە! دایە! بچم دانت بۆ لە چاڵاویٚ هەڵێنجم؟»

: «دایە! بچم لە حەساریٚ مریشکەکان ئاوپڕژێن بکەم؟» هەرچەند بە بیستنی ئەم هەڵە زمانیانە وەخت بوو بمرین لەبەر پێکەنین بەڵام لە ترسی مردنی ڕاستەقینە بەدەس دایک و بابمان نەماندەوێرا بەزار پێبکەنین و دەمانگۆیزتەوە نێو چاومان و هەر چاومان لێک دەکرد و بزەبزی چاومان بوو. بەڵام لەولاش دایە هەرگیز گوێی بەم قسانە نەدەبزووت. هەر بۆیە ئێمە دەبوو هەمیشە ترسی گورگیمان لەدڵ دابا، هەر ڕۆژەی چ باش باین و چ باش نەباین. یەک دوو کەسمان نۆرەی بوو.

: «ئاخ، ئاخ کوڕەکە! نازانی لەدەست ئەو سەرزلە زەلامە نێرەکەرە — ئەوە منی دەکوت- چ دەکێشم، دەردی سەگانم دەداتی.» نەمدەزانی سەگ چ دەردێک دەدا بە یەکی وەکوو دایکم بەڵام ئەوەی من بە قسەم نەکردبوو ئەوە بوو چونکە پاشنوێژیٚ لە مەدرەسەی نەزافەتمان[٥٧] هەبوو و دەستمان پیس بایە ئاغای «قاف» هەر بە زیندوویی دەیخواردین، بەقسەم نەکردبوو پڵیتەی فانووسەکە کە کەوتبوو نێو نەفتەکە دەرم نەهێنابۆوە و چاکم نەکردبۆوە ئاخر ڕاستە ئەودەم منداڵ بووم بەڵام ئەوەندم هەر دەزانی کە

---

٥٧- نەزافەت: خاوێن کردنەوە. پاك و خاوێنی.

هەزار لێدانی بابم وەک لێدانێکی ئاغای «قاف» نابێ هەر بۆ ئەوەی زۆرترم بە لێدان بدا درێژەی پێدەدا.

: «دەڵێم سەر زل ڕاوەستە با بابت بێتەوە. پێی دەڵێم چت بە قسە نەکردووم، کەچی زارم لێ خێچ و خوار دەکاتەوە. بەخودای وەختە لە دەستانی سەروەکێوان بنێم، یان دەبێ چاک چاکی عاقڵ بکەی یان لەو ماڵەیدا نامێنمەوە.»

ئەوەی زۆرتر لە هەمووومانی وێدەکەوت، برا چکۆلەکەم بوو. بەستەزمانە ئەوەندی لە خۆڕا وێکەوتبوو کە بەتەواوی خارابوو. ئەگەر ڕۆژێک بە هەڵکەوت وێی نەکەوتبا بە ڕاستی نەخۆش دەکەوت! ئەم شانۆیە هیچ ڕۆژێ نەبوو سەری ساعەتی یەکی نیوەڕۆیە کە بابم پێی لە ماڵێ دەناوە بەڕێوە نەچێ، بێجگە لە ڕۆژی هەینی کە شانۆکە ساعەتێک زووتر بەڕێوە دەچوو چونکە ڕۆژی پشوودان بوو و بابم ساعەتێک زووتر لە ڕۆژان دەهاتەوە ئەڵبەت ئێستا پێی گەیشتووم زۆرتر لەبەر بووک نازێ بوو، کە جومعانە حەمامی دەکرد و بە کراسە زەردەکەی یەک پشوو لەبەر شێرە ئاوە گشتییەکەی بەردەرگایان ڕادەوەستا. هەوەڵ کاری بابم کەهەرگیز نەبوو جارێک لەبیری کا ئەوە بوو دەچوو لەسەر تاقەی ژوورێ دیوانە شێعرێکی هەڵدەگرت جا چ نالی بابە چ مەحوی چ ناری بابە یان میسباحوددیوانی ئەدەب یان دیوانەکەی وەفایی کە سەییدیان چاپی کردبوو، هەر لەوێڕا دەیهاویشتە سەر دۆشەگەڵەکەی و دەچوو بۆ لای پەردەی ژوورەکە، ئەگەر دەربیجە چکۆڵەکەی لای چەپی وەتاغەکە نەبوایە ژوورەکەی بابم دەبوو بە شەوی تاریک و هەر جارە بابم بەدزی گۆشەیەکی لەو بەنێو پەردەیەی بەدەستەوە دەگرت و ئاوڕی دەداوە تا بزانێ دایکم لێی نیزیکە یان دوورە، بۆ تاقیکردنەوەی مەودای نێوان خۆی و ئەو هەر لەوێڕا هەرای دەکرد: «ئافرەت ئەرێ وەک بەیانی پێم ڕاسپاردی فرووجاوێکت بۆ لێناوم؟» و لە ڕووی دووری و نێزیکی دەنگی دایکم ڕا دەیزانی دەتوانێ پەردەکەی زۆر وەلا بدا یان کەم. خۆی و شانسی و خۆمان و شانسمان، ئەگەر بووک نازێ لەبەر پەنجەرە بوایە، ئێمەی منداڵ بەهەر سووچ و تاوانێک و بێ

تەربییەتیەکی کە کردبوومان یەکجێ دەبەخشراین، ئەگینا بووک نازێ لەبەر پەنجەرە نەبوایە قیژە و هاوارمان ڕێی ڕۆژێک دەڕۆیی، چاک چاک دارکاریی دەکردین. کاری دووهەمی بابم هەمیشە ئەوە بوو کە جلوبەرگەکەی بە جوانی و بە وەسواسێکی تایبەتی دادەکەند و ماهووتماڵی پێدا دەکێشان و بەڕێکوپێکی هەڵیداوەسین. من بە عومری خۆم وەبیرم نایە شەقی ئوتووی شەڵواری بابم شکابێ یان زەڕڕەیەک تۆزوخۆڵ یان چڵک و چەپەر بە لیباسەکانییەوە بێ. ئینجا دەچوو لەسەر جێگای تایبەتی خۆی دادەنیشت و دیوانە شێعرەکەی بەدەستەوە دەگرت. خۆ ئەودەمی ئاگاداری ئەوە بایەم کە نالی شێعری مەستوورەی گوتووە بێشک و گومان دەمکوت بابم کە ئەوەندە دیوانی نالی بەدەستەوەیە دەبێ جێگۆڕکێی بە بووک نازێ و مەستوورە کردبێ. خوا عالمە نالی بووک نازێی بدیتبایە خۆی جێگۆڕکێی بە مەستوورە و بووک نازێ دەکرد. ئەودەم کە من منداڵ بووم پێم سەیر بوو بابم کتێبە شێعرەکەی بۆ قەت بۆ تەواو نابێ. تازە دەزانم خۆێندنەوە بیانوویەک بوو بە دەست بابم تا دایکمی پێ لە خۆی دوورتر بکاتەوە و سەیرانی بووک نازێ لە خۆی نیزیکتر. گۆشەیەکی بچووکی لە پەردەکە لادەدا. بەکەلێنی پەنجەرەکەدا چاوی لە لەنجەولاری بووک نازێ دەبڕی، ئەوەی ئەودەم من هەستم پێدەکرد، ئەوە بوو کە بووک نازێ پێی ناخۆش نەبوو نیگای حەسرەتبار و پڕ لە مەیل و حەزی بابمەوە لەسەری بگیرسێتەوە. قسەی خۆمان بێ. بابم پیاوێکی سەروڕووخۆشی جوانچاک و وێچوو و کۆکوپۆشتە بوو. منیش پێم خۆش بوو زۆر لە بابم نیزیک ببمەوە. بەڵام بووک نازێ ئەوەی هۆش و ئارام و قەرار بوو بۆ بابمی نەهێشتبۆوە کە جار جارە وەبەر چاوی بێم.

: «ڕۆڵە! ئەوە چ دەکەی لێرە ڕاوەستاوی؟ مەگین دەرس و مەشقت نییە؟ بۆ ناچی بیاننووسییەوە؟»

: «بابە هەموویانم لە مەدرەسەی نووسیوەتەوە.»

: «دەی باشە بچۆ لەو پێشخانەی خەریک بە دەرسەکەت لەبەر کە.»

: «بابە هەمووم لەبەر کردوون، کتێبەکەم بێنم لێم بپرسییەوە؟»

: «نا، جارێ وەختی ئەو کارەم نییە. هێندێک ماندووم. با پشوویەک بدەم دوایی لێت دەپرسمەوە.»

: «باشە بابە گیان»

: «دەی ئێستا وەک کوڕێکی ئاقڵ بچۆ لە حەسارێ لیوانێک ئاوی سارد ساردم بۆ بێنە، لەبیرت نەچێ بۆخۆت ئاوەکەم بۆ بێنە مەیدە بە دایکت با بە کارەکانی ڕابگا.»

بۆم دێنا. زوو دەگەڕامەوە.

: «نا ڕۆڵە! ئەوە چ ئاوێکە بۆت هێناوم؟ دەڵێی شیری گەرمە بڕو ئاوەکەی بەردە با زۆری لەبەر بڕوا ئەگەر سارد بوو بۆم تێکە.»

هەڵدەهاتم. بەدڵ و بە گیان، ئەو ماوەیەی بابم گەرەکی بوو نەیدەخایاند، خۆزگە ئەودەم لێک حاڵی دەبووین.

: «ڕۆڵە! دابچۆ لە حاجیژن بپرسە بزانە حاجی محەممەد هاتۆتەوە یان نا؟»

من کە دڵنیا بووم نەهاتۆتەوە.

: «بابە نەهاتۆتەوە من دەزانم.»

: «ڕۆڵە! کاتێک کارێکت پێ دەسپێرن دەبێ بە دروستی ئەنجامی بدەی، من چیم بە تۆ کوت، من دەڵێم بچۆ لە حاجیژن بپرسە خۆ لە تۆم نەپرسیوە. بڕۆ زووکە ئیتر لەدووی مەدە.»

منیش وەک تاجی هەڵدەهاتم تا هەرچی زووتر ئەمری بابم بەجێ بگەیەنم وزۆر زووتر لەوەی بە زەینی بابیشمدا بێ دەگەڕامەوە.

: «ناڵێم ڕۆڵە! لە ڕۆیشتندا زۆر پەلە مەکە. نازانی خودا نەخواستە. لە پڕ دەکەوی و جێگایەکت دەشکێ، جا ئێستا چۆن بێ قسەیی منت کردووە دەچی سەر لەنوێ لێی دەپرسیوە و هەتا سەدی دەبژێری ئینجا وردە وردە وەرەوە خەبەرەکەم بدەیە.»

من زۆر زۆر درەنگ زانیم ئەو خۆشویستن و عەلاقەی من بە بابم چەشنێک بەر دەست گرتنی بوو. خودا هەڵناگرێ، ئەوەندەی ئەودەم بە ئەقڵی منداڵانەی خۆم وەچەنگم هێنابوو ئەوە بوو کە تەنیا پەردەی ماڵە ئێمە نەبوو

کە بە دزی بەرەو ماڵە بووک نازێ هەڵدەدراوە، هەر ماڵێکی پەنجەرەیان بەرەو ماڵە غەفوورەگێڕی بوو پەردەیان وێدەخست! بۆخۆم بە چاوی خۆم زۆر جارم دیوە بە سووری هاوین پیاوەکان و لاوەکانی دەروجیران وەسەربانەکانیان دەگەڕان و باگردێنیان دەگێڕا لە حاڵێکدا وێنەدەچوو تا دووسێ مانگی تریش دڵۆپێک ئاو لە چاوی ئاسمان داکەوێتە خوارێ. کە شەو دادەهات چون هیچ چراومرایەک لە گۆڕێ دا نەبوو و کۆڵانی ئێمە وەک شاری خامۆشان تاریک دەبوو. دەتدیت لە هەر لاوە پۆل پۆل لەو لاوانەی پێیان وابوو دەنگیان خۆشە لە هەرلاوە تێیان هەڵدەکرد. بە ڕاستی بووک نازێ کۆڵانەکەی ئێمەی وەبرەو خستبوو، لە وەتی بووک نازێ پێی نابووە کۆڵانەکەی ئێمە هیچ کەس نەهات باسی ئەو جندۆکانەی ناوم بردوون بکا، دەتکوت جندۆکە جگە لە بیسمیلا و دۆخین، لە جوانیش دەسڵەمێنەوە. ئەویش ئەگەر جوانێکی وەک بووک نازێ بێ.

ئەگەر لەڕاستی مەسەلەکە بپرسین بووک نازێ ئەو گەڕەکەی وەڕمێن خستبوو، کرێخانوو لە لای ئێمە هەر دەهات و گرانتر دەبوو! کە ئێوارە دادەهات سەیر ئەوە بوو، هەرکەس دووکانی لە شەقامیش بوو بۆ چوونەوە بێشک بە کۆڵانی ئێمەدا ڕادەبردن. لەبەر دەرگای ماڵە ئێمە یان باشترە بڵێم لەبەر درگای ماڵە بووکنازێ کە ڕووبەڕووی ماڵە حاجی محەممەد ساحێبماڵمان بوو، بەخشداری ئەو کاتە شێرە ئاوێکی[58] گشتی لەبەر درگای ماڵە بووکنازێ چەقاندبوو. ئیدی بووک نازێ کە جوانی بێوێنەی خۆی تەنانەت لەچاوی ژنانیشدا بەدی کردبوو پێیەکی لە ژووری خۆیان بوو هەڵبەت مەبەستم بەرپەنجەرەی ژووری خۆیان و پێیەکی لە کۆڵان گۆزە بەدەست لە پەنای شێرەی ئاوەکە. با ئەگەر درۆم کردبێ خودا هەروەک مستەفا گولی، گولم کا. بە چاوی خۆم دیومە ئەو پیاوانەی دەچوونە مزگەوت بۆ نوێژکردن، زۆر جاران ڕێگەی خۆیان بە ئانقەست دوور دەکردەوە و بە کۆڵانی ئێمەدا ڕادەبردن تا بەڵکوو چاوێکیان بە بووکنازێ

---

٥٨- بەخشدار: بەخش: ناحیە. بەخسدار: بەر پرسی یەکەمی مودیر ناحیە بوو.شێرە ئاو: بەلووعەی ئاو.

بکەوێ و بتوانن بە بیانوویەکی باش لەگەڵ خێزانیان بەشەڕ و کێشە بێن. هەر لەو سەردەمەدا بووکە خاڵیشم ماڵی هاتە سەردەشت. بابم دیوێکی لە حاجی محەممەد بۆ بەکرێ گرت. بووینە جیرانی دەرک بە دەرکە. تەنیا شتێک کە دیوەکەی خاڵی لە ژووری زیندان جیا دەکردەوە دەربیجەیەکی[٥٩] بچووک بوو کە دەیڕوانیە سەر ڕەزی مەلا شێخی، دەبوو وەک وشتر ملت قوت بکەیەوە تا بەڵکوو بتوانی تەنیا گۆشەیەک لە دنیای ڕووناکی دەرەوە ببینی. خاڵم ڕۆژی دووهەمی هاتنی زانی کە چ بەختەوەرێکە، کە ئەم دیوە بچووکەی لەم کۆڵانە ئاوەدانە وەگیر کەوتووە و بابیشم هەر هەمان ڕۆژ زانی چ هەڵەیەکی گەورەی کردووە کە ئەو ڕەقیبە جوان و جحێڵەی لە پەنای خۆی ڕێداوە. هێشتا ژن و منداڵەکەی خاڵم نەهاتبوون. بە ناچار زۆرترین کاتی لەگەڵ ئێمە ڕادەبوارد. دایکم لە تەنیشتەکەی تری پەنجەرە دۆشەگەڵەیەک و دوو سەنیریشی بۆ خاڵم دانا. کە باب و خاڵم بە یەکەوە دادەنیشتن، هەریەک گۆشەیەک لەو بەنێو پەردەیان لادەدا تا بە دزی چاویان پڕ بکەن لە بزەی بووک نازێ کە وەک تیشکی خۆر بێ دریخ پێشکەشی هەموو کەسی دەکرد. کاتی ڕوانینیان لە بووکنازێ، هەروەک پەیکەری دووشێرە بەردینەکانی بەردە نووسەکانی تەختی جەمشید بوون. ئای کە دوو بە دوو چییان دەگوت و چییان نەدەگوت!! هەر ئەو جۆرەی کە پەردەی ژوورەکەیان هەڵدەداوە، بەم شێوەیەش پەردەی حەیا و شەرمیان هەڵدەداوە. بابم کە زانیبووی خاڵم هەر چەند ڕەقیبێکی بەرچاوە بەڵام وەک هێزێکی یارمەتیش چاوی لێدەکرد هەر بۆیە لەلای خاڵم بەدایکمی دەگوت:

: «ئەرێ ئافرەت! ئەم پەردە ئەستوورە ئەم ژوورەی زۆر تاریک نەکردووە؟ بۆ پەردەیەکی تەنکتری پێ هەڵناوەسی؟ با جار جارە تاویش لە ژوورێ بدا.»

دایکم دەیگوت: «پیاوەکە! عەیبە لەبەر دەروجیرانان، خەڵکی بۆ بزانێ چ دەکەین و چ ناکەین؟»

---

٥٩- دەربیجە: پەنجەرەی زۆر بچووک. دەلاقە.

خاڵم لەسەر بابم وەجواب دەهات.

: «باجە گیان! جا بە خەڵکی چی؟ خۆ ئێمە لە زیندانی قەجەردا نین. با تاو و بایەکیش لێمان بدا.»

پەردەکە ئەوسا بوو کە بۆ ماوەیەکی کورت هەڵدەدراوە. لە ڕاستیدا تاوەکە، هەمان بووکنازێ بوو، هەروەک تاو دەچوو، هەم بە جوانی و بێگەردی و بێوێنەیی خۆی و هەمیش بە داد و بەخشین و دڵاوایی. هیچ کەس نەبوو لە جوان و ناحەز و پیر و لاو و منداڵ و ژن و پیاو کە چاوی لە بووک نازێ کردبایە و ئەویش بە ڕووی خۆش و پێکەنینەوە چاوی لێنەکردباوە. چ پێکەنینێک؟ دەتکوت دە تیانێکی هەنگوینت هەڵدەکێشێ. شەویش لەکاتی خەو قامکی خۆت لێستباوە زاری شیرین دەکردی. هیچ کەس تا ئیمڕۆ نەیزانیوە بەدەر لە خودا کە ئەویش دیارە بە کەسی ناڵێ کە چۆن بوو چارەی نازێ لە چارەی غەفوورەگێڕی گرێ پووچکە درا. غەفوورەگێڕێکی کە لە برسان هەر وەختبوو بمرێ. ئاخر مەگین ڕۆژێ چەند کەس لەوسەردەمیدا کە نە ماشێنێ هەبوو، نە خانووی بەرز، نە کەوشی پانێ بڵیند، نە فیلمەکانی بڕۆسلی و ئێستیوێن سیگال و تارزان چەند دەست یا لاق دەشکا؟ کوا بەو سەرقەڵەمانە ژیان دەگوزەرا؟ تازە سەرقەڵەمانەکەشیان لەپاش چاک بوونەوە بۆ دەبرد و کەس وەبیری نایە مەگین موعجیزەیەک ڕووی دابا غەفوورەگێڕ دەستێک یان لاقێکی باب مردووی وەگیر کەوتبێ و بۆ هەمیشە گێڕوخێچ و خوار و لە ساحیبەکەی زیز ونەبانی نەکردبێ. هەتا بووک نازێی نەهێنابوو، بە دەگمەن هەڵدەکەوت یەکێک بڕواتە لای، مەگین ئەقڵی لێگۆڕابا. بەڵام لەودەمەوە بووک نازێی پێی دەماڵی نا، لەگەڵ خۆی ئەوەی بەخەت و ئیقباڵ و شانس و سامان و داهات و ڕێز و حورمەتی خەڵکی بوو هەمووی لەگەڵ دەستی خۆی بۆی هێنایە ژوور. زۆرکەس کە هیچ عەلەمیان تێدا نەبوو لەخۆڕا دەچوون و بە ئاخ و ناڵە و هاتوهاوار دەیانکوت: «دەستم جەمام بووە یان شانم لەجێ چووە، نێوکم کەوتووە. یان ئای ئای ئای چ ژانە پشتێکم پێوە نووساوە» و ئەوانە

ئامادە بوون بە ڕاستی تووشی ئەم ئازار و دەرد و ژانانە بێن بەڵام لە نیزیکترین مەودا چاویان بە چاوی بووک نازێ بکەوێ.

ئەوەی باسی دەکەم درۆ نییە. بڕوام بەوە هەیە ئەتۆش خوێنەری بەڕێز حازربووی تەنیا لەبەر دیداری بووک نازێ دەست و لاقی ساغ و سەلیمی خۆت بدەیە دەست غەفوورەگێڕی کە بە کەیفی خۆی و بە هەر شێوە و فۆڕم و شکڵێک با دەری هێنابا. هەر لەو کاتانەدا بوو کە بووک نازێ بە کراسە زەردە هەمیشەیی‌یەکەی بە کەشەفێک چاوە وەژوور دەکەوت. هەر لەودەمە ناسک و ئاستەمە دابوو کە ئاڵوگۆڕێکی بنەڕەتی و چەند چرکەیی بەسەرت دا دەهات بۆ ماوەی ئەم چەند چرکەیەکە کە بووک نازێ چایەکەی لەبەر دەمت دادەنا و بە بزەیەک بەخێر هاتنی دەکردی و دەگەڕاوە دەر تۆ دەبووی بە هەرکەس و شتێکی تر بەدەرلە خۆت. ئەگەر لەو دەمەدا لە ئیستکانی چایی‌کەی‌دا دۆی بۆ هێنابای هەر وەتدەزانی چای دەخۆیەوە یان ئەگەر بووک نازێ پێی کوتبای بباورە هەر ئەوەندەمان ژاریمار لەماڵ داهەبوو، تۆ دەتکوت بە زیاد بێ. قەیدی ناکا و بەسەرتەوەدەنا و هەروەها لەودەمەدا ئەگەر غەفوورەگێڕ بە پێلاقان کەوتبایە گیانت هەستت بەهیچ ژان و ئازارێک نەدەکرد. چون ئەوەی هەتبوو و نەتبوو بێ‌گومان پێشکەشی بووک نازێت کردبوو. بەڕاستی بووک نازێ غەفوورەگێڕی دەوڵەمەند کردبوو. بەپێچەوانەی ئامینەشەل، کە غەفوورەگێڕی خستبووە سەر ساجی عەلی.

کە مێردی پوور و خاڵەکەی‌ترم هاتنە سەردانمان، هەر لە ڕۆژی دووهەمی هاتنیان بابم بە پشتیوانی خاڵەکانی و مێردی پوورم پەردە و مەردەی بە پەنجەرەوە نەهێشت. هەرکە بووک نازێ خۆی دەچاوی ئەوانیش هاویشت ئیتر ئەو چەند ڕۆژەی میوانمان بوون، بۆئاودەستان نەبوایە هیچ کامیان لەجێی خۆیان نەدەبزوتن. هەموو بەشەو و بە ڕۆژ بەرەو پەنجەرە دادەنیشتن هەروەک ئەوانەی ڕوو وەپەردەی سینەما دادەنیشتن. بەختەوەرانە ئەودەم سەردەشت هێندە چکۆڵە بوو کە هەر ڕۆژی هاتنیان بە سەعاتێکی هەموو جێگەیەکیان تەقاندبووە. جا بۆیە هەرکە دایکم پێشنیاری

پێدەکردن تاوێک برۆن نێو شارودەوروبەرەکەی بگەڕێن، تێکڕا دەیانکوت هیچ کوێ نەماوە کە نەماندیبێ. هەر لێرە دادەنیشتین و بە یەکەوە قسان دەکەین. وە نەبێ دآیکم نەیزانیبێ لەبەرچی ناڕۆن. بەڵام غرووری ژنانەی ئیزنی پێنەدەدا ئاماژەی پێبکا.

کە میوانەکانمان هاتن لە ڕۆژی دووهەم ڕا ئیتر خاتری یەکتر گرتن لەنێوانیان‌دا نەما، هەرکەس زووتر لەخەو ڕاست بباوە. بەرپەنجەرەی وەبەر دەکەوت. من بەڕاستی سەرم لە بووک نازێ سوڕ مابوو. چون دەیتوانی لە دابەشینی بزە و عیشوە و ناز و نیگا، ئەوەندە دادپەروەر بێ کە هەموو وەگومان بخا کە دەگەڵ ئەویتی. خۆزگە دلۆڤانی و بەزەو ڕەحمی ئەو ببایە سەرمەشقی هەر مرۆڤێکی سەرڕووی زەوی، بە پێچەوانەی هەرچی پیرەپیاو و پیاو و لاو و جحێل بوو، ئەوەی کچ و ژن و پیرێژن بوو لە هەر تەمەنێک دابان، بووک نازێیان وەک دوژمنی ژیان و بەختەوەری خۆیان چاولێدەکرد. هیچ حاشا لەوە ناکرێ کەم شەڕوکێشە لەنێو ماڵان دابوو کە هۆی سەرەکی بووک نازێ نەبووبێت. هەرچەندە خودا دەزانێ، بۆخۆی ڕووحی لەو شەڕوکێشانە خەبەردار نەبوو. کەم پیاوهەبوو لە ماڵە خۆی کاتێک ویستبای منداڵەکانی بلاوێنێتەوە، نا بە ئاگا و لەپڕ گۆرانی هەی نازێ! نازێ! نازێ! هەی نازێ! گەردن قازێ تێهەڵنەکردبا و ئاکامەکەی شەڕێکی تێر و تەسەل و بەزم و هەرایەکی ئەوسەر نادیار و لەدەس چوونی شەوێکی جومعەیان نەبێ.

هەرچەندە بەجێش نییە. ئەوەی کە دەیڵێم، بەڵام چونکە باسی بووک‌نازێیە دەبێ هەموو شتێک بڵێم. لەڕاستی‌دا من لە باب و خاڵ و مێردی پوورم و تەواوی پیاو و لاوەکانی شار. تەنانەت دەتوانم بڵێم لە غەفوورەگێڕیش بەختەوەرتر بووم. من کە بۆ حەمامی ژنان نەدەبووم چون بەڕاستی گەورە ببووم و هەموو شتێکم دەفامی، دایکم هەر بە زۆری دەیبردمە حەمامی ژنان. بیانووی ئەوە بوو، بۆخۆی خۆی جوان ناشوات هەر چڵکەسووی دەکات و دێتە دەرێ. کە دەیبردمە حەمام ئەوەندە ئەژنۆمی پێ دەنوشتاندمەوە دوو ڕۆژیش تێدەپەڕی هێشتا نەمدەتوانی بە جوانی برۆم بە

هەر حاڵ وای مەجبوور دەکردم چکۆلە ببمەوە کە ناچار ڕێیان دەدامێ بۆ ژوور حەمامی ژنان. من هەر لەوێ چاوم بە بووک نازێ کەوت هەڵبەت بە ڕووتی، من بەو چاوانەی خۆم دەمدیت چلۆن ئەو ژنانەی لەحەمام دابوون لەجیاتی خۆشوشتن، بە چاو بووک نازێیان قووت دەدا. کەلەکەیان بۆ یەکتری نەهێشتبووە ئەوەندەی بە مست تێیانکوتابوو تا گۆشەیەک لە هونەری خودا لەسەر پەیکەری بنیادەم نیشانی یەکتر بدەن. ئەودەم کە دایکم زۆر بە توندی و تووڕەیی و ماندوویی‌یەوە کەوتبووە گیانم تا بە وتەی خۆی تویێخێکم لێ بکاتەوە، بووک نازێ یەک دوو هەنگاو ئەولاتر بە بزە دەیبزاوتم. پێم وایە دەیهەویست لەنێو ژنان‌دا ئابڕووم بەرێ، هێندەشی نەمابوو ئابڕووم بچێ چون هەرئەودەم یەک دوو ژنەتیو لە حەیفی بووک نازێ لەگەڵ دایکم بە شەڕهاتن.

: «ئەرێ ئەو زەلامەت بۆ هێناوەتە حەمامی ژنان؟»

: «کوا ئەوە زەلامە خۆ هێشتا نەمناردۆتە مەدرەسە.»

: «دابڕۆ تۆخوداکەی، عەیبە، ئەی ئەگەر منداڵە ئەو عەلەمەی بۆ هەڵداوە؟»

شەڕەکە بە ئاوی داغ و کوڵیو پێ‌داکردنی دایکم بە من‌دا و لەپڕ ڕوو وەرگێڕانی بووک نازێ نەبوایە لەوانەبوو ژنان حەمام بەدەرم بکەن! ئێستا کە دەوێرم باسی بکەم دەتوانم بڵێم کە ئەوە بووک نازێ بوو کە تافی منداڵیی لێدزیم و زۆر زوو گەورەی کردم.

غەفوورەگێڕ ڕەزێکی کڕیبوو هێندێک دارە گوێز و دارە تووی تێدا بوو، کە گوێزەکانیان دەتەکاند دەتەلیسان‌دا لە ماڵێ هەڵیدەگرت. نازانم چۆن فێر ببووم ئاخۆ بۆخۆی پێشنیاری پێدابووم جوانم لە یاد نییە بەڵام دەچووم گوێزم لە بووک نازێ دەکڕی. فێری کردبووم چلۆن لە درگای بدەم. هەرچەندە بۆ ئەودەم منداڵ بووم بەڵام بزە جوانەکەی بووک نازێ هەر بڵێی یەک و دوو گەورەی کردم، فێری کایەیەکی زۆر خۆشی کردبووم، ئەوگوێزانەی بە خۆڕایی پێی دەفرۆشتم لەنێو بەرۆکی داویشت و من دەبوایە دەنکە دەنکە دەریانکێشم کە دەرمدەکێشان وەقدیلکە دەکەوت و

پێکەوە تێر وپڕ پێدەکەنین، هێندێ جاریش دەکۆشی داویشتین و نەیدەهێشت دەستم بیانگاتێ بەڵام ئەوەندەم حەول لەگەڵ دەدا هەتا هەموویانم لەنێو کۆشی دەردەکێشا. ئەم کایەم زۆر پێ خۆشبوو پێی گەرم دادەهاتم گڕم لێ هەڵدەستا، وام لێهاتبوو هەرچاوم پێی دەکەوت جۆرێکم لێدەهات لە پێشدا شەرمم لێ دەکرد، وردە وردە شەرمەکەم وەک مژ دەڕەوییەوە دەبوو بە پێکەنین و پێکەنینەکەشم دەبوو بە قاقا کە دەستی بەسەر دەمم دادەگرت.

: «وسس. سەبر کوڕە! کەس نابێ بزانێ.»

هەموو جارێ کە لە درگاکەیانم دەدا. گۆشەیەکی درگاکەی دەکردەوە.

: «دیسان هاتووی گوێزم لێ بکڕی؟»

بەسەر دەمکوت بەڵێ، چونکە بەر لە هەرشت زمانی لێ دەستاندم. دەیبردمە پێشخانەکەیان ئەودەم کە دەچووم بۆ گوێز کڕینێ و بۆخۆی کاتەکەی دیاری کردبوو غەفوورەگێڕ لە ماڵ نەدەبوو دەیکوت: «ڕاوەستە ئەوە دەچم گوێزەکانت بۆ دێنم.»

گوێزەکان هەرلەوێ بوون دەچوو خۆی بۆ کایەکە ئامادە دەکرد تا دەهاتەوە وەک شێتانم لێ دەهات. لەم دوای‌یانەدا توند توند بە خۆیەوە دەکوشیم.

من لێرە ڕا ئیتر باسی هیچ شتێکی تری خۆم و بووک نازێ ناکەم. هەر ئەودەم زۆرم زگ بە باب و خاڵ و مێردی پوورم دەسووتا. زگم بە هەموو ئەو پیاوانە، ئەو جحێل و لاوانە و هەروەها ئەو گرووبانانە دەسووتا وەک سەگی پێ‌سووتاو هەر بەخۆڕایی بە کۆڵانی ئێمەدا ڕادەبردن و دەست بەتاڵ دەگەڕانەوە، دەتوانم بڵێم کە تەنانەت ڕۆژانی جومعەش کە مەدرەسەمان نەبوو ئەمن وازم لە گوێزکڕینی خۆم نەدەهێنا. هەر دەهات کزتر و درێژتر دەبووم. دایکم لێم وەسەر شک گەڕابوو. بووک نازێ لەپاش ئەوەی کە تەواوی ئەو گوێزانەی لە جێگا تایبەتی لەشی‌دا حەشار دەدا و پێی دەدیتمەوە، لە دواییش‌دا قڕانەکەشی دەدامەوە. دەیگوت: «بڕۆ شتی‌تریش بۆخۆت بکرە بەڵام لە لای کەس نابێ باسی گوێز گوێزینەکەمان بکەی، ئامان، دەنا هەرگیز گوێزت پێ نافرۆشمەوە، » ئەمنیش کە لەمێژ بوو لەبەر

گوێزان نەدەچوومە ماڵە بووک نازێ، بەڵکوو تەنیا لەبەر خۆی و کایەکەی دەچووم، لەت لەتیشیان کردبام هیچم لە زاری دەرنەدەهات. ئاخ! نازانن هەر ئەودەم لە ماڵە ئێمە لە نێوان باب و خاڵم کێبەرکێ بوو بۆ داگیرکردنی شوێنێکی باشتر لەبن پەنجەرە بۆ دیتنی تاوناتاوێکی بووک نازێ. هەر ئەودەمیش بەخۆم دەخورِیم[٦٠]، ئەوان وەدوای چی دەکەوتن و من چیم وەدەست دەکەوت! تەنانەت ئەودەمیش کە لەگەڵ عەلیلە و قالەش ببووم بە ئاواڵ، هەر دەچووم بۆ گوێزکرِین لە بووک نازێ. بووک نازێ وردە وردە کربوومی بە مێو و لە چنگی خۆی گرتبووم. هەرکارێکی ببیایە یان شتێکی پێویست بایە دەینارد لە دوام و من وەک ودودەی جادوو بۆم بە ئەنجام دەگەیاند. هەمیشە لەژێردەست و لە ژێر دەسەڵاتیدا بووم. کەم نەبوون ئەوانەی ئێرەییان پێدەبردم. هەرچەند ئەودەم نازێی خوشکی عەلیلەم وەبەر دڵی کەوتبوو چون نەمدەزانی ئاخۆ مەیلی لەگەڵم هەیە یان نا؟ هەر هات و چۆی بووک نازێم دەکرد. تا ئەودەم کە رِۆژێکی نازێ هەرِەشەی لێکردم کە بێتوو جارێکیتر کار بۆ بووک نازێ بکەم یان بچمە لای، هەرگیز نامدوێنێ. نازانی لە خۆشی ئەم قسەیەی نازێ چەندەم خۆ هەڵاویشت. ئەی گیان! ئەی گیان! نازێش منی دەویست. ئیتر بووک نازێم بە تەواوی هەستە پرِ لەخۆشی و شاراوەکانم بە یەکجاری بەجێ هێشت. هەڵبەت گەورەش ببووم. تەمەنم دەهات لە یازدەش تێپەرِێ.

| | |
|---|---|
| هۆی نازێ، نازێ، نازێ | هۆی نازێ، گەردن قازێ |
| هۆی نازی نازان مەکە | ماڵا من خرا مەکە |

***

٦٠- بەخۆم دەخورِیم: شانازیم بەخۆمەوە دەکرد. غەریب بووم.

# ٤٤

...... سۆفی حەسەن لە گەڕانەوەی دا بۆ سوورەچۆم بە پێچەوانەی کاتی هاتنی بۆ تاران کە بۆ ساتێکیش چاوی هەڵنەهێنا و تا گەیشتە تاران هەر لە خەو دابوو. ئەم جارەیان تەنیا بۆ ساتێکیش نەیتوانی چاوان وێک بنێ و وچانێ بدا. بیری دوکتور وەک.....

- زۆر خەریک بووم ئەو وشەیەم لە پێشنووسەکە بۆ نەخوێندراوە، هەرچەند کە بۆخۆم نووسیبوم. ڕاستیەکەی ئەوەندە بە پلە نووسیبووم نازانم چی بووە. خۆتان هەرچی پێتان خۆشە لەجیاتی دایبنێن — بە مێشکیەوە نووسابوو. یەکدەم دەسبەرداری نەبوو. بەو ڕێگا دوورودرێژەی تاران، سوورەچۆمیش چارەی نەکرا. دەیزانی بە درێژایی تەمەنی حەول و تەقالای بۆ ئەوە بوو ڕازێکی ژیانی خۆی هەروەک پرێسکەی پیرێژنێکی کوێری تەنیا لە قوژبنێک بشارێتەوە. ئەوجۆرەی کە لە دواییدا خۆشی نەیتوانی بیدۆزێتەوە، کێشەیەکی ناوخۆیی و درێژ خایەن. چەشنێک ئاڵوگۆڕی بنەڕەتی هەروەک ئەو ئاڵوگۆڕەی بەسەر «سامسا گریگۆری» کەسایەتی چیرۆکی «مەسخ»ی فرانتێس کافکا هاتبوو. چاری نەمابوو دەبوو کەوڵی مەڕێک بەسەر خۆیدا بکێشێ و بێتە ڕێزی مرۆڤ مەڕەکان، تا ڕادەیەکی زۆر لەم بارەوە سەرکەوتوو بوو. توانیبووی ببێتە پیاوێکی باش و لە خوداترس. ڕەنگە ئەگەر توانیبای خێر و شەڕی ژیانی خۆی لە دوو تای تەرازوویەک نابا و بۆخۆی تەرازوودارەکە با، بەبێ ئەوەی بیهەوێ لایەنی خۆی بگرێ، بێگومان تای خێرەکەی قورستر دەبوو، بەڵام نە ئەوەندەش قورس کە دوکتورێکی بەناوبانگ و بە ئەزموونی شاری تاران، نەدیوو و نەناسیاو بۆی ببێتە پشت و پەنا و هەر ئەوەندەی چاکە دەرحەقی بکا کە ئەگەر برای بایە، ئەوەندەی لە دەست نەدەهات. هەر حەولێکی دەیدا، لە

خۆڕایی بوو، بۆی نەدەچۆوە سەر یەک یان نەیدەویست بۆی بچێتەوە سەریەک، خودا دەزانێ ئەم کوردی زانینەی دوکتور و شێوەی ئاخافتنی لە لایەک و لە لای ترەوە ئەو شارەزایی و ئاگاداریيەی کە لە زۆربەی خەڵکی بە ساڵاچووی ناوچەکە هەیبوو و هەروەها ئەو خزمەت کردن و ڕێز لێگرتنەی و ئەو پرسیار و مەیل و تامەزرۆییەی هەیبوو و بۆ ئاگاداربوون لە بەسەرهاتی خەڵک بەتایبەت خەڵکی سوورەچۆم و لە ناو سوورەچۆمیش پرسیاری زۆر سەبارەت بە ژیانی فاتێ و کاوەیس و ئامین و ئەو داوایەی کە لە گەڕانەوەی دووبارەی سۆفی حەسەن بۆ تاران حەتمەن خەبەروباسی زۆرتری لە ژیانی ئێستای کاوەیس و فاتێ و ئامین تەواوی ئەو کەسانەی پێوەندیان بەم چیرۆکەوە هەبووە بۆ بەرێ.

بەڵام سۆفی حەسەن کە حەولی دەدا بیر لەو شتانە نەکاتەوە، زۆر سەیر بوو بەخۆی دەگوت:«تۆ بڵێی من لە لای خودا ئەوەندە پەسەند کرابم کە خودا ئەم دوکتورەی هێنابێتە سەرڕێم. تا ببێ بە سەبەبی چاک بوونەوەم. و منی غەریب و نابەڵەد وبێ کەس و کار لە هەڵوەدایی و سەرگەردانی لەم شارە بێ دەرودەروازەیە نەجات بدا. ئەرێ بێت و من ئەم نەقل و باسەی بۆ خەڵک بگێڕمەوە. بڵێی تاقە کەسێک لە سوورە چۆم پەیدا ببێ کە بڕوام پێبکا و لای وانەبێ بە هۆی خەرەفانم ئەو شتانەم لە خۆوە ساز کردووە؟ بەخودای کە عەلیم و خەبیرە هێشتا شتی وا لە حەکایەتانیش‌دا ڕووی نەداوە. منی نەخۆشی، پیری، زورهان، بە پشتی کۆم و چەماوە، بێکەس‌وکار، بە هەزار ناری عەلی خۆم بگەیەنمە تاران، ئینجا باشترین دوکتوری تاران نەهێڵێ تاقە قڕانێکیشت پووڵ بچێ نە برسی بمێنی نە تینوو، نە لە کووچەوکۆڵانان‌دا سەر بە عەرزی دادەی. لەجیاتی ڕێم بکەوێتە نێو کۆشک و تەلارێک هەر مەپرسە. دەیجا ئەگەر ئەمە موعجیزەی خودا نەبێ ئەدی چییە؟»

سۆفی حەسەن بیری دەکردەوە لەوە کە کێ بوو ناونیشانی ئەم دوکتورەی دابوویە. لەبیری بوو کە پێی کوتبوو: «زۆر دوکتورێکی قابیلە، زۆر پیاوە و لەگەڵ کوردان نێوانی خۆشە، دەڵێن زۆر جاران پووڵی دەرزی

و دەرمانی نەخۆشەکانیشی لە گیرفانی خۆی داوە. ئەزقەزا سۆفی حەسەن! دوکتوری پشتئێشەیە.»

: «نا، کەست ناوێ دەگەڵت بێ. من ناونیشانی مەتەبەکەی کە سەرڕاستە بۆت دەنووسم، هەر لە کارێژێ سواری تاکسیەکە بە و کارت پێی نەدابێ لەبەر درگای مەتەبەکەی داتدەنێ.»

سۆفی حەسەن ئێستا مێشکی خۆی ڕێک دەکوشێ تا نێوی ئەو کەسەی کە چوار ساڵ لەمەوپێش ئەو ووتوویژەی لەگەڵ کردبوو و وەبیر خۆی بهێنێتەوە و ئاخریەکەی هاتە سەر ئەوە کە بڵێ: «بەڵێ بڕوام پێیەتی کە موعجیزەی خودایە. تۆ بڵێی ئەوێ ڕۆژێ کە من گیانی کاوەیسم لە مردن ڕزگار کرد. هەر لێرەش‌دا شکێک چنگی بە مێشکی داگرت:

: «خۆ هیچ باس و خەبەرێک لە زیندووبوون یا مردووبوونی کاوەیسی نەگەڕاوە ئەی من بۆ وا بە دڵنیایی دەڵێم گیانم لە مردن ڕزگار کرد. شکە ئیتر هەرکات پێی خۆش بێ دێ. ناهێڵێ سۆفی حەسەن ڕستەکەی کە مابوو، تەواو بکا. خودا پاداشتی ئەو کارەی نەدابێتمەوە؟»

سۆفی حەسەن ئینجا کوتی: «خودایە هەر ئەتۆی کارسازی کاران. هەزاران هەزار جار شوکرانە بژێرم. خودایە شوکری نیعمەتی تۆ هەرگیز بە من تەواو نابێ.»

: «حەلیم تۆهەرگیز لە زاری من درۆیەکت بیستووە؟ وەڵڵا ئەوەی بۆم گێڕایەوە بەقەرا سەرە دەرزییەک درۆی تێدا نییە.»

: «دەجا سۆفی! ئەگەر ئەوەی گێڕاتەوە وابووبێ، بێ و نەبێ ئەم کابرایە دوکتور نییە. داخودا چ شێتێک بووە، یان کەسێک ویستوویەتی گاڵتە و گەپت پێبکا.»

: «کچێ ئافرەت! گاڵتەی چی؟ تۆ نازانی من دەزانم خەڵک یان ئەوانەی لە نەخۆشخانە کاریان دەکرد چ ڕێزێکیان بۆ ئەم دوکتورە دادەنا. شێتی چی؟ خۆ ئەگەر شێتی ئەم شێوەیە دەبوو خۆزگە ئەوەی مرۆڤی سەر زەوییە شێت دەبوون. بریا زانیبات چ ڕێزێکی لێناوم و چەندەی قەدر گرتووم، لە

خەجاڵەتیان سەرم بۆ هەڵنەدەهات. نەیهێشتووە تاقە قڕانێکیش خەرج بکەم ئەوەتا پووڵەکەی خۆم چۆن بردووە هەرواشم هێناوەتەوە.»

ئەوەی حەلیم پێی دەمێنێ کە بڵێ ئەوەیە: «دەی جا چووزانم سۆفی! بڕوا ناکەم بۆ هەرکەسێکی‌تری بگێڕیەوە باوەڕت پێبکا. ئاخر لەم دەوروزەمانەدا کە برا بە فریای برا ناگا چۆن کەسێکی ئەم جۆرە پەیدا دەبێ. نەدیو و نەناس بە چەشنێکی چاکەت لەگەڵ بکا کەلە دەستی باب و برات نایە؟»

: «وەڵڵا حەلیم! تۆ راست دەکەی منیش دەڵێم بۆ باوەڕکردن نابێ. ئەوجار کە گەڕامەوە تۆش لەگەڵ خۆم دەبەم. دەبێ بێی و بە چاوی خۆت بیبینی. دوکتور دەڵێ عەمەلی جەڕڕاحیم پێویستە هەڵبەت دەیکوت وا چاکت دەکەمەوە کە بتوانی ژنێکی تریش بخوازی.»

حەلیم وەجەفەنگ دێ: «دوکتور دەیهەوێ بەتەواوی لە ناوت بەرێ ئەگینا تۆ بە تاقە ژنێک ئاوا پشتت چەماوەتەوە دەبێ بە دوو ژن چت بەسەر بێ سۆفی؟»

: «حەلیم! ئەو دوکتورەی من دیومە دەیگوت وەها کۆڵەکە وەبەر پشتت دەدەم کە بە دە ژنانیش دانەیەتەوە. هەڵبەت دوکتور دەیکوت حەتمەن دەبێ لە گەڕانەوەدا کەسێک لەگەڵ خۆت بێنی کە لەپاش عەمەلەکە ئاگاداریت لێبکا. حەلیم ئەگەر تۆ لەگەڵم بێی و بە چاوی خۆت دوکتور ببینی دەزانی کە هێشتا هیچم بۆ باس نەکردووی کەمیم لێ گوتووە.»

: «دەی جا شوکری خودا زۆر باشە. سۆفی ئەرێ ئەو جۆرەی تێگەیوی ئەم دوکتورە کوێندەرییە؟»

: «بە خودای حەلیم! زۆرم سەری خۆم لەگەڵی هێشاند بۆم نەچۆوە سەریەک، ئەوەی تێی گەیشتم ئەوەیە لەهەموو شوێنێک هەر بە فارسی دەدوێ و هەر بە فارسیشی دەناسن. بەڵام کەدەکەوتە لای من بەکوردێکی وەک خۆمان قسەی دەکرد. نە ئەو کوردییەی کە فارسێک یان تورکێک دەیلێ. بەڵکوو کوردێکی پەتی هەروەک خۆمان. کە قسان دەکا هەرگیز بیر ناکەیەوە کە کورد نەبێ، کاتێک کە بە فارسیش دەدوێ. گومان ناکەی تاقە وشەیەکی کوردی بزانێ هەرچەند بەقام پێی نەکرد. دەیکوت ماوەیەک لە

ناوچەی ئێوە ماومەتەوە و هەر لەوێش فێری زمانی کوردی بووم. بەڵام ئەوجۆرەی ئەو قسەی دەکرد کاری ئەوە نەبوو کەسێک بەدوو سێ ساڵ مانەوە لە شوێنێک ئاوا فێری بێ. هەرچەند دەیکوت سەردانی سوورەچۆمم کردووە.»

حەلیم سوێند بۆ سۆفی حەسەن دەخوا کە پێی شتێکی سەیر و سەمەرەیە.

: «کچێ ئافرەت! لەوە سەیرتر ئەوەیە کە لە بەسەرهاتی زۆربەی خەڵکی دەپرسی بەتایبەت ئاگاداری تەواوی لەسەر کێشەکەی ماڵە کاوسێنی هەبوو. هەواڵی کاوەیسی دەپرسی. پێی خۆش بوو بزانێ فاتێ ئێستا لە چ حاڵ و وەزعێک دایە تەنانەت خەبەری لە کەینەوبەینەی ئامین و هەمزاغاش هەبوو. کەس نەمابوو لە وێدا کە دوکتور لە حاڵ و وەزعی نەپرسێ. داوای لێکردووم لە گەڕانەوەمدا زۆرتری خەبەر و باس بۆ بەرم. دەڵێ: «پێمخۆشە بزانم لەوێ کێ ماوە و کێ مردووە؟»

: «سۆفی! تۆ ئەوەت پێ سەیر نییە؟ ئاخر لێت نەپرسیوە ئەوشتانەت بۆ لە لا گرینگن؟»

: «بەخودای حەلیم! چەند جارێکیشم لێ پرسی، بەڵام یان وەڵامەکەی وڵام نەبوون یان گوێیەکانی من گوێ. بەڕاستی هەر بۆ پێکەنین دەبێ. دەیکوت ئەو ماوەیەی لەو ناوچەیەدا ماومەتەوە، خەڵک زۆریان قەدر گرتووم. هەر لەچاوم دایە هەڵبەت بەو چاکەیەی دەرحەق بەمنی کرد، من باوەڕم بە قسەکانی هێنابوو دەیگوت: «چەندە بە ئاواتم جارێکی تریش بێمەوە سوورە چۆم و دەورووبەرەکەی و لە نیزیکەوە سروشتە جوان و دلڕفێنەکەی ببینمەوە کە بیرەوەرییەکی زۆرم لێیان هەیە. ڕەنگە ڕاست بڵێ هەرواش بووبێ، هەر خودا بۆخۆی دەزانێ.»

: «ئەرێ حەلیم تۆ دەزانی، کوڕەکانی کاوسێن ئێستا لە کوێن؟»

: «جا چووزانم خودا هەر یەکەی هەڵیداشتۆتە لایەکی. لەبەر ئەو زوڵمەی دەرحەق بە زڵەخایان کرد. وەک بزانم تا یەک دوو ساڵ لەمەوبەر کە

خەبەرم هەبوو فاتێ لەگەڵ منداڵەکانی پێشتر لە سەردەشت دەژیان بەڵام دەڵێن لەوێ نەماوە. ئێستا لێی بێخەبەرم.»

: «ئەرێ حەلیم! وەک بزانی کێ لە سوورەچۆمێ ئاگاداری حاڵ و ڕۆژیانە؟»

پێم وایە کاک جەلیل خەبەری لە هەموو منداڵەکانی کاوسێن هەبێ، خاڵیانە دەبێ بزانێ.

: «وەڵڵا ڕاست دەکەی. هەر لەبیرم نەبوو. تازە دەزانم چەند پیروکەنەفت بووم.»

: «ئەگەر ڕاست دەکەی سۆفی! ئەو قسەیەت بەو دوکتورەی کوتبا کە بەنیازە ژنیترت پێ بێنێ.»

: «کچێ حەلیم! بەڕاستی ئەو قسەیەت هەر لەبیر ماوە؟ کچێ شۆخیم لەگەڵ دەکردی دەنا کوا ئەمن تازە بۆ ژن هێنان دەبم؟»

: «سۆفی! دەڵێی چی وەڵڵا پیاو تاقەتی ئەو کارەشی نەبێ قسەوباسەکەی هەر پێخۆشە.»

: «باشە حەلیم! حەقتە کە وابوو بەیانی دەچم لە کاک جەلیل دەپرسم»

: «بە خودای سۆفی حەسەن! بەدوای ئەو ڕووداوە کە بە ناحەق ئەو کوڕە بەستەزمانەیان لەناو برد. ماڵە خوشکم ئیتر خۆیان نەگرتەوە. ئەو شوبرەی زاوام چەندم تکا لێکرد. کوڕە مەخر بۆ ڕەزای خودا، ئەوەندە ئەو کوڕانەت تین مەدە. وەڵڵاهی ئەو کوڕە، کاوەیس دەڵێم سۆفی حەسەن لەمن کە خاڵی ئەو کچەم پاکتر بوو. نازانم شەیتان چوو دەکەڵیشەیەوە. وازی نەهێنا کە هەر نەهێنا. وەک من خەبەرم هەبێ دوان لە کوڕەکانی زێنەبی خوشکم ئەوە لە شنۆیە بوونە شۆفیر، یەکیان لە ورمێ و لە موسافیرخانەیەک کار دەکا. دوو کوڕە گەورەکانیش کە ماوەیەک لەسەر ڕووداوەکە گیرابوون، پەڕیونەتەوە ئەودیوی. لەوێ بوونە خاوەن خێزان و منداڵ، زۆر ئاگاداریان نیم. یەکیان لە دێهاتێکی لای جلّدیان و ئەوەی هەرە چکۆڵەیان، لە مەهابادە، وەک بزانم حاڵ و وەزعیشی باشە، من چەند جارێک سەرم لێداوە. گوایە ماوەیەکە ئەو خوشکە قوڕبەسەر و خۆشی نەدیوەکەی

بردۆتە لای خۆی و خانووبەرەیەکی لە ئیختیار ناوە، بۆیَ تیَ هەڵێناوەتەوە. هەر چەند ئەم برایەیان خەتای لە ڕووداوەکەدا نەبوو. سۆفی! بەخودای هەرچەند جاری ئەو کچە جوانەی دەبینم ئاورم بۆی تێبەردەبیَ. ماوەیەکە چاوم پێی نەکەوتووە. بەڵام دەڵێن بیبینی نایناسییەوە. دەڵێن لەبەر ژانی پشتی ئارام و قەراری لێهەڵگیراوە، هەمیشە دەبیَ یەکیَ نان و ئاوی بە زاری دابکا. دوکتوران دەڵێن بە عەمەلی جەڕڕاحی نەبیَ چارەی نایە، کە قوڕبەسەرە نە دەوێریَ خۆی بخاتە ژێر چەقۆ و نە پارەی عەمەلەکشی هەیە. ئاهی ئەو کوڕوکچە بیَ گوناحەیە خودا وای لە سەبەبکاران کردووە هەر بە خەونیش نەیاندەدیت، لێرەیە کە پیاو دەبیَ سەر بۆ حیکمەتی خودا دابنوێنیَ.»

: «کاک جەلیل! فەرمایشتەکەت زۆر بەجێیە. بەڵام کەس سەرەدەرە لەو حیکمەتەی ناکا. ئەوەتا ئامینە شەل کە ئەوهەموو زوڵم و زۆرییەی دەرحەق بە منداڵی خەڵکی کردووە، دەبینی لە بەرانبەردا کچەکەی کە مێردی بە هەندەران کردووە لە خۆشی و ناز و نیعمەت دایە. دەڵێن وەک ژنە شایان دەژی، یان کوڕە سەر زلەکەی کە لە داخی دایکی هەڵات، دەڵێن ئێستا لە تارانیَ حاڵ و ڕۆژێکی زۆر خۆشی هەیە. بەڕاستی خودا نەبیَ کەس نازانیَ چی بە چییە؟»

***

# ٤٥

.... پێشتر گێڕامەوە کە تەنیا جارێک خەونی خۆم دیوە و تەنیا جارێک خەونەکەشم وەڕاست گەڕا. من کە بۆ سەردان چووبوومە تەورێز و بە پێچەوانەی ویستی خۆم ناچار بە مانەوە بووم و شەو و ڕۆژم لە بێخەبەری و غەفڵەتدا تێدەپەڕاند، نازانم چ شتێک لە جیهانی هەستیدا ڕووی دابوو کە من خەونێکی خۆشم دیت، خەونێکی پڕاوپڕ لە پەپوولە. خەونێکی ڕاست ڕاست، بێ هەڵە. ڕاست و خۆش وەک ئەوکات و ساتانەی لە سەردەشت لەگەڵ نازێ جیا لەو کایانەی لەگەڵ عەلیلە و قالە دەمانکرد. کایەی نهێنیشمان هەبوو کە بە دزی ئەوان دەمانکرد کە تەنیا چاو و دەستمان لەو کایەدا دەوری دەگێڕا. ئەودەم خودا هەرچی هەیبوو هەمووی یەکجێ ڕشتبووە سەردەشتێ. قەڵەمەکەی خوداش وەک قەڵەمەکەی ئێمە کە لە مەدرەسەی نەققاشیمان پێدەکرد لە دووڕەنگ پێک هاتبوو، بەو جیاوازییەی کە قەڵەمی نەققاشی ئێمە سەرێکی سوور بوو و سەرێکی شین و ئێمە ناچار بووین کە هەزاران هەزار ڕەنگ و نەقشی خودا تەنیا بەم دوو ڕەنگە ئاشکرا بکەین. دیارە کە چۆمەکەمان شین دەبوو بە ناچار سەوزەڵانەکانمان سوور هەڵدەگەڕان، دەنا جیهانی ئێمە دەبوو بە جیهانێکی یەکڕەنگ کە لەگەڵ زەینی ئەودەم و ئێستای خەڵک یەکی نەدەگرتەوە، بەڵام قەڵەمەکەی خودا سەوز و سوور بوو. یانی هەر جێیەکی سەردەشت کە سەوز و سەوزەڵان نەبا، بێ شک گوڵ بوو و هەرشوێنێ سوور نەبا، سەوزە و دار و دەوەن بوو. باوەش باوەش گوڵ لە ئامێزی دەگرتی و پۆل پۆل پەپوولە هەزار ڕەنگینکەکانی سەردەشت، ئیتر باڵیان نەدەبزاوت. هەڵنەدەفڕین و وەک ئێمە بە پێیان دەڕۆیشتن. قسەیان دەکرد. دەیاندواندین، جار جارە کە تووشی یەک دوو پەپوولەی گێژوبەستەزمان دەهاتین،

یارمەتیمان دەدان. زۆر جار بە دەستی مندالە پەپوولەکانمان دەگرت و گولاوگوڵ دەمانپەڕاندنەوە. لە سەرەوەی ماڵە ئێمەی ئەوان سەردەمان، نا، ماڵە ئێمە بڕێک لە پێشتر بوو، لە سەرەوەی ڕەزی مەلا شێخی، چاڵەبەفرێکی لێبوو زستان  کە ڕێی لەوێ دەکەوت. لەپڕ لەو چاڵە بەفرە دەکەوت و خەڵک بە پێلاقان دەکەوتنە گیانی و ئەوەندەیان دەکوتا. تا لە زمانیان دەخست. سەریان دادەپۆشی تا هاوین دەهات و لەگەڵ گەرمای هاوینی بەشەڕیان دەدا. زۆر جار بەهاران من و قالە و عەلیلە و نازێ و براکەم و خوشکم، کە یەک دوو سالان لەمن گەورەتر بوو، بە دزی دەچووینە زگ زستانی نێو چاڵەکە دەستدرێژیمان دەکرد. پەلە پەلمان بوو هەرچی زووتر هاوین بگا، تا ئێمە لە دەس مەدرەسە ڕزگار بین و زستانی نێو چاڵەکەش لە دەس هاوین و گەرما دڕەکەی، ئاخر هاوینان کەچاڵەکە بەتاڵ دەبوو وەک گۆشەیەک لە بەستێنی چۆمی بەنێوبانگی ئامازۆنی لێدەهات. چ گیایەک لەسەر زەوی نەدەما کە پێی خۆش نەبێ وەک ئێمە بۆ کایەکردن ڕوو لە چاڵە بەفرەکە بەکا. زۆر ئێواران بە تەنیایی دەچوومە نێو چاڵە بەفرەکە و ڕادەکشام و چاوم لە ئاسمان دەبڕی. لە خودای دەگەڕام. پێم خۆش بوو بیبینم، بیدوێنم، دەمویست لە لای سکالا بکەم. لە ماڵێ ئازاریان دەدام. ئەوەی کاری ناخۆش بوو بەمنیان دەکرد. جارجارە دەمویست سپاسی بکەم ئاخر بووک نازێ هەموو ئازارەکانمی لەبیر دەبردمەوە. جارجارەش هەر وا بە ڕاکشاوی چاوم لە هاتوچۆی بێ مەنتیق و بەپەلەی پەڕەسللێرکەکان[٦١] دەبڕی کە ئێستاش کە ئێستایە وازیان لەسەرنجم نەهێناوە. زۆرجاران تەرمی بێوازی و بێکاری خۆمیان دەخەمە سەر شانی هاتوچۆیان. تا بیبەن بۆم بنێژن. لەپڕ بەردێک دەکەوێتە تەنیشتم نا لەپڕ بەردێک کەوتە تەنیشتم لەنێو چاڵە بەفرەکە. دەزانم مەبەست ئاگادار کردنی منە نە ئەنگاوتنم. بەڵام کە لە قەستی دەئەنگێورام یەکبەخۆم هاوارم دەکرد «ئەی سەرم، ئەی بابەگیان! سەرم، سەرم شکا.»

---

٦١- پەڕەسێلکە.

لەپڕ نازێ بە کوڵەبارێک نازەوە، بە سەد قاقا و پێکەنینەوە، بە عالەمێک بێخەمییەوە. دەهاتە سەر لێوی چاڵە بەفرەکە.
: «ئەی درۆزن! ئەی درۆزن! بۆ دەڵێی سەرم شکاوە؟ کوا کوێی سەرت شکاوە؟»
: «ئەی ئەگەر شکابا چی؟»
: «جا خۆ ئێستا نەشکاوە بۆ لە خۆڕا هاوار دەکەی؟»
: «نازێ وەرە بۆخۆت دەستی لێبدە بزانە شکاوە یان نا، جارێ پێم بڵێ عەلیلە و قالەت خۆ لەگەڵ نین؟»
: «بۆچی لەگەڵمن. لەپەنای دارە توویەکە خۆیان حەشار داوە. دەزانن لێرەی بەنیازن هەر بێیە دەر مستێک نووسەنەکەت پێدادن. من بە دزی ئەوان هاتووم ئاگادارت بکەمەوە. جارێ لە چاڵێ مەیە دەر.»
: «نازێ! درۆیان مەکە. تۆ وەرە خوارێ شتێکت پێشان دەدەم.»
: «نا، نایەمە خوار، دەتهەوێ وەک ڕۆژان بۆ خۆت پاڵم پێوەبنێی لە چاڵەکەم وەسەر خەی نا، من چیتر ئەو کایەم پێخۆش نییە.»
: «نازێ بە ڕاستی دەڵێم. بڕوام پێبکە بەو بەردەی پێت دادام سەرم شکاوە بە ئانقەست دەنگ ناکەم. دەنا وەرە بیبینە چاو لە دەستم بکە هەمووی خوێناوییە.»
بەڕاستی دەستم خوێناوی بوو. دمدم خوێنەم دەکەپۆم نابوو وەخوێنم هێنابوو. نازێ کەدەستی خوێناوی دیتم بە پەلە خۆی لە چاڵە بەفرەکە داوێ. ئێستاش لێم ڕوون نییە کە نازێ بە ئانقەست فریوی دەخواردم یان بە ڕاستی فریوم دەدا یان شارەزایانە فریوی دەدام کە دەهاتە لام بە زەبری زۆری دەستی پێ لەسەرم هەڵدەگرت. ئەودەم دەیزانی وەک هەمیشە لە داوم کەوتووە بە مستەکۆڵان دەکەوتەگیانم، دەستم دەگرت و چاوم لە چاوی دەبڕی. ئەودەم تەمەنم ببوو بە دوازدە، ماوەیەک بوو وازم لە بووک نازێ هێنابوو. هەرچەند شەوانە تا خەوم لێدەکەوت لە خەیاڵی خۆمدا دەستم دەنێو سینگ و بەرۆکی بووک نازێ دەگێڕا و گوێزم دەدیتنەوە بەڵام

هەردەم کۆخەی بێ وادەی یەکێ لە خوشک و براکانم هەموو گوێزەکانی لێ پووچ دەکردم.»
: «نازێ! نازێ! وەرە تۆ ئەو ئاسمانە شینە. تا من گەورە دەبم تۆمێردی مەکە.»
: «کوا مێردکردنی کچی بە دەستی خۆیەتی؟ دایکم دەیکوت ئەگەر بەدەستی خۆم با پرچی سپیم دەهۆنییەوە و هەرگیز مێردم نەدەکرد. منیش مەگین بە دەس خۆمە.»
: «بۆ بە دەستی خۆت نییە؟ ئەگەر زۆریشان لێکردی جوابیان مەدەوە.»
نازێ پێدەکەنی: «باشە مێرد نەکەم ئەدی چ بکەم؟»
دەڵێم: «خۆ من هەروا بە چکۆڵەیی نامێنمەوە، منیش گەورە دەبم، کارێکی دەدۆزمەوە، دەتخوازم و بە یەکەوە دەژین.»
پێم دەڵێ: «تۆ تەنیا دوازدە ساڵت تەمەنە. تا دەرسەکانت تەواو دەبن و دەچی بۆ سەربازی و دەگەڕێیەوە. کوا واز لەمن دێنن کە چاوەڕوانی تۆ ببم؟»
: «نا، نازێ! ئەگەر بۆخۆت نەتهەوێ هیچ کەس ناتوانێ زۆریت لێبکا. تازە مەگین هەمیشە عەلیلە ئاگای لێت نییە کە کەس زوڵمت لێ نەکا؟»
: «ڕاستە عەلیلە زۆری ئاگا لەمنە. بەڵام ئەو جۆرە بڕواتە پێش دەبێ عەلیلە دەس لە خوێندن هەڵگرێ و خەریکی کارکردن بێ.»
: «نازێ! کوا لێرە بۆ یەکێکی وەک عەلیلە کار دەس دەکەوێ؟»
: «دەزانم لێرە کار نییە هەر بۆیە دایکم ڕایسپاردووە کە لە سابڵاغ کارێکی بۆ وەدۆزن. خاڵم زۆر لەمێژە داوا لە دایکم دەکا کە هەموومان هەڵگرێ و بەماڵەوە بچینە سابڵاغ بۆ لای ئەوان. بەڵام دایکم پێی خۆش نییە ببێتە سەرباری هیچ کەسێک، هەرچەندە خاڵم دەڵێ سابڵاغ بۆ دەرسخوێندنی منداڵەکان باشترە.»
: «بۆخۆم دەستێک خانووبەرەی زیادیم هەیە نیازم پێی نییە. وەرنە لای خۆم چاوەدێریتان دەکەم.»

لەپڕ من ئاور دەگرم: «نازێ! خو ئێوە ناچن بۆ سابڵاغ مەگین وانییە؟ هەر ئێستا بۆخۆت کوتت دایکم دەڵێ پێم خۆش نییە سەرباری کەسێکی تر بم وانییە؟ تۆ لێرە کاردەکەی و دەرسیش دەخوێنی. دەچن لەوێ چ دەکەن؟ کەس ناناسن، خۆشتان بۆ ناگوزەرێ، پەشیمان دەبنەوە. تۆخودا نازێ بە دایکت بلێ با ڕازی نەبێ هەڵوەدا بن. بۆخۆت لەوێ چ دەکەی؟ بێ هیچ دۆست و ئاوالێک؟ تەنیایی دەتکوژێ. تۆخودا مەڕۆن.»

نازێ پێدەکەنێ. دەستم دەگرێ. چاوە جوانەکانی لە چاوم دەبڕێ. تەنیا لەو کاتانەدا بوو کە من ئەهوەن دەبوومەوە و هەستم بە هیچ چەشنە ترس و ئازار و نیگەرانییەک نەدەکرد. ئەو دڵەڕاوکەیەی لە دەروونم دابوو، دەڕەوی، کە لە چاوی نازێدا نوقم بووم، دەتکوت لە دەریایەکی بێ سنوور و بێ نەهایەتی ئارامیدا نوقم دەبووم من ئەودەم تێی نەگەیشتبووم. بەڵام دوایی زانیم ئەوە چەشنێک خوداحافیزی بوو کە نازێ لەگەڵی کردم. کە ڕۆیشت سوکنایی و قەراری منیشی بە یەکجاری لەگەڵ خۆی برد تا ئەودەم کە عەلیلە و قالە و نازێم لە دەوروبەری بوو هیچ چەشنە ناخۆشی و پەژارەیەکم هەست پێ نەدەکرد. کە نازێ و عەلیلە ڕۆیشتن، تازە تێگەیشتم کە قالە لەخۆم خراپتر، تەنیا قالۆرێکی بۆشی ئیشکی بێ کەڵک بوو و هەرگیز ناتوانێ گۆشەیەکی بچووکم لەو دنیا گەورەیەی کەنازێ و عەلیلە بۆیان ساز کردبووم بداتەوە. سەیر هەستم بە تەنیایی دەکرد. ئێواران کە لە مەدرەسە ڕا دەگەڕامەوە. هەوەڵ شوێنێکی پەنام بۆ دەبرد تا بەڵکوو تێیدا ئۆقرە و ئارام بگرم. چاڵە بەفرەکەی سەرەوەی ڕەزی مەلاشێخی بوو. لەسەر لێوی چاڵە بەفرەکە دادەنیشتم. بەدەس خۆم نەبوو. گریان بە سەرم دا زاڵ دەبوو. دەگریام و دەگریام، تا ئیتر کە فرمێسکێک نەدەما، بێهێز، شەکەت، ماندوو، تەنیاتر لە چاڵە بەفرەکە، وەڕەز لە هەموو شتێک، تەنانەت لە هەڵگرتنی باری قورسی ژیان بەرەوماڵ دەبوومەوە. لەسەر لێواری چاڵە بەفرەکە بوو لە زمانی «نالی»یەوە گوتم: «نەچم شەرتە هەتا ئەم خوارە بێ تۆ» ئەو چاڵە بەفرە نازانم بە هۆی فرمێسکی زۆر و بێئەمان هەر ڕۆژەی من بوو یان بە هۆی نەبوونی نازێ کە بە نازەوە بەدەوری دا دەسووڕاوە

چەپڵەی لێدەدا، تازە بەفری دەخۆیدا ڕانەگرتەوە ببوو بە چاڵە بەفرێکی بێکەس وکار. هەمووی لە دەس چووبوو، بەفر و نازێ و من و پەپوولەکان ئاخ کە «کەسی تێدا نییە ئەم شارە بێ تۆ». ئەوەی لە ماڵدا دەمدیت هەموویان بۆم غەریب و نامۆ ببوون. دانووم لەگەڵ هیچ کام لە خوشک و براکانم نەدەکوڵی. شەو و ڕۆژ لەسەر هیچ و خۆڕایی لە هەموویانم دەکوتا مەشقم نەدەنووسییەوە. دەرسەکانم لەبەر نەدەکردن. بە ئانقەست خۆم بە دەست ئاغای «قاف» بە لێدان دەدا. دەتکوت عەلیلە میراتی وێکەوتنی هەر ڕۆژەی خۆی بۆ من بەجێ هێشتووە یان داوای لێکردووم بۆ ڕێزلێنان لەو ڕەنجەی بە درێژایی ساڵانی ڕابردوو کێشاویێتی، من ڕێگاوشوێنەکەی ون نەکەمەوە، یەک دوو جاران لە تاوان بە بەردرگای ماڵە بووک نازێدا ڕۆیشتم. تا بەڵکوو سوکناییم بێتێ، بەڵام دەتکوت هەرگیز بووک نازێم چاو پێ نەکەوتووە. زۆر نامۆ و نائاشنام دەهاتە بەرچاو، چەند جاران ئیشارەی دامێ بچم گوێزی لێبکرم، نەچووم، لە ڕاستیدا ئیتر وەبەرچاوم نەدەهات. ئێستا کە بیری لێدەکەمەوە، دەزانم کە ئەودەم سەیر عاشقی نازێ ببووم. وەنەبێ پێشتر عاشقی نەبووبم، هەمیشە بووم  و دەبم. ئاخر هەوەڵێ وەمدەزانی لەسەر نەبوونی عەلیلەیە وا هەست بە تەنیایی دەکەم. چونکە عەلیلە بەشێک بوو لە ورە و ئازایەتی و سەرقاڵبوونی ڕۆژانەم. بەڵام وانەبوو زۆرتر لەبەر نەبوونی نازێ بوو، کەم کەم تووشی نەخۆشی بووم، نەخۆشییەکی بەنێو نەخۆشی خۆ نەدیتن! بێزاربوون لە خۆ، خۆ بە کەمزانین. دەتکوت هەمیشە بە دار لە تەپڵی سەریان داوم. لە هەڵدان و گەورەبوون کەوتم، لە خوشک و برا و منداڵەکانی هاوتەمنم وەدوا کەوتم. باڵام لە کورتییدا، تەنیا کارێکی لە دەستم هات ئەوە بوو کە نازێم بردە ژوورر خۆم لە قووڵترین بەشی ڕووح و گیانم دا جێگەیەکی تایبەتیم بۆچێ کرد. کردبوومە ساحێبماڵی وجوودم. هەرگیز بە بیرم دا نایە ساتێکم بەبێ یادی ئەوم تێپەڕاندبێ.

شەوانە تا خەوم لێدەکەوت، ئەڵبەت چ خەوێک ئەوە منم کە ناوی ئەو ئازارەی دەمکێشا نابوو بە خەو، هەر بیرم لێدەکردەوە تا بەڵکو لەخەودا

بیبینم.جارێکیان کە ببوومە پۆلی سێهەمی ناوەندی مامۆستاکەمان شێعرێکی، شێخ ئەبووسەعیدی ئەبولخێری دەخوێندەوە کە لە کتێبەکەمان دابوو:

در دیده به جای خواب آب است مرا  زیرا که به دیدنت شتاب است مرا
گویند بخواب تا به خوابش بینی  ای بی‌خبران چه جای خواب است مرا

هە لەسەر کلاس خۆم و نازێ و خەوەکەم وەبیر هاتەوە فرمێسک بە خوڕ لە چاوم دەڕژا چی نەمابوو ئابڕووم بچێ. دەمکوت دەنووستم تا بەڵکوو لە خەودا بیبینم. بەڵام لە خەوی وا پڕ لە ئازار و ئەشکەنجەدا چ خەونێکی خۆش دەتوانێ سەر هەڵبدا. هەر وەک پێشتریش باسم کردووە من هەمیشە لە جیاتی ئەوەی خەونی خۆم ببینم وێدەچوو زۆرتر خەونی خەڵکی‌تر دەبینم. چون هەر کەسێ دەهاتە نێو خەونەکانی من، بۆم نامۆ و نائاشنا و ئازاردەر بوون. هەتا ئەوی شەوێ کە پێشتر بۆم گێڕانەوە، لە تەورێز لە ماڵە پوورم، نا، وانەبوو، تەواوی ڕووداوەکە لەو ڕۆژەوە دەستی پێکرد کە دوو کچ بە کۆڵانەکەی ئێمەدا تێپەڕین. من کە هەرگیز بە درێژایی ژیانم چاوم پێیان نەکەوتبوو، نازانم یانی ئێستاش نازانم بۆچی ئەو کچەی هەلووکەکە وەپشتی نەکەوتبوو، زیاد لەو هەموو منداڵەی لە کۆڵان‌دا خەریکی کایە بوون، ڕووی لە من کرد ئەڵبەت چاوی لە چاوم بڕی و نەیهێنا و نەیبرد پێی کوتم «بێ‌تەربییەت» کە هەرگیز نەبووم، ڕاستە منیش هەروا چاوم لە چاوەکانی بڕیبوو، بەبێ ئەوەی بە دەست خۆم بێ یان بمهەوێ ئەم کارە نەکەم، من پێشتر ڕووداوەکەم بۆ گێڕاونەوە کە ئەم کچە چلۆن دەستی گرتم و هەر ئەودەم لە کۆڵان ڕا یەک سەر هاویشتمێ نێو شەقامەکانی شار بە دوای خۆیدا کاروپیشەم ببوو بە خولانەوەیەکی ماندوویی نەناسانە بە شوێن ئەودا. هەر کە لە مەدرەسە دەهاتمە دەر و دەچوومەوە ماڵ بە پەلە شتێکم دەخوار و بەرگی تازە و جوانم دەبەر دەکرد و دەکەوتمە گیانی شەقامەکانی شار، یەک بە یەک دەمتەقاندنەوە تا تاریک دادەهات. دەسووڕامەوە وچاوم دەگێڕا تا بیدۆزمەوە. لە یادم نەماوە ئاخۆ بە ئێوەم

کوتووە یان نا، کە من جارێکی تر چاوم پێی کەوتەوە. کەوتمە شوێنی. دەمویست بە ماڵەکەیان بزانم. بەڵام نازانم ئاگادارم بوو یا نەبوو لە پڕ ونم کردەوە و ئێستا ئەوە ڕوو بە رووی من ڕاوەستاوە. بەڵێ ڕاست بۆ خۆیەتی ئاخ  من چەندە بەختەوەرم لە دوای ئەو هەموو گەڕان و گەڕانە دا. دۆزیمەوە، هێزی هەناوی من، ڕووح و ڕەوانەکەم، چوار ساڵ چ زەمانێک نییە کە بتوانێ ئەوەندە ئاڵوگۆڕی سەیر بەسەر کەسێک دابێنێ کە نەتوانی لە یەکەم نیگادا بیناسییەوە. چوار ساڵ ئەوەندە زەمانێکی دوور و درێژ نییە کە کەسێک ئەوەندە پیش بخواتەوە  کە هەر هەڵنەدا، بە شێوەیەکی کەسێکی ئاشناش نەیناسێتەوە. هەر ئەوەندەی ئەو جوان ببوو و باڵای کێشابوو، من وێک هاتبووم و وردیلە ببووم. ڕەنگە هیچی لە من لە یاد نەمابێ یان لەوانەشە هەموو شتێکی لەبیر مابێتەوە بەڵام نەیهەوێ هیچ وەبیر خۆی بهێنێتەوە. چەکەرەی خەمێکی تازە لە دەروونمدا سەر هەڵدەدا. نەکا دۆستی تازەی گرتبێ؟

ئەم جار بە جوانی ناسیمەوە. خۆی بوو، ڕێک بۆخۆی بوو، نازیلە و نازێی من. نازێی وە هەناسەبڕکە کەوتووی نێوکادێنم، نازێی سەری بە درۆشکاوم، بەفری نێو چاڵە بەفرەکەم، نازێی من، نازێی نێو خەون و خەیاڵەکانی زیزونەبان لەمن، نازێ بوو لە بەرگێکی تازە و نوێدا «نازێ»یەکی کە سەیر بۆنی شاری گرتبوو، بۆنی فریو، درۆ و خۆڕانان، خۆ نیشان دان  بە درۆ قاقای بەختەوەری لێدان. نازێی چاوکراوەی چاو جوانی چاو مەست.

چ دەستێکی نهێنی هێنابوویە بەر دەمم. نازێ بوو کە هاتبوو جارێکی تر ونم کا لە خۆیدا، بمتوێنێتەوە دە نیگای نائارام و بەرەڵلای دا. هآتبووە سەر ڕێگای من. من دەڵێم: «لە وانەیە خۆی بە تاوانبار زانیبێ لەوەی کە من هەڵم نەداوە. هاتبوو یارمەتیم بدا تا خۆم بدۆزمەوە. بەڵام دەکرا منێک کە لە سەردەشت خۆم لێ ون ببوو لە سابڵاغ خۆم بدۆزمەوە؟ نازێ ئەم جارەش هاتبوو مان و نەمانم دە دەست بگرێ. هێندێک هەنگاوەکانی شلتر کردەوە. لە ئاواڵەکەی جیا بۆوە. گەیشتمەوە سەری، ئاوڕی لێدامەوە. سەیر ئەوەیە بە

پێچەوانەی من، ئەو منی نەناسیبۆوە، وە هەر وەیدەزانی کە منیش یەکێکم لەو دەیان کەسەی هەر ڕۆژە بوونە گەپچاری دەستی.

: «بۆ وەدوام کەوتووی؟»

چی نەمابوو بێحال بەربمەوە سەر عەرزی. ڕاست بۆ خۆی بوو. لە بری ولاّم تەنیا چاوم لە چاوی بڕی. لە پڕناسیمیەوە.

: «تۆی؟ لێرە؟ تۆ؟»

: «بەڵێ خۆمم تۆچی؟ خۆتی؟»

: «تۆ بۆ وات بەسەر هاتووە؟ نەخۆش بووی؟»

: «نازێ! تۆ بۆ وا بێدەنگ و بێ هەستوخوست جێت هێشتم؟ چۆن دڵت هات بەبێ خوداحافیزی؟ ئەی عەلیلە چۆنی دڵ هات؟»

: «چەند جاران بە بەر درگاکەتان دا هاتم. دەمەویست پێت بڵێم کە ناچارین لێرە بڕۆین تۆم نەدەدیت. نەمویست بە خوشکت بڵێم.»

: «نازێ! نازانی ئەودەم تۆ منت کوشت. هەرگیز خۆم نەگرتەوە. هیچ دەزانی کاتێک بێخەبەر دڵت بردم من ماوەی ئەو چەند ساڵە بەبێ دڵ چم بەسەرهات؟ باجە فاتێ چۆنە؟ کەژاڵ و دوو خوشکە چکۆلەکەی ترت چۆنن؟ ئەی لە عەلیلە چ خەبەر؟ لە کوێیە؟ چ دەکا؟ ئەی ماڵتان لە کوێیە؟ خۆت کە دەزانم خەریکی خوێندنی. پێم بڵێ پۆلی چەندی؟ چ دەخوێنی؟ باجە فاتێ پشتی چۆنە؟»

نازێ تەنیا چاوم لێدەکا، بزەی دێتێ. هەمان بزەکەی جارانە. هەمان دوو چاڵە بچووکە جوانەکەی دوولای ڕوومەتی.

: «نازێ! زۆر پرسیارم هەیە.»

: «ناتوانم، ئێستا ناتوانم قسەت دەگەڵ بکەم، ئەوە ئاواڵەکەم هاتەوە. دەمانبینێ. پێی ناخۆش دەبێ. کاتێکی تر دەتبینمەوە. منیش پرسیارم لێت هەیە.»

: «باشە باشە. بەلاّم تا جارێکی تر دەتبینمەوە لانی کەم ولاّمی ئەم پرسیارەم بدەوە. پێم بڵێ چەند مانگ لەمەوبەر کە لەگەڵ ئەم ئاواڵەت بە کۆلاّنەکەی ئێمەدا ڕادەبردی کاتێک لە نەکاو هەلووکێک وەپشتی ئاواڵەکەی

تۆ کەوت تۆ بۆچی زیاد لە هەموو ئەو منداڵەی لە کۆڵان دابوو ڕووت لە من کرد و پێت کوتم «بێتەربیەت» لە حالێکدا من هیچ سووچ و تاوانێکم نەبوو.»

دیسان پێکەنی: «ئەی خودایە گیان تۆ شتی چەندە جوان ساز دەکەی.»

کوتی: «ئەگەر باوەڕم پێدەکەی بۆخۆشم نازانم بۆ وام کرد. تا چاوم وەچاوت کەوت، هەستێکی سەیر ئاشنام پەیدا کرد. هەستێکی وەک وەخەبەرهاتن، ڕاستبوونەوە، لە خۆڕا پێم خۆش بوو دەنگت بدەم. بتدوێنم، بەڵام تۆ هەر هیچت نەگوت. تەنیا بە زارێکی ئاواڵەوە چاوت لە من بڕیبوو. نیگات بۆ من زۆر ئاشنا بوو. ئاشناتر لەوەی یەکەم جار بێ کە بتبینم. کە لە کۆڵان تێپەڕیم ئەو ئاواڵەی لەگەڵم بوو، پێشی پێگرتم، ئەگینا بەنیاز بووم بگەڕێمەوە تا بە بیانووی داوای لێبوردن چاوم سەر لە نوێ پێت بکەوێتەوە. هەر لەو ڕۆژەوە کە لە ماڵ دەهاتمە دەر هەر چاوم دەگێڕا تا بەڵکوو ئەم نیگا ئاشنایە بدۆزمەوە. بەڵام هەرچی چاوم دەگێڕا تۆم وەبەر چاوت نەدەهات. بزەیەکی مردوو بە نابەدڵی خۆی هاویشتە سەر لێوم کوتم: «هیچ دەزانی نازێ! چیت پێ چێشتووم؟ یەک دنیا قسە و باسم پێیە.»

: «دەڵێ زۆر باشە. دڵنیا بە. زۆر زوو یەکتر دەبینینەوە.»

من لێی جیا دەبمەوە لە حالێکدا نازانم لەمەو بەدواوە لەگەڵ خەونە ڕاستەکانی خۆم چ بکەم؟!

***

## ٤٦

...... ڕەنگە هۆی سەرەکی لەجێداکەوتنی خاتفاتێ بگەڕێتەوە سەر غەفوورەگێڕی کە بە پێلاقە و قۆڵنج شکاندنەکەی ئەو بەڵایەی بەسەر هێنابوو، دیارە کەسیش نەبوو گومانی لەوە هەبێ. بەڵام وێدەچێ هۆیەکی شاراوەی دەروونی و نابەئاگا، دەرفەتی ئەوەی دابێ بە خاتفاتێ کە بە ڕۆژایی ڕۆژ و بە شەوایی شەو جیهانێکی خەیاڵاوی، پڕپڕ لە خۆشی و حەز و خۆشەویستی بۆخۆی وەک تاکە کەسێک پێک بێنێ. جیهانێکی تایبەت بە تاکە کەسێک، سەییارەیەکی بچکۆلانە کە پانتاکەی بە قەرا سوورە چۆم بوو. ئەم سەییارە بچووکە سەرەتاکەی لەسەر کانی کەوان ڕا دەستی پێدەکرد. هەر ئەو کانییەی کە دەیان جار وێنەی خۆی و کاوەیسی بە یەکەوە لەسەر ئاوە ڕوونەکەی دەکێشاوە کە تەنیا بۆماوەی یەک چرکە دیار دەبوو. دەنا وەک بلّق بە هەرگۆزە و دیزە و دەفرێک کە ژنان و کچانیتر لە کانییەکەیان ڕۆ دەکرد دەتەقی، تەنیا خۆشییەکی نامۆی لە لەشی داگیرساوی فاتێدا جێ دەهێشت. ئەم سەرەتایە لە کانییەکە جێ دەما، کووچە باخێک لە دوای ئەوان وەڕێ دەکەوت ئەوبەر ئەوبەری پەرژین بوو لە توودڕک و بەڵاڵووک و گوڵی هەمەڕەنگ کە میلیان لەنێو توودڕکەکە قوت کردبووە، ئەوەندە زۆر بوون کە توودڕکەکان وەبەرچاو نەدەهاتن. ئەم کووچە باخە کە دەگەیشتە جۆگەلە ئاوێک خۆی خلاس دەکرد. پردێکی بچووک دوو لێواری لە یەک زیزی جۆگەلە ئاوەکەی ئاشت دەکردەوە، بە زۆری زۆرداری دەبوو ناوی بنێی پرد، ئەگینا دوو کۆلکەداری ئەستووری ناڕێکبوون کە ناچار کرابوون بە هەموو جیاوازی قەوارەیانەوە بە زۆر یەکتر لە ئامێز بگرن. لە پردەکە کە تێپەڕیبای دەبوو بە قەراغ دیواری ڕۆژهەڵاتی مزگەوتدا ڕۆیشتبای تا

ڕێگات کەوتبایە نێو کووچەیەکی باریکی تەنگەبەر کە ئەگەر بەلای چەپی کووچەکەدا لێهالابای دەگەیشتییە کووچەیەکی پان کە دەرگای چوارەم لە لای ڕاستەوە ماله کاوەیس بوو. دوو درگا خوارتر بە بەری ئەولاوە ماڵە فاتێ بوو. فاتێ دەیان جار ئەم ڕێگایەی پێوابوو. مەودای نێوان ماڵە خۆیان تا سەرکانی کەوان هەمیشە بە یەک ئەندازە بوو گەزێک ئەم بەر ئەوبەری نەدەکرد. مەگین ئەو کاتانەی کە دەیزانی کاوەیس بە دواوەیەتی. هەرچی هەنگاوی خۆی شلتر دەکرد، کە ڕێگایەکەی دوور ببێتەوە، کەچی ڕێگایەکەی کورتتر دەبووە. ئەمە دژ بە مەنتیق و زانست بوو. زەمان ئاڵوگۆڕی بەسەردا دەهات چونکە مەودای نێوان دەیاردەکان دەبەسترانەوە بە هەستی مرۆڤ و لەگەڵ ویستی مرۆڤەکان دەبوونە دژبەیەک، وا وێدەچێ کە چاوەڕوانییەکانی ئێمە قورسایی دەخەنە سەر میلەکانی کاتژمێر، واتا هەتا تامەزرۆ بین و پێمان خۆش بێ زەمان زووتر تێپەڕێ. درەنگتر تێدەپەڕێ. بە پێچەوانەوە هەرچی پێمان خۆش بێ زەمان درێژخایەن بێ. زۆرتر لە کورتی دەدا. تۆ پێت خۆشە لەو شوێنەی کە خۆشت بۆ دەگوزەرێ زۆر بمێنییەوە کەچی هەتا سەر هەڵدێنی دەبینی وەک برووسکە زەمان تێپەڕیوە و وادەی ڕۆیشتنت هاتووە. بەڵام لەو شوێنەی کە خۆشت بۆ ناگوزرێ. هەرچرکەی بە قەرا یەک ساعەت لەبەریەک دەکشێتەوە و دەبینی زەمان لە پێ کەوتووە و هەر ناڕوا، ئەوە دەر دەخا کە خۆشی و ناخۆشی ژیان ئاڵوگۆڕ بەسەر ڕەوتی زەماندا دەهێنێ. هەمیشە فاتێ سەری لەوە سوڕمابوو بۆ کاتێک کاوەیس بە دواوەیەتی، هەر بڵێی یەک و دوو دەگەیشتە بەر درگای ماڵیان، یان گەیبووە سەرکانی. هەموو جارێ دوو قسەیان بە تەواوی نەگەیاندبووە یەکتر کە لەپڕ فاتێ دەیکوت: «کاوەیس بۆخاتری خودا بکشێوە. براکانم بمانبینن شل و کوتمان دەکەن.»

کاوەیس هەموو جارێ کە ئەم قسەیەی لە فاتێ گوێ لێدەبوو پێدەکەنی و ئەو بەیتە شێعرە فارسییە کە لە مزگەوت لە زاری مەلای گوێ لێ ببوو و هێندەی خۆ لەگەڵ ماندوو کردبوو تا لەبەری کردبوو بۆی دەخوێندەوە. هەڵبەت ئەو لەبەرکردنەی دەگەڕاوە تەمەنی حەوت ساڵانەی.

سر که نه در راه عزیزان بود        بار گرانیست کشیدن به دوش

فاتێ کە لێی تێ نەدەگەیشت سووکە ئاوڕێکی لە کاوەیس دەداوە و دەیگوت «چت گوت؟»

: «هیچ فاتێ گیان! دەڵێم کە وابوو، با شلەکەی وەبەرمن بکەوێ و کوتەکەی بەشی تۆ بێ»

فاتێ هەموو جارێ دەبوو بە گوڵێکی سوور  سوور سوور، دەسبەجێ دەپشکوت گەش، گەش، گەش.

بەڵام ئێستا کە فاتێ وەها زەوی لە ئامێز گەرتبوو کە بە کەس لە باوەشی دەرنەدەهات. هاوکات چارەنووسی ئەم سەییارە بچکۆلانەی گرتە دەست خۆی و بە کەیفی خۆی بە دەوری تەوەرەی دڵخوازی خۆی دا، دەیسووڕاند. هەر جێگەیەک یان هەر کاتێک پێی خۆش با، یان بە پێویستی زانیبا، لە گەڕی دەخست. فاتێ بە درێژایی ئەوساڵە تفت و تاڵانەی خستبوویە نێو ناسنامە شڕودڕاوەکەی، بە غەیری خۆی و بیرەوەری کاوەیس هیچ کەسی تری لەم سەییارە بچووکەدا نەهێشت. لە ڕاستیدا ئەم گۆیە بچووکە تەنیا دوو کەسی تێدا دەژیا. خات فاتێ بە پشتی ناپشتی خۆی و بە ڕەنجێکی زۆرەوە هەموو جێگای سەییارەکەی بە گوڵ خەملاندبوو. ڕۆژ نەبوو کاوەیس بۆ نەهار خواردن بانگ هێشتن نەکا. هەر لەبەر درگای ماڵە خۆیان بەڕەیەکی بۆ ڕادەخست. ئەوەی خودا لەسەر زەوی دابنابوو ئەو یەکجێ هەمووی بۆ کاوەیس دادەنا. کاوەیس کە دەهات، بەرەولای دەچوو. بەبێ ترس لە براکان و باوکە بێ ڕەزاکەی، لە ئامێزی دەگرت. نیگەرانی هیچ کەس نەبوو. چون کەسێکیتر ئیزنی نەبوو پێی دەسەییارەکەی ئەوان بنێ. ڕووبەرووی یەکتر دادەنیشتن  و هەزاران هەزار جار خۆیان لە یەکتردا دووپات دەکردەوە. هەموو جارێ کاوەیس پرسیاری لێدەکرد: «فاتێ گیان! بۆ هێندە دەستت بە پشتت دەگری؟»

فرمێسکی فاتێ ئابڕووبەرەتر لەوە بوو کە کاوەیس باوەڕ بەم قسەیەی فاتێ بکا.

: «کاوەیس گیان! خۆ هیچ عەلەمی خودام لێ نییە. تەنیا کەمێک لە کاران ماندوو بووم.»

: «نا فاتێ! تەنیا لەبەر ئەوەی من نیگەرانت نەبم، ماندوو بوون دەکەیە بیانوو، دەزانم هۆیەکەی تەنیاییە. تۆ تەنیای. تەنیا تەنیا.»

خات فاتێ دەیکوت: «من هەمیشە تەنیا بووم، تەنیا تەنیا. نە بابێک کە باب بێ، نە دایکێک کە نەختێک بیرەوەریم لێی هەبێ، نە خوشکێک. نە برایەک وەک پشتوپەنا و نە کەس وکارێک.»

بیری گەڕاوە لای کاوەیس. ماوەیەک بوو بیری کآوەیس وازی لێنەدەهێنا. هەر لە دەرفەتێک دەگەڕا بۆ وەگەڕ خستنەوەی ئەم سەییارە بچووک و تایبەتییە. لە خۆی پرسیار دەکا: «ئەرێ ئەگەر کاوەیس زیندوو بوایە دەبوو ئێستا ڕوخساری چ ئاڵوگۆڕێکی بەسەردا هاتبا؟»

بیست ساڵ تەمەن. ئەگەر دڵخۆشی و بەختەوەری لە ئارادا نەبێ دەبێ چ بەسەر جوانی مرۆڤ بێنێ؟ ئەمە تەواو و پڕ بەپێستی ئەو پرسیارە نەبوو کە ئەودەم فاتێ لە خۆی پرسی، بەڵکوو لێکدانەوەی پرسیارەکەی «فاتێ»یە ئەو جۆرەی کە لەبیرماوە. فاتێ بە شوێن پرسیارەکەی هەر ڕۆژەی، کاوەیسێکی لە زەینی خۆیدا ساز دەکرد. کە کآوەیسی هیچ ڕۆژێکی وە کاوەیسی ڕۆژەکەی تری نەدەچوو. سەری سوڕ مابوو لەو هەموو وێنەیانەی بە درێژایی زەمان لە زەینیدا پێک هاتبوو. کاوەیس لە زەینی فاتێدا ببوو بە هەزار کاوەیس، هەزار وێنەی جیاواز لە یەکتر، لە کەسێکی کە بە درێژایی ژیانی شوێنێکی هەتا هەتایی خستبووە سەر فاتێ، ئێستا کە ئیختیاری ئەو وێنەیانە لەدەس فاتێدا نەمابوو. وەخۆ دەهاتەوە. ماوەیەک بوو. خۆی لە ئاوێنەدا نەدیتبوو. لە ڕاستیدا نەیدەویست چاو لە خۆی بکا. سامی لە خۆی دەکرد. دەترسا ئەوەندە تێک چووبێ کە خەیاڵەکانیشی ڕوخساری ئەوساتەی نەناسنەوە و دەستی تەنیایی ئەو نەگرن و ئیزنی

گەڕان و سەفا و سەیرانی نەدەنێ لە باخی هەمە ڕەنگی خۆشی خەیاڵەکانی. جار جارە کە غیرەتی وەبەر خۆی دەنا و ئەو پرسیارەی لە خۆی دەکرد.

: «ئەرێ ئەگەر ئێستا کاوەیس زیندوو بوایە و لەم جێگە و بانە و بەم ڕوخسار و دیمەنەوە منی دیتبایە، بڵێی چەندە واقی وڕمابا؟»

هەر بۆخۆی وڵامی خۆی دەداوە:

: «ئەگەر من لە جیاتی کاوەیس بووبام بێگومان ڕووم وەردەگێڕا و بۆی دەردەچووم و هەرگیز ئاوڕم نەدەداوە.»

لەپڕ فاتێ دەستی دڵی خۆی بە توندی ڕاکێشا و بە دڵی کوت: «دا ڕاوەستە بزانم تۆ باسی چی و کێ دەکەی؟ وێدەچێ بۆنی دڵداریشت پێنەگەیوە. تۆ پێت وایە کەئەوین و خۆشەویستی لە چەند چین و گنجی نێوچاوان و چەند تاڵەمووی سپیدا ون دەبێ؟ دەی کەوابوو دەبێ بڵێین خۆشەویستی و عیشق و ئەوین دەبێ تەنیا لە سەردەمێکدا و بۆ ماوەیەکی کورت مانای هەبێ. هەرکە سەردەمەکە بەسەرچوو دەبێ ئەوینەکەش لەناو بچێ هەروەک بەفری بەرخۆر؟ یانی دەبێ بڕوا بە وەی بێنین کە تەنیا مرۆڤی کەم تەمەنی لاو و خاو، شیاوی عیشق و ئەویندارى و خۆشەویستین. هەر ئەوانەی کە ڕوخساری جوان و بێگەردیان هەیە؟»

خات فاتێ بێزی لەم چەشنە بیر و فیکرکردنەوە هەستا. زۆر جار کە لەگەڵ کاوەیس قسەی دەکرد. دەیکوت: «کاوەیس گیان! ئەگەر هات و ڕۆژێک ئەمن گول بووم تۆ چ دەکەی؟ وازم لێ دێنی؟»

کاوەیس بە بزەوە دەیکوت: «دەی دیارە وازت لێدێنم. ئەودەم کە تێرووپڕ دەمم بە برینەکانتەوە نا و تێر تێرم هەڵمژین و منیش گول بووم وازت لێدێنم تا بە ئختیاری خۆت سەرپشک بی کە گولێک ڕێ دەدەی لەگەڵت بێ بۆ هەمیشە یان وازی لێ دێنی؟»

فاتێ بەخۆی دا شکاوە بۆ ئەو فیکرە و خەیاڵە ناخۆشانە. ئەوە ڕاستەقینەیەکە هەر مرۆڤێک کە لە خۆشەویستی دڵدار و ئەویندارەکەی شک بکا، خۆی لە زاتی خۆیدا دەتوانێ هەڵگری ئەو مانایە بێ کە ئەوینەکەی

خۆی ڕاستەقینە نەبووە و خەوش و خاڵی تێدابووە. لەپڕ لەرزێک سەرتاپای ئەندام و ئازای لەشی فاتێی تەنیۆوە و دەستی کرد بە سەرکۆنە کردنی خۆی.
: «دەک دەری بابانت وێران بێ فاتێ. هەناوت نەمێنێ تۆش دەڵێی عاشق و دڵدار بووی؟ ئەو بێگوناحە لەبەر خۆشەویستی من ئەو چارەنووسە ڕەش و تاڵەی بە نەسیب بوو. نەمکرد وەدوای بکەوم. ئاخر بزانم مردووە یان زیندوو؟ نەمکرد یەخە و بەرۆکی خۆم لەبەر زوڵمی برایان دابدڕم، نەمکرد جارێک لە تاو کاوەیس قوڕی عالەمێ وەسەر خۆم بکەم. نەمکرد بکەومە تووک و دۆعایان لە سەبەبکار و باعیسکاران. نەمکرد پێش بە برایان بگرم و لێیان بپرسم لەسەر چی ئەو پەندەیان بەسەر کاوەیسی من هێنا. نەمکرد لێیان بپرسم بە چ تاوانێک ئەو ئاورەیان لە دەروونی من بەردا. نەمکرد بۆخاتری کاوەیس ڕوو لە کێو و سەحرایان بکەم یان خۆم لەناو بەرم. لەپڕ ڕوخساری کاوەیسی هاتەوە بەر چاو کە ئەوە بە چەند برایان کەوتوونە گیانی.
لە پاش کوژاندنەوەی ئاوری شەڕەکە، ڕۆژێک فاتێ لە زمانی سۆفی حەسەنی بیستبوو ئەودەم کە براکانی کاوەیسیان خستبووە ژێر شەپ و مست و گۆپاڵ، هەر ئەودەم کاوەیس تکای لە براکانی فاتێ دەکرد کە فاتێ لەم ڕووداوەدا بێ تاوانە و خۆی تێنەگەێنن. سۆفی حەسەن ئەو قسەیەی لە یەکێک لە براکانی فاتێ بیستبوو. ئێستا حەمە قاچاخچی نەکوژرابوو کە سۆفی حەسەن ئەو قسەیەی بە فاتێ کوتبوو. فاتێ هەستی کرد هەرگیز نەیتوانیوە بگاتە ئەم ڕادە لە خۆشەویستییە. بەرانبەر بە گەورەیی ڕووحی کاوەیس خۆی بە شەرمەزار دەزانی. کە وای هەست کرد خۆی لەم ڕووداوەدا بەبێ تاوان نەدەزانی. کاوەیسی کە بۆ هەمیشە لە قیس چووبوو[٦٢]. فاتێ درەنگ زانیبووی کە براکانی بۆیە ئەو بەڵایەیان بەسەر کاوەیس هێنابوو کە ئامینە شەل تۆمەتی ئەتککردنی فاتێی لێدابوو. فاتێ ئەجەلی نەهاتبوو بۆیە براکانی نەیانکوشت هەڵبەت تکای مەلا و هەمزاغا و

---

٦٢- لەقیس چوون: لەکیس چوون، لەدەست چوون.

دەس بە قورئان دادانی خۆی بوو بە سەبەب هەرچەند ئەو دەم لە مردن ڕزگار بوو، بەڵام لە دوای ڕزگاربوونی گیانی، ڕۆژ نەبوو کە ئاواتەخوازی مەرگ نەبێ. ئێستا کە ساڵانێکی دوورودرێژ بەسەر ئەو کارەساتەدا تێپەڕیوە. ئێستا کە لە پێکەوتوو لەنێو جێگەوبانی هەمیشەیی‌دا خەریک بوو بێزی لە خۆی دەکرد. کە چۆن بۆ پاراستنی گیانێکی ناقابیل و ئازارکێش و تەنیا چەند ڕۆژ پتر ژیانی مەینەت‌بار و ناخۆش لەگەڵ حەمەناحەز، خەیانەتی بە ئەوینی خۆی کردووە بەخۆی دەکوت:« ئەگەر تەنیا جارێکی‌تر چاوم بە کاوەیس کەوتباوە، خۆم دەخستە ژێر پێی و ژیانم هەموو پێشکەشی دەکرد. تەنیا بە مەرجێ کە بڵێ منی بەخشیوە.»

کاوەیس ساڵهای ساڵ بوو کە فاتێی بەخشیبوو. خۆشەویستی فاتێ لەنێو دڵی کاوەیس‌دا، ئەوشتە نەبوو. زەمان، یان شوێن و مەکان، یان ڕووداو و کێشەکانی ڕۆژانە ئاڵوگۆڕی بەسەردا بێنێ.

فاتێ بولبولێکی دەنگ خۆشی پڕ نەخش‌ونیگار بوو کە لە باخێکی بەهەشتی‌دا کە کاوەیس لەنێو دڵی خۆی‌دا چێی کردبوو، دەژیا. کاوەیس لەمێژ ساڵ بوو عادەتی کردبوو کە لەگەڵ بیرەوەرییەکانی فاتێ ژیان بەرێتە سەر.

***

## ٤٧

...... کەریم چیوا کەمتر لە باقی نەترسابوو. ڕەنگە ئەودەم کە دەنگی باقی دا کە بێدەنگ ببێ، زۆرتر بۆ شاردنەوەی ترسەکەی خۆی بوو، بەڵام ئەو هاتوهاوارەی باقی دەیکرد مەودایان بەترسەکەی کەریم نەدەدا کە ئاشکرا بێ و خۆی بنوێنێ. باقی یەک بە خۆی هاواری دەکرد، «ئەی بابەگیان! لە کوێی؟ بە خودای ئەوە لێرە دەمانکوژن. ئەی خودایە نازانم ئەمن بۆ ئەوەندە کەر بووم. وەدوای کەریم کەوتم. بابە بە خودای دەزانم ئەمن تازە ئەتۆ نابینمەوە.»

: «باقی! خەجاڵەتێ بکێشە. عەیبە ئەو هاتوهاوارەت بۆ داناوەتەوە. ئەوە خۆشت بە پیاو دادەنێی؟ چەندەم پێکوتی لەگەڵم مەیە. نەمکوت ئەم ڕێیە گەلێک پڕمەترسییە؟ تۆ بۆ دەهاتی. خۆ هیچ گیروگرفتێکت نەبوو. بابی چاک، دایکێک کە یەک شەو بەبێ تۆ هەڵینەدەکرد. ئاخر لەچت کەم بوو. بۆ لە خۆڕا وەدوام کەوتی؟ لەبیرت چۆتەوە پێم گوتی: باقی! لەوانەیە ماندوو بین، برسی بین، تینوو بین. تەنانەت لەوانەشە بشکوژرێن. تۆ دەتکوت:

: «دەزانم کەریم! خۆ منداڵ نیم. من ئەوانە هەموو دەزانم، پێم خۆش نییە هەرگیز تۆ بەجێ بهێڵم. مەگین پێکەوە پەیمانی برایەتیمان نەبەست. کە لە خۆشی و ناخۆشی یەکتری بەجێ نەهێڵین. دەجا لەسەر تۆ هەرچی بەسەرم دێ با بەسەرم بێ. ئێستاش باقی گیان! لەجیات ئەو هاتوهاوارەت شوکری خودا بکە کە ئێستا زیندووین. هێندێک بێدەنگ بە، با بزانین خودا چمان بەسەر دێنێ.»

هەر لەو کاتەدا هەمان دەنگ کە پێشتر دەنگی دابوون وەدەنگ هاتەوە: «کوڕە ئەوە خەجاڵەتێ ناکێشن ئەو نووزە نووزەتان لە چییە؟ پێم بڵێن بزانم

کێن و لێرە چ غەڵەتێکی دەکەن؟ خۆتان بە سینگە خشکە بخشێنن. وەرن بۆ لای من، بەڵام سەرتان زۆر بەرز مەکەنەوە. دەنا دەپێکرێن.»

کەریم، باقی هان دا بەدوای دا لەسەر زەوی بخشێ. باقی بە کەریم دەڵێ: «کەریم! خۆ ئێمە نازانین ئەوە کێیە؟، وەرە با بە قسەی نەکەین و نەچین، هەر بەو ڕێگایەی دا کە هاتووین بگەڕێینەوە. لەوانەیە ئەوانە بۆخۆیان بمانکوژن.»

: «باقی! هەرگیز نەمدەزانی تا ئەو ڕادەیەی ترسەنۆک و خوێڕیی. ئاوام نەدەناسی پێم وابوو کوڕێکی زۆر ئازا و بەجەرگی.»

: «کەریم! بە خودای بەدەست خۆم نییە. ئازای لەشم دەلەرزێ تۆخودا باس مەکە پێم وایە خۆم پیس کردووە.»

: «باقی! بڕوام پێبکە هیچ شتێک ڕوو نادا. تۆ پێت وایە ئەمن ناترسم؟ زۆریش دەترسم، بەڵام لەخۆڕاش هاتوهاوار ناکەم. چون هاتوهاوار کردن دەبێتە هۆی ئەوە کە ترسەکەی مرۆڤ چەند بەرانبەر بێ، من دڵنیام ئەوانە هیچ کارێکیان بە ئێمە نەداوە، لەوانەیە یارمەتیشمان بدەن، من هەست دەکەم ئەوانە پێشمەرگەی مەلا مستەفان و خەریکی شەڕ لەگەڵ بەعسییەکانن، نیگەران مەبە، وەرە بە دووم‌دا. جێی خۆیەتی کە بچین تێکەڵیان بین. مەگین لەبیرت چۆتەوە. ئێمە هەر لەبەر ئەوە هاتبووین کە بچین تێکەڵ بە پێشمەرگەکانی مەلا بین؟»

باقی کەمێک ئارام بۆوە. بە دوای کەریم دا دەخوشی چەند میترێک کە داکشانە خوار هەر ئەو جۆرەی کە دەنگەکە پێی کوتبوون هەمان دەنگ کوتی: «جا ئێستا بە قەراغی ئەو بەردە گەورەیەدا ئەوجار هەڵکشێن بۆ لای سەر.»

گرمە و تەقە هەروەک برێشکە هەر دەهات و زۆرتر دەبوو. ویزە ویزی گوللە کە وەدار و بەرد و گەڵا دەکەوت، پڕیشکەی داروبەردی بۆ هەر لاوە بڵاو دەکردوە، باقی چەند هێندەی تری لە گەڕووی ڕەشی ترس ڕۆکرد. بە ڕاستی ئیتر خۆی بۆ ڕانەدەگیرا، بە بانگ و سەڵا دەگریا. کەریم کە وەپێش کەوتبوو. خۆی هاویشتە ئەودیو ئاوێرە بەردەکە. چاوی بە ڕێزێک پێشمەرگە

کەوت کە نوقمی چەک و چوڵ، هەریەک لە پەنایەک لەسەر زەوی ڕاکشابوون و بەرەو ڕووی دوژمن تەققەیان دەکرد. یەکیان کە لە هەموان بە کەریم نزیکتر بوو کوتی:

: «وەرنە پێشتر بزانم ئێوە کێن؟ لەو کێو و دۆڵ و بەندەنە لەچی دەخولێنەوە؟ پێم بڵێن بزانم لەبەرچی ڕێگاتان کەوتۆتە ئەو جەهەندەمە؟ مەگین نازانن ئێرە بەرەی شەڕە و ئێوە بەڕاستی گیانتان لە مەترسی کەوتووە؟ پێم سەیرە چۆنە تاکوو ئێستا زیندوو ماون؟»

ئەوە وڵامی کەریم بوو هەڵبەت چ پێویست بە کوتن نەبوو چون هەموو دەزانن بەو حاڵ و وەزعەی باقی هەیبوو دیار بوو کە ناتوانێ وشەیەکی لە زاری بێتە دەر.

: «ببوورە کاکە! ئەو هاواڵەم هێندێک ترساوە.»

هەمان دەنگ کوتی: «ئەتۆ وڵامی پرسیارەکەی منت نەداوە. ئێوە کێن؟ لێرە چ دەکەن؟»

کەریم تێمابوو، نەیدەزانی دەبێ ڕاستی پێ بڵێ یان درۆیەک ساز بکا.

بە ناچار نیوەڕاستێکی کوت: «خەڵکی ئەم وڵاتە نیم. هاتووم مامم کە لێرەیە بدۆزمەوە بابم ناردومی. دەبێ هەواڵێکی بدەمێ.»

: «بێت و نەبێ بابت پیاوێکی عاقل نییە. یان دەبێ زۆری ڕق لەتۆ بووبێ. بڵێ بزانم خەڵکی کوێی؟ مامت کێیە و لێرەچ دەکا؟»

: «من و باقی لە سەردەشتێ ڕا وەڕێ کەوتووین. مامم ناوی حەسەنە. حەسەن بانەیی پێدەڵێن و لە شۆڕش دایە. لەگەڵ پیاوەکانی مەلا مستەفای دەبێ.»

کابرا چاوی شک و گومانی لە کەریم بڕی.

: «کێ ئەو قسە قوڕانەی فێر کردووی کوڕە! بابت مەگین شێتە کە منداڵێکی وەک تۆ داوێتە نێو ئاور؟ ڕاستییەکەم پێ بڵێ، دەنا هەر لێرە کەوڵتان لە حاجەت دەخەم.»

: «کاکە! بڕوام پێ بکە درۆیە ناکەم، چاو لە قەڵافەتم مەکە منداڵ نیم. دەتوانی لەو ئاواڵەم بپرسی بزانە من چەند ساڵم. من تەنیا چەند مانگم ماوە

ببمە حەفدە ساڵ.» کابرا کە حازر جوابی کەریم کەوتە بەردڵی کوتی: «دەی باشە ئێستا پێم بڵێن لەو چول و بەندەنە چ دەکەن؟»

کەریم کوتی: «بڕیار وابوو دۆستێکی بابم بە ناوی مەلا برایم ئێمە بباتە لای مامم، چونکە کاری بە پەلەی هەبوو. دەبا چووبا بۆ سەردەشت، ئێمەی بە کەسێکی تر ئەسپارد بەڵام چۆن دەیکوت تا مەلا برایم نەیەتەوە، نابێ بچن بۆ هیچ شوێنێ، منیش دەبوو زوو مامم ببینمەوە خۆمان ملی ڕێگامان گرتە بەر، بەڵام وا بزانم لە ڕێ هەتەڵە بووین. ماوەیەک بوو هەروا دەڕۆیشتین. نەمان دەزانی ڕوومان دەکوێ کردووە. زۆر برسی و تینوو بووین لەبەر ماندوویی خۆمان لەبن نیسێی ئەو بەردە هاویشتبوو کە ئێوە دەنگتان داین.»

کابرا پرسیاری لێکرد: «مەبەستت مەلا برایمی سوورە چۆمە؟»

کەریم هەر لە خۆڕا کوتی: «بەڵێ مەبەستم مەلا برایمە.»

: «زۆر سەیرە مەلا برایم و ساویلکەکاری؟ هەرگیز یەک ناگرنەوە، یانی مەلا برایم ئێوەی بە کەسێک ئەسپاردووە کە نەیتوانیوە ئاگاداری لە دوو منداڵ بکا، من باوەڕ ناکەم!»

کەریم هەڵیدایە و کوتی: «کاکە! ببوورە، عەرزم کردن ئەمن منداڵ نیم. هێندەم نەماوە ببمە حەڤدە ساڵ.»

: «ڕۆڵە گیان! ئەو ئاورەی تێیکەوتووی لێت ناپرسێ چەند ساڵی تا پڕت داتێ.»

: «ئێمە هەمووومان هەر منداڵێن، ئێستاش ئەوەندەی لە دوو مەدە. هەر لێرە لە پەنایەکی خۆتان حەشار دەن. با بزانین دەتوانین ڕێگایەک بۆ دەربازبوونمان بدۆزینەوە.»

: «کوڕە! ئەتۆ! وەرە پێش بزانم، ئەتو نێوت چییە؟»

: «باقی»

: «باشە باقی! کوڕە شوورەییە. ئەو هاتوهاوارەت لەچییە لانی کەم چاوێک لەو خڕناڵەی بکە. عەیبە دوو قەڵافەتی ئەوت هەیە.»

کەریم کوتی: «کاکە! ناوی من کەریمە، خڕناڵ نییە.»

: «دەی باشە خڕناڵ! با ناوت کەریم بێ خڕناڵ.»

کەریم زەردەیەکی هاتێ: «کاکە! بە دەستی خۆی نییە وا دەکا، قەت شەڕوگرمە و هەرای نەدیوە.»

کابرا پێکەنی و کوتی:« دەی خڕناڵ! تۆ پێم بڵێ لە کوێ شەڕ و تەقە و گرمە و هەرات دیوە؟»

: «منیش هەرگیز نەمدیوە. بەڵام بەئەقڵم دەمزانی دەبێ شتێکی ئاوا ناخۆش بێ.»

هەر لەو دەمەدا گوللە تۆپێک لەلای ڕاستیان کەوتە نێو دارستانەکەوە چی نەمابوو بە گرمەکەی گوێیان کەڕ بێ. تۆز و خۆڵ و داروبەرد بڵاو بووە ئەو کەسەی کە لەگەڵ کەریم و باقی دەدوا. وێدەچوو سەرکردەیان بێ. هەر لەوێڕا هەرای کرد: «کوڕینە زوو جێتان بگوێزنەوە. وا وێدەچێ جێگەی ئێمەیان دۆزیبێتەوە، بخزێنە ئەو باسکەیتر. دەی زوو دەست ببزێون.»

یەک جێ دەیان پێشمەرگە کە پێشتر وەبەر چاوی کەریم و باقی نەکەوتبوون وەجووڵە کەوتن وەهایان خۆ بە گەڵا و لقوپۆپی داران شاربۆوە هەرکە جووڵانەوە، دەتکوت ئەوەی دار و دەوەنە یەکجێ وەجموجۆڵ کەوت. لە بەر گەلا و پەلکی داران کە لە خۆیاندابوو وەبەر چاو نەدەهاتن، ئێستا کە دەخزین بۆ لای چەپی دارستانەکە، دەتکوت بەشێک لە دارستانەکە وەڕێ کەوتووە. کەریم و باقی چاویان لە ئەوان کرد و داخزان. هەمان سەرکردە حەولی دەدا بەو بێسیمەی بە دەستییەوە بوو پێوەندی لەگەڵ بنکەکەیان بگرێ و داوای یارمەتی بکا. بەڵام وێدەچوو پێوەندی بۆ نەدەگیرا، چەپ و ڕاست بە قسە و دروشمدان تین و گوڕی دەدا بە چەکدارەکان. باقی هەروا لە گێژاوی ترس دا پەلاقاژەی دەکرد. ترس مۆتەیەک بوو دەستی دەگەرووی نابوو خەریک بوو دەیخنکاند. بەڵام بە پێچەوانەی باقی، کەریم ئارام بوو. دەتکوت دەیان جار شەڕ و هەنگامەی بە چاو دیوە. لە سەرەخۆیی کەریم لەبەر چاوی سەرکردە ون نەبوو.

: «خڕناڵ! داوەرە ئێرە بزانم.»

هاوکات باقیشی دەنگدا: «کوڕە! ئەتۆ لە جێی خۆت نەبزووی. گوێت لێبوو چم پێ کوتی؟» باقی بە نیوە نووزەوە ئەرخەیانی کرد کە لە جێی خۆی ناجوولێتەوە. کەریم خۆی گەیاندە لای سەرکردە! «خڕناڵ! کوتت ناوت چییە؟»

: «کەریم»

: «وا وێدەچێ ناترسی. ها؟»

: «بۆچی دەترسم. بەڵام زۆر زۆر نا»

: «دەی کەوابوو زۆر باشە. ئێستا باش گوێ بگرە چیت پێ دەڵێم. ئەو دارەی پەنای ئەو کۆگا بەردە دەبینی؟»

: «کامە دار؟»

: «ئەو دارە گەورەیەی لکەکانی کەوتۆتە سەر ئەو بەرداشە گەورەیە»

: «بەڵێ، بەڵێ، دەیبینم.»

: «بزانم دەتوانی جۆرێک سینگە خشکە بکەی وەبەرچاو نەیەی؟»

: «حەولی خۆم دەدەم.»

: «کە وابوو، بچۆ لە پەنای دارەکە تەلیسێکی لێیە، لەگەڵ خۆت رایکێشە و بۆم بێنە. قەلافەتت یارمەتیت دەدا نەکەوی‌یە بەرچاویان، دەنا هەر کەسێکی تر بچێ دەیئەنگێون.»

: «باشە بەسەر چاوان ئەوە دەچم»

: «خڕناڵ! لێت دڵنیا بم ناترسی؟»

: «نا، بڕوام پێبکە، ناترسم.»

کەریم بوو بە مار و بە سەرزەوی دا خوشی و بەرەوپێش چوو، جەستەی بچووکی ئیزنی‌دا بە بێ هیچ گیروگرفتێک خۆی بگەیەنێتە بن دارەکە، لە وێڕا کە ڕوانی‌یە دوورە دەست. هێزێکی زۆری چەکدار دیت کە بە پەلە لە جموجۆڵ دابوون دەتکوت خۆ تەیار دەکەن بۆ هێرش بردن، کەریم دیتی کە بوونە دوو بەش و هەر بەشەی ڕووی لە لایەکی کرد. وای بۆچوو کە خەریکن گەمارۆیان بدەن، ئەو شوێنەی پێشمەرگەکان و باقی لێبوون، زۆر لە مەترسی دابوو، بە ڕاکێش ڕاکێش تەلیسەکەی بەدوای

خۆیدا کێشا و گەڕاوە. ئەوەی دیتبووی بۆ سەرکردەی گێڕاوە و بیروڕای خۆشی دەربڕی، سەرکردە چاوێکی ماناداری لە کەریم کرد. هەر بە دووری دەزانی بەعیسیەکان هێرش بکەنە سەریان. وێدەچوو بیری کردبێتەوە کە بێت و قسەکانی کەریم ڕاست بن و ئەوان لە دوولاوە گەمارۆ بدرێن. قەت تاقیان بە زیندوویی دەرناچن. شکی بۆ نەما کە دەبێ جێگەیان بگۆڕن. دەشیزانی بێت و بکەونە بەرچاوی بەعسییەکان لەوانەیە بە ئاوری بێئامان و قورس و کوێری تۆپ و خومپارە زۆربەی پێشمەرگەکان بکوژرێن. بۆ لای سەر هەر ڕێگای درەچوونیان نەبوو. لە دوو تەنیشتیشیان هەرکە لە دارستانەکە هاتبانە دەر وەک ئەوەی کە چووبنە سەر سەکۆی شانۆ، ئاشکرا دەکەوتنە بەرچاوی دوژمنەکانیان، ئەو کارەش وە ئەوە دەچوو کە بە دەستی خۆیان بە ئانقەست خۆ بە کوشتن بدەن، تەنیا ڕێگایەکی کە بۆیان مابووە، ئەوە بوو کە داگەڕێنە خوار و هێندەیتر لە هێزی دوژمن نیزیک ببنەوە. کە گومان لەوە دا نەبوو ئاکامەکەی دەبوو بە شەڕی دەستەویەخە، چون لە باری کەسەوە زۆر زۆر کەمتر لە هێزە داگیرکەرەکانی بەعسی بوون بێ گومان لەو شەڕەدا یەک کەسیان زیندوو نەدەما. سەرکردە سەیر تێمابوو. هیچ چارەیەکی بۆ نەمابۆوە. زوو زوو بێسیمەکەی دەس دەدایە تا بەڵکوو بتوانێ پێوەندی دەگەڵ بنکەکەیان بگرێ. سەرنەدەکەوت. هیچ قسەی تێدا نەبوو کە بڕوای هێنابوو نابێ لەو جێگەیان بمێنەوە و هیچ چارەش نەبوو، دەبوایە هەر بەرەو خوار داگەڕێن و ئەو کارەش ئەگەر کرابا دەکەوتنە بەرچاوی دوژمن و هێرش و ئاگری خەستوخۆڵی ئەوان.

سەرکردە کوتی: «هیچ دەزانن کوڕینە؛ ئەگەر توانیبامان ئەو ئیشکەڵانەی خوار دارستانەکە ئاور تێبەردەین. دوو کەڵەکەی بەرز دەبێتەوە و ناهێڵێ بکەوینە بەرچاویان. ئەودەم دەتوانین خۆمان بگەیەنینە ئەم گردەی کە سواری سەری دوژمن بووە و لەوێڕا پەلاماریان بدەین.»

سەرکردە زوو لە قسەکەی پاشگەز بووە، چونکە ئەوە کارێکی مەحاڵ بوو. کەس نەیدەتوانی بەبێ ئەوەی وەبەرچاوی دوژمن بکەوێ خۆی بگەیەنێتە لای ئیشکەڵانەکە. حاڵ و وەزعی ئەو سیودوو کەسە بەبێ

ئەژماردنی کەریم و باقی تا دەهات خراپتر و خراپتر دەبوو. سەرکردە هەرچی حەولی دەدا، لەگەڵ بنکەکەی خۆیان پێوەندی بگرێ بە هیچ کلۆجێ نەیدەتوانی. بە درێژایی ئەو ساڵانەی لە خەبات و شەڕدابوو. هەرگیز ئاوای لێنەقەومابوو. بە تەواوی دامابوو. حاڵ و وەزعیان جۆرێک بوو، نە بۆ ئەوە دەبوو ڕابوەستن و هەر لەو جێیە بمێننەوە و نە بۆ ئەوەش دەبوو شوێنی خۆیان بەجێ بێڵن و بڕۆن. دڵی بڕوای نەدەدا کە گیانی هیچ یەک لە پێشمەرگەکانی لە مەترسی باوێ. دەیتوانی خۆی ئەو ئەرکە وەئەستۆ بگرێ بەڵام لە ئاکامی کارە ساتەکە دەترسا. دەترسا دوای کوژرانی ئەو، ئەوانیتر ورەیان بەربدەن یان کارێکی شێتانە بکەن و هەموویان خۆیان بە کوشتن بدەن، لە تەواوی ئەو ماوە کورتەدا، کەریم لە پەنای باقی لە بن دارێک خۆی مات دابوو. لە خۆڕا بیری لە ڕابردووی خۆی دەکردەوە. ئەم دیمەنەی ناسییەوە. دەتکوت لە ڕابردوویەکی زۆر دوورەوە، جارێکی تر پێی ناوەتە ئەو شوێنە. وێنەکانی یەک یەک دەناسییەوە وەبیری هاتەوە، ماوەیەک بوو دڵی دابوو بە پیاوەتی و ئازایەتی «مەلا.» یەک دوو ساڵ بوو کە گەورەیی و مەزنایەتی «مەلا» ژەنگی خەم و کەسەر و تەنیایی لە دڵی کەریم شۆردبۆوە. لە تەنیاییدا لەگەڵ «مەلا» دەدوا. هێز و تین و گوڕی لێوەردەگرت. «مەلا» هەموو جارێ دەستی بەسەری کەریم دادێنا. هەرکات کە مەلا بە کەریمی دەکوت: «کوڕم، خەفەت مەخۆ، پێکەوە بە ئامانج دەگەین.»

کەریم دڵی لەخۆ دەبۆوە، مەست دەبوو، سەرتاپای وجودی پڕ دەبوو لە خۆشی و حەز، ئیتر هەستی بە تەنیایی نەدەکرد. چەندەی وێکەوتبا، هەستی بە هیچ ئێش و ژان و ئازارێک نەدەکرد. «مەلا» ئەوەی ژان و ئێش و ئازار بوو لە جەستە و ڕووح و ڕەوانی کەریمی دەرکێشابوو. کەریم هەمیشە بە ئاواتی دیتنی «مەلا» بوو، پێی خۆش بوو ئەو دیمەنەی لە ڕووی قسەکانی باب و کاک قادری خەیات و ئەوانی تر لە «مەلا« دە زەینی خۆیدا، دروستی کردبوو لەگەڵ دیمەنی ڕاستەقینەی «مەلا» پێکیان بگرێ، هەر لەبەر ئەوەش بوو کە دەستی لە هەموو شت هەڵگرتبوو. هەڵبەت هەموو

شتەکەی ڕەحمان بەدەر لە تەنیایی و چارەڕەشی و هەناسە ساردی شتێکیتر نەبوو. چونکە، هەرگیز ڕۆژێکی خۆشی لە ژیانی خۆیدا وەبیر نەدەهاتەوە. ئەگەر باقی هەر ئەو باقییەی ئەوە تا لە پەنای هەڵکورماوە و بە دزی سەرکردە خەریکە دەگری بە دەورێوە نەبووبا بێگومان تەنیاترین مرۆڤی سەرڕووی زەوی بوو.

بۆ هاتبوو؟

: «دەچم وەک مامە حەسەنم دەبمە پێشمەرگەی مەلا مەستەفا.»

گوێی لێببوو، بابی بە کاک قادری خەیاتی دەکوت:«بڕوام پێ بکە کاک قادر ئەگەر هێندێک تەمەنم لە ئێستام کەمتر با، یەک سات لێرە نەدەمامەوە، وەک حەسەنی برام دەچووم تێکەڵی ڕاپەڕینەکە دەبووم و ئەوەی لە دەستم هاتبا بە گیان و دڵ دەمکرد.»

کەریم کە ئەو قسانەی دەبیست بەگوێی گیانی هەڵیدەمشتن. کەریم هەرگیز بە خەیاڵیشی دانەدەهات، وا زوو لە جەرگەی شەڕ بکەوێ. بەڵام ئێستا کە بەڕاستی لە مەیدانی شەڕ دابوو و مەترسی نەمان هەڕەشەی لێدەکرد، خۆی دەدیت کە بێ ئەوەی چەکی بە دەستەوە بێ لەگەڵ باقی، تەنیا بەردەستی پێشمەرگەکانی گرتبوو و خەمێکی بۆ زۆرتر کردبوون. بێزی لە خۆی هەستا، زۆر بەخۆیدا شکاوە. چوو بۆ لای سەرکردە.

کوتی: « کاکە! بمبوورە من درۆم کرد. ڕاستییەکەی ئەوەیە کە بابم منی نەناردووە کە مامم ببینمەوە تا هەواڵێکی بۆ بەرم. من لە ماڵە خۆمان ڕام کردووە. من زۆر لەمێژە بە ئاوات بووم ببم بە پیاوی مەلا مستەفا. پێم خۆش بوو منیش خەبات بکەم. بەڵام ئەوەی کە کوتم مامم لەگەڵ شوڕشە ڕاستە و درۆی تێدا نییە. ئێستاش داواتان لێدەکەم من وەک پێشمەرگەیەک لە ڕێزی خۆتان ڕابگرن، هەر دەستوور و ئەمرێکی هەتانبێ بەڕێوەی دەبەم. چاو لە قەڵافەتم مەکە کورتە باڵام. ڕاستم پێکوتی. هێندەم نەماوە ببمە حەڤدە ساڵی تەواو.»

: «خڕناڵ! من هەر لە پێشدا زانیم، ڕاستت پێ نەکوتووم. بەڵام دیارە، کوڕێکی بە جەرگ و زیرەک و وریای، من بە تەنیایی ناتوانم بۆ ڕاگرتنت

بڕیار بدەم، ڕاگرتنی کەسێک لە ڕیزی پێشمەرگەدا هەروا سووک و سانا نییە. تۆ جاریٚ ئاگات لە خۆت بیٚ، با لەو ئاورەی تێی کەوتووین ڕزگار ببین، ئەودەم باسی تۆش دەکەین، خۆم پێم خۆشە لە پەنام بی، ئێستا بڕۆ لای ئاواڵەکەت، خۆتان لە پەنایەکی حەشار بدەن تا بزانین بۆ ڕزگاربوونمان چمان لەدەست دیٚ.»

کەریم بە سەرکردە دەڵیٚ:« کاکە! منیش دەزانم زۆر لە مەترسی داین. ئەگەر تۆ بڕوام پیبکەی. هەڵبەت لەپێش‌دا ئەوە بڵێم ئەگەر بڵێم ناترسم، درۆم کردووە. زۆریش دەترسم. هەرگیز بیرم نەدەکردەوە لە شەڕ دابوون مانای ئەوەیە! ئێستا بە چاوی خۆم دەیبینم. دەمەویٚ بڵێم ئەگەر بڕوام پیٚ بێنی چون جەستەم زۆر بچووکە دەتوانم بەبیٚ ئەوەی بهێڵم کەسێک بمبینیٚ خۆم بگەیەنمە ئەو شوێنەی باست کرد و ئاگری تێبەردەم.»

سەرکردە کوتی: «هەر باسی شتی وا مەکە، ئەمە کاری هەموو کەس نییە. یەکجار مەترسیدارە. پێویستە چارەیەکی تری بۆ بدۆزمەوە.»

کەریم کوتی: «کاکە! ئەمن بە چاوی خۆم دیتمن کە چەندە بەپەلە خەریک بوون لە دوو لاوە بۆ لای ئێمە هەڵبکشێن. تۆ ئیزنم پیٚبدە. ناهێڵم هەر بمبینن، بەڵێنیت دەدەمیٚ چاکتر لە مار لەسەر زەوی بخشێم. باوەڕم پیٚبکە خۆم بە جوانی دەپارێزم.»

: «برۆ خڕناڵ! هەر وەکوو کوتم بچوو لە لای ئاواڵەکەت خۆت حەشار دە، هەرگیز ئیزنی ئەوەت پیٚ نادەم، ئێستاش ڕامەوەستە بڕۆ، زۆربەر دەستمان مەگرە.»

کەریم هاتەوە لای باقی کە لە پەنای دارێک هەڵکورمابوو، لە مردووی قەبرانت نەدەکردەوە. هەرچەندە کەریم زۆرتری دەدواند باقی کەمتر وەخۆ دەهاتەوە.

: «باقی! گویٚ لە من بگرە، هەرلێرە نەجاتیمان هات، دەگەڕێینەوە سەردەشت، قەولت پێدەدەم باشە. من بە سەلامەتی دەتبەمەوە ماڵە خۆتان، چیتر مەترسە و خۆت ئازار مەدە، بۆ تۆ عەیبە. بزانە ئەوانەی لێرەن چۆنت

چاو لێدەکەن، هێندێک غیرەت وەبەر خۆت بنێ  با لە دواییدا نەبی بە گەپچاریان.»

: «کەریم! برۆ! ئەتۆش دڵت خۆشە! ئەوانەی دەیانبینی هەموویان چەکیان پێیە دەتوانن دەست بکەنەوە، بەڵام ئێمە چی بە دەستی بەتاڵ؟»

: «باقی! یانی تۆ وا بەغیرەت و ئازا ی چەکت بدەنە دەستی شەڕ دەکەی؟»

: «نازانم کەریم! جارێ تۆ وازم لێ بێنە. با بە دەردی خۆم بناڵم، خۆ ئەگەر تەقەشی پێنەکەی بە دەستەوەت بێ هەر باشترە لەوەی دەست بەتاڵ بی. دەزانی چییە کەریم! بە خودای دەزانم لێرە هەر دەکوژرێین. تازە چاوم بە دایک و بابم ناکەوێتەوە.»

کەریم بە توندی بەگژیدا دێ: «عەیبە باقی! تۆ شەرم ناکەی؟ ئابڕووی منیشت برد. زیاد لەو هەموو عالەمە کە وەک تۆ لە مەترسی مردن کەوتوون، ئەو نووزە نووزەت داناوەتەوە هیچ دەزانی شوێنی خراپ دەخەیە سەر ئەوانی تریش. دۆعایە بکە جارێ خودا ڕووحمی پێکردووین کە تووشمان بە تووشی ئەو برایانە هاتووە، ئەگینا ئەگەر وەدەست عەسکەرەکانی بەعس کەوتباین تا ئێستا لەتوپەت کرابووین. پێت خۆش بێ یان پێت ناخۆش بێ تازە ئێمە تووشی ئەو وەزعە نالەبارە هاتووین، بە ناڵە ناڵ و نووکە نووکی تۆش کارمان جێبەجێ نابێ. ئەگەر خۆت نەدۆڕێنی و هێندێک پشووت لە سەرەخۆ بێ، بێگومان ڕزگار دەبین. باقی ئەرێ ئەو شەمچەیەی کە لە قەلادزێ کڕیمان لە لات ماوە؟»

: «بۆ چیتە کەریم؟ ئەوەتا لە گیرفانم دایە.»

: «زۆر باشە بمدەیە بۆ سەرکردەی بەرم داوای دەکا.»

کەریم شەمچەکەی لە باقی وەرگرت و بۆ لای سەرکردە چوو.

: «چییە خڕناڵ؟ دیسان بۆ هاتوویەوە؟»

: «کاکە! بمبوورە، بێ ئەدەبیشە، ژان و پێچێکی سەیرم بە زگی دادێ. لە کوێ دەتوانم دەست بە ئاو بگەیەنم؟»

: «جا خڕناڵ! ئێستا وەختی ئەوەیە؟ چووزانم بڕو هەر بن بەردێکت دیت لێی دانیشە بەڵام زۆر لە ئێمە دوور نەکەوی جێی مەترسییە.»

کەریم بەرەوخوار داگەڕا. مارێک بوو بە سەر زەوی‌دا دەخوشی. نە هەستێک، نە خوستێک، نە خشەیەک، ببوو بە زەوی. لە چاوترووکانێک‌دا لەبەر چاوی سەرکردە ون بوو. سەرکردە ڕووی وەرگێڕا و باقی دەنگ دا: «کوڕە خوێڕی ئەم ناڵە ناڵە چیە داتناوەتەوە؟ شەرم ناکەی؟ پێم بڵێ بزانم خڕناڵ ڕاستی دەکرد تەمەنی حەڤدە ساڵە؟»

: «بەڵێ ڕاستە. چەند مانگی تر دەبێتە حەڤدە ساڵی تەواو. منیش چبکەم بە دەستی خۆم نییە دەترسم بمانکوژن تازە دایک و بابم نەبینمەوە.»

: «هەوەڵ ئەوەی‌کە تا ئێمە هەمووومان نەکوژرین تۆ چت بەسەر نایە، دووهەم، دەیجا کوشتیانین، بۆ گیانی تۆ لە گیانی ئەوان شیرین‌ترە؟ تۆ کە وا دەترسای بۆ لەگەڵ خڕناڵ کەوتووی؟»

: «ئاخر زۆر بەیەکەوە دۆست بووین، هەر لە منداڵییەوە پێکەوە گەورە بووین. لەمن بەدەر هیچ ئاواڵێکی تری نییە. منیش زۆرم خۆش دەوێ.»

: «بڵێ بزانم بابی ئەو کوڕە کێیە و چ کارەیە؟ چۆنە تا ئێستا کەس بە شوێنی دا نەهاتووە؟»

: «کەریم کوڕی حاجی محەممەد بانەیی‌یە. دایک و بابی زۆریان ئەزییەت دەکرد بە تایبەتی دایکی کەریم، هەمیشە لە لای من دەیکوت مەلا مستەفا بابی منە، بۆخۆی داوەمی بەو بابم تا بەخێوم کا، کە گەورە بووم دەچمەوە لای بابی ڕاستەقینەم و شەڕی بۆ دەکەم. ماوەیەک لەمەوبەر کە کوتی کاتی وەی هاتووە بچمە لای «مەلا» منیش کوتم کەریم بەجێت ناهێڵم، هەرجێیەکی تۆ بچی بەشوێنت‌دا دێم. نەمدەزانی ئاوامان بەسەر دێ. من پێم وابوو لە سەردەشت سواری ماشێن دەبین و دوای یەک دوو ساعەت دەگەینێ. ماوەیەک لە لای مەلا مستەفا بە خۆشی ڕایدەبوێرین. دوایی کە کەریم وەڕەز بوو بە کۆڵێک قسە و باسی شۆڕش و بیرەوەری «مەلا»وە دەگەڕێینەوە و دەبینە قارەمان! هەرگیز نەمدەزانی ئەوەندە تووشی مەترسی و سەخڵەتی دەبین. جارێ پێش هەموو شت لە کاتی پەڕینەوە لە سنووردا

هێندەی نەمابوو بە دەست ژاندرمەکانی سەر سنوور دابێژ دابێژ بین. ئەگەر ئەو مەلا برایمە کە کەریم باسی کرد نەبوایە، بێگومان هەر لەوێ کوژرابوین. تازە لەدوای ئەو هەمووە ئازار و سەختی کێشان و ماندوویەتی و برسییەتی‌یە ئەوەتا، سەرمان لێرە دەرێناوە.»

: «گوێت لێ بێ کوڕە! کوتت نێوت چ بوو؟»

: «نێوم باقی‌یە.»

: «زۆر باشە باقی! گوێم بدەیە. ئەوەندە مەترسە. چاوێک لە خڕنالّی ئاوالّت بکە، هەر دەلّێی هەلووکە هەلّدەسووڕێ. لە هیچ شتێ ناسلّەمێتەوە. تۆ بۆ ئەوەندە بێ دلّ و جەرگی؟»

: «کاکە! بە خودای پێم خۆش نییە وام. بڕوام پێ بکە بێز لە خۆم دەکەم. بە دەست خۆم نییە، دەلّێی عەرز لاقی گرتووم، ناتوانم بە ڕێگاش‌دا بڕۆم، زۆر دەترسم.»

: «کوڕە! غیرەتێک وەبەر خۆت بنێ. هیچ شتێک ناقەومێ. ئەوە ئێمە لە لاتین و دەتپارێزین، هیچ جێی مەترسی نییە. خەیالّت ڕاحەت بێ. ئەگەر خودای نەکردە هات و شتێک ڕووی دا. دلّنیا بە کە ترسەکەی تۆ ناتوانێ بەرگریت لێبکا، پێت وانەبێ ئەو پیاوانەی لێرە دەیانبینی لە گیانی خۆیان تێر بوون یان بێکەس وکارن و هیچ کەس چاوەڕوانیان ناکا. تازە بۆخۆت خەتاباری، نەدەبوو وەدوای خڕنالّ بکەوی.»

سەرکردە ڕووی لە پێشمەرگەکان کرد: «کوڕینە زۆر وریابن. خۆتان بە باشی تەیار بکەن، ئەوەندەی کە دەتوانن و بۆتان هەلّدەگیرێ فیشەک و تەقەمەنی لە خۆتان بهالّێنن. ئەو ڕۆ لەو ڕۆژانەیە، بۆخۆتان دەزانن، تا ئەو جێیەی لە دەستتان دێ نابێ یەکتر ون بکەن. ئامادە بن هەرکات کوتم دەس بکەن بە هێرش. ئاگاتان باش لە خۆتان بێ، لەوانەیە ئاوری زۆر قورسمان بەسەر دابڕێژن. هەتا ڕێگەیەک بۆ دەرباز بوونمان دەدۆزمەوە بە هیچ شێوەیەک کارێک مەکەن دوژمن جێگەمان بدۆزێتەوە.»

پێشمەرگەکان خەریکی بەجێ هێنانی دەستووری سەرکردە بوون سەرکردە هەروا بە بێسیم خەریکی پێوەندی گرتن بوو کە لەپڕ دەنگی

مەقەڕڕەکەیانی گوێ لێبوو. زۆر بە پەلە لەحاڵ و وەزعی خۆیانی ئاگادار کردن و داوای یارمەتی کرد. پەیامی مەقەڕڕ بۆ سەرکردە ئەوە بوو تا ئەو جێیەی پێتان دەکرێ خۆڕاگری بکەن کە هێزی یارمەتی لە دوو لاوە بۆلاتان دێن. سەرکردە ئاهێکی هاتەوە بەرخۆ و لەپڕ باقی دەنگ دا: «باقی! نازانی ئەو ئاواڵە گووکەرەت بۆ هێندەی پێچوو؟ بڵێی بەخۆی‌دا نەڕیابێ و لە شەرمان نایەتەوە؟»

باقی نەیدەزانی کەریم بۆ ئەوەندەی پێچووە. بەڵام دەیزانی کەریم لەو کەسانە نییە خۆی پیس کا. چوون سوور و عەیان دەیزانی کاری وا لە خۆی دەوەشێتەوە. چووزانین ڕەنگە هێندێک ڕاستگۆ با و شەرمی نەکردبایە دەبوو بەسەرکردە بڵێ: «کاکە کەریم لەو کارانە بە دوورە ئەگەر منت کوتبا دیسان شتێک!»

باقی لە وڵامی پرسیارەکەی سەرکردەدا هەر هیچی نەکوت. کە لەگەڵ چاوەڕوانی سەرکردە لە باقی کە هەر هیچ نەڵێ یەکیان دەگرتەوە. لە پڕ سەرکردە ڕووی لە باقی کردەوە: «کوڕە! ئەودەم خڕناڵ لە لای من هاتەوە لات چی پێ گوتی؟ کە هەرتکتان چاوتان لە من کرد؟»

: «هیچ، هەر منی دڵخۆشی دەداوە، دەیکوت نیگەران مەبە لێرە ڕزگار دەبین، هەڵبەت ئەودەم کە چاومان لە تۆ کرد داوای شقارتەی دەکرد بۆ تۆی بێنێ.»

: «چی؟ شقارتە؟ من؟ خۆ داوای شقارتەم نەکردووە؟ نا، نابێ، نەکا؟ کوڕینە هەستن وەخۆ کەون، بەخودای وێدەچێ خڕناڵ کاری خۆی کردبێ. هەستن دەست ببزێون. هەر ئێستا کە جەهەندەمێک ساز دەبێ کە کەس نەیدیبێ. خودایە بۆ خۆت ئاگات لەو شێت و شوورە ببێ. خۆی لە مەترسییەکی یەکجار گەورە هاویشتووە. مەگین هەر خودا بۆخۆی بیپارێزێ. جموجۆڵ کەوتە نێویان. هەر لەو کاتەدا، دەنگی گرمە و تەقە کە کەم ببۆوە لەپڕ پەرەی سەند، عەرز و دار و بەرد وەلەرزین کەوت. سەرکردە بە پەلە هێندێک داکشا بۆ لای خوار و لە پەنای بەردێک ڕا سەری دەرێنا و چاوی لە دەورووبەری کرد. ئاگرێک بەرز ببۆوە سەری لە ئاسمان دەسوو، دەتگوت

جەهەندەمیان یەکجێ هێناوەتە سەر زەوی. دووکەڵێکی ڕەش و قرچە قرچی ویشکە گیای تامەزرۆی سووتان. سەرکردەی وەدەنگ هێنا. کوڕینە هەستن وەختی ڕزگاریمان هات. هەرچی زووتر دەبێ خۆمان بگەیەنینە سەر ئەو گردەی بەرچاومان. تا ئاگر و دووکەڵ چاوی دوژمنی بۆ بەستووین دەبێ ئەوێ داگیر بکەین. لەبیر نەکەن تەنیا ڕێگەی دەرچوونمان داگیرکردنی ئەو شوێنەیە. کوڕە باقی! وەرە پەنای من، یەک سات لەبەر چاوم ون نەبی، ئەو قسەیە کە تەواو کرد لە ناخیەوە ئاخێکی هەڵکێشا.

: «ئای.... خڕناڵ.»

هەر ئەودەم کەریم خەریک بوو لە ناو دڵی سەرکردەدا خوشترین جێگای دڵی بۆ خۆی داگیر دەکرد....

***

## ٤٨

..... ئێوارەیەکی درەنگ وەخت، خات فاتێ ماڵی تێکەوەپێچا. هەڵبەت ئەگەر بکرێ بەو شتەی هەیانبوو بڵێن ماڵ. پێشتر تەنانەت خات بەسێشی ئاگاداری ڕۆیشتنەکەی نەکردبوو. هەر بۆیە کە زانی، هەر وەک کێچ دەستی کرد بە هەڵبەزینەوە.

: «کچێ فاتێ! ئەوەچ کارێکە دەیکەی؟ بۆخاتری خودا ئەوکارە مەکە. کچێ نەتبیستووە کە دەڵێن بەرد هەتا لەجێی خۆی بێ سەنگینە؟ مەگین لێرە لە چمان کەمە؟ خودا پاروە نانێکی دەگەیەنێ. ئەوا بەیەکەوە دەیخۆین. تازە منداڵەکانیشمان خوویان پێک گرتووە. بەبێ یەکتری هەڵناکەن. هەڵبەت زۆرتر ئاماژەی خاتبەسێ بە قالە بوو کە یەکدەم بەبێ عەلیلە هەڵی نەدەکرد.

کچێ! وەرە بە قسەم بکە لە هیچ جێیەکی تەنانەت لە ماڵە براکەشت وەکوو ئێرە بۆت ناچێتە سەر. باشە، باشە تۆ پێم بڵێ دەتهەوێ ڕوو لە کوێ بکەی؟ چلۆن و بەچی ژیان دەبەیە سەر؟ باشە پێم بڵێ لە پاش ئەو هەموو ساڵە کە لەگەڵ یەک بووین تۆ بە قابیلت نەزانیم پێشتر ئاگادارم بکە.»

: «بەسێ گیان! خۆ تۆ دەزانی من هەرگیز خوشکم نەبووە، بەو بەسەرهاتە تاڵەی من چێشتم دەزانم هەرگیز هیچ نیعمەتێکی خودای وەک خوشکێکی دڵسۆز نییە و تۆ بۆ من هەمیشە ئەو بۆشاییە و کەلێنەت پڕ کردبۆوە، بەڵام خۆت چاکتر لەمن دەزانی منداڵەکانمان وردە وردە گەورە بوون، نیازیان بە سەرپەرەست و گەورەیەک هەیە، بە ناشکوری نایڵێم. خۆت ئاگاداری حاڵ و وەزعی من هەی، وەها کەوتوومە سەر جێیە بە کەڵکی هیچ نایەم. بەردێک کەلکی لەمن زۆرترە. منداڵەکانم نیازیان بە ڕێنوێنی و ئامۆژگاری گەورەیەک هەیە، ئەوە لەمن ناوەشێتەوە. برایەکم لە سابڵاغە، لەمێژە داوام لێدەکا بچمە لای، ئێستا ئیتر ناچارم لە بەر منداڵەکانم

بچمەلای با وەکوو هەرچی دەیکێشم و بەسەرم هات لەچاوی براکانمی دەزانم، هەڵبەت ئەو برا چکۆلەم کە دەچمە لای تاوانبار نەبوو. نەیدەتوانی بێ ئەمری برا گەورەکانم بکا و کارێکم بۆ بکا. ئێستا دەڵێ:

: «فاتێ! وەرە لە ڕێی خودا دا و لەبەر خاتری ئەو منداڵانەت وەرە لام، من دەستێکم، خانووبەرەی زیادی هەیە. بۆخۆم چاوم بەسەر منداڵەکانتەوە دەبێ.»

تێی گەیاندووم کە ئەوەندە شەرمەزاری منە کە چاوی لە ڕووم هەڵنایە، بەسێ گیان! لە لای تۆ باسم نەدەکرد دەنا چەند ساڵە هەروا داوام لێدەکا بچمە سابڵاغ، دەڵێ:

«بێت و بە منداڵەکانمەوە نەچم بۆ لای دیارە نەبەخشراوە و ئەویش هەرگیز خۆی نابەخشێ.»

: «فاتێ! ئەو دەرفەتەم بدەیە بۆت تێهەڵبێمەوە و گۆشەیەک لە ڕابردووم قەرەبوو بکەمەوە.»

کوتوویەتی بچمە لای تا دەوا و دەرمانم بکا و حەول بدا بەڵکوو پشتم چاک بێتەوە. ئێستاش ناچارم بە قسەی بکەم. برامە، هیچ نەبێ لە بێگانە بۆ منداڵەکانم باشترە. بەسێ گیان! من ماوەیەکی دوور و درێژ باری قورس و گرانی ژیانی خۆم خستبووە سەر شانی تۆ، هیچ خوشکێک ئەوەندەی چاکە دەرحەق بە خوشکی خۆی نەکردووە کە تۆ دەرحەق بەمنت کردووە. نازانم چۆن و کەی دەتوانم وڵامی ئەو هەموو چاکەی تۆ بدەمەوە، مەگین هەر خودا بۆخۆی تۆڵەت بۆ بکاتەوە. نازانی چەندە بۆم سەخت و گرانە واز لێرە بێنم!»

: «کچێ فاتێ گیان! ئەو قسانە چییە دەیکەی؟ تۆ بۆ من هەمیشە لە خوشکەکەی خۆم فەرزتر بووی. منداڵەکانی من زۆرتر تۆیان بە دایکی خۆ دەناسی تاکوو من. بە خودای بزانن لێرە دەڕۆن هەموویان شێت دەبن. بەخودا تا ئێستا نەموێراوە بە قالەی بڵێم دەترسم بەلایەک بەسەر خۆی بێنێ. ئەدی کولسووم و مەنیجی چی لێبکەم. بەخودا چارم نییە بە بیانوویەک دەبێ بەڕێیان بکەمە ماڵێکی هەتا ئێوە دەڕۆن. هیچ چارەیەکم نییە دەبێ

درۆیان بۆ بکەم. دەبێ پێیان بڵێم بۆ ماوەیەکی کورت دەچنە سەفەر، ئەگینا ئەگەر بزانن کە بە یەکجاری دەڕۆن. هەر خودا دەزانێ چییان لێ بەسەر دێ، لە وانەیە بە یەکجاری شێت ببن.»

: «ئەرێ بەسێ گیان! بۆئەتۆش دەستی منداڵەکانت ناگری و لەگەڵ ئێمە نایەی خۆ لە سابڵاغیش دەکرێ پاروونانێک پەیدا بکەی. وەرە لەوێ دیسان لێک دەهاڵێینەوە. ئەوەی خودا گەیاندی بە یەکەوەی دەخوێن.»

: «نا، فاتێ گیان! من ناوێرم تازە دەست لە خۆم دەم، دەترسم وەکوو خۆم لێ نەیەتەوە. لێرە خەڵکەکەی دەمناسن. یارمەتیم دەدەن. خێرو خێراتەکەیان دەدەن بەمن. منداڵەکانیشم تازە لەگەڵ ئێرە ڕاهاتوون، ناتوانم لێرە هەڵیانکەنم.»

ئەوە ئاخرین دیداری فاتێ و بەسێ بوو. ئەوەی ئەو دوو چارەڕەشەی لێک نیزیک کردبووە، ڕەنج و مەینەتی هاوبەشیان بوو. هەرگیز خۆشی هاوبەش ناتوانێ بەڕادەی دەرد و ڕەنجی هاوبەش مرۆڤەکان لەیەک نیزیک بکاتەوە. وێدەچێ مرۆڤەکان لە کاتی مەینەت و دەرد و هەژاریدا دەتوانن زۆرتر تێک بگەن، تاکوو کاتی خۆشی و دەسرۆیشتوویی. ئەو ماڵەی خات فاتێ بۆیان پێچاوە هێندە نەبوو. چون هەر هیچیان نەبوو، ئەو کونە گورگەی تێیدا دەژیان بەرلەوەی شوێنی حەسانەوەیان بێ شوێنێک بوو کە هەژاری و دەستەنگی و چارەڕەشی ئەوانی لەبەر چاوان شاردبووە. ئەویش ئەم کونە گورگە کە  بە زەحمەت جێگەی خۆیانی تێدا دەبۆوە  چ بگا بەوەی شتێک بەنێو نێوماڵی تێدا بێ. خالید برا چکۆڵەکەی فاتێ ماشێنێکی پشت ئاوەڵەی لە دوویان ناردبوو. هەر لە پشتەوەی ماشێنەکە جێگاوبانێکیان بۆ خات فاتێ ڕاخست. لەسەری درێژیان کرد، عەلیلە و برا نێونجییەکەی لە پەنای شۆفیرەکە دانیشتن و نازێ و دوو خوشکەکەیتری و هەروەها برا چکۆڵەکەی لە پەنای دایکیان لە پشتەوەی ماشێن دانیشتن. بەدەر لە شۆفیرەکە، ئەوەی لەوێ بوون دەگریان، وێدەچوو خات بەسێ نەیتوانیبوو بە بیانوویەک منداڵەکانی لە ماڵ وەدەرنێ. سەیر ئەوەیە عەلیلەش کە ئاغای «قاف» ئەو هەمۆی کوتابوو تا فرمێسکی چاوی ببینێ و نەیدیبوو چاوی

پڕببوون لە ئاو بۆیە دەڵێم ئاو چونکە بەڕاستی عەلیلە یەک تنۆک فرمێسکی نەمابوو هەر بۆیە ئەوەی لە کاتی ڕۆیشتنیاندا لە چاوی عەلیلە دەڕژا ئاو بوو ئاوێکی ڕوون نە فرمێسک و من ئەوکات بێ خەبەر لەوەی کە بڕیار وایە چ بەسەر من بێ. هەروا لە چاڵە بەفرەکە دا چاوەڕوانی نازێ بووم ئەی بەڵکوو وەک هەمیشە بە بیانوویەک ڕێی لەوێ بکەوێ و بڵێ: «ئەوە چ دەکەی لەو چاڵەدا چەند لەمێژە دایکت لە کۆڵاندا گازت دەکا؟».

هەرچەندە دەمزانی وڵات تاریکتر لەوەیە کە نازێ بێ. بەڵام ئێوە مرۆڤی عاشق ناناسن. مرۆڤی عاشق بۆ خۆ فریودان بیانووی زۆرتری بە دەستەوەیە. ئاخر ماوەیەک بوو بۆ دیتنی نازێ. نەدەچوومە ماڵەکەیان یانی لەو کاتەوە کە بە تەواوی دڵم دا بە نازێ. شەرمم لە عەلیلە دەکرد کە بچمە ماڵیان، پێم وابوو ئەوکارەی من ناڕەوایە و چەشنێک خەیانەت کردن و نامەردییە. بەڵام خۆشەویستی نازێ لە دڵمدا بە جۆرێ بوو کە ڕێی لە هەرشتێکی تر گرتبوو. دەڕاستیدا من نازێم زۆر لە خۆشم، خۆشتر دەویست. جار جارە هەستم دەکرد عەلیلە سۆسەی کردووە. بەڵام کە لەگەڵ عەلیلە بەرەوڕوو دەبووم لە ڕووی ئاکار و ئاخاوتنی لەگەڵ من، هەستم دەکرد. عەلیلە پێی ناخۆش نییە من لەگەڵ نازێ نێوانم هەبێ. هیچ نەبێ ئێمە زۆرتر بە یەکەوە بووین و زۆرم لەسەر عەلیلە کردبۆوە زۆر جار لەسەر ئەو لێیان دابووم. لە جەریمەکانی[٦٣] دەرسی تەلەیفون کە بە ئاغای «قاف» قەرزدار بوو دەستم بۆ سەد شوڵک ڕاگرت کە ئاغای «قاف» لەجیات عەلیلە بە پێنج جاران لەمنی بدا لە حاڵێکدا قالە تەنیا پەنجا شولکی وەئەستۆ گرت، ئەویش بە هەر شولکەی کە وێی دەکەوت وەها هەڵدەبەزییەوە و دادەبەزییەوە و ئەدای هێند سەیر سەیری دەردێنا، کلاس دەمردن لەبەر پێکەنینی، ئەو ئاغای «قاف»ە کە هەمیشە وەک شوبر قەلس و تووڕە و تۆسن بوو، وای قاقای دەکێشا کە هەموویان پێان سەیر بوو. دەمکوت بەڕاستی عەلیلەم زۆر خۆش دەویست نە لەبەر خاتری نازێ. نا لە بەرخۆی پێم وابوو ئەویش

---

٦٣- جەریمە: غەرامە. تەمبێ.

وەک منە، هەر بۆیە وەهام خوو بە نازێ و عەلیلە گرتبوو کە نەمدەزانی کامیان لە دڵم دا زۆرتریان جێ گرتووە؟ هەرچەند من مرۆڤێکی درۆزن نیم بەڵام لێرەدا بە ڕاشکاوی دەڵێم درۆم کرد. چون بێ‌یەک و دوو هەرچەندە عەلیلەم بەڕاستی زۆر خۆش دەویست. بەڵام نازێم زۆر زۆر لەوی خۆشتر دەویست. من عەلیلەم بە قەرا خۆم خۆش دەویست بەڵام نازێم لە خۆم و عەلیلە و دنیا خۆشتر دەویست. ئەوە بوو هەر کە هەواڵی ڕۆیشتنیانم بیست یەکجێ دووجارڕووخام. جارێکیان زۆر ناجۆرتر و سەخت‌تر لە جارێکیان و بەداخەوە لەبری ئەو دوو جار ڕووخانەم تەنیا یەک جاریش ساغ نەبوومەوە. هەر ئەودەم بوو کە خۆم لە دنیای پڕ لە خەون و خەیاڵ و خۆزیای منداڵانەم دا لێ ون بوو و بێ سەروشوێن بە شوێن بێ‌سەروشوێنیان‌دا عەوداڵ بووم. ئەگەر لە ڕاستییەکەی بپرسن وەدوای هیچ کەوتبووم. هیچێک کە نەڕەنگی هەبوو، نە فۆڕمی هەبوو. نەدەنگی هەبوو. ماوەیەک نەخۆش کەوتم، نەخۆشی کەوتوویيم گرت، هیوایان لە مانم بڕابوو. هێمن کوتەنی پەرستارەکانم ڕەشپۆش ببوون «دەبێ هیوام بەمان چەند بێ کە ڕەش‌پۆشە پرستارم» هەر ئەودەم زانیم کە چەندەم نازێ خۆش ویستووە. کەسێکی کە بتوانێ لەبەر نازێ ئاوڕ لە بووک نازێ نەداتەوە دیارە دەبێ بە نەبوونی نازێ لە گیان بکەوێ و من کەوتبووم. سەیر ئەوەیە کە مرۆڤ تا ئەوکات کە خاوەن شتێکە. هەر ئەوەندە تێدەگا کە شتێکی هەیە. ئەودەم هەرگیز ئاگاداری مانای نەبوونی ئەو شتە نییە. بەڵام هەرکە ئەو شتە لە کیس چوو تازە تێدەگا، نەبوون یانی چی. ئێمە کە دەبینە خاوەنی شتێک، هەرگیز بە خۆمان ئیزنی ناسینی ئەو شتە نادەین چون بە هی خۆمانی دەزانین و لامان وایە چون ئەم شتە تایبەت بە منە و من خاوەن ماف و ئختیاری ئەوم، چ پێویست بەناسینی نییە، هەرکاتێک نیازم پێی بێ ئەوە لەبەر دەستمە. دیارە شتێکە وەک دەستمان، وەک چاومان، وەک هەریەک لە ئەندامەکانی لەشمان چون هەمیشە لەگەڵمانن پێویست بە ناسینیان ناکەین، ئێمە هەرگیز تێناگەین هەرکام لەم ئەندام و ئازای لەشانە چەندە بەقیمەتن، ئێمە هەرگیز شارەزای ئەوە نابین، هەر ئەو کارە ئاسایی و سادانەی کە ڕۆژانە بەم دوو دەستەمان

دەیکەین چەند بەنرخن و چەندە مایەی حەیات و ژیانی ئێمەن. لە ڕاستیدا ئێمە هەموومان بە چاوی بەسراو ژیان دەبەینە سەر. ئەو کەسە نرخ و ئەرزیشی دوو گەوهەری دەست هەست پێدەکا کە دەستەکانی کۆڵ بووبن یان لە ناو چووبن. ئەو دەمەیە کە تێدەگا دوگمە داخستنێکی ئاسایی، دۆخین بەستنێک. لوێچێک ئاوهەڵگرتن لە کانییەک، کەوچکێک چێشت بۆ زاری بردن، چ هونەرێک تێیاندا شاراوەیە کە هەرگیز لە کاتی ساحیبی دوو دەستی ساغ و سەلیم بوون وەبەرچاوی مرۆڤ ناکەوێ و من ئەودەم کە خات فاتێ باری کرد و ڕۆیشت، یەکجێ هەرتک چاوم لە دەس چووبوو. دوو دەستەکانم شکابوون، دوو پێی ڕۆیشتم نەیاندەبردمە هیچ کوێ لە جێگەدا کەوتم، قسەکانی دایک و بابم ڕەشیان پۆشیبوو. کەسێک لە دەورو بەری من هیوای بە زیندووبوونی من نەبوو، حەقیشیان بوو، ئێسکێکی کە پێستێکی بە ڕوویدا بکێشی و دوو دڵوپ خوێنی تێدا نەبێ بۆچ بۆ ژین دەبن؟ بەڵام خۆم وەک ئەوانیتر نەبووم، من دەمکوت تا ئەودەم کە نازێ نەفەسێ دەکێشێ منیش دەبێ پشووم بێتە دەر. ئەوەی کە زۆر پێم خۆش بوو بیزانم ئەوە بوو بڵێی ئێستا نازێ و عەلیلە لە چ حاڵێک دابن؟ ئاخۆ ئەوانیش هەروەک من بە پەرۆش بوون؟ بە هەموو هەست و وجوودم پێم خۆش بوو وڵامی ئەم پرسیارەم بکەوێتە دەست، بەڵام هەموو جارێ لە خۆم دەپرسی لە کوێ؟ چلۆن؟ لەکێ؟ دەتکوت عەرز قووتی داون، خات بەسێ سەدان جار کە پرسیارم لێکردبوو. هەزاران جار سەری لەقاندبوو دەیکوت: «بەخودای ڕۆڵەگیان! منیش هەروەک تۆ.»

هەموو جارێ دەمدیت کە چاوی، زاری وەدرۆ دەخاتەوە، بەڵام من چم لە دەست نەدەهات ئەودەم کە ئەو نەیدەویست هیچم لە لا ئاشکرا بکا. ئێستا لە خۆم دەپرسم: «بڵێی لەبەر قالەکە دەیزانی چاوی لە دووی نازێیە و نازێش منی پەسەند کردبوو ئازاری نەدابێتم؟»

نازانم ئەودەم خۆ عەقلم بەوشتانە نەدەشکا. قالە لە من زۆرتر ئاگاداریان بوو بەڵام نە ئەوەندە زۆر کە یارمەتیمان بدا بۆ ئەوەی بەجۆرێک دستمان پێیان ڕابگا.

: «دایکم دەڵێ خاڵە خالیدی هاتووە لەگەڵ خۆی بردوونی.»
خات بەسێ هەموو شتێکی دەزانی بەڵام هیچی بە قالە نەکوتبوو. لەپێشدا پێی کوتبوو خات فاتییان بردۆتە لای دوکتور، بڕیار وایە پشتی عەمەل بکەن. کە چاک بۆوە دەگەڕێنەوە. من تا نەخۆش نەکەوتم، پێم خۆش بوو باوەڕ بەم قسەیە بکەم و پێشم کرد، بەڵام کە لە جێگادا کەوتم. لە لای قالە ئەم قسەیەم بە چەند بەڵگە وەدرۆ خستەوە. وەک ئەوەی کە ئەگەر بڕیار وابێ خات فاتێ عەمەل بکرێ ئەدی ئەو ماڵ و بارگەوبنەیان بۆ بردووە؟ یان کاتێک بڕیار وایە خات فاتێ عەمەل بکرێ ئەو هەموو منداڵە بۆ دەبەن کەبەردەستیان بگرێ و لە هەموو ئەو بەڵگانە باوەڕ پێکراوتر دڵی خۆمە کە دەڵێ: «سەرتاپای ئەم قسانە هەموو درۆیە و نازێ و عەلیلە تازە ناگەڕینەوە.»
قالەی بەستەزمان وەک سەگی بێ ساحیبی لێهاتبوو. ڕووی لە هەر دەرکەیەک دەکرد. دەردەکرا، ئەو منداڵانەی سەردەمێک لە ترسی عەلیلە نەیاندەوێرا بە قالە بڵێن قالە پشتی چاوت برۆیە. لە مچە کوێرەوە بگرە تا دەگەیشتە ساڵەخێل و تەنانەت قاسم چڵمنیش – ئەو گرینۆکە- بەربینگیان پێدەگرت. من کە لە جێدا کەوتبووم و نەمدەتوانی لە سەری بکەمەوە. جار جار سەردانی منی دەکرد هەستم دەکرد بۆنی عەلیلە بەمنەوە دەکا. بەڵام زۆر بێکەلک بوو، بەبێ عەلیلە هەرتکمان هەتیو بووین کە من نەخۆشییەکەم پەرەی سەند. ئەوە چارەڕەشی و مەینەت بوو کە قالەی لێقەوماوی دڵخۆشی دەداوە. هەڵبەت ئەوە بڵێم ئەو بەشەی تێیدا باسی خات فاتێ و نازێ دەکەم، نازێ بۆی نەگێڕامەوە، ئەو زانیارییانەم لە کاک جەلیلی خاڵی فاتێ وەرگرتووە. کە بە سۆفی حەسەنی کوتبوو، ئەویش بۆ خاتبەسێ گێڕابووە لەسەردەشتێ هەرچەند سۆفی حەسەن دەیزانی بە پێی قسەکانی کاک جەلیل فاتێ و منداڵەکانی ماوەیەکی زۆر بوو کە لە سابلاغ دەژیان بەڵام چون خۆی بە ئەمەگداری دوکتور بەختیار دەزانی هاتبوو وەدوای بەسەرهاتی ساڵانی ڕابردووی فاتێ کەوتبوو، جابۆیە هاتبووە لای خات بەسێ و خات بەسێش دواتر ئەو نەقڵ و باسانەی هەموو بۆ دایکم گێڕابۆوە ئەودەم کە هاتبۆوە

سابلاغ و بە هەڵکەوت لە شەقامدا تووشی دایکم دەبێ، ئیتر بەرۆکی بەرنادا هەتا هەمووی لە نووکەوە بۆ دەگێڕێتەوە. بەڵام بەشی دووهەمی ئەم زانیارییانە بۆخۆم ئاگاداریان بووم، من باش دەمزانی پاش ڕۆیشتنی نازێ و عەلیلە چ بەسەر منی کڵۆڵ و قالەی بەستزمان هات، قالە کە مەدرەسەی جێ هێشت. هەڵبەت پێشتریش کوتوومە کە ساڵێک دوای ڕۆیشتنی نازێ لە سەردەشت، ئێمەش ماڵمان لەوێ ڕۆیشت، لەو دەمەوە، تا ئێستا لە قالە بێخەبەر ماوم، ئەودەم کە خاتبەسێ نەقڵ و باسەکەی خاتفاتێی بۆ دایکم گێڕابوۆە باسی ئەوەی دەدنیایەدا هەیە لە لای دایکمی کردبوو بەدەر لە باسی قالە، دەتکوت تەنیا شتێکی کە لە دنیادا نییە قالەی کوڕیەتی. دایکیشم نەیکردبوو پرسیاری لێبکا. هەر لێرەدا دەبێ ئەوەش بڵێم قالە تازە هیچ دەورێکی لە ژیانی هیچکام لە ئێمەدا نییە و ڕەنگە بتوانم بڵێم تەنانەت لە ژیانی خۆشیدا نییەتی، چونکە هیچ کاممان نازانین قالە ماوە یان مردووە؟! ئەگەر ماوە لە کوێیە و چۆنە و چ دەکا؟ ئەگەر مردووە، بۆ مردووە؟ یان بەچی مردووە؟ یان لە کوێ نێژراوە؟ کە هیچ کام لەمانە نازانین دەیجا هیچ پێویست ناکا لەخۆڕا تازە ناوی بێنین. بەڵام دەربارەی ئەو نەخۆشییە پڕمەترسییە کە تووشی هاتبووم هەرچەندە ئەو دوکتورەی هێنابوویانە سەرم لای وابوو تازە لە چنگی ڕزگاریم نایە، بەڵام هەرگیز بیری لەوە نەکردبۆوە کە من تەنیا نەبووم «من» سێ کەس بووین من و نازێ و عەلیلە! دەی بەس ڕوون و ئاشکرایە، کە هەم دوکتور بە هەڵە چووبوو و هەمیش دایک و بابم. ئێمە بەسەر نەخۆشیەکەمدا زاڵ بووین، بە ڕۆژ کە چاوم هەڵدێنا دەمدیت کە نازێ و عەلیلە هەرکام دەستێکمیان لە دەستی خۆیان ناوە و لە پەنام نەدەجووڵانەوە و کە شەو دادەهات و چاوم وێک دێنا، هەرتکیان بەجووت دەهاتن و دەستیان دەگرتم و دەیانبردمە نێو خەونەکەی خۆیان. ژیانی من هیچ ئاڵوگۆڕێکی بەسەردا نەهاتبوو. شتەکان لەسەر جێی خۆیان مابوونەوە. تەنیا جیاوازییەکی لەگەڵ پێشتر بەدی دەکرا ئەوە بوو کە من نازێ و عەلیلەم بردبووە ژووری خۆم، هەرسێکمان ببووینە کەسێک، بەبێ هیچ جیاوازییەک لە نێوانماندا، هەتا لەسەر پێیان ڕاگرتمەوە

ئینجا ورده ورده ئەوان گەڕانەوە ماڵەکەی خۆیان و من جارێکی تر تەنیا مامەوە. بەڵام نەوەک کەسایەتی پێشووم. لە کورتی و کەمی و کزیم دابوو. من خۆمی سەردەشتێم نەبووم، ببوومە کەسێکی تر. خۆمێکی سابڵاغی و ئەودەم کە لە کۆڵان خەریکی دار و هەلووک بووم، هەرگیز نەمدیت و نەمزانی ئەو دوو کچە بە کوێ دا هاتبوون و بەرەو کوێ دەچوون؟ هەرکە هەلووکە کە وەپشت یەکیان کەوت و ئەوی تریان لەجیات تەواوی ئەو منداڵانەی لە کۆڵاندا کایەیان دەکرد، ڕووی لەمن کرد و کوتی: «بێتەربیەت»! لەبەر ئەوەی پێشتر ببوومە کەسێکی تر. نەیناسیبوومەوە و دیارە منیش هەروەتر....

❊❊❊

## ٤٩

...... ئەودەم هیچ کەس لە گوڵە شێتێ نەدەگەیشت. بە پێچەوانە، گوڵێ لە ناخی دەروونی هەموو کەسێک ئاگادار بوو. دەتگوت بەشێک لە ڕووح و ڕەوانی خەڵکی شار بوو ئەوەی بەرەوڕوو پێی دەکوتن، وەهای هەڵدەبەزاندنەوە کە ناچار دەبوون بۆ شاردنەوەی ئەو ڕاستیانەی بەسەر زاری گوڵێ دا هاتبوو، جنێوبارانی بکەن و گوڵێ وەقاقا و پێکەنین بخەن. ئەو مەبەستانەی لە قووڵترین بەشی نابەئاگای دەروونت دا حەشارت دابوون و نەتدەوێرا هەرگیز ئاوڕیشیان لێ بدەیەوە. کەس نەیدەزانی گوڵەشێت چون ئاگاداریان بووە کە لە کاتی خۆیدا لەبەر چاوت لێفەی لەسەریان هەڵدەداوە و تۆی ناچار دەکرد سەرداخەی و ڕێگەیەک بدۆزییەوە کە بۆی هەڵێی. دەتکوت گوڵە شێت ویژدانی شاراوە و لەبیرچووی کۆمەڵگایە. بڕوای گوڵەشێت هەروەک بڕوای نێڕۆن، ئیمپڕاتۆری ڕۆمی کەونارا بوو. گوڵێش هەر وەکی ئەو دەیکوت: «چ پێتان خۆش بێ و چ پێتان ناخۆش بێ ئەمن مێردی تەواوی ژنانی ئێرەم و ژنی هەموو پیاوانی ئێرەم.»

خودا هەڵناگرێ ئەوەی من لێیدەزانم ئەوە بوو. بە پێچەوانەی نێڕۆن و وتەکەی گوڵێ نە هەرگیز ژنێکی پێ ژن بوو و نە پیاوێکیشی بە پیاو دەناسی بەڵام لەوەی کە دەیکوت هیچ کام لەو ژن و مێردانە هەرگیز ناتوانن هیچ شتێک لە چاوی من بشارنەوە ڕاستی دەگوت.

کاری گوڵەشێت هەرکە بەیانان لە خەو هەڵدەستا ئەوە بوو کە بە بەر درگای دووکانی خەڵک دا بڕوا و ئەوەی دەستی پێی ڕاگەیشتبا. پڕی دەدایە و دە زاری داویشت لە کافلەکونێکدا ئاوای دەکرد، شەوانەش بەو ئاڵوگۆڕەی بە درێژایی ڕۆژ بەسەری دێنان لەبەر درگا و بانی خەڵک بۆی ڕۆدەکردنەوە. هەڵبەت سوور و عەیانە ئەو شتانەی بە کاڵی و نەکوڵاوی

ڕۆی دەهێشتن تا مەودای ڕیخوڵەکانی گوڵێیان تێپەڕ دەکرد کە گومانیش لەوە دانییە بەو خواردنەی لەبەری بەیانەوە هەتا درەنگانی شەوانی دەخایاند دەبوایە درێژی ڕیخۆڵەکانی گوڵێ دوو هێندەی ڕیخۆڵەی مرۆڤێکی ئاسایی بێ و چەند جاریش قایمتر لە دەزووی نەپسێنی تای قەند و شەکر بێ، وەها ئاڵوگۆڕێکیان بەسەردا دەهات کە هیچ کەس شتەکانی خۆی نەدەناسییەوە!!! هەر بۆیە بە پرتەوبۆڵە و سووکایەتی و جنێو پێدان، چیان بۆ گوڵێ نەدەهێشتەوە. هەڵبەت لەو شتەیان بۆ نەدەهێشتەوە کە هەرگیز نەیبوو و ئەو جنێوانەشیان دوور لە چاوی گوڵێ پێدەدا، ئەگینا، ئەگەر گوڵێ لەوێ بوایە، وەهای لێفە لەسەر هەتیوان هەڵدەداوە کە کابرا هەزار خۆزگەی بە مردن دەخواست و بە ئاوات بوو عەرز زاری لێک کردباوە و دەچاوترووکانێکدا هەڵیلووشیبا، خۆم لەبیرمە جارێکیان کە مەولوود قەساب بەربینگی بە گوڵێ گرتبوو و پڕجنێوی کرد. گوڵێ متەقی نەکرد. خەڵک، ئەوەی لە دەوریان هالابوون، زۆریان پێ سەیر بوو، شتی وا هەرگیز ڕووی نەدابوو. گوڵێ و بێ جوابی؟

یەک دەیگوت: «خەڵکینە! پێم وایە گوڵێ وادەی مردنی هاتووە ولام نادآتەوە.»

ئەویتر دەیگوت: «ڕەنگە دوێ شەو، دەزگیرانی گوڵێ هاتبێتە خوازبێنی و گوڵێ سەبارەت بەو هیچ ناڵێ، تا نەکا لێی پەشیمان ببێتەوە.»

هەر دەهات و قەرەباڵغتر دەبوو. مەولوود قەساب کە هەرگیز گوڵێی ئاوا بێدەنگ و بێ ولام وەچنگ نەکەوتبوو، پڕکێشی دەکرد.

: «هەموو ئێوە! ئەو ژنەتیوە شێت و شوورەتان ڕوودار کردووە، ئەگەر تەنیا دوو کەستان وەک من جوابێکتان لە پارسەنگی ئەم شێت و شوورە نابایە کار و پیشەی نەدەبوو بە گووکردن بۆ عالەمێ.»

هەر لەودەمەدا گوڵەشێت وەدەنگ هات. دەتکوت بە ئانقەست ڕاوەستاوە تا خەڵکێکی زۆریان لێ کۆ بێتەوە.

گوتی: «ئاخر دە دمەپووچەکەی بابت ڕیم کە نان و ماستیشی پێناخورێ هەڵبەت گوڵێ هەرگیز چاوی بە بابی مەولوود قەساب نەکەوتبوو. ئەوانەی

وا بابی مەولوود قەسابیان دیتبوو. سەریان لەوە سوڕ مابوو. گوڵێ ئەو کەڕامەتەی لە کوێ هێناوە. ئەوەی دەربارەی بابی مەولوود قەساب گوتبووی ڕاست ڕاست بوو. دیارە خۆ گوڵێ خاوەن کەڕامەت نەبوو، تەنیا حیسابێکی سادەی مەنتیقی تێیگەیاندبوو دمێک کە پووچ دەبێ ڕادەیەکی کەم لە خورادەمەنی دەبا و ئەو کە هەمیشە زۆری لەسەر زەوی ڕۆ دەکرد. ئەگەر دەدمی بابێ مەولوود قەسابی کردبا چۆن جێی نەدەبۆوە، بەس دەبێ دمی پووچ بووبێ و خەڵک وەک کەرامەتیان لێ دیت. گوڵێ سەر لەنوێ لێی دووپات کردەوە تا خەڵک بێدەنگ بن و بە جوانی گوێی بۆ هەڵخەن: «ئەی دە دمە پووچەکەی بابت ڕیم! یانی مەولوود ورگن! تۆ نەتزانیوە کە من چاکەم دەرحەق بەتۆ کردووە. ئەودەمی کە بۆم لەبەر درگا ڕۆکردی؟» گوڵێ کە بە ڕاستی لە دەست مەولوود قەساب تووڕە ببوو کەفی هەڵدەخڕاند.

: «خوێڕی! دوێنێ نیوەڕۆیە کە زارا چاوبەڵەک هاتبوو گۆشتت لێبکرێ – زارا چاوبەڵەک ژنی عەزیزکورتان درووە بوو کە لەوێ ڕاوەستابوو. پیاوێکی فیتەرەی، زەلامی زەبەلاح بوو کە دە دەرکەیەوە نەدەچوو دەیانگوت کە لاو بوو گوێدرێژی بە بارەوە لەسەر ملی دادەنا و هەڵیدێنان – ناپیاو هەرکە زارا گوتی کاک مەولوود نیو کیلۆ گۆشتی جوانم بدەیە. تۆ پێت گوت......

من پێم عەیبە گەواد، بیگێڕمەوە خۆت بڵێ چت پێگوت؟ ئەگەر خۆت بە پیاو دەزانی بە زمانی خۆت بڵێ چت لە زارایە داوا دەکرد کە دوو کیلۆ گۆشتی زۆر جوانی دەدەیەی، ئەویش بە خۆڕایی، دەی بڵێ زارا چ جوابێکی داوە بە تۆ؟ نەیگوت: «ئایاڕۆ تۆ خەجاڵەتێ ناکێشی ئەو قسانە دەکەی. وەڵڵاهی گووشت بۆ ناکەم.»

: «ناپیاو! من ئەو دەم زگم بە تۆ سووتا کەلێی دەپاڕایەوە بۆت بکا و بۆی نەدەکردی، هەر بۆیە من تێڕێکم بە خۆڕایی بۆ کردووی. گەواد! بۆ قەڵس دەبی و جنێوان دەدەی؟ عالەمینە حەقم نەبوو بۆی بکەم؟»

لەپڕ لەگەڵ قاقا و پێکەنینی خەڵک، عەزیز کورتان درووە خۆی بە مەولوود قەساب دادا و لەبنەخۆی نا. دایگرت ئەمما داگرتن. ئەگەر خەڵکەکە بە

هاواری نەگەیشتبان و لە ژێر دەستی عەزیزیان دەرنەکێشابا، لەوانە بوو کە وەک کەلاکە هەڵاوەسراوەکەی بەردووکانی خۆی، شەقە بە شەقەی بکا و لە پەنای گۆشتەکانیتری هەڵواسێ، گوڵێ ئەودەم جنێوی بەسەر هەموو ئەو خەڵکەی لەوێ ڕاوەستابوون دەباراند.

: «هەی گەوادینە! خۆتان بۆ فریودەدەن. هەمووتان گەوادن، بۆخۆشتان باش دەزانن. هیچتان ژنەکانتان هی خۆتان نییە. پێتان بڵێم کێ هی کێیە؟ هەی بێ نامووسینە! ئەمن لە خۆڕایی گوویەکەم خەسار دەکەم، ئێوە گووشتان قابیل نییە.»

کەس نەبوو لەو شارەدا لە منداڵ و گەورە و پیر، لە ژن و پیاو تەنانەت سەگ و پشیلە و مەڕومانگاش، ئەودەم کە گوڵێ دەکەوتە جنێودان بێبەش بێ. هەرکەس بە پەنایدا تێپەڕیبا. جنێوێکی هەر دەگەیاندێ بەم دوو چاوەی خۆم دیتم. ڕۆژێک جنێوی بە مێرووله دەدا، ڕۆژێکی تر بە ژەنگە سوورەیەکی کە بە دەوریدا دەخولاوە.

: «قوون گوواوی بۆ بەتەنێ وەدەرکەوتووی ئەدی دایکە قاحپەکەت لە کوێیە و خەریکی چییە؟»

ژن بە پەنای تێپەڕیبا، یەکی دەگەیاندێ: «بەڕەڵڵای، سووزمانی بەو توولحی بەیانییە ناڕازی هاتوویەوە بە کەیفت نەبوو؟»

سەیر ئەوەیە تەنیا کەسێک کە گوڵێ ڕێزی بۆ دادەنا و هەرگیز قسەی سووکی پێنەدەکوت بووک نازێ بوو. هەرچەند ئەوەی لە جنێو و قسەی سووک لە جانتای دەروونی دابوو هەمووی بە غەفوورەگێڕ دەکوت. هەرگیز نەبوو جارێکیش قسەیەکی ناحەز بە بووک نازێ بڵێ. سەیرتر ئەوە بوو کاتێ بووک نازێی دەدواند هەر بانگی دەکرد: خانم گیان، خەڵک ئەوەیان زۆر پێ سەیر بوو، چ رازێک لە مابەینیاندا بوو. کاتێ لە بووک نازێیان دەپرسی گوڵە شێت بۆ لەگەڵ تۆ ئاوا بە ئەهوەنی و بەرێزەوە دەدوێ؟ دەیگوت: «ئاخر گوڵێ خوشکی منە»

هیچ کەس بڕوای بەم قسەیەی بووک نازێ نەبوو، ئەوەی هەبوو هەر ئەوە بوو کە گوڵێ هەرگیز لە گوڵ کاڵتری بە بووک نازێ نەکوت و هەرگیز

لەبەرخاتری دڵی بووک نازێ هەرچەندە ڕقی دنیایەی لە غەفوورەگێڕ بوو یەک جاریش لەبەر درگایان پیسایی نەکرد، چون دەیزانی دەبێ بووک نازێ خاوێنی بکاتەوە.

گوڵەشێت لە یەکێ لەو دەمانەدا کە لە شێتایەتی هێندێک سووک باردەبوو لە لای یەکێ کوتبووی – هەڵبەت ئەو دەمە بوو کە تازە پێی نابووە ئەم شارە و ئێستا خەڵک بە کەیفی خۆیان شێتیان نەکردبوو – کە بڕیار وایە هەر بەم زووانە یەکێک بێتە شوێنی و لەگەڵ خۆی بیبا. هەموو ڕۆژێ خودای لای تاوپەڕان کە ویستبات چاوت بەگوڵێ بکەوێ دەبوو بچی بۆ لای کانیمەتکە و لە سەرەوەی کانیمەتکە گوڵە شێت ڕوو بە باسکەدوو دادەنیشت و چاوی لە ڕێگا دەبڕی تا شەو کە تاریکی دنیای دادەگرت ئینجا هەڵدەستا وەڕێ دەکەوتەوە. دەهاتەوە نێو شار بۆ بەجێگەیاندنی ئەرکی هەمیشەیی خۆی، یانی ناچار کردنی بە نۆرەی خەڵکی شار بۆ گەسک لێدان و خاوێن کردنەوەی بەر درگا و حەوشەیان، هەڵبەت ئەگەر گوڵێ توانیبای خۆی تێڕۆکا.

ڕۆژێک لەگەڵ عەلیلە و قالە تووشی گوڵێ هاتین. عەلیلە پرسیاری لێکرد.

: «گوڵێ ئەرێ شەوانە، جندۆکە و شەیاتینی نایەنە زگت.»

گوڵێ نەیهنا و نەیبرد کوتی: «هەتیوی فاتە قوون پانی هەتا ئەو دایکە خڕوخۆڵەت لەوێ بێ مەگین جندۆکە و شەیاتینی کەرن بێنە زگ من؟»

هەر چاک بوو ئەودەم هەر ئەو سێ کەسەمان لەوێ بووین و ڕازداری یەکتر، ئەگینا کەسێکی ترمان لەگەڵ بوایە نازناوی عەلیلە دەبوو بە هەتیوی فاتە قوون پان، چونکە ئەودەم کەس نەبوو کە خاوەنی نازناوێکی لەم چەشنە نەبوایە و خەڵک پێیان خۆش بوو کە لە ناوی ئاسایی کەسێک کەڵک وەرنەگرن. من خۆم هەمیشە ئەوەم بۆ ببوو بە پرسیار، گوڵێ کە هەرگیز تاقە بیسمیلایەکی لە زاری نەدەهاتە دەر و دۆخینداریش نەبوو ئەی چۆن بوو جندوکەکان خۆیان تێنەدەگەیاند. تۆ بڵێی گوڵێ لە عەشیرەتی خۆیان نەبێ؟ نازانم ئێمە کە ماڵمان بە دوای ماڵە عەلیلەدا لە سەردەشت ڕۆیی. ئیتر ئاگا و خەبەرم لە گوڵێ شێت بڕا. با ڕاستییەکتان لە لا بدرکێنم. من بەدەستی

خۆم نەبوو. بە پێچەوانەی زۆربەی خەڵک، گوڵە شێتم خۆش دەویست. هەمیشە کە چاوم لە دوو چاوە کاڵەکانی دەبڕی. شتێکی زۆر سەیر و نامۆم لە چاوی دا بەدی دەکرد. ئێستاکەش نازانم ئەوە چی بوو؟ کە هەمیشە سەرنجی منی بۆ لای خۆی ڕادەکێشا. هەرچی بوو و نەبوو لە گوڵە شێتم عاقڵتر و ڕاستگوتر کەس نەدەدیت. لە دوایش‌دا کە پرسیارم لە چارەنوسی گوڵێ کرد چیم وەدەس نەکەوت. بێ‌گومان خۆم ئەوڕایەی خۆم زۆر بە ڕاست و دروست دەزانم کە: ڕۆژێک لە ڕۆژان، کە خەڵکی شار نوقمی دنیای بێ خەبەری هەمیشەیی خۆیان بوون، لە لای باسکەدوو سوارێک هات لەدووی گوڵە شێت، پێشتر گوڵێ خۆی تەیار کردبوو، کەس نەیدیتن چون یەکتریان لە ئامێز گرت. هەر ئەودەم بوو کە بۆ هەوەڵ جار گوڵێ تێر تێر گریا. هێند گریا، هێند گریا کە ئاوی کانی‌مەتکە کە ئەوێ ساڵێ لەکەمێی دابوو. لە پڕ تەقیەوە و بە لێشاو دەشت و دەری سەردەشتی داگرت و بوو بە سێلاو و گوڵێ و سوارەکەی لەگەڵ خۆی برد.

بەیانی کە خەڵک لە خەو ڕاست بوونەوە لەبەر درگاوبانیان ئاسەواری گوڵێیان نەدی، تازە زانیان کە بەشێک لە بزەی شار بزر بووە، سەردەشت هەرگیز خۆی نەگرتەوە....

❊❊❊

..... حاجی محەممەد کە چۆوە ماڵ خۆی بۆ ڕانەگیرا و درکاندی کە کەریم ڕووی کردۆتە کوێ.

تەنیا بووک هەنار بوو گوتی: «هەی بۆت لاڵ بم کەریم.»

بەڵام مۆڕەی پڕ لەڕقی حاجی ژن دووهەم ڕستەی «بەستزمانە هەرگیز ساتێکی عومری خۆش بە خۆیەوە نەدی» لێ بزر کرد و خۆی دەسی پێکرد.

: «حاجی! چەندەم پێگوتی ئەو بێ نامووسەی تەمبێ کە، هێندەی لێ خۆش مەبە، هەر ئۆینێکی دەریهێنا گوێت نەدایە و لێی خۆش بووی، بۆخۆم چەنەم لەگەڵی شل بوو ئەوەندەی ئامۆژگاری بکەم و بە قسەم نەکا. بەو کابەیەی دەستت پێی گرتووە هەمیشە لە چاوەکانی دەترسام. دەمزانی ئاخری پەندێکمان هەر بەسەر دێنێ و دەبێتە هۆی سەر شۆڕیمان. کەریم! ڕەببی خودا لەبەر دڵی منت هەڵگرێ. تۆ چۆنت وێرا بەم جۆرە ئابڕووی چەند ساڵەمان لە لای دەروجیرانان بەری. حاجی! جا تازە چۆن لەنێو خەڵکی سەرمان هەڵێنین. ڕەببی خودا دەوامی عەمرت نەدا. قەستەم بەو خودایەی هەموومانی خەڵق کردووە هەر لەو ڕۆژەوە کەوتە نێو زگم تا ئێستا لەبەر ئەو هەتیوە نەحەساومەوە. حاجی! خۆ تۆ جوانت لەبیرماوە چۆنی لە جێگەوبان هاویشتم چۆنی باب و کاک کوشتم. بەو خودایەی کە خودایە ئەو هەتیوە سەرەخۆرە، دەزانم تا سەری هەموومان بە فەتەڕات نەدا دەست هەڵگر نییە.»

حاجیژن سەری بەردابۆوە و بە دەم سووڕاندنی تەشییەکەی هەروا لە بەر خۆیەوە قسەشی دەڕست! بووک هەنار هەموو گیانی ببوو بە ویست و ئاواتێک کە ئەحمەدی مێردی کە هەروەک هەیکەلی ئەبوولهول بێدەنگ و مات دانیشتبوو هان بدا تا قسەیەک لە پارسەنگی دایکی بنێ و بێدەنگی بکا کە

چیتر ئەو منداڵە بێتاوان و بێ گوناحە نەخاتە بەر پلاری تەوس و تانە و جنێو و بوختان. هەرچەند ئەحمەد زەق چاوی لە چاوی بووک هەنار بڕیبوو. بەڵام خۆی هەر لە وەتاغەکەدا نەبوو. ماوەیەک بوو وەشوێن قادرئاغا کەوتبوو تا بزانێ ئاخۆ ڕەزەکەی خوار پاسگای پێدەفرۆشێ یان نا؟ بە ڕاستی گوێی لە تاقە قسەیەکی هیچ کام لە دانیشتوانی نێو وەتاغەکە نەبوو. حاجی محەممەد ڕووی لە حاجیژن کرد و کوتی: «ئەرێ ئەوە ئەتۆ دەڵێی چی؟ هەر لەبەر خۆتەوە دەیرێسی.»

: «بۆ حاجی مەگین ئێمە پشیلەین؟ هەر بە هێندمان ناگری بە ناشکوری ناڵێم. هەموو جوانیم لەسەر ئێوە و ژیانتان خەسار کرد.»

حاجی کە دووبارە بیری چووبووە لای حەسەنی برای، بیری لەوە دەکردەوە کاتێک مەلا برایم نامەکەی بداتێ و ئاگادار بێ کە کەریم ماڵی بەجێ هێشتووە و وەشوێن ئەو کەوتووە. تۆ بڵێی ئەوەندە دەرفەت پەیدا بکا کە بە شوێنیدا بگەڕێ؟ مەلا برایم ئەرخەیانی کردبوو کە نامەکەی لە زووترین کاتدا دەگەیەنێتە دەستی. وێدەچوو تەنیا کەسێکی قسەکانی حاجیژنی گوێ لێبوو بووک هەنار بوو کە ئەوەش هیچ بە کەیفی حاجیژن نەبوو. لە دوای ئەوە کە بە ڕۆیشتنی کەریم، ئاسنگەرییەکەی حاجی وەک جاران نەدەگەڕا و بەو سەرکۆنە کردنە مەلا برایم حاجی محەممەد بۆ هەوەڵ جار سەیر بەخۆیدا شکابۆوە. هەستی کرد بە درێژایی تەمەنی هەرگیز کەریمی وەک کوڕی خۆی چاو لێنەکردووە. کە وابوو هەرگیزیش نەکەوتۆتە بەر دڵیشی. حاجی تەنیا میسراعێکی شێعری فارسی دەزانی، هەر لە منداڵییەوە لەبەری بوو جار جارە لە خۆڕا ئەو میسراعە شێعرە لە نێو مێشکیدا سەری هەڵدەدا و ئیتر وازی لێنەدەهێنا و وەک بنێشت لە بەیانیرا تا شەو دەزاری دابوو و هەر دەیجووتەوە، نە دەیزانی شاعیرەکەی کێیە، نە دەیزانی لە کێ فێری بووە. ئەوە لە ئەختیاری شێعرەکە دابوو کە هەر کات و ساتێک کە پێی خۆشبا، دەکەوتە گیانی حاجی و تا وەڕەزی وەڕەزی نەکردبایە بێ سەروشوێن نەدەچوو هەر لەو دەمەدا لەپڕ لێی وەدەرکەوت:

«از دل برود هرآنچه از دیده برفت»

لەپڕ شتێکی سەیری بە دڵدا هات. هەرگیز درگای دڵی بۆ ئەو کوڕەی نەکردبۆوە، کە وەبیری خوی دەهێناوە کەریم لە کاتی دەماندنی کوورەی ئاسنگەرییەکە، زۆرجار بە حەسرەت چاوی تێدەبڕی و ئەویش نیگای خۆی لێ دەدزییەوە. هەر لەبەر ئەوەی بووە تا وەبەر چاوی نەیە، وەبەردڵی نەکەوێ، لە ماوەی ئەو دوو حەوتوویەدا کە کەریم جێی هێشتبوون، هیچ کارێکیان بۆ ڕانەپەڕیبووە پێش. ئەحمەد کوڕە گەورەکەی حاجی کە ئێستاش تێنەگەیبوو بۆچی هەموو ڕۆژێ بە بیانوویەکی تازە وەدەر دەکەوت و کاتێک دەگەڕاوە ناچار دەبوو بۆ نان خواردن دەست لە کار بکێشنەوە. بۆخۆی کە نە تاقەتی جارانی مابوو و نە دەست و دڵیشی بۆ کار دەچوو. عەوڵای کوڕی کە دەرسی دەخوێند و نەدەهاتە ئاسینگەری، هەرچەند هاوینان کە دەهات نە تەنیا کارێکی لەگەڵ نەدەکردن بەڵکوو بەردەستیشی دەگرتن، ئەو کەسەی کە کاری لەگەڵ دەکردن ئێستا بە بیانووی یەکتەنی و لەوێ نەبوونی کەریم کارێکی وای نەدەکرد. یانی کەریم لە کاردا ئەوەندە دەورێکی گرینگی هەبوو؟ حاجی نەیوێرا ئەم پرسیارە لە خۆی بپرسێ- شێوەیەک لە خۆ فریودانی مرۆڤ. زۆر جاری وایە مرۆڤ ئەگەر پرسیارێکی بەجێ لە خۆی بکا و خۆشی بەوپەڕی ڕاستی وڵامی پرسیارەکەی بداتەوە لە وانەیە گیروگرفتێکی گەورەی ژیانی بۆ هەمیشە چارەسەر بکا گیروگرفتێک کە ڕۆژ نییە ئازاری نەدا و ناچاری نەکا بۆ هەڵاتن دە دەستی پەنا بۆ فریویکی تر ببات بەڵام ئێمە وامان عادەت گرتووە کە تەنیا لایەک بە مافی خۆمان بزانین یان دەبێ ئێمە بپرسین خەڵک وڵام بدەنەوە، یان کەسیتر پرسیار بکا و ئێمە وەڵام بدەینەوە، ئەم چەشنە ڕوو بەڕوو بوونە لەگەڵ کێشەکانی ژیان، ئێدی بەچەشنێک باری هێناوین کەیان پڕ پڕین لە پرسیاری بێ وەڵام، بەهۆی ئەوە کە ناوێرین لەتەک ڕاستەقینەی وجوودی ڕووحی و ڕەوانی خۆمان ڕووبەڕوو بین و باوەڕیان پێ بهێنین و یان لیپاولیپ لە وڵامی جۆراوجۆرین بەو پرسیارانەی کە هەرگیز نیمانن و نامانبن. بەس حاجی محەممەد نەیوێرا ئەم پرسیارە لە خۆی بکا نەوەک ناچار بە وڵامدانەوە بێ هەر ئەوە بوو وەک دەیان شتیتر لە بیری خۆی بردەوە. بەڵام سەرەڕای ئەم خۆدزینەوەی حاجی لە پرسیار و

وڵامەکەی، شتێک لە ڕەنگی پەژارە ئامبازی بوو کە سەرێکی لە دیوە تاریک و تنووکەکەی ژوورەوەی وجوودی خۆی نا، پڕاوپڕی دیت لەو ئازار و ئەزییەتەی بە قسەی حاجیژن یان بە قسەی ماندوویەتی و برسییەتی خۆی و یان دوو زمانی عەوڵا دەرحەق بە کەریمی کردبوو. زۆری بێز لە خۆی کرد. لای سەیر بوو، ئەو کە هەمیشە بە ئاوات بوو پاڵەوانێک بێ، توانیبێتی بەم شێوەیە، ببێتە دەستەچیلەی دەستی حاجیژن. کە وەبیر خۆی هێناوە، دیتی تا ئەودەم نە تەنیا هەرگیز ڕوویەکی خۆشی نیشانی کەریم نەداوە، بگرە زۆر جاران لە هیچ و خۆڕایی وەک ئەودەمەی کە لە موشتەرییەکەی تووڕە دەبوو، یان حاجیژن شکایەتی لێکردبایە، بەبێ لێپرسینەوە دەکەوتە گیانی و ئازاری دەدا. قسەکانی مەلا برایم هاتەوە بیری.

: «حاجیئاغا! بەڕاستی لەتۆ ناوەشێتەوە منداڵێک بەم جۆرە دەنێو ئاور باوێی، چۆنت دڵ هاتووە ئەو بەستزمانە بۆ کارێکی وەها پڕ لە مەترسی بنێری، بەخودای ئەگەر دەفریایان نەهاتبام وەک بێژینگیان لێ هاتبوو.»

لە نەکاو وەخۆ هاتەوە، حاجیژن هەر وا لەبەر خۆوە بەسەروسەکتی کەریمی دادەدا. نەعرەتەی لەپڕی حاجی بوو بە مست و وەدمی حاجیژن کەوت، ئەحمەد کە لە دوای گەڕانێکی زۆر تازە قادرئاغای دیتبۆوە و خەریک بوو بە قسان نەرمی بکا تا ڕەزەکەی پێ بفرۆشێ. بەنیوەچڵی لە ژووری خۆی هاتە دەر.

: «بابە گیان! بۆ وا ناڕاحەت بووی؟ لەبەرچی دڵمەندی؟»

: «لەچی دڵمەندم؟ لەو ژنەتیوە سەگسارە، لەو دێوەزمە خێچ و خوارە، لەم ئەژدیهایە حەوت سەرە، لەو فاتە بۆرە. لەچی ناراحەتم لەو پۆڵا زرەییەی بەخۆی دەڵێ دایک، بە درێژایی ژیانی هاوبەشمان کاری هەر ئەوە بوو کە چاوی من ببەستێ بۆ ئەوەی نەکا منداڵە مەزلوومەکەی خۆم وەبەر چاو بکەوێ. وای لە من کردووە کە من ناچار بم ئەوەندە زوڵم لە منداڵێکم بکەم کە مردنی پێخۆشتر بێ لەوەی کە لە پەنای بابی ژیان بەرێتە سەر، لەوەی کە ڕۆژ تا ئێوارێ کاری ئەوەبێ بە درۆ هەڵبەستن و بوختان، منداڵێکی بەستزمان بە دەستی من بەلێدان بدا. هەمیشە پێم وابوو. ئەوە لەبەر عاملاندنی ئەو

منداڵەیە. پێم وابوو چونکە دەرسەکانی بەباشی نەدەخوێند پەرۆشی بوو و هەروەها لە کاروبارەکانی تریش‌دا تەمبەڵی و تەوەزەلی دەکا، هەمیشە پێم وابوو ئەوەی ئەو عفریتەیە پێم دەڵێ، لە ڕووی دڵسۆزی و خەمی دواڕۆژی ئەو منداڵەیە و لام ڕاست بوو کە ئەو کوڕە خەتابارە، دەبوو هەر لە هەوەڵەوە بزانم خودا لە خۆڕایی وا شەل‌وگێڕی نەکردووە.»

حاجی‌ژن کە بە درێژایی ژیانی هەرگیز بەم شێوەیە لەبەرچاوی کوڕ و بەتایبەت بووکەکەی – بەڕای حاجی‌ژن بووک و زاوا هەرتک بێگانەن و بۆ متمانە نابن و قەڵەشتێکن کە لە ژیانت دەکەون تا پێت خۆش بێ یان پێت ناخۆش بێ بەشێکی زۆر لە سوڕونهێنیەکانی ژیانت بکەوێتە دەست خەڵکی – بەم جۆرە وەدمی نەکەوتبوو. پڕی دایە دەمامکێکی تر و بەسەرو ڕوخساری خۆی‌دا کێشای.

: «ئایاڕۆ حاجی‌گیان! ئەو قسانە چییە دەیانفەرمووی. دیارە ئەوڕۆ زۆر ماندوو بووی، کچەتیوە زارا! تووبا! دەست ببزێون، ئەوە سفرەتان بۆ ڕانەخستووە؟ مەگین نابینن بابتان چەند برسییە؟ حاجی‌گیان! ئە بەو کابەیەی دەستی موبارەکت پێ‌گرتووە، منیش کەریمم زۆر خۆش دەوێ، درۆیە ئەگەر بڵێم بەقەرا ئەحمەدم خۆش دەویست. بەڵام بەسەری تۆ بە قەرا عەولام خۆش دەویست.»

حاجی گوڕاندی: «بەسەری خۆت بە سەری ئەژدادت، بۆ بەسەری من؟»

: حاجی‌گیان! بە قوربانت بم بۆچی لەخۆڕا خوێنی خۆت پیس دەکەی، خۆ تۆ پیاوێکی ئاقڵ و بە ئەزموونی، ئەوەندەی بیر لێ مەکەوە، بەخودای هەربینا ئەوڕۆ و سبەی بەشەرمەزارییەوە خۆی خستە بەرپێت، بۆ ئەوەی بیبەخشی. من ئێستاش دەڵێم کەریم غیرەتی ئەم جۆرە کارانەی نەبوو، بێ و نەبێ فریوی قسەکانی کوڕەکەی وەستا قادری خواردوە، هەرچی بوو دەمکوت با کوڕەکەت خراپ و بەدکارە نەبێ، دەنا چ دایکێک شک دەبەی منداڵەکەی خۆی نەوێ؟»

حاجی‌محەممەد کە وێدەچوو پڕتر لەوەیە کە حاجی‌ژن بتوانێ بە مەکری ژنانەی خۆی بەتاڵی کاتەوە، کوتی: «ئەتۆ! ئێستا کە ورد دەڕوانم دەبینم تۆ لە دەستت دەهات بە دەستی خۆت کەریم بخنکێنی!»

لەو دەمەدا کە حاجی‌ژن ئاگاداری قەدر و قیمەتی بووکهەنار لە لای حاجی‌محەممەد بوو بە گۆشەی چاو بووکهەنار ناچار کرد چیتر بێدەنگ نەبێ. بووکهەنار بە نابەدڵی هەرچەند لە هەموو کەس باشتر دەیزانی حاجی‌ژن چەندەی کەریم ئازار داوە. ڕووی کردە حاجی وکوتی: «مامەگیان چۆن شتی وا دەفەرمووی؟ هیچ دایکێک پێی‌خۆش نییە. هەرگیز وەیەک لە زاری منداڵەکەی بێتە دەر. جا چ بگا بەوەی بیهەوێ ئازاریشی بدا، ئامۆژنیش کەریمی خۆش دەوێ، کوڕیەتی. تکایە ئێوە چی‌تر خۆتان ناڕاحەت مەکەن. بۆ ئێوە باش نییە. منیش وای بۆ دەچم کە بەم زووانە دەگەڕێتەوە. ئاخر هیچ کوێ نابێتە ماڵە خۆت.»

بووکهەنار لە کاتی کوتنی ئەم قسانە بێزی لە خۆی دەکرد. چون دەیزانی ئەگەر هەرکەسێک ماڵێکی هەبووبێ کە تێیدا حەسابێتەوە ئەوا کەریم لە ماڵێکدا دەژیا کە هەرگیز تێی‌دا نەحەساوەتەوە. هەر بە بێزەوە کوتی: «ڕەنگە کەریم هێندێکی ناخۆشی چێشتبێ، بەڵام دیارە لە دوای ئەوەی ماندوو بوو. هەر دەگەڕێتەوە ئێرە. تکا دەکەم مامەگیان لەوەی پتر خۆتان ئازار مەدەن.»

حاجی‌محەممەد ئیتر لەسەری نەڕۆیی. هەرچەند لە دەروونی خۆی‌دا خەریکی کوژاندنەوەی ئاگرێک بوو کە مەلا برایم هەڵیکردبوو. لەوەی کە نەبوونی کەریم بۆتە هۆی ئەوە کە لەو ماوەیەدا هیچ کارێکیان بە تەواوی سەر نەگرێ و هەروەها قسەکانی کاک قادری خەیات کە لە ڕۆیشتنی کوڕەکەی بە خەتاباری دەزانین دیسان حاجی‌محەممەدی تووڕە کردەوە. خۆی ڕانەگرت وەدەنگ هاتەوە.

: «من پێم وابوو تا ئەحمەد لە دووکانە و جارجارە عەوڵاش دێتە کارێ، بوون و نەبوونی کەریم بەو قەڵافەت و جەستە ناقۆڵایەوە زۆر گرینگ نییە. بەڵام ئێستا وەک ڕۆژ لێم ڕوون و عەیانە. ئەوە کەریم بوو دووکانەکەی دەگێڕا، هەرتک دەستەکانم بوون، بیری ئەوە کە چەندەم بەهۆی دووزمانی

ئەو پیرەژنە قۆترە ئەزییەت دەکرد ساتێک دەسبەردارم نابێ. چەندەم ئێستا زگ پێی دەسووتێ، قەت نەبوو جارێکی وەدەنگ بێ، بڵێ ئەو کارانەم نەکردووە. هەربۆیە پێم وابوو ئەو ژنەتیوە ڕاست دەکا. ئەوەی بەو کوڕە بەستزمانەم کوتبایە بێیەک و دوو بە ئەنجامی دەگەیاند. هەمیشە بیرم دەکردەوە کە ئەوە بۆ قەرەبووکردنی خەتاکانیەتی بێقسەییم ناکا. من هەرگیز بۆ کەریم باب نەبووم، بووکهەنار! هیچ دەزانی ئەو خودا نەناسە دوو چاوی ڕاستبینی منی کوێر کردبوو. من چەندە بێ ڕەحم و بێ بەزە بووم. هەرچەند دەکەم و دەکرێنم ناتوانم خۆم ببەخشم، لە ماوەی ئەم دوو حەوتوویەدا کە کەریم ڕۆیشتووە. ساتێ هەدادانم نەبووە. هەر دەڵێی لەسەر پۆلووانم. بەنیازم سبەی بۆخۆم وەدوای بکەوم.»

هەرچەند ئەم قسەی ئاخری حاجیمحەممەد بە دڵی حاجیژن نەبوو و ئەگەر کات کاتی جاران بوایە بێیەک و دوو بەرگری لە چوونی حاجی دەکرد بەڵام ئەم جارەیان لە ترسی قامچی تووڕەیی حاجی بێدەنگ ماوە، ئەوەی دەیویست بیڵێ قووتی دایەوە، بووکهەنار هەرچەندە دەیزانی لە پاشان حاجیژن ئەوەی کە نابێ پێی دەکا خۆی ڕانەگرت و کوتی: «بە خودای مامە گیان کار لەوەی باشتر نابێ، بۆ کەریمیش ئاوا زۆر خۆشە بزانێ بەڕاستی بابی خۆشی دەوێ و لێی دەپرسێ و بە خۆڕایی ماڵی جێهێشتووە ئیشاڵڵا، خودات لەگەڵ دەبێ.»

حاجی هەرچەند لەخۆی ڕانەدەدیت کە بە پێیان و بە قاچاغی ئاودیوی سنوور بێ. بەڵام پێی وابوو بێت و مەلا برایم تا ئاخری حەوتوو بگەڕێتەوە، دەتوانێ ڕەگەڵی کەوێ کە شارەزای هەموو کونوکەلێن و کەندولەندی ڕێگەی ئەودیو بوو بە خۆی کوت: «تا خۆم بۆ ئەم سەفەرە ئامادە دەکەم خودا بکا مەلا برایم هەواڵێکم لە حەسەنی برام و لە کەریم بۆ بێنێتەوە کە پێویست نەبێ ئەم ڕێگا ناخۆش و دژوارە ببڕم. کە ئەو تەمایەی گرت. نەختێک ئارام بۆوە، هەرچەندە دڵی هەروا لە حاجیژن پڕ بوو و ئەوە شتێک نەبوو کە حاجیژن هەستی پێنەکا....

***

## ٥١

...... نازێ، نازێی جاران نەبوو، لە ئاوێنەیەکی ڕوونتردا خۆی دیتبوو. نیگای پڕ لە حەسرەت و ویست و خوازی لاوەکانی خوێندبۆوە. شار توێخێکی لێکردبۆوە. ئەو پێکەنینە بێگەرد و منداڵانەیەی کە پێشتر بە کامێرای ڕووحم لەسەر دەمی بێخەبەری منالی خۆمدا وێنەم لێ هەڵگرتبوو و ئێستاش هەر وەک خۆی لە ئالبۆمی وێنەکانی زەێنم دا خۆی دەنواند، لەسەر لێوەجوانەکانی بزر ببوو و لەجیاتی ئەو، بزەیەکی مانادار پڕ لە ڕەمزوڕاز جێی گرتبووە. کە هەرکەسێک دەیتوانی بە ویست و مەیل و ئارەزووی خۆی مانایەکی دڵخۆشکەری لێبداتەوە. نیگای جوان و ئارامکەرەوەی. ئارامی جارانیان نەمابوو، بێقەرار و نائارام یەک پشوو لە پشکنین و دیتن و هەڵسەنگاندن دابوو. لە ڕاستیدا نازێ، نازێیەکی تریشی ڕێ دابووە دەروونی خۆی. وا نەبوو کە من بتوانم لە هەوەڵ نیگادا ئەم نازێ دووهەمە ناس بکەم. زۆری خایاند، ئەوەندە زۆر کە لە دەروونی منیشدا کەسێکیتر سەری هەڵدا. کەسێکی زۆر نامۆ و نائاشنا لەگەڵ خۆم. کەسێک کە شەوڕۆژ لەگەڵ یەکتر لە بێنەوبەرە و بگرە و بەردە دابووین.

دەمگوت: «نازێ! پێم بڵێ ئاخر چۆن دڵت هات وا بێ خەبەر و لە نەکاو بەجێم بێڵی؟»

پاشان زانیم کە ئەم وڵامە لە لایەن کەسی دووهەمی نازێ بوو کە بە کەسی هەوەڵی منی دەگوت.

: «تۆ! ئەودەم زۆر منداڵ بووی. بۆ نەتدەزانی ئێمە لە چ حاڵێکی ناخۆش و دڵتەزێن دا دەژیاین؟»

هەوەڵ کەسی من ڕووی لە هەوەڵ کەسی نازێ دەکرد.

: «لەبیرت چۆتەوە نازێ! ئەوەی ئەودەمی وەدەستم دەکەوت بەشی خوشک و براکانم نەدەدا، هەمیشە نیوە بە نیوە پێکەوە دەمانخوارد. چەند جاران لەسەر ئەوەی بەشی خوشکم نەدابوو لە ماڵێ بە تێهەڵدانی دام، هەر ئەودەم کە وێمدەکەوت بیرم لە پێکەنینەکەی تۆ دەکردەوە و چ هەستم بە هیچ ئازارێک نەدەکرد، ئەگەر ڕاستت پێبڵێم. نازانم بۆچی پێم خۆش بوو لەسەر تۆ لێم بدەن؟»

نازێ چاوە جوانەکانی بۆ دوور ڕۆیشتبوون. پێم وابوو لە شوێنێ گیرسابوونەوە کە پێیان نەدەزانی بگەڕێنەوە وەک دوو کۆتری نائاشنا بە ڕکە. من پێم وابوو گیری کردووە لەبەر ئەوەی کە نازانێ دەبێ بە کامە نازێ بمدوێنێ. بە بێگومان کەسایەتی دووهەمی نازێ کەسی زاڵی دەروونی بوو، چون ڕووی کردە من و کوتی: «هیچ دەزانی ئەودەم ئێمە هیچ شتێکمان لە ژیان نەدەزانی؟ زۆر منداڵ بووین.»

کەسی هەوەڵی من ئەم جارە ڕووی لە کەسی دووهەمی کرد.

: «نازێ! ئەوە ڕاستە ئەدەم منداڵ بووین، بەڵام ئەوەشت لەبیر بێ کە دنیاش هەر بەقەرا ئێمە منداڵ بوو لەبیرت نەماوە؟»

کەسی دووهەمی ڕووی لە کەسی دووهەمم کرد. «نا، نا، من هەرگیز ئەودەمم لەبیر نەچۆتەوە، تۆ لەبیرت چۆتەوە کە ئێمە چەندەمان ئازار دەدیت. پێم سەیرە چۆنە وازت لە بیرەوەرییە تاڵ و ناخۆشەکانی ئەو سەردەم هێناوە؟ مەگین تۆ ئاواڵی هەرە نیزیکی عەلیلە نەبووی؟ لەبیرت نییە چییان بەسەر عەلیلە دەهێنا؟ چی دەچێشت بەڵام دەنگی نەدەکرد!»

عەلیلە، عەلیلە، ڕاستی دەکوت عەلیلە بەشێکی گەورە لە وجوودی خۆم بوو، لەبەر نازێ هۆشم لێی بڕابوو. لەو ماوەیەی دا کە نازێم دیتبووە، تاقە جارێکیش ناوی عەلیلە بەسەر زارمدا نەهات، هەرگیز هەواڵیم نەپرسی وەک ئەوەی کە هەرگیز کەسێک بەناوی عەلیلە نەهاتبێتە سەر زەوی یان من نەمدیبێ و نەمناسیبێ.

: «نازێ! هەموو خەتای تۆیە، ئەوە تۆ بووی کە جێگەی هەموو کەست لە دەروونی پڕ لە ویست و ئارەزووی مندا گرتبوو، تۆ! بێ ڕەزا و دڵڕەق

بووی. تۆ! تۆ! منت لە خۆشم کردبوو، ئیزنت نەدەدا بە هیچ کەسێک کە لە من نیزیک ببێتەوە.»

تەنانەت ئیزنی عەلیلەشت نەدا. ئەو برا خۆشەویستەت، ئەو عەلیلەیە کە هیچ کەسی لە دنیادا بە ڕادەی تۆ خۆش نەدەویست. من و تۆ و عەلیلە ببووینە سێ گۆشەیەک، قالەمان لە دەرەوە ڕاگرتبوو، دەیهەویست ببێتە بەشێک لە ئێمە بەڵام پێمان خۆش نەبوو، ئێمە سێ گۆشەیەک بووین لە مەدرەسەی پێمان دەکوت موسەللەس، سێگۆشەیەک کە هەرگیز نەیدەتوانی نە گۆشەیەکی کەمتر بێ و نە گۆشەیەکی پتر، ئەگەر بەم جۆرە نەبوایە سێ گۆشەکەمان نەدەبوو بە سێ گۆشە! بەڵام ئەودەم عەلیلە دەیویست تۆی لە هەموو کەس لەدنیادا پتر بوێ و منیش هەروەتر دەمەویست تۆم لە هەموو کەس زیاتر خۆش بوێ. ئێمە هەرکاممان بەنیاز بووین چوارچێوەی ئەم سێ گۆشەیە تێک بشکێنین. عەلیلە وەدوای خۆشەویستییەکی بێسنووری خوشک و برایەتی کەوتبوو و منیش بە دوای خۆشەویستیەکی بێنەهایەتی ئەویندارانەوە بووم. ئەودەم هەر تۆ بووی کە نەتدەهێشت من و عەلیلە بە تەواوی لە لای یەک بین لە ڕاستیدا تۆ بە تەنیایی تەواوی سێگۆشەکە بووی، من و عەلیلە هەریەک تەنیا گوشەیەکی تۆ بووین.»

ئەوە کەسی هەوەڵێ نازێیە کە بۆ ماوەیەکی کورت چاو لە چاوم دەبڕێ. هەر ئەوەندەم بەس بوو، جارێکی تر تەنیا بۆ ماوەی چاوترووکانێک ببمەوە بە خۆم. هەموو وجوودم بۆیەک چرکە بوو بە پرسیارێک و ئیختیاری ئەم پرسیارە.

: «ئەی ئێستا دەڵێی چی نازێ؟»

: «ئێستا؟»

کەسی دووهەمێتی کە وڵام دەداتەوە. پێدەکەنێ، نائاشنایە، نامۆیی لێدەکەم ئاڵوگۆڕێکی سەیری لە ڕوخسارە جوانە و سروشتییەکەی نازێدا بەدی هێناوە. زۆر جوانتری کردووە، بەڵام زۆر لە خۆڕایی. دەسەڵاتی بە سەرخۆیدا زۆر بووە. دیارە بەسەر کەسانیتردا زۆرتریش. کەسی هەوەڵی من لە کەسی دووهەمی من دەپرسێ: «ئاخۆ ئەو نازێیەی وا خەریکە

دەمدوێنێ و دەیدوێنم. هەمان خەیاڵی خۆشی دوێنێمە و ڕاستەقینەی ناخۆشی ئیمڕۆم؟ کاممان بە هەڵە چووین. تۆ یان من؟ تەمەن یان من یان نازێ؟ یان ئەو هەستەی پەروەردەم دەکرد تاکوو پەروەردەم بکا؟»

هەرچەندە نازێم وەک ڕاستییەک لەبەر چاوم دەدیت. بەڵام ئەوەی لەو بەینەدا دیار نەبوو من بووم چونکە من و ئەو حەز و خۆشەویستییە منداڵانەم هەر هەڵیان نەدابوو. بەپێی ئەو ماوەیەی تێپەڕ ببوو. گەورە نەببوون بە پێچەوانەی نازێ و هەستەکەی کە زۆر سەیر ئاڵوگۆڕیان بەسەردا هاتبوو. ئەوە من بووم بە خۆم ئیزنی گەورەبوونم نەدابوو تا هەمیشە نازێم هەر لە لابێ بەڵام نازێ کە گەورە ببوو لەگەڵ خۆی خەیاڵی منیشی گەورە کردبوو کە بۆ دووهەم کەسی من هەر، هەمان هەوەڵ کەسی من بوو لە حالێکدا دووهەمکەسی نازێ کەسێکیتر بوو کە هەوەڵ کەسی من نەیدەناسییەوە ئەویش هەروەتر، چونکە نازێ بە دیتنی من چاوەڕوانی دیتنی دووهەم کەسی من بوو کە وەبەر چاوی نەهاتبوو. هەر بۆیە لە ڕاست پرسیارەکەی من «ئەی ئێستا دەڵێی چی نازێ؟»

دەڵێ: «ئێستا؟»

پێدەکەنێ و درێژەی پێدەدا: «با بزانم»

با بزانم ئەو وڵامەی نازێ بوو بۆ من کە من بە ئاوات بووم لێی نەبیسم.

ئێستا کە من لە کێشەیەکی بێبڕانەوە دام لەگەڵ خۆم. وەبیرم دێ هەرچەند گەلێ پێم خۆش بوو بزانم عەلیلە چی بەسەر هاتووە و سەرقاڵی چییە، نازێ وەهای لە گێژاوی خۆم هاویشتمەوە کە نەمویست خەمی عەلیلەش بکەمە سەرباری خەمی خۆم. بەڵام لە خاتفاتێ و خوشک و براکانیم پرسیار کرد.

: «نازێ باجە فاتێ و منداڵەکانیتر چۆنن؟»

: «دایکم کە هەروەک خۆیەتی، چۆنت دیبوو، هەروای دەبینی. لەوانەیە ماوەیەکیتر بیبەن بۆ عەمەلی جەڕڕاحی. خاڵم دەڵێ، پێویستە دوکتورێکی باش عەمەلی بکا چون عەمەلەکەی زۆر دژوار و ئەستەمە.»

بۆ یەکەم جار لە قەوارەی مندالّیم دەترازێم و دەلّێم: «نازێ! جارێ پەلەی لێ مەکەن، من دەمهەوێ بۆ دوکتوری ئیمتحان بدەم ئیشالّلا بۆخۆم عەمەلی دەکەم»

نازێ پێدەکەنێ. ئەم قسەیە لەو کەسەی کە لەبەرچاوی ڕاوەستابوو واتا لەو مندالّە بالاّنەکردووە نەدەوەشاوە و بە دووری دەزانی. چاوێک و سەرنجێک و پێکەنینێکی تر و پرسیارێک.

: «ئێ؟ بە ڕاستتە؟ تۆ بۆ دوکتوری دەخوێنی؟»

ناچارم دەکا لەم قەوارە تازەیەم دا بمێنمەوە.

: «بۆ نازێ ئەمن چمە؟ لات وایە ناتوانم ببم بە دوکتور؟»

دیسان پێدەکەنن: «نا، مەبەستم ئەوە نەبوو کە تۆ ناتوانی، ئەوە بوو کە تۆ دەتوانی، وەدوای دەکەوی؟»

: «بەلّێ نازێ! وەدوای دەکەوم، بە هەموو وجوودمەوە وەدوای دەکەوم من دەبێ بە هەر جۆرێک بێ گەورە بم. ئەوەندە گەورە کە بتوانم تۆ لە هەر حالّ و وەزعێک دابی، وەدەستت بێنم.»

نازێ کە نازێی جارانم نەماوە. من بۆ دەبێ منی جاران بم، پێویستە هەرچی زووترە وەڕێ بکەوم.

هەوارێ گیان هەواری ئەوسالّ دەچمە هەواری
سەفەرێکم کەوتە بەر چیت بۆ بێنم بە دیاری

***

## ٥٢

...... ڕەنگە بۆ زۆرکەسان تەنانەت بۆ منیش جێی ئەم پرسیارە هەبێ. کە لە کوێی ئەم وڵاتە پان‌وپۆڕ و بەرینەدا کە بە وڵاتی گوڵ و بولبولیش ناوبانگی دەرکردووە، شتێکی وا ڕووی دواوە، کە دوکتورێکی بەنێوبانگ و ناسراو، لە شاری تاران بێت و لە هیچ و خۆڕایی لە کوڕە دێهاتییەکی کە جێی ساغی لە لەشی دا نەماوە ببێتە دایک و باب و کەس و کار و هەر ئەو خزمەت و یارمەتییەی کە بابێک بە تەواوی دەرحەق بە منداڵەکەی لە دەستی نایە، ئەو بەوپەڕی خۆی بگەیەنێ!؟ کاوەیس وڵامی ئەم پرسیارەمان دەداتەوە. هەرچەند ئەوەی تا ئێرە زانیومانە ئەوەیە کە ماوەیەک لەمەو بەر خێزانی مردووە. وەجاغ کوێریش بووە، تاک و تەنیا لە کۆشک و سەرسەرایەکدا لە شمیرانی تاران دەژیا. لەوانەیە ویستبێتی ئاودەنگێک بۆخۆی بدۆزێتەوە، ئەوەی کاوەیس ئاماژەی پێکرد و ئێمە پێشتر زانیاریمان لەسەری نەبووە ئەوەیە کە ئەو دکتورە خۆی کورد بوو و خەڵکی شاری کرمانشان بوو. جا ئاخۆ ئەوە هەستی نەتەوەیی بەسەری دا زاڵ بووە، کە کوڕە لاوێکی کورد کە هەژار و لێقەوماو و بێ کەس‌وکارە پەنا دەدا و پێی دەگەیێنێ، یان ئەوە چون بە درێژایی عومری وەجاغ کوێر بووە و کاوەیس گۆشەیەک لەو نیازە ڕووحییەی بە منداڵ بۆ پڕ کردۆتەوە و یا ئەوەی کە هەستی مرۆڤایەتی و ئینسان دۆستی هانی داوە بۆ ئەوەی چاکەیەک دەرحەق بە مرۆڤێکی تر بکات. بە هەرحاڵ کاوەیس دەیگوت: «من کە تازە پێم لە سوورە چۆمێ بڕابوو چونکە هەرکە هەواڵی مردنی دایکم لە زمانی کوڕی ئامینە شەلێ بیست، لێبڕام کە هەرگیز چاوم بە سوورە چۆمێ نەکەوێتەوە. هەرچەندە لە ماڵە دوکتور کەماڵی دەژیام و زۆریشی ئاگا لە من بوو، من تا ماوەیەکی زۆر هەر نامۆییم دەکرد. چەند جاران ویستم ڕابکەم و ئەو شوێنە بەجێ بهێڵم. بەڵام پێم کارێکی یەکجار ناجوامێرانە بوو، لە پاش ئەو هەموو چاکەیەی کە دوکتور دەرحەق بە منی کردبوو، هەروا بێ هەست و خوست بەجێی بێڵم، تا ڕۆژێ بە

هەڵکەوت دوکتور هەموو بەسەرهاتی خۆی بۆ گێرامەوە کە چۆن ئەودەم کە هەتیو و بێکەس لە کرماشان کەس وەخۆی ناگرێ ڕادەکاتە شاری تاران، نائاشنا و بێکەس و برسی بەرەڵڵای شەقامەکان دەبێ کە بە هەڵکەوت موهەندیسێکی مرۆڤدۆست تووشی دەبێ و لە لای خۆی وەک بەردەست ڕایدەگرێ. هەرکە تێدەگا منداڵێکی بەمرخ و زیرەک و ڕاستکرداره لێی دەبێتە باب و درسی پێدەخوێنێ. تا دەبێتە دوکتور، پاش پێگەیشتنی، دوکتور کەماڵی لێدەبڕی سەبارەت بە ئەو موهەندیسە ئینساندۆستە، ڕەوشتی ئەو ڕەچاو بکا. هەر کە لە نەخۆشخانە چاوی بە کاوەیس دەکەوێ کە بێکەس و کارکەوتووە، کە زانی کوڕێکی زیرەک و وشیار و دروستە، ڕابردووی تاڵ و ناڵەباری خۆی دێتەوە بیر و ئەو چاکەی کە موهەندیس دەرحەق بە ئەوی کرد کە بوو بە هۆی ئەوە کەژیانی بە تەواوی ئاڵوگۆڕی بەسەر دابێ، یانی لەوپەڕی چارەڕەشی و بێکەسی و لێقەوماوی بگاتە جێگایەک کە جێی متمانەی زۆر کۆڕی زانستی و پزیشکی ناوەوە و دەرەوە بوو. جا بۆیە لێدەبڕی وەک کوڕی خۆی ئاگاداری بێ و ئەوەی لە دەستی دێ دەرحەق بە ئەوی بکا. خودا هەڵناگرێ زۆریشی لە دەست هات. هەرچەند کاوەیس تەمەنی زۆرتر لەوە بوو کە لە مەدرەسەی ڕۆژانە وەریبگرن. بەڵام کە ناردی شەوانەبخوێنێ بە ڕۆژ دەیناردە خولی جۆراوجۆر تا ئەو ماوەیەی لە دەرس خوێندن وەپاش کەوتووە. قەرەبووی بکاتەوە کە کردیشیەوە. هەڵبەت ئێمە زۆر سووک و سانا لێی تێدەپەڕین و دەڵێن خۆی گەیاندەوە. لە حالێکدا کاوەیس دەڵێ: «خۆ گەیاندنی چی؟ گیانم دەرچوو تا توانیم خۆ بگەیەنمەوە.» زۆر جاران دوکتور زگی پێی سووتاوە.

: «ڕۆڵە بەختیار گیان- دوکتور ناسنامەی تازەی کە بۆ وەرگرتبوو ناوی نابوو بەختیار و شۆرەتیشی بۆ کردبوو شۆرەتی خۆی واتا کەمالی — ئەو جۆرەی خۆت ماندوو دەکەی لەناو دەچی، جار جارە پشوویەک بدە و تاوێک بحەسێوە.»

کاوەیس دەڵێ: «هەرچی پلەی خوێندنم دەچووە سەرتر. مەیل و حەزم بۆ خوێندن زۆرتر و زۆرتر دەبوو. هەبوو جاری وا لە ماوەی شەوڕۆژێک دا تەنیا چوار ساعەت نوستووم.»

دوکتور کەماڵی زۆر نیگەرانی سلامەتی کاوەیس بووە. پێی کوتووە:

: «تۆ ڕووحێکی گەورە و کۆڵنەدەرت هەیە. هەر بۆیە لە خوێندن‌دا سەر دەکەوی.»

کاوەیس دەیگێڕاوە: «دوکتور کەماڵی لە خەویش‌دا باوەڕی نەدەکرد کە من بتوانم قۆناغی سەرەتایی و ناوەندی کە دوازدە ساڵی دەخایاند. تەنیا لە ماوەی حەوت ساڵ‌دا تەواو بکەم و بە نمرەی زۆر باش لە زانستگای پزیشکی وەربگیرێم، هەڵبەت ئەو زەحمەتانەی دوکتور کەماڵی بۆ منی کێشا تا بتوانم بەم شێوەیە سەر بکەوم لە ئەژمار نایە. ئەوەندەی کە لەو پیاوە مەزن و گەورەیە فێری دەرسی پیاوەتی و مرۆڤ‌دۆستی بووم، لە هیچ مەکتەب و زانستگایەک فێری نەبووم، دوکتور کەماڵی توانی ڕووحی من کە پڕ پڕ بوو لە ڕک و قین لە ئەوانەی کە تووشی ئەم چارەنووسەیان کردبووم جەڕڕاحی بکا و ڕووحی پڕ کردمەوە لە خۆشەویستی ئینسانەکان. دوکتور کەماڵی مرۆڤێک بوو کە لە دنیادا وێنەی نەبوو. ئەو نە تەنیا دەرحەق بە من چاکەی گەورەی کرد، بەڵکوو دەرحەق بە هەر نەخۆشێکی کە پەنای بۆ هێنابا چاکەی دەکرد. زۆربەی نەخۆشەکانی هەر بە نیگای پاک و مێهرەبان و قسە خۆش و متمانەدەرەکانی دوکتور چاک دەبوونەوە.»

کاوەیس لە درێژەی گێڕانەوەکەی‌دا دەڵێ: «یەک دوو ساڵان لەبەر دەستی‌دا دەهاتم و دەچووم، لە ئەمرونەهی ئەو دابووم، ڕەنگە بابی خۆم هەبا هەرگیز بە ڕادەی دوکتورم خۆش نەویستبا. ڕۆژێ پێی گوتم.»

: «بەختیار! هیچ دەزانی؟ هەمیشە، بە درێژایی ژیانم لەگەڵ خێزانم چاوەڕوانی تۆ بووین کە پێ بنێیە ژیانمانەوە. هەرچەندە زۆر درەنگ هاتی، بەڵام دەزانم ئێستا ڕووحی شەهلا ڕازییە.»

گوتم: «کاکە گیان! هەڵبەت لەپێش‌دا پێم دەکوت دوکتور بەڵام کوتی پێم خۆش نییە پێم بڵێی دوکتور لەو دەمەوە پێم گوت کاکە.»

کوتم: «کاکە گیان بە ڕاستیش من کوڕی تۆم، چونکە هەرگیز بابی خۆم بە چاو نەدیوە. ئەوەی کە تۆش دەرحەق بەمنت کردووە. لەوانەیە بابی خۆم هەرگیز لە دەستی نەهاتبا، هەرچی ئەمر بفەرمووی لەسەر چاوم دایدەنێم.»

دوکتور پێی گوتم: «نا، نا بەختیار گیان! مەبەستم ئەوە نییە، تۆ لە من نەبووی، دەمهەوێ بڵێم ئەودەمی کە من و شەهلا بە ئاواتی منداڵێک بووین، شەهلا کە منداڵی نەدەبوو، بۆ زۆر وڵاتی دەرەوەم برد تا بەڵکوو ڕێی چارەیەک بدۆزینەوە، بەڵام ئەو کات گرفتی ئەو چارە سەر نەدەکرا. منداڵدانی بە چەشنێک نەخۆش بوو کە منداڵی لەخۆدا ڕانەدەگرت، من لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆر بە ئاواتی منداڵەوە بووم لەبەر دڵی شەهلا وەڕووی خۆم نەدەهێنا کە چەندەم منداڵ خۆش دەوێن تا ئەو ڕەحمەتییە زیندوو بوو کەمتر لە لای ئەو باسی منداڵم دەکرد، کە مردیش تەمەنم ئیزنی منداڵداربوونی نەدەدامێ. ئێستا لێم ڕوونە، ئەو هەموو پاڕانەوەم لەبەر خودا کە منداڵێکم بداتێ بێ جواب نەماوەتەوە. خودا لە خۆڕا تۆی لەسەر ڕێگای من دانەنا، ئاخر ئەوێ ڕۆژێ کە تۆیان بە نیوە گیانی هێنایە خەستەخانە نۆرەی کێشکی من نەبوو، بە تکای دوکتورێکی هاوکارم، لەوێ بووم. گرفتێکی بۆ هاتبووە پێش. کە تۆم موعایینە دەکرد، نەمزانی بۆ هەستم دەکرد کەسی منی. وەها هاتیە نێو دڵمەوە کە ئیتر نەهاتییەوە دەرێ.»

کاوەیس دەڵێ: «من هەرگیز ناتوانم لە ژێرباری منەتی ئەو پیاوە مەزنە بێمە دەر. ئەوێ ڕۆژێ کە پەنای دام و پێم نایە ماڵی هەر ئەو شەو، ئامۆژگارییەکی زۆری کردم، هانی دام بخوێنم. منیش کە پێشتر شتێکم لە خوێندن و نووسین دەزانی بە یارمەتی دوکتور وردە وردە ئاستی زانیارییەکانم بردە سەرتر. من لە پێش‌دا دەمخوێند تەنیا لەبەر ئەوەی خۆم بە ئەمەگداری دوکتور دەزانی و ئەو پێی‌خۆش‌بوو من بخوێنم، بەڵام لە پاشان خۆشم لەدەرس خوێندن هات، چونکە کاتی بێکاریم زۆر بوو، زۆرم دەخوێند، دوکتور سەری سوڕمابوو لە ڕادەی فێربوون و بەرەوپێش چوونم. تا هەروەکی پێشتر باسم کرد لە ماوەی حەوت ساڵان‌دا پێم نایە زانستگا، ئەویش بە نمرەی زۆر باش و پلەی بەرز.»

هەڵبەت کاوەیس ئەوەی لەبیری چووبوو پێشتر باسی بکا لێرە باسی کرد ئەوە بوو کە دوکتور کە ناسنامەی تازە دەداتە دەستی بەڕاستی کردبۆویە کوڕی خۆی. ناوی دایکی شەهلا بوو، دوکتور بە ئانقەست پێنج ساڵ لە تەمەنی کەم کردبۆوە واتا ئەودەم کە کاوەیس حەڤدە ساڵی بوو لە ناسنامە تازەکەدا ببوو بە دوازدە ساڵ تا کاتی خوێندن لە پاشان گرفتی بۆ ساز نەبێ.

کاوەیس دەیکوت: «دوکتور ئەوەی بە درێژایی ساڵانی عومری کۆی کردبۆوە هەمووی بۆ من بەجێ هێشت. کە بە منداڵی لە کرماشان ڕای کردبوو ئێتر نە کەسی خزم بوو و نە ئەویش خزمی کەسێک، ڕەنگە هیچ کام لە خزموکەس و کارەکەی باوەڕیان نەکردبێ کە منداڵێکی هەتیو و هەژار و بێکەس لە شاری تاران، لەو جەنگەڵە پڕ لە دڕندەیەدا تووشی سەدان خراپە و لە ڕێلادان نەبووبێ و گەشەی کردبێ و بووبێتە دوکتورێکی بە ئەزموون و بەنێوبانگ.»

بە هەرحاڵ ئەو جۆرەی کاوەیس باسی دەکرد هەرچی سامان و داهات و سەروەتی دوکتور بوو بە کاوەیس بڕا و کاوەیسیش بۆ قەرەبوو کردنەوە گۆشەیەک لە خۆشەویستی و دڵپاکی و چاکەی دوکتور ئیرەجی کەماڵی کە دەرحەق ئەوی کردبوو. ئەوەی لە دوکتورەوە پێی گەیشتبوو، هێندێکیش لە داهاتی خۆی لەسەر دانا و بیمارستانێکی یەکجار گەورە و مۆدێڕنی بەنێوی دوکتور و بە خێری دوکتور و خێزانی دوکتور کەماڵی ساز کرد کە لە خزمەت هەژار و دەسکورت و لێقەوماوان دابێ، بۆخۆشی وەک سەرپەرستی بیمارستانەکە، ئەرکەکانی بەجێ دەهێنا.

ڕەنگە زۆربەی خوێنەرانی بەرێز وابیر بکەنەوە کە یەکێک ئەوە خەریکە فیلمێکی سینەمایی هێندی بە ئاوتاوەوە لەجیاتی بەسەرهاتی کاوەیس دەگێڕێتەوە هەڵبەت مافی هەر چەشنە شکوگومانێک بۆ خۆێنەران پارێزراوە چونکە ئەگەر لە ڕاستییەکەی بپرسی خۆشم هەرگیز باوەڕ ناکەم ڕووداوی ئەم جۆرە و مرۆڤگەلی وەک دوکتور ئیرەجی کەماڵی لەم وڵاتە پان و بەرینەدا وەبەر چاوی هیچ کەس کەوتبێ. بەڵام بڕوام پێبکەن ئەوەی باسی دەکەم باخۆشم گومانی لێبکەم، بەڵام بێکەم و زیاد ڕووی داوە ڕاست ڕاستە و تۆش پێت خۆش بێ یان پێت ناخۆش بێ ناچاری باوەڕی پێبهێنی چونکە کاتێ دوکتور کەماڵی یەک نەهاتۆتە سەر ڕێگای تۆ کە بە خوڕایی بەختەوەرت بکا، نابێتە بەڵگە بڵێین نەهاتۆتە سەر ڕێگای کاوەیسیش. بەهەرحاڵ من تا ئەو کاتەی گێڕانەوەکەم تەواو نەبێ هەر درێژەیان پێدەدەم....

***

# ٥٣

...... ئاور، برسییەک بوو کە لە شاری قاتوقڕی ڕاهاتبوو. هەرچی لەسەر ڕێگای بوایە ڕۆی دەهێشت. هیچ شتێک بەرگەی ئیشتیای لە ڕادەبەدەری نەدەگرت.

سەرکردە هەرای کرد: «کوڕینە! دەی زووبن، دەست ببزێون، ڕۆژ ڕۆژی هیممەتە. ئەو هەلەی لە کیس مەدەن. ئەوە هێزی یارمەتیش بەڕێوەیە و بۆلامان دێن، دەبێ هەرچی زووترە ئەوگردەی خوارێ داگیر کەین، پەلە بکەن زوو بەرەو ئەوگردەی ڕوو بەڕوومان وەڕێ کەون. دەی! دەی! بە هەڵاتن وەدوام کەون دەی زووکەن دەی.»

پێشمەرگەکان وەک تیری سەختەکەوان دەرپەڕین. سەرکردە باقیی دەنگدا: «کوڕە باقی! گوێت لێبێ ئەوێ بۆ تۆ جێی مەترسییە. هەر لێرە خۆت مات کە ئێستا دەچم خڕناڵیش دەنێرمەوە لات. نەترسی. کوتت خڕناڵ نێوی ڕاستییەکەی چ بوو؟ ئەها بۆخۆم وەبیرم هاتەوە کەریم بوو.»

هێزی پێشمەرگە بێ ئەوەی تاقیان وەبەر چاوی دوژمن بکەون، گردەکەیان داگیر کرد و تێیدا بڵاو بوونەوە. ئەم فەرمانەی سەرکردە، ئەوانی سواری سەری دوژمن کردبوو. ئاگر گەیشتبووە تەشقی ئاسمان لەوانەبوو هەتاویش بسووتێنێ. چاو لەبەر دووکەڵ بەرەو هیچکوێ نەدەچوو. سەرکردە هەرای کرد: «جوان گوێ ڕابگرن، هەتا ئیزنم نەداوە، کەس تەققەی لە تفەنگی نایە. هەموو گوێتان لێبوو؟»

هەموو گوێیان لێبوو. ئەودەم یەک بە خۆی هەرای کرد: «خڕناڵ... خڕناڵ... کوڕە کەریم! گوێت لە دەنگی منە؟ کوڕە دەنگت بێ. بابزانم حاڵت بآشە؟»

بەڵام هیچ جوابێک لە کەریم نەهاتەوە. ئازایەتی و لە خۆ بردوویی کەریم ڕووحی سەرکردەی ئازار دەدا. پێی خۆش بوو چاوی پێی بکەوێتەوە و هێندێک فشەی لەگەڵ بکا، سەرکردە بە درێژایی تەمەنی، زۆر قۆناغی ئەستەم و پڕمەترسی بڕیبوو. لەگەڵ زۆر کەسان لە کاتی سەخڵەتی و دژواریدا هاونەفەس ببوو. چاوی بە کەسانێک کەوتبوو، هەرکە گوێیان لە تەققەی گوللە ببوو لە ترسان لەپێ کەوتبوون، ئی وای دیتبوو هەر کە چاویان بە دڵۆپە خوێنێک کەوتبوو، دڵیان لەخۆ ببۆوە. تا توانیبووی لە جەرگەی شەڕیان بەرێتە دەر چی وا نەمابوو زۆران بە کوشت بدەن، تووشی بە تووشی ئی وا هاتبوو هەموو گیانیان هەڕوگیف و خۆ هەڵمساندن بوو. بەڵام لە کاتی تەنگانەدا کونە مشکیان لێ ببوو بە قەیسەری! دیتبووی ئەوانەی لە ترسان قامکیان خستبووە سەر پەلاپیتکە و تادوایین گوللەیان نە ڕوحمیان بە گەڵای دار دا هاتبوو نە بە بەرد و نە بە هیچ، هەر بە چاوی بەستراو تەققەیان دەکرد، لە چی؟ خودا نەبێ کەس نەیدەزانی، شەلم، کوێرم، ناپارێزم، لە حالێک دا ئێستا تووشی ئی وەک خڕناڵی خۆی و کەریمی ئەوانیتر هاتووە، سەیر ئەوەیە لە ماوەی تەنیا دوو ساعەتدا کە لە ئاشنایەتیان تێدەپەڕی، هەستی دەکرد بە قەرا تەمەنی خۆی لەگەڵ کەریم ژیاوە، هەروەها کە کەریمی گاز دەکرد. بیرەوەرییەکانی خۆی دەپشکنی. بەڵام چی وەدەست نەکەوت. لە دڵە خۆی دا کوتی: «هەر کە خڕناڵ پەیدا بۆوە بە هەر جۆرێکی بێ لە ڕیزی پێشمەرگەکانی خۆم دا ڕایدەگرم. خودا بکا ئەوەندەش ئاقل بێ کە خۆی بە باشی حەشار بدا. خودا بتپارێزێ خڕناڵ گیان بۆ ئەو جەهەندەمەی بۆ داگیرکەرانت دروست کردووە.»

سەرکردە بە دووربینەکەی چاوی لەهێزی دوژمن کرد کە چەندە کوێرانە لە ترسی خۆیان ئەو جەهەندەمەی کەریم سازی کردبو گوللە بارانیان دەکرد. دەیان چەکی قورس پەیتا پەیتا ئاگرێکی خەست وخۆڵیان دەڕژاندە نێو ئاگری ویشکەڵانەکە کە دەم بە دەم زیادتر دەبوو. ئەو دوو هێزەی بەعسییەکان کە لە دوو لاوە ناردبوویان بۆ گەمارۆدانی پێشمەرگەکان، بە پەلە پڕووزێ گەڕابوونەوە جێی خۆیان و تێکە و لێکە یەکیان پێک هێنابوو مەگین خودا بزانێ. هەر جێگەیەکی ئاورەکەی کەریم ڕووی تێکردبا، دایان دەگرتە بەر گوللەی سەدان

چەکی سووک و قورس، تەنیا جێگەیەکی لێی غافل ببوون ئەو گردە بوو کە سەرکردە دەستووری داگیرکردنی دابوو، هەڵبەت ئەویش بەو هۆیە بوو کە گڕ و دووکەڵ دایپۆشیبوو.

سەرکردە جارێکیتر بە بێسیم پێوەندی لەگەڵ مەقەڕەکەی خۆیان گرت و چۆنیەتی وەزعی خۆیانی پێ ڕاگەیاندن و ئیشارەی کرد کە تەنیا ڕێگای دەربازبوونیان هێرش کردن بۆ سەر هێزە داگیرکەرەکانە و هەرچی زووتر هێزی یارمەتی بگاتە لایان. دەتوانن زووتر خۆیان ڕزگار بکەن. ئینجا ڕووی لە پێشمەرگەکان کرد و گوتی: «هەرکە گوتم دەست پێبکەن بێ‌یەک چرکە ڕاوەستان، ئاگر بخەنە گیانی ئەو داگیرکەرانە. لەبیر نەکەن کە ئەوە لە دوو لاوە هێزی یارمەتی بەرەولامان دێن هەربینا گەیشتنێ. تا ئەوان دەگەنێ دەبێ بۆخۆمان پەندێک بەسەر ئەو زۆڵانە بێنین کە لە چیرۆکەکاندا بیگێڕنەوە. لەبیر نەکەن هەمووومان بکوژرێین نابێ ئەو گردە لە دەستبدەین. ئێستا ئێمە بەسەریان دا زاڵین، هەر ئاورەکەی کەریم لە کزێدا، بزانم ئێوە چ ئاورێکیان بۆ دەکەنەوە.»

لە دوای تەواو بوونی قسەکانی فەرمانی تەققەکردنیدا، دەیان تفەنگ و بازووکا و ڕەشاش کەوتنە خوێندن!. بەعسییەکان کە بە ئاگرەکەی کەریم سەرقاڵ ببوون لایان وابوو هێزی پێشمەرگە لە پشتەوەی ئاگرەکە خۆی حەشار دآوە تا لە ئاوری قورسی تۆپ و خۆمپارەکانی ئەوان لە ئەمان دابن. کەچی ئێستا دەیاندیت کە لەسەر گردێکی کە کەوتبووە سەر تەپڵی سەری ئەوان، دەیان چەکی سووک و نیوە قورس ببوونە گورگی برسی و کەوتبوونە گیانی ئەوان.

سەرکردە بە دووربینەکەی دوژمنی خستبووە ژێر چاوەدێری، بە ئاشکرایی شپرزەیی و شڵەژاوی هێزی داگیرکەرانی دەدیت. نیشانەکانی ترسی لە چۆنیەتی هەڵاتن و هات و چۆیاندا بەدەی دەکرد. فەرماندەکەیان کە هەستی کردبوو فریوێکی زۆر گەورەی خواردووە بە پەلە داوای لە هێزەکانی دەکرد کە جێگە بگۆڕن و لەبن هەر شتێکی کە دەتوانن خۆیان حەشار بدەن، دەستووری دا کە چەکە قورسەکان گردەکە بخەنە ژێر ئاگرێکی خەستوخۆڵ. بەڵام فەرماندەکانیتر دەیانکوت ئەوەندە لە ئێمە نیزیک بوونەوە کە لەوانەیە ئەو گوللە خۆمپارانە لە بری ئەوان خۆمان بپێکن، دڵیان بەم دەستوورە خۆش نەبوو. لە تەواوی ئەو کاتە

دژوارانەدا سەرکردە بە تەواوی دووکوت ببوو، بەشێکی وجوودی خەریکی شەڕ و ڕێبەرایەتی چەکدارەکانی بوو و بەشێکیتری وجوودی خەمێکی گەورە کە هەر دەهات و گەورەتر دەبوو دایگرتبوو. کەریم وەها بە زەین و خەیاڵی سەرکردەوە نووسابوو کە بە تەواوی دوو لەتی کردبوو. سەرکردە هەرچەند نەیدەویست بەڵام ئەوە لە ئەختیار خۆیدا نەبوو کە بە تەواوی وجوودی لەشەڕەکە دابێ، چونکە کەریم ئەو ئەختیارەی لە دەست سەرکردە دەرهێنابوو. لە ڕاستیدا سەرکردە لە دووبەرە، خەریکی شەڕکردن بوو بەرەی دووهەم شەڕێکی عاتیفی و ناخۆش بوو. شەڕێک، وەک ئەو شەڕانە کە بەبێ ئەوەی هۆیەکی دیاری کراو بۆ شەڕکردن هەبێ تۆ ناچاری بەشەڕ بێی. وەک دڵداری و ئەویندارى کە چەشنێک شەڕکردنە، شەڕوکێشەی خۆتە لەگەڵ خۆت، تۆ لەگەڵ خۆت بە کێشە دێی تا واز لە بەشێک لە وجوودی خۆت بێنی، یان بەشێکی زۆر لە وجوودت بۆش و بەتاڵ بکەی تا بیئاخنی لە کەسێکیتر، کەسێکی نەناسیاو و نائاشنا بە ڕەمزوڕازی دەروونت و هەر ئەو کەسە نائاشنایە ئەبێ بێت و لە دواییدا بە شەکەیتری وجوودیشت لێ بستێنێ و یان قالبیکیترت بداتێ، بە چەشنێکی بۆتۆ شتێک بە نێوی «خۆم» نامێنێ و لەجیاتی ئەو«خۆمان» بەرز دەبێتەوە یان هەروەکوو دایکێک کە بەشێک لە وجوودی دەدا بەشتێکی نەبوو، ئەوەندە بچووک و نادیار کە نە وەبەرچاو دەکەوێ و نە وەبەر زەین. بێ ناو وناوەرۆک و بێ شکڵ و قەوارە. ئینجا ئەم دایکە لە قەوارەی خۆی، لە فۆڕم و شێوەی خۆی، لەناو و ناوەڕۆکی خۆی دەیداتێ، یانی پێی دەبەخشێ و وەهەستی دێنێ. ئەم چەشنە کێشەیەکە دایک لەگەڵ ڕووح و هەست و ئازا و لەشی خۆی دەکا بەرهەمەکەی دەبێتە کەسێکی تر واتا منداڵەکەی، بەڵام دیار نەبوو سەرکردە لەکوێی بەرەی ئەم شەڕە عاتیفی و ئیحساسیە ڕاوەستاوە، خۆشەویستەکەی و منداڵەکانی کە لە مەترسی شەڕ بە دووربوون. هەرچەند جارجار وەبیریان دەکەوتەوە و پێی خۆش بوو چاوی پێیان بکەوتبایە. بەڵام ئەم کێشە تازەیەی سەرکردە هێڵی سێهەم بوو، چون کەسێک بەربینگی بە هەست و عاتیفەی سەرکردە گرتبوو کە نە دڵداری بوو و نە منداڵی. داوای بەشێکی زۆری لە ڕووح و ڕەوانی سەرکردە دەکرد. ئەم خۆشەویستییە تازەیە، دەیهەویست جێی پێی ئەوانیتر لێژ بکا و

سەرکردەی لە گێژاوێک هاویشتووە کە نازانێ چلۆن لێی دەرباز بێ. کێشەی تازەی سەرکردە ئەوەیە، لەپڕ دوو منداڵ لەبەر دەمی قوت دەبنەوە. یەکیان لەوپەڕی ترسەنۆکی و خوێڕیایەتی و دەستوپێ سپیلکەیی‌دا و ئەوی‌تریان، بوێر و ئازا و لەخۆ بووردوو. لەخۆی پرسیار دەکرد: بڵێی چەند ڕێگا هەبێ تا کەسێک لە سنوور و مەرزی ترس و خوت خوتە و دڵە ڕاوکە، بگەیەنێتە سنووری یەقین و ئارامی و لەخۆ بووردوویی. سەرکردە بە خۆی کوت: «ئەوەی کە من پێی گەیشتووم ئەوەیە کە بۆ هەرکەسێک تەنیا یەک ڕێگا هەیە ئەویش هەر ئەو ڕێگایە بووە کە تا ئێستا بڕیویەتی. کە وابوو ئەو منداڵەی کە وا ترس لە ئامێزی خۆی گرتووە، تەنیا هەر ئەو ترسەش بووە کە لاواندوویەتەوە و لە ئامێزی گرتووە و بەهانایەوە هاتووە و لە حاڵ و وەزعێک دا ڕایگرتووە کە هەست بە بەختەوەریش بکا و تەنیا لە وەزعێکی ناخۆش و ئاڵۆز و نالەبای وەک ئێمڕۆیە کە خۆی لێ‌ون دەبێ و دیارە هەتا هەتایە مرۆڤ لە وەزعییەتێکی ناخۆش و نالەباردا نابێ. کە وابوو ئەو کەسە، هەمیشە لە لای خۆیەتی و ئەوە خڕناڵیش دەگرێتەوە.» سەیر ئەوەیە ئەم دوو کەسە بەم هەموو جیاوازییەوە چەندە لەیەک نێزیک بوون کە بوونە هاواڵی گیانی بەگیانی یەکتر و بەبێ یەکتر هەڵناکەن. کە واتا دەتوانین بڵێین کە هیچ مرۆڤێک بە تەنیایی کامیل و تەواو نییە. من نیازم بەوە هەیە کە هەزاران کەس لە دەوروبەرم بن. بمبینن و بمدوێنن و بمناسن تاکوو بتوانم هەست بە کەمایەسی نەکەم و خۆم وەک کەسێکی تەواو و پێگەیشتوو پەسەند بکەم. کە وابوو دەبێ بسەلمێنین کە ترسەکەی ئەم کوڕە واتا «باقی» هەر ئەوەندە بەحەققە کە ئازایەتیەکەی خڕناڵ! ئازایەتیەکەی خڕناڵ تا ئەوەندە بڕ دەکا، کە ترسەکەی ئەو کوڕە ئێزن دەدا و بەم جۆرەیە کە ئێمە پێویستە ڕادەی ترسەکەی ئەم داگیرکەرانە زۆرتر بکەین تا مەیدان و مەودا بۆ ئازایەتییەکەی ئێمە پتر و فرەوان‌تر بێ. ئەوە لێکدانەوە و بۆچوونێک بوو کە بەو نیوە زەین و وجوودەی سەرکردەدا هات‌وچووکە خڕناڵ تێی‌دا جێی گرتبوو. هەرلەودەمەی‌دا کە سەرکردە چاوی بە خڕناڵ کەوتبوو. زۆر بەنابەدڵی و بە سەختی توانی ئەم بەشە لە وجوودی خۆی لە خڕناڵ بستێنێتەوە. و لە بەشەکەی تری وجوودی گرێ بداتەوە و دەستووری تەققەی زۆر بدا. بە دووربین کە چاوی لە هێزی دوژمن

کرد، دیتی کە چۆن بە هەڵەباشی و سەر لێشێواوی وەجموجووڵێکی خۆڕایی کەوتبوون. نەیاندەزانی دەبێ تەقە لەکام لا بکەن. لەخۆڕا بە دەوری خۆیان‌دا دەسووڕانەوە. چەکە قورسەکانیان بەردەستیانی گرتبوو. ئەوی جێی شوکر بوو بۆ هێزی پێشمەرگە ئەوە بوو کە بەهۆی شاخاوی بوونی ئەو شوێنەی شەڕی لێدەکرا. نەیانتوانیبوو دەبابە و زریێپۆش لەگەڵ خۆیان بێنن. هەر لەو کات‌دابوو کە سەرەکردە ئاگادار بوو کە لە دوو لای تریشەوە هێزی بەعسییان خستە ژێر هێرش و بە توندی ئاگردران، دەرفەتی پلان داڕشتن و بیرکردنەوە لە فەرماندەکانی بەعس وەرگیرابوو. وەها سەریان لێ‌شێوابوو کە نەیاندەزانی ڕوو لە چ لایەک بکەن. زۆر بە توندی لەسێ لاوە کەوتبوونە بەرهێرش، ئیتر دەستیان بۆ نەدەکراوە. پێشمەرگەکان وەها سواری سەریان ببوون کە هیچ چاریان نەما جگە لەوەی بە شپرزەیی ڕابکەن و گیانیان دەرباز بکەن و چەکە قورسەکانیان بۆ نەچوو. چەند ماشێنی جیپ و نەفەربەر کە بە گەڵای دار شاردرابوونەوە وەدەر کەوتن و چەند کەس لە فەرماندەکان و سەرکردەکانیان سواریان بوون و بۆی دەرچوون، عەسکەر و بەکرێگیراوەکانی‌تر کە بێ فەرماندە مابوونەوە. چەکەکانیان فڕێ دەدا و گیانیان دەباوەشی دەگرت و هەریەک ڕوویان لە لایەکی کردبوو تا بەڵکوو گیان دەربەرن. بەڵام زۆربەیان وەبەرهاتن، لەو شوێنە کەلاک لەسەر کەلاک کەوتبوو. لە تەواوی ئەو ماوەیەدا کە شەڕ بەسەختی بەردەوام بوو سەرکردە بیری هەر لە لای کەریم بوو، هەرکە دیتی هێزەکانی بەعس بەتێک‌شکاوی خەریکی هەڵاتنن. چەند کەسێکی دەنگدا: «کوڕینە! ئەو دوو کەسەتان لێرەڕا بە تەنیشت ئەو ئاورەدا بڕۆن و هەموو جێگەیەک بەجوانی بگەڕێن. بزانن کەریم چی بەسەر هاتووە. زیندووە؟ یان مردووە؟ بیهێننە ئێرە، ئەو دوانەشتان ئەوبەری ئاگرەکە بگرن و بڕۆن بەشوێن کەریم‌دا.»

کەریم لە تەواوی ئەم ماوەیەدا کە هەر وەک مار لەسەر زەوی دەخوشی تا خۆ بگەیەنێتە ئەو شوێنەی پێی وابوو دەبێ ئاگری تێبەردا تا چاوی دیتنی دوژمنی پێ کوێر بکا بیری چوو بووە لای« مەلا». «مەلا» بۆ ئەو هەموو کەس بوو. ئەودەم کە حاجی‌ژن ناجوامێرانە دەیدا بەرپلاری تەوس و توانج و جنێودان، ئەودەمەی «عەمرت نەمێنێ» خۆشترین ڕستەیەک بوو لە زاری بابی دەبیست.

ئەودەمەی کە حاجی دەیخستە ژێر مست و شەق و پێلاقە، لەبەر ئەوەی یارمەتی حاجیژنی دابێ و زمانی جنێوی حاجیژن بێدەنگ بکا. ئەو کاتانەی عەولای برا چکۆلەکەی وەبنەخۆی دەدا و ئەویش لە ترسی حاجیژن نەیدەوێرا دەست بکاتەوە، ئەو دەمانەی هەموو ئازای لەشی لەبەر دەمینی لە ڕادەبەدەری کوورەکەی ئاسنگەری دەکوترا و ژانی دەکرد. هەمیشە لەو کاتانەدا لەپڕ «مەلا»ی لێ وەدەر دەکەوت دەستی دەکرد بە دڵ دانەوەی، دەستی بەسەر سەری دا دەهێنا: «کوڕم کەریمە! خەفەت نەخۆی ژیان زۆری بە بەرەوەیە، بەم شتانە نەبەزی، ڕۆژێک کە زۆر دوور نییە، دەنێرم لەدوات بێیە لای خۆم، خۆت ئازار نەدەی، لەبیر نەکەی تۆش کوڕی خۆمی، بەدڵو جەرگ و ئازا بە.»

«مەلا» یارمەتی دابوو کە کەریم ئەوەندەی کە لە لەشدا کورتی هێنابوو لە بەرانبەردا بخاتە سەر ڕووح و ورەی خۆی. ڕووحی هەردەهات گەورەتر و گەورەتر دەبوو.

: «جا ئەو ئیشکەڵانە چییە؟ خۆ ئەوە هەر کار نییە، با بگەمە لای مەلا مستەفا، ئەگەر فەرمانم پێبدا هەموو دنیای بۆ ئاگر دەدەم.»

ئاگری خستبووە گیانی ویشکەڵانەکە. لێی دوور کەوتبۆوە و لە پەنایەکەوە بەخۆشی چاوی لەو جەهەندەمەی دەکرد کە سازی کردبوو. گڕەکە هەر دەهات و زۆرتر و بەرزتر دەبوو، هەر دەهات پان و پۆڕتر دەبوو. هەردەهات حەزیاتر و بە ئیشتیاتر دەبوو. هەر دەهاتە پێشێ و ئەوەی دەهاتە پێشی ڕای دەماڵی و مۆرکی خۆی لێدەدا. کەریم گەش گەش لە گەشانەوەی لەڕادەبەدەری ئاورەکە، سەرخۆشانە قاقای دەکێشا، پێی سەیر بوو کە دەیتوانی ئەویش قاقای بکێشێ. هەوەڵ جاری بوو لە ژیانیدا کە لە ناخی دڵەوە قاقای لێدەدا قا... قا... قا...کە لەپڕ دەستێکی بەهێز کەوتە سەرزاری و سەرەنێزەیەک تا دەسکی لەدڵی ڕۆچوو.

تاودانی بێوادەی زگی یەکێ لە فەرماندە بەعسییەکان لەشەڕگەی دوور خستبووە و ئیشکەلانەکەی پێ شوێنێکی باش بوو کە ڕووی تێکا، ئەوە هاوکات بوو لەگەڵ ئاگرتێبەردانەکەی کەریم. فەرماندە بەعسییەکە کە گوێی لە دەنگی قاقای سەرخۆشانەی کەریم دەبێ بە ماتە ماتە لێی نیزیک دەبێتەوە کە دەبینێ تەنیایە لە پشتەوەڕا دەیکوژێ و تەرمەکەی وەک پەڕەکایەک هەڵدەگرێ و

دەگەڕێتەوە نێو ئۆردووی خۆیان، هەڵبەت ئۆردووەکە ئی کاتێک بوو فەرماندە بەعسییەکە نەچووبووە دەرەوەی ئوردوو بۆ دەس بە ئاو، ئەگینا کە گەڕاوە شتێک بەنێوی ئوردووی خۆیان نەمابوو. کەریم بەر لەوەی بکوژرێ لەبیری چووبوو لە جەرگەی شەڕدایە و دەبێ خۆی حەشار بدا هەڵبەت من لام وایە ئەو قاقایەی بۆ هەوەڵ جار کێشای ئەوەندەی سەرخۆش کردبوو کە لە بیری بچێ لە مەیدانی شەڕ دایە و دەبێ خۆی حەشار بدا.

تەرمی بێگیانی کەریم کە دەکەوێتە دەست هێزی بەعس، ئەوەندە لەو زەبرە گرچووبڕەی پێشمەرگەکان دڵپڕبوون. کە کەوتنە گیانی جەستەی بێ گیانی کەریم، هەروەک بێژینگ کون کونیان کرد. هێزە تێکشکاوەکەی بەعس سەریان لەو جەستە بچووکە سووڕمابوو. وەک کانی لەجێ برینەکانی کەریم خوێنێکی سوور و گەش هەڵدەقوڵی. ترس دڵی داگیرکردبوون. کەس نەیدەتوانی بڕوا بکا ئەوەندە خوێنە لەو هەموو جێی فیشەکانە بەخوڕ دێتەدەر. ئەویش لەو قەڵافەتە و جەستە بچووکە. لەدوای تێکشکانی هێزی بەعس. تەرمەکەی کەریمیان لەنێو خوێنەکەی کە دەوروبەری داگرتبوو دەرکێشا. سەرکردە بە دیتنی تەرمەکەی کەریم وەها کەوتە سەر چۆک کە ئەوەی لە دەوروبەری بوون. دڵنیا بوون کە سەرکردە تازە ناتوانێ لەسەر دووپێی خۆی ڕاوەستێ.

سەرکردە بە گریانێکی کپەوە دەیگوت: «ئەم سەرکەوتنە هەرچەندە سەرکەوتنێکی گەورە و بە شکۆیە. بەڵام لە بەرانبەر ئەم شەهیدە بچووکە، سەرکەوتنێکی یەکجار نادیار و بچووکە!»

کەریم بەرلەوەی وەڕێ بکەوێ بۆ ئاگر کردنەوەکەی، ئەوەی هەیبوو و نەیبوو دەنێو دڵی سەرکردەدا جێی هێشت. لە راستی‌دا کەریم تەنیا دوو شتی لە دەست چوو؛ جەستەیەکی یەکجار بچووک و ناوێکی تازە؛ خڕناڵ، تەنیا دوو ساعەت بەرلەوە ببوو بە خڕناڵ!!!

❊❊❊

## ٥٤

...... ئەو ئەوینە بە گوێیانی هەڵکێشابووم، پەروباڵم دەرکرد بەڵام ئێستا وەبریقە نەکەوتبوون و نەدەدرەوشانەوە. دەنگم کەڵەبابی ببوو، ماوەیەک دەبوو بە بیانوو یان بێ بیانوو خۆیەکەم پێشانی ئاوێنە دەدا، هەرچەندە کە ژوورەکەمان زۆر تاریک و تنووک بوو و ئاوێنەکەشمان لێڵ و مات، بەڵام من دەمتوانی جێ پێی حەز و مەیلێکی خۆش و نامۆ لەسەر ڕوخسارم دا بدۆزمەوە، خۆم وەک جاری جاران نەدەویست. نەئەوەی وا بیر بکەی کە جاری جاران خۆم نەویستبێ. هەرگیزاوهەرگیز، ئەوە دەتوانێ درۆیەکی گەورە بێ کە بڵێین تا ئێمرۆ کەسێک هەبووبێ کە خۆی نەویستبێ. لەوانەیە هەر لێرە بەرببینگم پێبگری و بڵێی: «دەی بەرخی بابم! ئەی ئەوانەی خۆ دەکوژن چی؟ لات وایە ئەوانیش خۆیان دەویست؟»

من دەڵێم: «بە پێچەوانەی باوەڕی چەوت و نادروستی باوی نێو خەڵک ئەوانەی خۆیان لەناو دەبەن، خۆیان لە هەموو کەس پتر دەوێ و هەر لەبەر ئەوەی لە وجوودی خۆیان هیچ نەدەن بە خەڵکیتر و خۆیان سەداوسەد بۆ هەمیشە داگیر و زەوت بکەن خۆیان دەکوژن. خۆویستی ئەم تاقمە کەسانە لەوپەڕی خۆیدایە.»

هەڵبەت ئەوە قسەیەک بوو کەوتە قسان هات ئەگینا ئێرە جێی ئەوە نەبوو لاڕێ بڕۆم.

دەمگوت: «کە خۆم لەجاران پتر دەویست چونکە دەمویست وەبەر چاوی خەڵک بکەوم. هەرچەند وەبیریشم نایە کە هەرگیز ئەم هەستەم نەبووبێ، وێدەچێ پێشتریش ئاماژەم پێکردبێ. جارێکیان بە تەنیا لە ماڵە مامم مابوومەوە حەوت ساڵانە بووم – تکایە حەوت ساڵانەی ئەوسەردەمی بە بەژنی حەوت ساڵانەی ئەم سەردەمە نەگرن کە بێگومان حەفتا ساڵەکانیشی

وەک حەوت ساڵەکانی ئێمڕۆ نەبوون! – ماڵی مامم لە شاری میاندواو بوو، منیش کە لە زمانی منداڵەکانی ئەو شارە نەدەگەیشتم نە دەچوومە کۆڵان و بەناچاری هەر لە ماڵ دەمامەوە و ببوومە مایەی گاڵتەوگەپی مامم و ئامۆزاکانم کە بە تەمەن زۆر لە من گەورەتر بوون، ئێستا کە بیری لێدەکەمەوە، دەبینم ئەودەم تەنیا لەبەر خاتری ئەوەی کە وەبەر چاویان بکەوم، هەرچی دەیانکوت ئەنجامم دەدا. من کە ئاواڵی عەلیلە بووم و ئازایەتی لەوی فێر ببووم حازر بووم ملی خۆم بشکێنم تا بەئازا و بەجەرگم بناسن! هەرکە مامم ماندوو دەبوو لە گاڵتە کردن بە من تا وەدەر دەکەوت، نۆرەی ئامۆزاکانم دەگەیشت کە هەریەکەی کایەیەک بدۆزنەوە تا پێی سەرقاڵ و سەرخۆش ببن. بۆ وێنە کوڕە مامێکم دەیکوت: «چاوی لێبکەن چەندە بەغیرەت و ئازایە بزانن چ زللەیەکی توند لە خۆی دەدا.»

من کە بەنیاز بووم وەبەرچاو بێم و بە ئازا و بەجەرگ بمناسن. بە تەواوی هێز و توانای خۆم ڕوومەتی منداڵانەی خۆمم وەبەر زللان دەدا، :«ئافەرین، بارەکەڵڵا بەوەی دەڵێن ئازا. برایم چاوی لێبکە چەند بە توندی گوێی خۆشی دەکێشێ!»

دەمکێشا ئەوەندە توند کە نازانم بۆ نەدەپچڕا. دەنگی قاقای سەرخۆشانەی ئامۆزاکانم و شەقەشەقی زللەکانی خۆم کە وەڕوومەتی بێ گوناهم دەکەوت و هەروەها هاواری باڕەکەڵڵای ئامۆزایان دوو پۆلووی گەش گەشیان لەسەر هەرتک ڕوومەتم دەگەشاندەوە. تا ئامۆژنم بە شەقە شەقی زللە و پێکەنین و هەرای منداڵەکانی وەژوور دەکەوت، هەرکە چاوی بە من دەکەوت دەستی دەکرد بە جنێو دان بە کوڕەکانی.

: «حەک عەمرتان نەمێنێ! بۆ وا لەو بەستزمانەی دەکەن؟»

من کەپێم خۆش نەبوو خۆشی ئازابوون و وەبەرچاوهاتن لە کیس بدەم، زوو زوو دەمگوت: «هیچ نییە ئامۆژن! خۆ نایەشێ، خۆ مەنزووریشم نییە.»

بەڵام ئەو دوو پۆلوویەی لە دوو لای ڕوومەتم گەش گەش داگیرسابوون لەپڕ سەهۆڵی نێو دڵمی دەتواندەوە دەیکردە ئاو بە دوو گۆشەی چاومدا لە نەکاو بەخوڕ دەهاتەوە خوار. خۆم بۆ ژێر نەدەکراوە. غەریبی نەیدەهێشت.

دەستی بەسەر دوو دەستەکانم داگرتبوو، نەمدەتوانی دەست بۆ چاوانم بەرم و بێ ئاویان بکەم. جارێکیان کە ئامۆژنم لە ماڵ نەبوو، یەکێ لە ئامۆزاکانم کە چاوی دایکی دوور دەدیت ڕووی لە من کرد و کوتی: تۆ کە نەهاتبوویە ئێرە، پاڵەوانێک هاتبوو لە پێش چاوی خەڵک بەسەری بەردی دەشکاندن. ئەی نازانی چ پاڵەوانێک بوو. چەندە ئازا و بوێر. خەڵک یەکبین چەپڵەیان بۆ لێدەدا، بڵێی تۆش بتوانی توند، توند سەرت لەم درگایە بکوتی؟

: «کێ؟ من؟ جا چۆن ناتوانم، دەڵێی بچمە حەوشەی ئەو بەردە گەورەیەی بەسەرم بشکێنم.»

: «نا، نا، لەو بەردەی واز بێنە، ئەگەر عومەر و برایم هاتنەوە لە لای ئەوان ئەو بەردەی حەوشەی بشکێنە. جارێ تا ئەوان دێنەوە ئەم درگایەی بە سەرت بشکێنە.»

من غافڵ لەوە کە شانۆیەک بۆ پێکەنینی ئەوانیتر پێک هاتووە کە لە وەتاغەکەیتردا چاوەڕوانن. و دەوری سەرەکی ئەو شانۆیە دراوە بە من، هەر وەک گایەکی ئیسپانیایی کە چلۆن بە شەقۆن شالاو دەباتە سەر ماتادۆڕەکان، بە چاوی بەسراوە و بە کەللەی لە زەمین و زەمان بێخەبەرم هێرشم برد بۆ شکاندنی درگاکە، لەپڕ ئامۆزاگیانم بە خەیاڵی خۆی ویستبووی ڕۆنی چێشتەکەی پتر بکا درگا دەکاتەوە و من هەر لە ژووورێڕا بە سەرەمەقولات لێدان لە پێنج پلیکانانڕا کەوتبوومە خوار و بێهۆش دەمبەنە نەخۆشخانە. ئەگەرچی ئەو ئامۆزایەم لێدانێکی باشی وێکەوتبوو تا بزانێ هیچ لە خۆڕا پێشینیانمان ئەقڵی خۆیان خەسار نەکردووە کاتێک کوتوویانە لەپاش هەر پێکەنینێک گریانێکی شاراوە هەیە! بەڵام ئەم گاڵتەیە بۆ من پەیامێکی خۆشی تێدابوو. ئامۆژنم بآوەڕی هێنابوو کە من کوڕێکی ئازا و بەجەرگم گوایە کە لە نەخۆشخانە وەهۆش دێمەوە و پرسیار دەکەن: «خۆ جارێکیتر ئەم کارەی ناکەی؟»

من گوتبووم: «دەیجا ئەوە خۆ هیچ نییە. من لە جێگەی زۆر بەرزیش دەتوانم خۆم بخەمە خوار!»

من ئەو نەقڵانە تەنیا لەبەر ئەوە دەگێڕمەوە کە بڵێم هەر لە زۆر زووەوە پێم خۆش بوو ببێنرێم. بە تایبەت لەو دەمەڕا کە نازێم دیتەوە هەر لەودەم ڕا سەریشیان بڕیبام تا شاڵوارە کۆنەکانی مامم کە دووی وەک منی تێوەدەچوو بە پێچەوانەی پێشتر تا چاک و پڕ بە بەری خۆمم نەکردبایە لینگم تیَ ڕۆ نەدەکردن. ئەودەم کێشەیەکی زۆرم لەگەڵ ماڵە خۆمان کرد، هەڵبەت دروستەکەی ئەوەیە کە بڵێم ئەوان کێشەیەکی زۆریان لەگەڵ من کرد تا ئیزنم بدەن مووی سەرم بە قەرا دەنگە جۆیەکی درێژ ڕاگرم. بەڵام بە داخەوە ئەو قژە نەعاملاوەی من دەتکوت نەشتەرە، بە هیچ بارێکیدا دانەدەهات. نە ئاو دەرەقەتی دەهات، نە ڕۆنی چێشت لینانیَ کە لە یەکێکم بیستبوو بە بارێکیدا دەیشکێنێتەوە، کە بەداخەوە وانەبوو و ئەوە ڕۆنەکە بوو کە بە خۆیدا شکاوە! تازە لەسەر ئەم قژە ڕا کە دەتکوت شاخی بزنەکێوین زەق لە سەر سەرم ڕوابوون چەندەیان ئازار دەدام، کاری ماڵیَ دەبوو بیَ یەک و دوو بە ئەنجامی بگەیەنم، ئەگینا پەڵپیان لێدەگرتم کە بە قەرا ئەو دەنکە جۆیە لەو موویە کۆڵنەدەرەم کەم بکەمەوە. بەڵام ئەوەندە موویەش کە ئەودەم نیشانەی گەورەبوونی منی ئەویندار بوو کە لە پاش چەند ساڵ دووری لە نازیَ سەر لەنویَ چاوم پێی کەوتبووە و ئاگری ژێر خۆڵەمێشی دەروونم دیسان بڵێسەی دابووە و ویستم ئەوە بوو بە هەرلەونیَ جارێکیتر دەروازەی دڵی نازیَ ڕوو بە دڵی خۆم بکەمەوە و ببمەوە بە هاودەمەکەی جارانی، بۆ من زۆر بوو کە دەیتوانی پێستی سەرم کە دەیان جێگای لە شەڕە گەڕەک شکابوو و شوێنێکی ناحەزیان لەسەر سەرم بەجیَ هێشتبوو لەبەر چاوان بشارێتەوە. من بڕوام بەوە هەیە کە هەرچی مرۆڤ بە درێژایی تەمەنی دەیکا. هەمووی لە هەستی خۆویستی ئەوەوە سەرچاوە دەگریَ.

دڵداری و خۆشەویستی ڕاستەقینە نەبیَ کە زۆرتر لە هەستی خۆشویستنی یار و گراویَ و دڵدارەوە سەرچاوە دەگریَ. چون لەعیشق و ئەوینی ڕاستەقینەدا، تۆ خۆت لەبەر خۆت ناویَ و خۆت بۆ خۆت ناڕازێنییەوە، خۆت لەبەر خاتری خۆت لەدەیان کێشە و گێرە و

چەرمەسەری و گیروگرفت ناوێی، بەڵکوو هەمووی لەبەر ئەوەیە کە کەسێکی تر بە پەیژەی وجوودت هەڵبگەڕێ و سەر بکەوێ و هەست بە بەختەوەری بکا. هەروەکی تۆ کە هاوکات لە پەیژەی وجوودی ئەو کەسە سەردەکەوی. ئەگەر ئەم هەستە ئەویندارانە هەستێکی ڕاستەقینە بێ، دەبێتە هۆی گەشە سەندن و پێگەیشتنی تۆ. هەروەکی ئەوینەکەی من، کە دەستی گرتم و لەچنگ دنیای منداڵانە و چکۆڵەی کووچە و کۆڵانی دەرێنام و دەنێو شەقامە قەرە باڵغەکانی هاویشتم بە سەدان جیلوە و مەبەستی تازەوە. مرۆڤ پابەستی مەکان و شوێنە، ڕێی بکەوێتە هەر شوێنی لە قالب و چوارچێوەی ئەو شوێن و مەکانە دەدرێ، ئێمە لەخۆڕا ئەو فریوە گەورەیە دەخوێن کە پێمان وایە خۆمان خاوەن ویست و ئاوات و ئارەزووی تایبەت بەخۆمانین، زۆر گەوجانەیە بناغەی ژیانمان لەسەر شتێکی دابمەزرێنین کە فڕی بە ئێمەوە نییە. هەر ئەو شتەی کە لامان وایە ئەوە ویست و ئارەزووی خۆمانە کە بە دوایدا عەوداڵین. ئەگەر جوان لێی ورد بینەوە، دەبینین زۆربەیان ئەو چاوەڕوانیانەن کە شوێن و مەکان و مرۆڤەکانی تری دەوروبەرت لە تۆیان دا پێک هێناوە واتە ئەو شوێنەی کە ژیانتی تێدا دەبەیە سەر، تۆ بە جۆرێک پەروەردە دەکا کە بتوانی ئەندامێکی باش بی بۆ ئەو، نە بۆ خۆت و تۆ تا ئەو ڕادەیە سەر هەڵدەدەی و پێدەگەی کە ئەو چوارچێوە تەنگە کە تۆی بەستۆتەوە ئیزنت پێ‌دەدا.

گەورەیی و چکۆڵەیی ئارەزووکانت پێوەندی هەیە بە گەورە بوون و چکۆڵەبوونی فەزا و شوێن و مەکانی ژیانتەوە، هەرچی لە چوارچێوەیەکی گەورەتر و پانوپۆڕتر دا بژی ویست و ئاوات و ئارەزووەکانت گەورەتر و بە شکۆتر و پڕشنگدارتر دەبێ، هەرچی ژیانت لەشوێن و جێگەیەکی بچووکتر دا تێپەڕێ تۆش لەگەڵ هەموو ئاواتەکان و ویستەکانت بچووکتر دەبی و ئەوە ئەوینی نازێ بوو کە لە قەوارە و چوارچێوە بچووکەکەی سەردەشتێی دەرهاویشتم کە ئیستعارەکەی کووچە و کۆڵان بوو کە دەسبەرداری نەدەبووم و منی هاویشتە چوارچێوەیەکی گەورەتر واتا شەقامەکانی شار کە بە هەزاران ڕەنگ و شکڵی جیاواز کە هەرگیز پێشتر

وەبەر چاوم نەهاتبوون، دەورە دەرام، هەر ئەو سەردەمە بوو کە توانیم بۆ هەوەڵ جار ڕوخساری ڕاستەقینەی خۆم لە ئاوێنەدا بەدی بکەم. توانیم لەگەڵ خۆم ئاشت ببمەوە و توانیم سەر لەنوێ نازێم بوێتەوە. هەرچەند نازێ ئەو نازێی جاران نەبوو، شار ئاڵوگۆڕی بەسەردا هێنابوو. هەر لە هەوەڵ دیدارمان زانیم لەگەڵ نازێیەکیتر ڕووبەڕوو بووم و پێویستە بەشێک لەو بیرەوەرییانەی لە ڕابردوودا لەگەڵ نازێ هەمە، لە قووڵترین بەشی وجوودمدا بیانشارمەوە و هەرگیز وەک ئەزموون و تەجرەبەیەکی هاوبەشی خۆم و خۆی چاولێنەکەم. یانی ئیتر کەڵکی نابەجێی لێ وەرنەگرم. ئەوەی کە ئەودەم پێی گەیشتم ئەوە بوو کە تازە منیش وەڕێ کەوتبووم. تا گەیشتن بە نازێ، بڵێی چەند هەنگاوم مابێ؟

❊❊❊

## ٥٥

...... لەو ڕۆژەوە دوکتور، سۆفی حەسەنی بەڕێ کردبوو، ئارام و قەراری لێهەڵگیرابوو. بە درێژایی ساڵانێکی دوورودرێژ، خووی بە ژیانێکی ئارام و بێهەست و خوست گرتبوو، وەک کاتژمێرێک بێ چرکەیەک ئەم لاو ئەولا کاری دەکرد، ئەو بەرنامەی بۆ ژیانی ڕۆژانەی لەبەر چاو گرتبوو بەبێ ئەوەی بەقەرا سەرە دەرزییەک لێی لابدا بەڕێوەی دەبرد. جگە لەو دەمانە کە بۆ کۆبوونەوەی زانستی دەچوو بۆ دەرەوەی وڵات هەرگیز بەرنامەی هەر ڕۆژەی ژیانی تێک نەدەچوو. بەری بەیانی ساعەت شەش لەخەو هەڵدەستا، بەر لە هەر کارێک کتری ئاوەکەی لەسەر ئاگرێکی کز دادەنا کە بە کاوەخۆ وەکوڵ بێت، ئینجا دەچوو لەنێو حەوشە دەستی دەکرد بە هەڵاتن و وەرزیش کردن. نیو ساعەت لە عومری بۆ دادەنا، دەهاتەوە ژوور و خۆی لە حەمام ڕۆ دەکرد و ئاوێکی بەخۆی دا دەکرد.کە لە حەمام دەبۆوە کترییەکە دەکوڵی، بەرچایی کە تەواو دەبوو ڕووی دەکردە بیمارستان. لەوێ کارەکانی پێشتر دیاری کرابوون، نانی نیوەڕۆی لە بیمارستان دەخوارد و هەر لەوێ هەندێک دەحەساوە، ئەوجار ئەگەر بڕیاری نەشتەرگەری هەبایە دەچوو بۆ عەمەل کردنی نەخۆشەکانی، ئەگینا ڕووی دەکردە مەتەب و هەتا شەو تاریک دەبوو هەر نەخۆشی دەدیتن کە درەنگ وەخت لە عەیادەکەی تەواو دەبوو، دەهاتەوە ماڵ، هەڵبەت بەر لە هاتنەوەی، لە دەرێ شتێکی دەخوارد کە دەگەیشتەوە ماڵ چاییەکی وەسەر دەنا. هێندێک خۆی بە تەماشاکردنی تلویزێون و هەواڵی ڕادیۆیەکانی دوورەوەی دەخافڵاند، لە پاشان بۆ ماوەی ساعەتێک یا دوو ساعەت موتاڵای کتێبە تازەکانی زانستی پزیشکی دەکرد تا هەمیشە ئاگاداری تازەترین دەسکەوتەکانی پزیشکی بێ، لە پاش موتاڵا، کاتی خەوی بوو، بەڵام چ خەوێک. بە درێژایی ژیانی هەموو شەوانە کاتی نووستن

دەچوو دەبیروخەیالانەوە، بیروخەیاڵی ڕابردوو، بیروخەیاڵی سەردەمی منداڵی، هەموو شەوێ جارێک بەسەر بەسەرهاتەکەی‌دا دەهاتەوە. تاسەر لەنوێ دەبۆوە بە دوکتور، تا دەگەیشتە ئەو کاتەی کە تێی‌دا خەریکی بیرکردنەوە لە ڕابردووی بوو. ئینجا خەو کە ماوەیەک بوو لە پەنایەک بە بێ‌وازی خۆی مات دابوو تا دوکتوری وەڕەز لەم هەموو دووپات کردنەوە خۆڕاییی‌یانە چاوان ویک بێنێ و لەپڕ خەو بچێ نەرم و هێدی لە ئامێزی ئارام و کۆدئێنی خۆی بگرێ، ئەودەم بوو کە خەوی لێدەکەوت تا خەون ببینێ، خەونی تەواوی ئەو شتانەی لە خەیاڵەکانی بەر لە نووستنی بیری لێدەکردنەوە، خەونی ئەو کەسانەی پێی خۆش بوو جارێکی‌تر بیانبینێتەوە. هەر لەو ڕۆژەوە کە بوو بە دوکتور بەبێ یەک جار پسانەوە یان وەپشت گوێ‌خستن ئەم بەرنامەیەی دووپاتە و چەند پاتە دەکردەوە. بەڵام ئێستا کە چەند ڕۆژ لەو ڕۆژە تێپەڕیوە کە سۆفی حەسەنی بەڕێ کردۆتەوە، بەرنامەی هەر ڕۆژەی ژیانی وەها لێ‌تێک چووە، کە هەر ئاوڕی لێناداتەوە، لە دەریایەکی دیکەدا وەمەلە کەوتووە. مەلە نا، پەلەقاژە دەکا، پەلەقاژە ناکا، خنکاوە، واتا لە دەریایەکی دیکەدا خنکاوە. خنکاو خنکاویش نا، هەر بە حاڵ ماوە و هەر بە بێ هۆ باسکان داوێ، بەڵام خۆی بۆ دەرباز نابێ.

: «بڵێی چۆن بێ؟»

کێی لەگەڵ دایە؟ بە حیسابی تەنیاییی‌یەکانی خۆی بیست و چوار ساڵ لەودەم گوزەراوە.

دەڵێ: «کە وابوو تەمەنی دەبێ ئێستا، سی‌ونۆ، چل ساڵ ببێ.»

دیسان دەڵێ: «مرۆڤ چ ڕاحەت و ئاسان فریو دەخوا. هەڵبەت فریوی خۆی زووتر.»

هەروا دەڵێ: «ئەو جۆرەی کە لێی دەڕوانم مرۆڤ سەد ئەوەندەی فریوی خەڵکی دەخوا، فریوی خۆی دەخوا. هەردەم خەریکی ئەوەیە ڕاستییەک لە خۆی بشارێتەوە. هەموو کەس وای عادەت گرتووە کە تەمەنی خۆی بە مانگ و ساڵ دەپێوێ بەڵام لەبیر دەکا کە لە ساڵێکەوە تا سالێکی تر جیاوازیان لە نێوان دایە. ساڵی وا هەیە لە چاوتروکانێک‌دا تێدەپەڕێ.

هەروەک برووسکە، ئێستا بە تەواوی خۆی هەڵنەکردووە کە خۆی دەکوژێنێتەوە و ساڵی واشمان هەیە بارتەقای ئەبەدییەتێک لێک دەکشێتەوە. تۆ هەرچی دەکەی دەبینی ئەو ساڵەت بۆ تەواو نابێ. ساڵی وا هەیە وەک ژاری مار تاڵ و ناخۆش و کەکرە، ساڵی واش هەیە خۆش هەروەک هەنگوین، شیرین و بەتام وەک پێکەنینەکانی سەردەمی منداڵی فاتێ، وەک ساڵەکەی پار و ڕۆژەکەی پار لەم گۆرانییەی مامڵێ‌دا: ساڵەکەی ئەوساڵ وەک ژاری ماربێ، هەمووی بە قوربانی ڕۆژێکی پار بێ» ساڵ هەیە پڕە لە بەرەکەت و نیعمەت و داهات و باران و سەوزە و ئەها گوڵم لەبیر چوو. بەڵێ گوڵ و ئاو و تاو و سەیران و ساڵی  واش هەیە، ویشک و قاقڕ پڕپڕ لە قاتی و قوڕی و کوللە و سن و فریزوو، ساڵی وا هەیە ڕووی لە خۆشەویستانە و بەیەک گەیشتن و ئازادی و ڕزگاری و ساڵی واش هەیە کە ڕووی لەهیجران و دوورە پەرێزی و دابڕان و دوژمنایەتی و دەست بەسەرییە.»

نەیدەزانی چ دەستێکی بەهێز و نهێنی بۆ چ کایەیەکی شاراوە و غەریب لە هەڕەتی لاوەتی‌دا پیلی کێشاوە و وەهای تۆڕ هەڵداوە کە ئێستاش هەر چی دەکا پێی عەرزی ناگرێتەوە. هەر بۆیە لە مابەینی عەرز و ئاسمان‌دا دەبێ خۆی ون بکا، هەروەک ئەو کەسانەی لە خەونیان‌دا ڕێگایان دەکەوێتە شارێکی غەریب و نامۆ. نازانن بۆ لەوێن، نازانن ئەوێ کوێیە، دەبێ بە کوێ‌دا و بەرەو کوێ باژوێن. لە کێ پرسیار بکەن کە کێن و ئەو کێیە و بە شوێن چی‌دا لەوێیە. تەنیا ئەودەم کە لە خەوەکەیان جیا دەبنەوە ئاهێکیان دێتەوە بەرخۆ. ئەوکاتە دەزانن ئەوە هەموو خەون بووە، بەڵام ئەو دەخەودا نەبوو. هەر لەو جیهانە ڕاستەقینەدا بوو کە دەستێکی بەهێز فڕێی داوەتە شوێنێکی‌تر، کە تێی‌دا ژیانی خۆی نەباتە سەر، بەڵکوو ناچار بکرێ کە ژیانی کەسێکی‌تر بژیت، بۆ ئەوەش ناچار بێ نەتەنیا ژیانی خۆی بەڵکوو هەموو کەسی تریشی، هەموو شوێن پێی بیرەوەرییەکانیشی. هەموو چوار چێوەی خەونە خۆشەکانیشی، لە دەس بدا تاکوو ئیتر نەتوانێ بەخۆی بزانێتەوە و بە باشی خۆی بناسێتەوە و تەنانەت لە خەونەکانیشی‌دا نەتوانێ وڵامێک بۆ

سەدان پرسیاری دەروونی خۆی بدۆزێتەوە. بە درێژایی ساڵانی ڕابردووی ژیانی، کاروپیشەی هەر ئەوەبوو کە بێ پشوودان و ماندوبوون هەربڕوات و ڕێگە ببڕێ. وەک چارەنووسێکی دیاریکراو، وەک لاقێکی گۆجی زگماکی خووی پێگرتبوو. خۆی لەنێو دووپات کردنەوەی بەرنامەیەکی هەر ڕۆژەدا شاردبۆوە کە ئەگەر بە ئانقەستیش لە خۆی گەڕابا، نەیدەدۆزییەوە. بەڵام تەنیا چەند ڕۆژ لەمەوبەر بوو کە سۆفی حەسەن پەیدابوو.

لە خۆی دەپرسێ: «ئەرێ بە بیستنی قسەکردنی سۆفی حەسەن ئەودەم کە نەیدەزانی سۆفی حەسەن کێیە لەگەڵ بەردەستەکەی دڵی داخورپابوو، خۆ دەیتوانی هەر بە هێندی نەگرێ وەک تەواوی ئەو نەخۆشانەیتر، کاتێک لەگەڵ بەردەستەکەی قسان دەکەن، هەرچەند دەیتوانی گوێی لە وتوویژیان بێ، بەڵام گوێی ڕاناگرێ. سۆفی حەسەن لە پشتە کۆم و نەخۆشەکەی دا پەیامێکی نهێنی بۆ دوکتور پێ بوو؟ هەر لەبەر ئەوە بەبێ ئەوەی ویستوخوازی بێ درگای ژوورەکەی خۆی لێ کردبووە و سۆفی حەسەنی کردبووە نەخۆشی خۆی، پەیدابوونی سۆفی حەسەنی بۆ دوکتور وەک بەردێکی گەورە بوو کە کەوتە نێوگۆمی مەند و ئارامی زەینی دوکتور. سەدان وردە شەپۆلی لەم ئاوە مەندو ئارامەدا سازکرد. بە چەشنێکی کە دوکتور تازە نەیتوانی خۆی بگرێتەوە و ئێستا ئەوە بە هەموو گیان و چاو و گوێ و هەستی، چاوەڕوانی گەڕانەوەی سۆفی حەسەنە، سەری لە کاری خۆی سوڕمابوو. بیری لەوە دەکردەوە کە دەیتوانی سۆفی حەسەن لە پاش دوو ڕۆژان عەمەل بکا. بۆیە بە ئانقەست بیست ڕۆژی لێ وەپاش خست؟ کە بە قسەکانی پێشوویدا چۆوە، وە بیری هاتەوە لە کاتی بەڕێکردنی سۆفیحەسەن لە کەسایەتی ئێستای خۆی گەلێک دوور کەوتبۆوە و نامۆیی لێدەکرد.

: «سۆفی لەبیر نەکەی کە هەواڵ و باسی هەموو کەسم لەگەڵ خۆت بۆ بێنەوە. لە گەورە و بچووک، لە مردوو، لە زیندوو، لەوەی ئێستاش هەر لەوێ دەژین و لەوانەی لەوێ ڕۆیشتوون. بەتایبەت خەبەری....»

سۆفیحەسەن بەسەرسوڕماوی چاوی لە دوکتورێ بڕیبوو کە پێی وابوو خودا بۆ ئەوەی ناردوویەتی بۆلای چون دەرحەق بە خەڵک ڕەنگە چاکەی کردبێ..هات زاری پڕ کرد کە بڵێ: «بە قوربانت بم دوکتور! دیسان هەر درێژە بەکایەکەمان بدەین؟»

بەڵام نەیکوت. لەجیاتی ئەوەی گوتی: «بە قوربانت بم دوکتور گیان! فەرمووت بە تایبەت هەواڵی کێ؟»

: «هیچ کەس سۆفی! مەبەستم کەسێکی تایبەت نەبوو.»

دوکتور دەدڵیدا کوتی: «سەیر ئاڵوگۆڕی بەسەردا هاتووە. دەبێ خەمی غەفوور چەندە بووبێ لەسەر ئەو پیاوە زیرەک و زۆرزان و زیتەی ئەوا ئەو کۆلکەدارە بێ ڕووح و گیانەی لێ سازکردوە. دەهات منداڵ بێتەوە و گوێ بۆ حەکایەتەکانی سۆفیحەسەن ڕابگرێ کە ئێواران لە پاش نوێژی شێوان سۆفیحەسەن بۆ کاوەیس و چەند منداڵی دیکەی دەگێڕاوە کە سۆفی حەسەن کوتی: «بەقوربانت بم ئەوەندەت خەجاڵەت کردووم کە پێم خۆشە بەم دەرد وئێش و ژانە هەر لەوێ بمێنمەوە و چیترت زەحمەت نەدەم.»

دوکتور دەڵێ: «ئەو قسانە چییە سۆفی! دەیانکەی؟»

بیستوپێنج ڕۆژی خایاند تا سۆفی گەڕاوە. لەم بیستوپێنج ڕۆژەدا دوکتور دەتکوت هەر لەسەر پۆلووانە. نائارام و بێقەرار. هێندێک قەڵس و بیانووگر. بۆ ساتێک نەیدەتوانی لە جێگایەک ئۆقرە بگرێ، بەشلی دەچۆوە مەتەبەکەی، وەک جاران نەیدەتوانی زۆری لێ بمێنێتەوە، ڕایسپاردبوو نۆرەی دیتنی زۆربەی نەخۆشەکانی وەدوا بخرێ. لەشتێک بەنێوی بەرنامەی ڕۆژانەی ژیانی ئاسەوارێک نەما، لەوێ ڕۆژێ کە دوکتور ئیرەج کەماڵی ئاوێنەی دایە دەستی و ڕوخساری خۆی تێدا دیت و ئەو جێگە برینە ناحەزەی لەسەر ڕوومەتە شەقەکەی خۆی دیت تیغی بەڕدێنی دانەهێنابوو تەنیا جار جارە هێندێکی کورت دەکردەوە بەڵام ئێستا لەوەتی سۆفیحەسەن ڕۆیبوو کۆڵە ڕدێنێک تەواوی ڕوخساری شاربۆوە حەمام کردنەکەشی پەکی کەوتبوو، ئەو کەسایەتیە تازەیەی لەبەرخۆی کردبوو وەک بەنداوێک بوو کە لەپێش چۆمی بیرەوەرییەکانی ڕابردووی دووری هەڵبەسترابوو و وردە

ورده ئەم ئاوە بەهێزە لە پشت ئەو بەندە کۆ ببۆوە و ئێستا هێزێکی ڕامالّینی وەها گەورەی پێک هێناوە کە بەندی وجوودی ئێستای دوکتور توانایی ڕاگرتنی ئەو ئاوە زۆر و لەڕادەبەدەرەی نەمابوو و ئەو بەندەی تێک ڕەماندووە و هەزاران جۆگەلە ئاوی بیرەوەری بەنێو دەمار بە دەمار و ئازا بە ئازای لەشی دوکتور دا وەڕێ کەوتووە و دوکتوریش کش ومات و تا ڕادەیەکی زۆر دلخۆش و ڕازی کەوتۆتە ژێر دەسەلآتیان.

کە سۆفی حەسەن چاوی بە دوکتور کەوتەوە. بۆ چەند ساتێک نەیتوانی بیناسێتەوە، هەڵبەت لە کزی دانی شۆقی چاوی سۆفیحەسەن بێهۆ نەبوو، هەر چەندە وێدەچوو ئەو ردێنەی ڕوخساری کز و پەشۆکاوی دوکتوری شاردبۆوە، باعیسی نەناسینی دوکتور بێ. دوکتور کە چاوی بە سۆفیحەسەن کەوتبۆوە، بەڕاستی ڕاچەنی، چون ئەو درەنگ گەڕانەوەی سۆفیحەسەن ئەو بڕوایەی لە دوکتوردا بەهێز کردبوو کە لەوانەیە تازە چاوی بە سۆفی حەسەن نەکەوێتەوە، هەر ئەودەم لیبڕا کە سۆفیحەسەن ئاگادار بکا کە واز لە کایەکەیان بێنن.

***

# ٥٦

....... سەرکردە تەنیا دووجار فرمێسک لە چاوی خزابووە خوار. لەدەس‌دانی دایک و بابی و تەنانەت خوشکە ئازیزەکەشی زڵەخا، هەرچەند زۆر پەژارەمەندی کردبوو بەڵام هەرگیز فرمێسک لە چاوی نەڕژابوو، وەبیری دەهات ئەودەم کە بابیان دەناشت، دوایی دایکی وەک گلەیی پێی دەکوت:

: «فایەق! هەرگیز نەمدەزانی ئەتۆ وەک بەرازی. چۆن بابتیان ئاوا دەقەبری دەنا ڕاوەستابووی فرمێسکێک لە چاوت نەدەهاتە خوار.»

فایەق دەیگوت: «دایە گیان! وە نەبێ خەمیم نەبووبێ، وەخت بوو شێت بم بەڵام ئەختیاری فرمێسکم لەدەست خۆم دانییە. هەرچی حەولیش دەدەم نایە و نایە.»

بەڵام ئەودەم کە درەنگ‌تر لە وەختی خۆی، وەدوای مردوو یا زیندووی خوشکەزاکەی کەوتبوو، کە ناجوامێرانە ئەوجۆرەی بۆیان گێڕابۆوە لە نەکاو وەبەر تەوژمی ڕک و قینی چەند کەسی بێ بەزە و بێ ڕەحم کەوتبوو کە خۆیان لێ مات کردبۆو «خاڵان خوارزا مەزن کرد.» خۆڕایی بوو. ئەودەرفەتەی بۆ هەمیشە لە کیس چووبوو، چونکە هەموو گەڕان و بەم لاوبەولا داچوونەکەی بێ کەلک مابۆوە. وەشوێن ئاوێک کەوتبوو کەبە عەرزی‌دا ڕۆچوو بووە خوار. هەر جێگەیەکی بیری بۆی چووبووئەویش بۆی چوو. بەڵام دەس بەتاڵ دەگەڕاوە. نەیدەزانی چۆن بە خوشکە ئازیزەکەی بڵێ. ئیتر کوڕێکی بەنێوی کاوەیس بۆ نەماوە. ئەو جۆرەی بۆیان گێڕابۆوە. ژاندرمان کە دەگەنە سەر کاوەیس. یەک کوتبووی مردووە و یەک کوتبووی زیندوویە، لە نەخۆشخانەی سەردەشتی‌ڕا شوێنی هەڵگرتبوو و لە نەخۆشخانەی سابڵاغ کە پرسیاری کردبوو ناردیانە ورمێ. چەندە بە خۆڕایی لەوێ ماوە، هیچ نەخۆشخانە و بیمارستانێک نەمابوو کە نەیپشکنێ.

ڕاپۆرتێکی بیمارستانێک لە ورمێ وای دەردەخست کە بە پەلە بەڕێ کراوەتە بیمارستانێکی تەورێز. ڕووی کردە ئەو شوێنەش. بێکەلک بوو، چەند ڕۆژان با وەکوو دەیزانی هیچ شوێنەوارێک لە کاوەیس لەو شارەدا ناکەوێتە دەستی، لەوێ خۆی ماتل کرد. ڕەنگە وای هەست کردبێ کە لەوانەیە درگایەک لەو درگا نهێنیانەی ئاسمان لەپڕ بکرێتەوە و کاوەیس ساغ و سەلیم بەرببێتەوە نێو باوەشی خاڵی! پاش چەند ڕۆژان، ناچاری بەڕێی کردەوە. تەنیا ئەودەم کە بە دەستی بەتاڵ بەبێ هیچ هەواڵێکی خۆش یان ناخۆش چاوی لە چاوی زڵەخای خوشکی بڕی، فرمێسک لە چاوی دا خزا خوار و ئیتر وەبیری نایەتەوە بە درێژایی ساڵانی پێشمەرگەیی و ڕوو بە ڕوو بوون لەگەڵ سەدان ڕووداوی دڵتەزێن، فرمێسک و گۆنای یەکتریان ناسیبێتەوە، بەڵام ئێستا بە دوای تێپەڕبوونی ساڵانێکی زۆر لەم ڕووداوە دڵتەزێنە، ئەو خڕناڵە، ئەو ئینسانە کورتە باڵایە. وەهای لێکردبوو کە ئەوەی بە درێژایی ئەو ساڵانە لە دەروونی‌دا پەنگی خواردبۆوە، یەکجێ دەرباز بێ. دەتکوت تۆڵەی تەواوی ئەم ویشکە ساڵانەی چاوەکانی دەکاتەوە، هەمیشە کانیاوی چاوەکانی درۆزنە ئاو بوو. بەڵام ئێستا لەو بەردەڵانە، دوو کانی تەقی‌بوونەوە، دوو کانی ئاوی ڕوون ڕوون و سپی کە وردە وردە سوور هەڵدەگەڕان سوور بوون و سوورتر ببوون. ئیتر خوێن بوو لە چاوانی بە خوڕ دەڕژان. خوێنی سوور وگەش ڕشتن لە بەر بێدەسەڵاتی، لەبەر لە تاریکایی‌دا مان و ناشارەزایی کە زاواکەی، مراد ناجوامێرانە لە خوێن گەوزا، تەمەنی دوازدە ساڵانە بوو. بێدەسەڵات و دەستەوەستان، نەیدەزانی دەبێ چ بکا. تەنیا دە دەروونی دا لە باڵای کورت و جەستەی نابووتە و بێ دەسەڵاتی خۆی تووڕە ببوو. ئەوەندەی زڵەخای خوشکی خۆش دەویست، سەد ئەوەندە کاک مرادی زاوای. هەر ئەودەمیش بە هەموو خەم و خەفەت و پەرۆشی کە دایگرتبوو، نەیتوانیبوو بگری، زۆر خۆی لەگەڵ خۆی ماندوو کرد نەهات و نەهات، بەڵام ئێستا خوێن دەگریا. نە لە دەستی دەهات کە بە گژ حەوت برایان دابچێ و نە دەیتوانی ئەم سەرداخستنە و سەرشۆڕییە لەبیر بکا، کە تاقە خوشکەزاکەی بەبێ سووچ و تاوان لەتوپەت بکەن و

ئەویش مابێتەوە بە بێ ئەوەی هیچ شتێکی لەدەست بێ، تەنیا چارەیەکی بەزەینی گەیشت ئەوە بوو کە ڕوو لەو  دیوی بکا. تا لە تەنگانەکانی شەڕ و خەباتی ئەودیودا خۆی بدۆزێتەوە. بەڵێنی بەخۆی دابوو، ئەوەندە گەورە و بەهێز ببێ تا دەستی تۆڵەی دەگاتە قوڕقوڕۆچکەی ئەو کەسانەی کە خەمێکیان بۆ کردبوو بە مۆتەی هەموو شەوێی کە دایم و دەرهەم هەستی دەکرد ئەو مۆتەیە چۆکی لەسەر سینگی داکوتاوە و هەردەم خەریکی خنکاندنی بوو، ئێستا فایەق کە هەموو کەس بەسەرکردە دەیناسی و ببوو بە مەردی ڕۆژانی تەنگانە و سەختی شۆڕش. لە بەرانبەر تەرمی بچووک و کز و لاوازی منداڵێکی پیاوکارە، هەست و ئیحساسی خۆی لەدەست داوە و بۆجاری دووهەم گریان دەستی بەسەری داگرتووە و لە قەوارە و چوارچێوەی ئاسایی خۆی دا نەماوەتەوە.

پێشمەرگەکانی سەریان لە ئاکاری سەرکردە سوڕمابوو. دەیان برینی ئەستەمی گوللە و پریشکەی خومپارە، زۆر جار تا سنووری مەرگیان بردبوو، کەس پەڕە سلێرەکەی ئاخی نەبینیبوو کە لە هێلانەی زاری سەرکردە بێتە دەر، کەچی ئێستا ئەوە بە کوڵ دەگری، چ گریانێک؟ گریان نا، چ سێلاوێک؟  سێلاوێک کە لە تاریکایی‌یەکی نادیار و ڕەمزاوی دەروونێکی هەمیشە مات و نائاشنا سەرچاوەی گرتووە و هەردەم دەهات بەهێز و بەهێزتر دەبوو. بۆ سەرکردە. کوژرانی خڕناڵ تەنیا کوژرانی منداڵێک نەبوو کە تەنیا دوو ساعەت لەوەپێش چاوی پێکەوتبوو، هەر ئەو مەبەستەش بوو کە ئەوەی لە دەوروبەری سەرکردە بوون، تێینەدەگەیشتن. چۆن دەگونجێ بۆ کەسێکی کە تەنیا دوو ساعەت لە دیتنی تێنەپەڕیوە، یەکێکی بە جەرگی وەک سەرکردە، ئاوا بەکوڵ بۆی بگری. گریان کەنا، خوێن ڕشتن و داچۆڕان و توانەوە، گۆڕان  و  لە خۆ ترازان و چوون دە چوارچێوە و قالبێکی ترەوە. ئەم کوژرانە لە زاتی خۆی‌دا بەرهەمێکی تر پێک دێنێ. ئەو کێشەیە بۆ سەرکردە دەکاتە کێشەیەکی شەخسی و ناوخۆیی. ئەم تەرمە بە ڕواڵەت بچووک و بەدەروون گەورەیە بە پەلە پیلی سەرکردە دەگرێ و بەنێو دالانە تاریک و تنووکەکانی ڕابردووی زەینی‌دا ڕاکێشی دەکا. کاوەیسی

خوشکەزای، دەخاتەوە بیر. چەشنێک مەزلووم بوون، چەشنێک ناخواستە مردن لەوپەڕی بێ دەسەڵاتی‌دا. واتا چەند کەس لە نەکاو ئامبازی تازە لاوێکی خافڵ و بێخەبەر لەبۆسە بن، تازە لاوێکی کە لای وایە بەرەو ژوانی عەشقێکی پاک و ئاسمانی دەڕوا و لەپڕ بێ هیچ بەڵگە و بیانوویەکی باوەڕ پێکراو لەناوی بەرن. نە بە چەشنێکی کە ڕێز و حورمەتێک بۆ تەرمەکەی هەبووبێت. وەک گڵکۆیەک، واڕشێک لە دەوری، دارە بووزێک و ئێوارەی جومعانە و گریانێکی لە کوڵی زڵەخای دایکی، بەڵکوو لە ناوچوونێک کە هیچ ئاسەوارێک لەمان و نەمانی نەمابێ و مەرگی خڕناڵێک، کە هیچ بیانوویەکی بۆ مەرگی نەدیتەوە، بەدەر لە غیرەت و لەخۆبردوویی لە ڕادەبەدەری. بەغەیری هەستی خۆ بەختکردن نەبێ. سەرکردە کە چاوەکانی ببوونە دوو گۆمیلکەی خوێن، ڕووی لە دەوروبەرەکەی کرد و گوتی: «تەرمی خڕناڵ هەڵگرن لەگەڵ خۆمان دەیبەینەوە، هەرچەند پێشنیاریان پێکرد بەهۆی ئەوە کە ڕێگەی گەڕانەوەمان زۆر هەوراز و ئەستەم و دژوارە و بۆمان دەرناچێ، باشتر ئەوەیە هەر لێرە کە سەرکەوتنمان بە دەست هێناوە وەک سەمبول و نیشانەی سەرکەوتنەکەمان بینێژین. لێی نەسەلماندن، کوتی: «ئێوە! دەجا ئێوە بکشێنەوە بۆخۆم بە کۆڵ دەیهێنم.»

لەونێوەدا مردووی ڕاستەقینە باقی بوو نە کەریم کە ئەو خۆ بەختکردنە و شاکارەکەی دەمادەم مێشک و ڕووح و ڕەوان و هەست و عاتیفەی هەموانی دەهەژاند، ئەگەر مردوویەک بتوانێ نەفەس بکێشێ، ئەو مردووە هەر باقی بوو. کش‌ومات و بێ زمان کەوتبوو. سەرکردە کە دیتی حاڵی پەشێوە و باش نییە بانگی کردە لای خۆی و دەستی گرت.

پێشمەرگەکان کە تازە لە کۆکردنەوەی چەک و چۆڵی بەجێ ماو لەهێزی بەعس و ناشتنی تەرمی کوژراوەکانیان تەواو ببوون، تەرمی کەریمیان هەڵگرت و وەڕێ کەوتن. سەرکردە دەستی کرد بە دڵدانەوەی باقی، بڕێک ئەهوەنی کردەوە، هێنایەوە سەر حاڵی ژیان. باسی خەبات و ڕزگاری و ئازادیخوازی بۆ دەکرد. باقیش باسی تەواوی ئەو ئاوات و ئارەزووانەی کە کەریمی لە سەردەشتێ‌ڕاهەڵگرتبوو تا ئێستاکەی، کە تەرمەکەی وا لەسەر

شانی پێشمەرگەکان دەگەڕاوە، بۆ سەرکردە دەکرد. سەرکردە هەرگیز گومانی نەدەکرد، یەکێکی وەک کەریم بەو تەمەنەی و بەم قەڵافەتە بچووکەی، ڕووحێکی تا ئەو ڕادەیە گەورە و بەشکۆی هەبێ. هەرگیز بیری نەدەکردەوە کە لاوێکی وەک کەریم توانیبێتی پێشتر خۆی بۆ هەرچەشنە گیانبازی و فیدا کارییەک ئامادە بکا. تا ئەو ئاستە کە بیهەوێ گاڵتە بە مردنیش بکا. ئێستا کە خوو و خدەی کەریم کە باقی بۆی باس کردبوو لە زەینی خۆیدا دەیهێنا و دەیبرد، خەمێک بەقەرا خەمی لە ئەژمارنەهاتووی هەموو وڵاتەکەی دایگرتبوو. بیری ئەوەی ئەو خڕناڵەی کە دوو سێ ساعەت لەمەو بەر ناسیبووی و تەنیا بەپێی هەستی ئینسانی خۆی، بۆ پاراستنی ئەو کەسانەی، تا دوو سێ ساعەت لەمەوبەر هەرگیز چاوی بە ڕوخساریشیان نەکەوتبوو. بەم شێوەیە گیانی خۆی بەخت بکا. ئازاری دەدا. بۆچی ئەو تەمەنە دوور و درێژەی کە لە خەبات و گێرەوکێشەدا ڕای بردووە نابێ ئەوەندەی وریا و زیتکردبێ کە لە نیگایەکدا بتوانێ ڕووح و ڕەوانی یەکی وەک خڕناڵ بناسێ. باقی هەروەها باسی ئەو دەرد و ڕەنج و بەسەرهاتە ناخۆشانەی کەریمی بۆ سەرکردە دەگێڕاوە کە لە چلۆن جەهەندەمێکدا سەری هەڵدابوو و ژیانی ناخۆش و پڕ لەمەینەت و ئەو سووکایەتییەکی کە پێی دەکرا، تەنیا بە لێبوردوویی لە ڕەنج و دەرد و ئازاری خۆی و هەروەها ئەوانەی ئازاریان پێ دەگەیاند لە خۆی هەموار و هاسان دەکرد. سەرکردە ئاوری لێدەبۆوە. سەری سوڕمابوو لە مرۆڤ. دەیزانی جارجارە ئەزییەت و ئازار، ئەگەر لە ڕادەی تاقەت و توانایی بەشەر تێپەڕێ، مرۆڤ دەکاتە دڕندەیەکی وەک گورگ و ورچ و بەراز کە هیچ ڕەحم و بەزەیی تێدا نامێنێ و تەنیا ڕێگایەک دەبینێ و پەیرەوی لێدەکا، ئەویش؛ بڕین و دڕین و لەناوبردنە. جاری واش هەیە هەمان ڕادە لە ئەزییەت و ئازار دەبێتە هۆی گەورەبوونی ڕووحی مرۆڤ و کەرامەتی زۆرتری ئینسانەکە، گەلێ لە لای سەیر بوو. چلۆن چەشنێک رەنج و ئازار دەتوانێ هێندێکیان بەرەوسەر، بەرەو ڕۆچنایی و نوور و ڕاستی و حەقخوازی و ئازادی بەرێ، لە حالێکدا هەمان ڕادە ڕەنج و ئازار، هێندێک کەسان بەرەوخوار، بەرەو تاریکایی و

زوڵم و زۆری کردن و ناحەقی و ئەشکەنجە و ئازاردانی خەڵکی‌تر و دژایەتی لەگەڵ هەرچی نیشانەیەکی لە جوانی پێوەیە ببا. ئەوەی ئەو ساتە لە ئارادا بوو ئەوە بوو کە کەریم شوێنێکی تایبەتی لەسەر سەرکردە دانابوو، خۆی لە بەرانبەر بە کەریم بە بچووک دەزانی، وە یادی هاتەوە ئەودەم کە خوشکەزاکەی لەدەس چووبوو، چی لەدەستان نەهاتبوو بەدەر لەوەی خوشکە هەناسە ساردەکەی بە دڵ دانەوە فریو بدا، بۆ درێژەدان بە ژیانێکی تاریک و بێ هەتاو و ڕوناکایی. هەرچەند بەدوای ئەو کارەساتە دابوو کەهاتە ڕیزی پێشمەرگە تا بێ دەسەڵاتی خۆی لە گەورەکردنی ڕووحی لەنێو کوورەی قاڵ کەرەوەی شۆڕش لەبیر بەرێتەوە. بەهێز و بەجەرگ و ئازا بێ تا بتوانێ ڕۆژێک توانایی تۆڵەسەندن لەخۆی‌دا بدۆزێتەوە. بەڵام هاتن و تێکەڵاو بوون لەگەڵ شۆڕش کێشە تاکە کەسییەکەی لێکردە کێشەیەکی گشتی و ئینسانی، لەبیری چووبۆوە چ بڕیارێکی بەخۆی دابوو. ئێستا سەرکردەیەک بوو و پاراستنی گیانی دەیان کەس، ئەرکی سەرشانی، وەدوای تۆڵەی کۆمەڵ کەوتبوو، بەڵام ئەو بە ڕواڵەت منداڵە، ئەو خڕناڵە، تەنیا لە ماوەی دوو سێ ساعەت بە تەواوی هەڵیتەکاندبوو و ئاڵوگۆڕی تازەی بەسەر داهێنابوو، زۆر شتی وەبیر سەرکردە هێنابۆوە کە سەردەمێک سەرکردە بۆ گەیشتن بەو شتانە بوو کە شوێنی ژیانی خۆی جێ هێشتبوو و چاوپۆشی لێکردبوون. بەڵام خڕناڵ وێدەچوو تەنیا لەبەر ئەوەی هاتبوو کە سەرکردە وەدرۆ بخاتەوە. پەیمانەکەی وەبیر بێنێتەوە. سەرکردە لە حاڵی ڕۆیشتنیش‌دا هەر لە ئامێزی گریان دابوو....

***

# ٥٧

...... سۆفیحەسەن دەڵێ کە تەنیا لەبەر بەجێگەیاندنی فەرمایشەکەی ئەوبوو کە گەڕانەوەکەی خۆی پێنج ڕۆژ وەدوا خستبوو. ویستبووی کە بە دەستی پڕەوە بگەڕێتەوە. منداڵانی سەرلانکێشی هەڵنەبواردوە. هەروەها وەدوای خەبەر و باسی ئەو کەسانەش کەوتووە کە ماوەیەکی دوور و درێژە لە سوورەچۆمێ نەماون و هەریەکەی ڕوویان لە لایەکی کردبوو. لە مردوو ڕا بگرە تا زیندوو. لە لەشساغ تا نەخۆش و پەک کەوتە، لە زاوا و لە بووک، لە ورد و درشتیانی کۆڵیوەتەوە. ئەوەندەی هەواڵی تازە کەوتۆتە دەستی کە لە ماوەی تەمەنی حەفتا ساڵەی خۆیدا کە بەشی زۆری لە سوورە چۆمێ تێپەڕیوە تاقە جارێکیش شتی وای نەبیستووە.

دەیتوانی بە ڕاشکاوی بڵێ کە کاک جەلیلی ڕەحیمەسوور گاڕانێکی مانگا و گا هەیە! ئێستا دەیزانی کە پیرۆزەکۆڵ چەندی مریشک و جوجکەو کەڵەباب هەبوو، ڕۆژێ چەند هیلکەیان لەبن هەڵدەگرێتەوە. زانیبووی کە کوڕی دەروێش کەریم کەینەوبەینەی لەگەڵ کچی مامقالە ساز کردووە. دەیتوانی بە دوکتور بڵێ، وەستا عەزیزی دارتاش خانووبەرەیەکی خۆشی لەوبەرچۆم لەنێو ڕەزەکەیدا ساز کردووە. دەیتوانی هەروەها پێی بڵێ، کە کاک ڕەحمانی کوێخا برایم خەریکی سازکردنی هۆڵێکە کە جێی سەدوپەنجا سەر مەڕ و بزن دەبێتەوە. تەنانەت دەیتوانی باسی ئەوەش بکا کە ئێستاش کەژاڵی کوێخا برایم مێردی نەکردووە چونکە وەک دەگێڕنەوە، بەرلەوەی کاوەیس بە دەس براکانی فاتێ بە کوشت بچێ ئامینەشەل بە درۆ بە کەژاڵی کوتبوو کە کاوەیس لە تاوانت شێت بووە نازانی چەندەی تۆ خۆش دەوێ. شەرمی زۆری کاوەیس ئیزنی ناداتێ کە بێ قسەی دڵیت بۆ بکا. ئامین ئەوەندە بە درۆ قسەی کاوەیسی بۆ بردبوو کە کچە شێت و شەیدای

کاوەیس دەکا کە ئەوڕووداوە، ڕوودەدا کەژاڵ کە بەرگی ڕەش لەبەر دەکا ئیتر دایناکەنێتەوە. دەڵێن کوتوویەتی لەپاش نەمانی کاوەیس حەلاڵی دنیام لێ حەرام بێ.

بزەیەک دێتە سەر لێوی سۆفیحەسەن لە دڵی خۆیدا دەڵێ بۆ تەواوبوونی کایەی من و دوکتور ڕەنگە گێڕانەوەی بەسەرهاتی کەژاڵی کوێخا برایم کار ساز بێ. هەروەها سۆفیحەسەن دەیتوانی باسی سەدان شتیتر بکا، کە بەر لەوەی دوکتور ئەم ئەرکەی پێی بسپێرێ، هەرچەند شەو و ڕۆژ لەبەر چاوی بوون و بە پەنایاندا ڕادەبرد هەرگیز تاقە دەنکیشیانی وەبەچاو نەهاتبوو. تا بەر لەو ئەرکەی دوکتور، دەتکوت سۆفی حەسەن لە حاند ئەوشتانە کوێر و کەڕ و لاڵە، سەیر ئەوەیە هەرچەند بە هۆی چەشنی کارەکەی کە مجێوری مزگەوت بوو و لەگەڵ خەڵکی زۆر پێوەندی هەبوو و هەروەک دەلاک و دەلاڵ و بەربووک ئەوەی خەبەر و باسی دنیایە لە لایانە، سۆفیحەسەنیش زۆرزان بوو. بەڵام ئێستا لێی یەقین بوو کە هەمیشە شتەکان لەپشت پەردەیەکی تەماوی خۆیان پێشان داوە، ئەگینا تەواوی ئەوانەی تازە ناسیونی، هەمیشە لەبەرچاوی بوون کە نەیدیون، پرسیاری لە خۆی کردبوو، بڵێی خەڵکی تریش هەر وەکوو من بە چاوی قووچاو ژیان ببەنە سەر؟ ئەگینا چلۆن دەبێ مرۆڤێک ڕۆژێ دەیان جار بە کووچەیەکدا هاتوچۆ بکا، بەڵام ئەو ئاڵوگۆڕانەی کە بەسەر دیوارێک یان درگایەک یان پەنجەرەیەک یان مرۆڤێک کە لە دەوروبەریەتی دادێ وەبەر چاوی نەکەوێ و نەیانبینێ، سۆفیحەسەن ئەودەم کە بەم ڕاستییە گەیشت، هەستی کردبوو کە بەدرێژایی تەمەنی کڵاوی چۆتە سەر، نە تەنیا لەبەر ئەوەی ئەو شتانەی نەدیوە بەڵکوو لەبەر بابەتێکی تر کە نایهەوێ بە هیچ لەونێ باسی بکا هەستی کرد هیچ جیاوازییەک لە نێوان ئەو تاتە بەردەی لە مزگەوتێ هاوینان پێنج فەڕزەی نوێژی لەسەر دەکرد لەگەڵ خۆی دا نابینێ. تازە تێگەیشتووە کە زیندوو بوون تەنیا جووڵانەوە و خواردن و دەردانەوە و نەفەس کێشان نییە، بەڵکوو زیندوو بوون یانی دیتن، یانی حازربوون لەنێو ئەو چرکانەدا کە ئێمەی گەمارۆ داوە و یەک پشوو هەر شتی واقیعیمان لێ دەدزێ و لەگەڵ

خۆی دەیبا و دەیکاتە شتێک بەنێوی مێژوو و بیرەوەری و دەیانداتەوە دەستی ئێمە. زیندووبوون یانی دیتنی هەموو ئەوئاڵوگۆڕانەی کە بێ پسانەوە و بێ بڕانەوە لە هەر سات و کاتێکدا ڕوو دەدا، زیندووبوون یانێ تێکەڵاو بوون لەگەڵ زات و ڕووح و ڕەوانی هەر بوونەوەرێک و سەرهەڵدانەوەی دەم بە دەم لەناویاندا و لەگەڵیاندا تازە بوونەوە و بەردەوام پەیدا کردنی بیچم و ڕوخساری نوێ و تازە، هەر ئەودەم بوو وەبیری هاتەوە کە چ کلاوێکی گەورەی لەسەر خۆی ناوە، کە خۆی ناچار کردووە بە لای هەموو شتێکدا بەبێ ئاوڕدانەوە و دیتنیان تێپەڕیوە. وەک ئەوەی ئەو شتانە هەرگیز نەبوون و نابن، سۆفی لەپڕ وەبیر کاوەیس کەوت ئەودەم کە براکانی فاتێ کەوتبوونە سەری لە ڕێگای خۆی لای دا و بەپەلە خوی گەیاندە پاسگای سەرگردی قازەلاغێ، زۆر لە کانیکەوان دوور نەبوو، دەیتوانی خۆی دەنێو شەڕەکە باوێ بەڵام کە دیتی کوێخا برایم و کوڕەکەی شەڕەکەیان کردە ئی خۆیان، ڕووی کردە پاسگا، لە کاری پاسگا، لە کاری خۆی ڕازی بوو بەڵام ئەودەم کە ژاندرمەکان جەستەی لە خوێندا شەلاڵی کاوەیسیان هەڵگرت کە بیبەن، خۆی وەبیر هاتەوە چەند ڕاحەت ڕاوەستابوو چاوی لێدەکردن. کە کاوەیس و کوێخا برایم و کوڕەکەیان بەڕێ کرد، دەیتوانی لەگەڵیان بچێ، دیارە ژاندرمەکانیش پێیان ناخۆش نەدەبوو کەسێک لە خەڵکی ئاوایی بۆ شاهیدیدان ڕەگەڵیان کەوێ. وەپشتگوێی خست، نەچوو. لە پاشانیش کە ئەو هەموو چارەڕەشییەی یەخەی فاتێی گرتبوو، دەیتوانی کارێک بکا، تکا کارییەک، بەگژداهاتنێک، خۆقەڵس کردنێک، لە قیامەت ترسانێک، ئاخر هیچ هەر نەبێ بەردەستی مامۆستای ئاوایی بوو. خەڵک بە پیاوێکی ژیر و عاقڵیان دەناسی و بڕوایان پێی هەبوو. بەڵام ئەودەم دەتکوت کوێرە و چ نابینێ. لەحاند هەراوقیژەی فاتێ و ئەو زوڵم و زۆرەی لێی دەکرا هەرچەندە ئاگاداریش بوو بێدەنگ ماوە، سۆفیحەسەن پێی سەیر بوو. هەرگیز خۆی بەم چەشنە نەدیبوو، بیری بۆلای ئەوەچوو کە لەوانەیە دوکتور بە ئانقەست ئەم ئەرکەی پێی ئەسپاردبێ. ویستبێتی شتێکی بە چاوی داداتەوە، دەنا دوکتورێکی ئاوا ناودار و بەئەزموون بەو هەموو

داهات و سامانەوە بۆ دەبێ لەپاش ئەو هەموو ساڵانەی لەو ڕووداوە تێپەڕیوە بەسەرهاتی ئەم خەڵکە لەبیر کراوەی کە زۆر جاران بۆخۆیان لە خۆیان ناپرسن، ئەوەندە بۆی گرینگ بووبێت کە چەند جاران تکا بکا.

: «کوڕە! سۆفی حەسەن! لەبیر نەکەی لە وردودرشتیان هەواڵم بۆ بێنیەوە. گەلێ پێم خۆشە بزانم ئەوانەی ئەو سەردەمەی چاوم پێیانکەوتبوو و دواندبوومن ئێستا لەچ حاڵ دان و چییان بەسەر هاتووە؟»

سۆفیحەسەن لەوەی کە زۆر قسە و باسی بۆ دوکتور هێنابوو هەستێکی ڕەزامەندانە ئازای وجوودی داگرتبوو.

: «سۆفی حەسەن! یاخودا بەخێر بێیەوە. زۆرت پێچوو، هەر نیگەرانی ئەوە بووم کە نەکا ئەو دەرمانانەی داومە بە تۆ، ژانی پشتتیان هێدی کردبێ و ئیتر نەگەڕێیەوە.»

: «بە قوربانت بم دوکتور گیان، پشتم زور لەجاران باشترە، شوکری خودا، هەر ئاواش بێ ڕازیم، جار جار لەخۆم پرسیار دەکەم من کە وەبیرم نایە چاکەیەکی گەورەم دەرحەق بە کەس کردبێ. نازانم ئیتر خودا سەبارەت بە کێ تۆی هێنایە سەر ڕێگام؟ من لێرەدا بە مافی خۆمی دەزانم بێئیزن وەرگرتن لە سۆفیحەسەن و دوکتور بەختیار پرسیارێکی خۆم بخەمە ڕوو، کاتێ سۆفیحەسەن دەڵێ نازانم ئیتر خودا سەبارەت بە کێ تۆی هێنایە سەر ڕێگام ئاخۆ سۆفیحەسەن ئاماژەی بە ئەودەمە دەکرد کە بە چەند برایان کەوتبوونە گیانی کاوەیس یان ئاماژەی بە ئێستای دوکتورە، کە چاکەی دەگەڵ دەکا؟ سۆفیحەسەن زۆر شتی لە ئێمە شاردۆتەوە ئەگەر لە ڕاستی بپرسن، سۆفیحەسەن سەوادی خوێندن و نووسینیشی هەیە. سەردەمێک تەواوی گوڵستانی سەعدی لەبەر بوو بە مەسنەوی مەولانادا هاتبۆوە، حافزی شیرازی لەبەر بوو. لەوانەبوو وەک چۆن دەڵێن تەیمووری لەنگ قورئانی ئەوەندە لەبەر بوو کە لە ئاخر ڕا بۆ هەوەڵ دەیخوێندەوە، سۆفیحەسەنیش بتوانێ حافز لە مەقتەعی ڕا بۆ مەتلەعی لەبەر بڵێتەوە، دەیزانی سەعدی لەگوڵستاندا کە دەڵێ:

تۆ نیکی میکن و در دجله انداز   کە ایزد در بیابان دهد باز

من کە دەڵێم ئەوێ ڕۆژێ کە لە پاسگا پێی ڕاگەیاندن، بگەنێ ئەوە خەریکن کاوەیسی خات زڵەخا دەکوژن. هەر ئەوێ دەمیش ئەو ئەرکە کەوتە سەرشانی کە دەبێ ڕۆژێ لەناو دێی سووورە چۆم لە قاو بدا کە ئەوە کاوەیسی خات زڵەخایە زیندوو کرایەوە، من دەڵێم بە پێچەوانەی پرسیارەکەی سۆفی حەسەن لەخۆی، ئەوە سۆفی حەسەنە چاکە لەگەڵ دوکتور دەکا. سۆفیحەسەن پردێکە کە ئیمڕۆی دابڕاوی دوکتور لە دوێنێی لەبیر کراوی گرێ دەداتەوە واتا سۆفی حەسەن کاتالیزۆرێکە کە عەمەلی تێکەڵبوونی دوو چەشنە کەسایەتی، دوو شێوە دیتن و ڕوانین، دوو جۆر ژیانی ئاسایی لەناو چوارچێوەیەکی بچووک لە ژیانێکی تایبەتیدا، لە ناو چوارچێوەیەکی گەورەدا هاسان دەکاتەوە. بەڕای من ئەوە دوکتورە کە دەبێ بڵێ: «نازانم ئیتر خودا لەپاداشتی چی تۆی هێنایە سەر ڕێگام؟» مافی ئەوەم داوە بەخۆم کە زۆرتریشی لەسەر بڕۆم بەڵام لەسەری ناڕۆم تۆ ئەوەندەت چاکە دەرحەق بە من کردووە کە سەرم هەڵێنایە. لە ڕاستیدا ئەگەر بەڵینی ئەوەم نەدابا بە تۆ کە هەواڵ و باس و خەبەرت بۆ بێنمەوە وازم لە عەمەلەکەم دەهێنا و نەدەگەڕامەوە.

: «سۆفی! کارێکی زۆر باشت کرد گەڕایەوە. چون ئەو دەرمانانەی بۆم نووسیبووی تەنیا بۆ ماوەیەکی کورت ژان و ئێشەکەی لە پشتت دەستاند، بە تەواوی ژانەکەی چارەسەر نەدەکرد تەنیا عیلاجی هەر وەک پێشتر پێم کوتووی نەشتەرگەرییە. دەنا تووشی مەترسی زۆر گەورەتر دەبی.»

دیارە سۆفیحەسەن هیچ لەگەڵ بۆچوونەکەی من هاوڕا نییە کە دەڵێ: «ئاخر ئەمن ئەوەندە شەرمەزارم لەحاست تۆ کە نازانم چۆن سپاسی ئەو هەموو چاکەی تۆ بکەم. بەخودا کە بۆ حەلیمی خێزانم گێڕاوە دەیکوت:«ئەتۆ لەبەر دڵی من کە نیگەرانت نەبم ئەو حەکایەتانە لەخۆتەوە ساز دەکەی. دەنا کوا لەو ڕۆژ و ڕۆژگارەدا برای کەس دەرحەق بە براکەی ئەوەندە چاکە دەکا؟»

:«سۆفی! بۆ پێت وایە من کارێکی گەورەم کردووە، من تەنیا ئەرکی خۆم بەجێ گەیاندووە لە ڕاستیدا هەموو دوکتورێک دەبێ بەر لە هەرشت باری

تەندروستی و چاک بوونەوەی نەخۆشەکەی خۆی لەبەر چاو بگریٚ، بۆ گەیشتن بەم مەبەستەش پێویستە جاروبارە لە زۆر شتان چاوپۆشی بکا، هەر ئەو شتانەیە کە مانا دەدەن بە ژیان و ئەوین و مرۆڤایەتی. کەم نەبوون ئەو پسپۆڕو زانایانەی بۆ پاراستنی گیانی ئینسانەکانیتر ئەو داو دەرمانانەی دروستیان کردبوو بۆ جاری هەوەڵ لەسەر خۆیان تاقی کردۆتەوە. تەنانەت تووشی کێشەش بوون و زۆر جار گیانیشیان لە سەری لە دەستداوە. کە وابوو سۆفی! ئەوەندە خۆت ئازار مەدە. من هیچ کارێکی ئەوتۆم دەرحەق بەتۆ نەکردووە، پێم وایە ئەگەر تۆش لە جیاتی من بای هەر ئەو کارەت دەکرد کەمن کردوومە، با واز لەم قسانە بێنین من بۆ چوار ڕۆژ لەوەپێش نۆبەی عەمەلم بۆ گرتبوویەوە. ئێستا هیچ چارەیەک نییە دەبیٚ چەند ڕۆژی تریش چاوەڕوان بی تا نۆرەیەکی ترت بۆ دەگرمەوە. ئەو ماوەیە دانیشە بۆ خۆت بحەسێوە.»

: «ئەگەر ڕاستت بویٚ، دەمتوانی لە کاتی دیاریکراو دا بگەڕێمەوە بەڵام بەر لە هاتنەوەم بیستم کوڕێکی کاک وسێنی جیرانمان لە سابڵاغ دەژی. وەک بیستم لە پاش چەند ساڵان وەدوای خوشکە بەدبەخت و چارە ڕەشەکەی کەوتبوو، کە گۆیا بە نەخۆشی و هەناسە ساردی لەوپەڕی هەژاری و دەسکورتی دەکونە گوڕگێکی لە شاری سەردەشت دەژیان  و وەک دەیانکوت ئەو برا چکۆلەیەی چەند ساڵ لەمەوبەر ئاخری دەیانباتە لای خۆی لە شاری سابڵاغ.  من کە ڕێم دە سەرەدەشت کەوتبوو چوومە لای ئەو خات بەسێیە، کە لەگەڵ فاتێی قوڕبەسەر پێکەوە دەژیان. زۆری بۆ گێڕامەوە لە گەورەیی ڕووحی ئەو ژنە بەشەرەفە. وەک پیاوان کاری دەکرد. لەبەری بەیانەوە هەتا بانگی خەوتنان هەر بە پێوە بوو بەڵام دەیکوت لەو ئاخریانەدا پشتئێشەی پێوە نووسا کە لەسەر پێیان ڕانەدەوەستا، غەفوورەگێڕێک هەیە کە دەیبەنە لای وای پێلاقە بە پشتی دادەدا کە بۆ هەمیشە کۆڵەواری دەکا، من کە ئەوانە و زۆر شتی ترم لە خات بەسیٚ بیست، لێبڕام بچمە سابڵاغ سەردانێکیان بکەم. لە ڕووی نیشانەیەکی کە لە خاڵیانم وەرگرتبوو دۆزیمنەوە.»

سۆفیحەسەن کە  یەکبین قسەی دەکرد، لەپڕ دیتی کە دوکتور ڕەنگی بەڕوویەوە نەماوە، هەر ئیشک ببوو، هەر وەک مار پێوەی دابێ. بۆ زۆر دوور دەیڕوانی. سۆفی بە درێژایی تەمەنی نەیدیبوو کەس بەم شێوەیە ڕەنگی پەڕیبێ و ئیشک هەڵاتبێ.

: «دوکتور گیان! بۆ وات لێهات؟ ناسازی؟ بچم چۆڕێکت ئاو بۆ بێنم؟»

سۆفی بۆلای دوکتور چوو، دوکتور لەوێ نەبوو کە پیلی کێشا، پیلی مردوویەکی بێ هەست و نەست، تێ مابوو چ بکا؟ هیچی لەدەست نەدەهات. تەنیا توانی ئەوەندەی یارمەتی بدا کە لەسەر کورسیلەیەکی دابنێ. سۆفی ببوو بە دوکتور و دوکتور ببووە نەخۆشەکەی. پەرداخێکی ئاو بۆ هێنا و دایە دەستی، بە هەر جۆرێک بوو دەرخواردی دا، ئیتر سۆفیحەسەن گومانی نەمابوو کە کاتی تەواو بوونی کایەکەی ئەو و دوکتور هاتووە. کە بە قسەکانی خۆیدا هاتەوە گومانی نەمابوو کە ڕازی تێکچوونی حاڵی دوکتور، فاتێیە.  سۆفیحەسەن ئێستاش جارجارە وەسەر شک دەکەوت.

: «نا، هەرگیز، مەحاڵە، شتی وا  ڕێی تێناچێ. ئاخر چلۆن دەکرێ شتیوا ڕوو بدا. ئەوە ڕاستە هەموو کارێک بە دەست خودایە، ئەوەش ڕاستە بە قوربانی خودا بم هەموو کارێکی ناکا. کاری خودا حیکمەتی تێدایە ئاخر لە دوای سیوچەند ساڵ بڵێی ئەوە خۆی بێ؟ کاوەیس بێ؟

سۆفیحەسەن، بە پەلە بێ ئەوەی گوێ بداتە تەندروستی خۆی، بە داڵانە تەنگ و تاریکەکانی نێو زەینیدا ڕۆچووە خوار چاوی لەسەر دوکتور هەڵنەدەگرت، دوکتورێکی زانای بەناوبانگ، بە سەروسیمایەکی زۆر جوان و بە ویقار کە لە کاتی قسەکردندا هەرگیز پێت خۆش نییە چاو لەسەر سیمای وێچووی هەڵگری، ئێستا وەها سست و بێحاڵ بووە، بۆت نائاشنایە، لە حاڵەتێکی خەلسە و جەزبە دایە، لە نێوان خەون و بێداریدا لە حاڵی پێداچوونەوە و بەسەرکردنەوەی سەر لە نوێی هەزاران شتدا کە بە ئانقەست خۆیان لێ نەبان بکەی. نیشان بدەی کە ناتهەوێن. بەڵام فرێشیان نەدەی.

سۆفی بە پەلە سەفەرێکی دەروونی دەس پێکرد، هەرچی دوورتر و قووڵتر دەڕۆیی ئاڵوگۆڕی زۆرتر بەسەر خۆی و سیمای خۆیدا دەهێنا. تاکوو خۆی هێنایە سەردەمی لاوی، لاوێکی واش نا، هەڵەیە، لەویٚ نەبوو، پیاوێکی تەواو پیاو، عاقڵ و ژیر و بەمشوور، سەری بەماڵی دەروجیرانانٚدا دەکرد. ئەوانەی دەیناسین، دەیبردنەوە سەردەمی منداڵیان، وردە وردە گەورەی دەکردنەوە، مێر منداڵی، لاوی، ئینجا گەورە گەورەی دەکردەوە. لەپڕ لەسەر یەکێکیان لەنگەری دەگرت، سەرنجی دەدایە. ئەریٚ ڕاست بۆ خۆیەتی؟ بەڵیٚ، بیٚگومان بۆ خۆیەتی. بەلام ئاخر چۆن شتی وا دەگونجیٚ؟ باوەڕ پێنەکردنی زۆر هاسانترە لە باوەڕپێکردنی، نا، نا، نابیٚ، ڕەنگە من بە هەڵە چووبێتم. بیٚشک ئەوە منم کە زەینم کوێر بۆتەوە. من سەرجەم ڕوخسارەکانی ئەو سەردەمم لێک داوەتەوە، تێکەلاوی یەکتریم کردوون، چما شتی وا هەر دەقەومیٚ؟ ئەی چۆنە تا ئێستا هیچ جووڵەیەک، پرسیارێک، وەدوا کەوتنێک، سەردانێک، مەگین دەلویٚ کەسێک بۆ دەیان ساڵ بەبیٚ ڕابردوو، بەبیٚ بیرەوەری، بەبیٚ هیچ مێژوویەکی ژیانی چاوپۆشی لە خۆی کردبیٚ؟ مەگین دەکریٚ مرۆڤێک لە هەزاران ڕەنگی تایبەت، هەزاران دەنگی تایبەت، هەزاران نەخش ونیگاری تایبەت، هەزاران هەست و ئیحساسی تایبەت، هەزاران تام وچێژی ئاشنا، هەزاران بۆنوبەرامەی تایبەت کە تان و پۆی وجوودی ئەو کەسەیان پێک هێناوە، سازیان کردووە، فۆڕم و بیچم و ڕوخسار و کەسایەتیەکی تایبەتیان پیٚ بەخشیوە، لەپڕ واز بێنیٚ و ببێتە شتێکیتر، کەسێکیتر، نائاشنایەکیتر، شتێکی بەراوەژوو، نامۆ و غەریب، شتێکی لە چەشنی سێبەر و نیسیٚ، کە هەرچەندە بە مرۆڤەوە دەنووسیٚ و لەگەڵ بچووکترین جووڵەی دەجووڵێتەوە، لەگەڵ هەستانی هەڵدەستیٚ. لەگەڵ هاتنە دەرێی دێتە دەریٚ لەگەڵ چوونە ژووری دەچێتە ژوور، بەلام نە ڕەنگی تۆی هەیە، نە دەنگی تۆ و نە هەمیشە شکڵ و قەوارەی تۆ، هەرچەند ئی تۆیە بەلام فەرمانبەری تۆ نییە، بە کەیفی خۆی یان بە کەیفی ساتوکات. وێک دێتەوە، لێک دەکێشێتەوە، قەڵەو دەبێتەوە، کز و لاواز دەبێتەوە و پەکی بە تۆ کە خاوەنی ئەوی، ناکەویٚ، کە وابوو چلۆن دەکریٚ شتیوا ڕوو بدا،

یانی دەگونجێ کەسێک ماوەی سی‌وچەند ساڵ خۆی لە خۆی و بیرەوەرییەکانی بشارێتەوە؟

سۆفی‌حەسەن لێبڕا سەرلەنوێ ڕووی باسەکە لە فاتێ و براکەی بکاتەوە.

ڕووی کردە دوکتور: «دوکتور گیان! پێت خۆشە بێدەنگ بم و چیتر نەڵێم؟»

دوکتور کە وردە وردە دەگەڕاوە سەر خۆی و خۆی دەدیتەوە بزەیەکی سەیری هاتە سەر لێو، کە سۆفی هیچی لێ هەڵنەکڕاند، چون بە درێژایی تەمەنی هەرگیز بزەیەکی ئاوا بێ جێی چاو پێنەکەوتبوو.

:«سۆفی! ببوورە کەمێک حاڵم تێک چوو. جارێ تۆ تاوێک بحەسێوە، ئیشاڵڵا شەوێ دادەنیشین، تێروتەسەل قسە دەکەین.»

: «بە قوربانت بم چۆنت پێ باشە وا دەکەین، تا دەگەڕێیەوە دەچمە نێو باخچەکە.»

دوکتور کە لە ماڵێ وەدەر کەوت، دوکتورەکەی جاران نەبوو، سۆفی حەسەنیش کەوتبوو ململانێ لەگەڵ زەینی خۆی، تا ناچاری بکا ڕوونترین و ئاشکراترین وێنەکانی ڕابردووی کاوەیسی بۆ زیندوو بکاتەوە....

❊❊❊

# ٥٨

..... من کە تازە پێم نابووە حەڤدە، لە ڕاستیدا هەر چاردەم دەنواند ئەگەر کەریم یان هەمان خڕنالی سەرکردەتان لە یادمابێ، هەر بە قەرا ئەو دەبووم و نەدەبووم. دەتوانم بە ڕاشکاوی ئەوە بڵێم لە چاو ئەزموون و ئاکار و ڕەوشتی هاوتەمەنەکانی خۆم، من زۆر وەدوا کەوتوو و سادە و خاو و دەستوپێ سپیلکە مابوومەوە. من کە سەردەمانێک لەگەڵ عەلیلە و قالە و نازێ و نیۆتۆن و ئەوانیتر دنیامان لەسەر سەرمان دادەنا و دەمانسووڕاندەوە هەڵبەت ئەودەم نیۆتۆن پێی کوتبووین چۆن خۆمان لە داوی جازیبەی زەوی ڕزگار کەین و دنیا لەسەر سەرمان دابنێین و بیسووڕێنین تا سەرەگێژەی دەگرت و لەپڕ تەپ فڕێمان دەداوە نێو جازیبەکەی خۆی، من کە سەردەمێک بە دمدمخوێنە زۆرترین خوێنم لە لووتم دەڕشت و هەموانم دەبەزاند، من کە سەردەمێک هیچ کەرێک نەبوو کە بە نەقیزە تێکوتانی من فێری جووتە هاویشتن نەبێ، من کە ئاساییترین کایەی ڕۆژانەم گرتنی ژەنگە سوورە و زەرگەتە و مارمێلکە و فەرخەباشوو و بێچووە ڕێوی بوو، ئێستا لەم شارە کەوتبوومە حال و وەزعێک کە مێش لەبەر دەمم هەڵنەدەفڕین، دەتکوت لەو دەمەیڕا کە لە عەلیلە و قالە و نازێ هەڵبڕام ئیتر من لەعەینی عیشق دامامەوە و لە خۆشم هەڵبڕام، هەڵدان و گەشە سەندنم، چەوتی تێکەوت، هەروەک مرۆڤیتر، ڕۆژ و مانگ و ساڵم تێپەڕ دەکرد. بەڵام بە پێچەوانەی ئەوان کە لەگەڵ ڕەوتی زەمان گەورە دەبوون و دنیای مندالانەی خۆیان بەجێ دەهێشت، ئەمن دەتکوت لەو سەری ڕا بەرەو منداڵی دەگەڕێمەوە، هەروا بە هەست و بیر و ئاکارێکی مندالانە دەژیام. وەک ئەوەی ئەو ساڵانەی دوایی تەمەنم لەنێو شووشە بەندێک و بێپێوەندی لەگەڵ ڕاستەقینەکانی دەوروبەرم ژیاوم. کەم ئەزموون و خۆش

باوەڕ، دەمویست وانەبم بەڵام وابووم، دەتکوت یەکێ لەو دێوە بێ ڕەزایانەی حەکایەتەکانی قەدیم دەستی لە سەرم داناوە و بە هەموو هێز و توانای خۆی بەرەو خوار پاڵم پێوەدەنێ تابچووک و بچووکترم بکا. هەرچی زۆرتر تیغم بە ڕوومەتم دادێنا. چما دەنکەموویەکیش بۆ دڵخۆشی من سەری دەردێنا؟ لەچاو هاوپۆلەکانم ئەوەندە کورتە باڵا و نابووتە و لەڕولاواز بووم وەک برا چکۆلەی یەکێ لەوان دەچووم کە دایکی لە ماڵ نەبووە و ناچار لەگەڵ خۆی هێناویەتە مەرەسە. تا لەبەر چاوی بێ! زۆرتر وەک شاگردێکی پۆلی یەکەم دەچووم کە چووبێ لە پۆلی شەش دانیشتبێ. هەر لەبەر ئەوەش هیچ کام لە هاوکلاسییەکانم نەدەبوونە ئاواڵم، هەرکە دەهاتم قسەیەکیان لەگەڵ بکەم. زوو بەگژم دادەهاتن: «برۆ ئەو لای ڕۆڵە. ئەتۆ ئیدی خۆت تێکەڵی پیاوان مەکە.»

که دەمدیتن چ پەلە پەلێکیان هەیە بۆ ئەوەی زوو زەنگ لێبدرێ و بە هەڵاتن خۆ بگەیەننە سەر ڕێگای ئەو کچە قوتابیانەی لە مەدرەسەی ڕا دەچنەوە ماڵ و من ئەو هەستەم نەبوو، هەموو جارێ بەخۆم دا دەشکامەوە، ئەگەر لە ڕاستی بپرسن، منیش بە دزی چەند جارێک چوومە سەر ڕێگای کچان، بەڵام بەداخەوە هەرە دزێوەکەشیان ئاوڕێکی لێ نەدامەوە، لەوانەیە لە دڵە خۆیاندا کوتبێتیان: «دەڵێی ئاخر زەمانە، منداڵەورکەش دێنە سەر ڕێگای ئێمە!»

تەنیا، تەنیایی بوو کە ئەو دەم منی لەبیر نەکرد و هەمیشە بەسەری دەکردمەوە، ڕێک لەو دەمانە دابوو، ئەودەمانەی کە من لە دنیای بێ خەبەری و منداڵانەی خۆمدا نوقم ببووم کە لە پڕهەلووکێک، جارێکیتر کەوی و دەستەمۆی نازێی کردم. دیسان کەوتمەوە سەر ڕێگای ئەو، واتە سەر ڕێگای عیشق و ئەوین، ئێستا بە ڕاشکاوی دەتوانم بڵێم کە عیشق موعجیزەگەرە، عیشق گیانبەخشە، عیشق گیانئەستێنە، عیشق بەدیهێنەرە، عیشق خوایە، لە تەوڕاتدا لەبری «هەوەڵێ کەلیمە هەبوو و کەلیمە خودابوو، » دەبوو بڵێ: هەوەڵێ عیشق هەبوو و عیشق خودابوو، عیشق هەم ڕووخێنەرە و هەمیش سازکەرە، عیشق ژیانە و عیشق نەمانە، ئاوە

حەیاتەکەیە کە ئەسکەندەری جووت قۆشە بە شوێنیدا ڕووی کەوتە تاریکستان، ڕەنگە هەرکەسێک بەختی پێی کوتبێ کە «نەی‌نامە»کەی مەولەوی بخوێنێتەوە، تێدەگا باسی چی دەکەم، دەمهەوێ باسی ئەوە بکەم کە نازێ وێنەی عیشق نەبوو، بەڵکوو خودی خۆی بوو. عیشقێکی بێ‌نیهایەت و بێ‌سنوور، بەر لەهەر شت گڕی تێبەردام. لەو گڕانەی ئیبراهیم ئەزموونی کرد و پێی هەڵکشا، لەو گڕو ئاگرانە کە قاڵت دەکات، دەتتوێنێتەوە، سەرەتا دەتکاتەوە بە هیچ، هیچێکی بێ‌فورم و بێ شکڵ و بێ‌وجوود، بەڵام هەرکە بووی بە هیچ، شک مەکە ئیتر بوویە شتێک، ئینجا لە قالبێکی نوێت دەدا. لە قاڵبی عیشق، کە خۆیەتی ئینجا وردە وردە تۆ فۆڕم دەگری. شێوە و ڕوخسار پەیدا دەکەی، هەست و ئیحساس و عاتیفە پەیدا دەکەی، جا ئەودەمەیە کە تۆ لە دایک دەبێ، لە دایکی ڕاستەقینەت. لەدایکی هەستی و هەستانەوە. لە دایکی هەبوون و هەرمان. بۆ خۆت تازەدەبی بەشتێک، ئەودەمەیە کە تۆش دەبی بە خۆت، نەخۆیەکی بەستراو بە هەر کەسێک و هەرشتێک و هەر شوێنێک و هەرکاتێکەوە، بەڵکوو بە خۆی خۆتەوە، تەنانەت ئەگەر هیچ کەسیش تۆی نەویست. تۆ هەر خۆت بۆ دەمێنێتەوە، باوەڕ پەیدا دەکەی، کاژ داوێێ، تۆێژ فڕی دەدەی، توێخێک نا، دوان‌نا، سێ‌نا، چوار، پێنج، شەش، نا، حەوت، بڵێ حەوت تۆێخ فڕی دەدەی. بەحەوت ئاوان دەشۆرێیەوە، حەوت شاری کەس پێ‌نەزان دەتەقێنیەوە، لە حەوت تەبەقەی ئاسمان تێدەدەپەڕی، جا ئەو دەمە کە تۆ خۆتی خۆتی خۆتی، عاشقی نازێ، ئیتر تۆش گەورەبووی، جا ئەودەمە کە باڵادەکەی، وەبەر چاوان دەکەوی، زۆر کۆتری چاو دێنە نێو هێلانەی چاوەکانتەوە. بەڵام لەو ماوەیەدا کە من و نازێ لێک هەڵبڕاین. نازێ لە شاردا زۆر جوانتر بووە، ئەوەندە جوان کە بۆ خۆی لەدەست جوانییەکەی وەڕەز بووە و قەدری جوانییەکەی خۆی بۆ ڕاناگیرێ. هەر کەسێک تەنانەت ئەگەر کەسیش نەبێ کە پێی هەڵدەڵێ. بە دەمی پێدەکەنێ، هەرکەس کە وەدوای دەکەوێ، خێسەیەکی دەداتێ و بزەیەکیش ئاوێتەی. هەرکەس داواکاریەتی وەختە بەڵێی بۆ بڵێ کە کەمیش نین ئەو کەسانە و هەموو ئەو شتانەیە کە ئازارم دەدەن، چ ئازارێک؟

دەڵێم: «نازێ گیان! بۆ لە حاڵ و ڕۆژی خۆتان ئاگادارم ناکەی؟ ئەرێ پێم بڵێ لە عەلیلە چ خەبەر؟ لە کوێیە؟ هیچ دەزانی چەند ساڵە کە چاوم پێی نەکەوتووە؟ دەزانی چەندە بە ئاواتم جارێکیتری ببینمەوە، ڕاستی خات فاتێ چۆنە؟ پشتی باشتر بووە؟ لە خوشک و براکانیترت چ خەبەر؟»

وڵامی هەموو ئەو پرسیارانەی لە نازێم کرد نازێی جارانی خۆم، تەنیا بزەیەکی تەوساوی بوو کە کاتێکی زۆری خایاند تا بتوانیم لێکی بدەمەوە، ئەودەم ئیتر چم لە دەست نەدەهات. هەرچی ئەمن زۆرتر دەبم بە نیاز، ئەو زۆرتر دەبێتە ناز، چ نازێک! نازی نازێ، نازیلەی جارانم بێ ڕابردوویە، شار لە دوێنێی سڕیوەتەوە. خۆشی یارمەتی داوە. نامناسێتەوە، هەرچی زۆرتر بیرەوەرییەکانی دوێنێ وەبیر دێنمەوە، زۆرتر نێوچاوانی تێک دەنێ تا سنووری مۆن بوون.»

دەڵێ: «تۆ! بە هەڵەچووی، زگم بەتۆ سووتا ئەوێ ڕۆژێ کە وەدوام کەوتبووی قسەم دەگەڵ کردی. دەنا ئێمە هەرگیز ماڵمان لە سەردەشت نەبووە. داخودا منت لەگەڵ کێ لێ تێک چووە.»

: «ڕاست ناکا.»

پێم دەڵێ: «من هەرگیز برایەکەم بە نێوی عەلیلە نەبووە.»

: «درۆ دەکا.»

: «دەڵێ ئەوکەسەی ناوی دێنی، نازانم کێت گوت، قالەیە، مالەیە هەرچی هەیە هەر ئێستا کە ناوێم لە تۆ بیست، تۆ بڵێ کێیە؟ دێوە؟ درنجە؟ جندۆکەیە؟ نایناسم.»

: «بەڵام دەزانم خۆی لێ گێل کردووم، خەریکە من فریو بدا.»

دەڵێ: «دایکم نێوی فاتێ نییە، نێوی دایکم توورانە، توورانە عەجەمی پێ دەڵێن و هەرگیز پشتی نەهێشاوە.»

دەڵێم: «نازێ گیان! لەبیرت چۆتەوە ئەوێ ڕۆژێ کەمانگا بەڵەکەکەی ماڵی حاجی محەممەد چلۆنی شەقۆن تێهەڵدای؟ چۆن کەوتی و سەرت شکا، من هەر ئێستا دەتوانم جێگەی برینەکەی ئەودەمیشت پێشان بدەم، ئەودەم تۆ زۆر گریای، منیش زۆرم زگ پێت سووتا، پێم خۆش بوو دەستت بگرمە

نێو دەستم، نەمدەوێرا، دەترسام نەکا دەست نەدەیە دەستم، سەرت خوێناوی ببوو کە دەستم بەسەرت داهێنا، ئیتر خۆم بۆ ڕانەگیرا، دەستم گرتی، ژێرم کردییەوە، تۆم بردە سەر شێخمەولانا لە خۆڵی ئەوێم بەسەر برینەکەت داکرد. تۆ ئێستا دەستت بەرنەدابووم. تاقڕانی‌یەکەی خەرجی ڕۆژانەم هەر پێبوو، ئێستا خۆمم لەکۆڵ نەکردبۆوە، دامنابوو چەند وێنە بەرگەردانی پێ‌بکرم و لە ڕووبەرگی کتێبەکانمی بدەم، دەمویست چاوبزی قالە و عەلیلەی بدەم. بەڵام هەر لەبەر تۆ وازم لەو هەموو خۆشییانە هێنا. قڕانەکەم دا بە بەلالووک، شان بە شانی یەکتر لە پەنای سەرچاوەخواردمان و هەموو دەنکەکانمان دەنێو ئاوی سەرچاوەکە هاویشت تا ماسییەکانی نێو سەرچاوەی پێ فریو دەین و وەهاتووچۆیەکی بە پەلەیان بخەین و ئێمەش پێیان بترقێینەوە، لە بیرتە دوور و نیزیکی ماڵە خۆتان کەعەلیلە وەدەرکەوت هەرکە دەستی تۆی دە دەستی مندا دیت چەند سەیر سڵەمیەوە. بەڵام تۆ کە هەمیشە زیت و وریا و زیرەک بووی لەپڕ لە پرمەی گریانتدا،

: «نازێ! چ ڕووی داوە. بڵێ بزانم بۆ وا دەگری؟»

بۆت گێڕاوە چۆن سەرت شکاوە، چۆنم یارمەتی داوی و بە خۆڵی سەر شێخمەولانا پێش خوێنەکەتم گرتووە. عەلیلە چاوی سپاسی لەمن بڕیبوو، تۆش لە بنەوە زوو زوو چاوت لێدادەگرتم.»

نازێ دەڵێ: «چیرۆکێکی خۆشت ساز کردووە، خۆزگە بۆ من ڕووی دابا.

ملنادا کە دەمناسی. دەیهەوێ منیش هەروەک ئەو بەشێک لە خۆشترین و بەتاموچێژترین بیرەوەرییەکانم لە سەتڵی زبڵ باوێم. بەڵام من ئەو کارەم لێ ناوەشێتەوە من ئێستا بەشێکم لە وجوودی نازێ، عەلیلە، قالە، خات فاتێ، خات بەسێ، نیۆتۆن، ئاغای «قاف» حاجی محەممەد، کەریم، بووکهەنار؛ گوڵەشێت، بووک نازێ و مانگا بەڵەک، مریشکە زەنجیری ماڵە نازێ. شێرە شێرە سەگەکەی هەباسە شوان و پشیلە ڕەشەکەی ماڵەغەفوورەگێڕی. ئێستا چۆن منیش بەشێکم لە وجوودی هەموویان، هەر بۆیە من کە وەخەبەرم هەموویان هەن و دەجووڵێنەوە وەکایە دێن و گیانیان دێتە بەر و هەرکە وەخەبەر نیم. لەجووڵە و لە کایە و لە بوونیان بێ بەش دەبن ئێستاش نازێ

دەیهەوێ، بۆ ئەوەی هەمان نازێی جاران نەبێ. بەتاڵم بکا لە خۆم و دەسکورت و هەژارم بکا. بێ مێژوو بمێنمەوە هەر وەک ئەوەی بە هەڵکەوت لەپڕ لە شوێنێک لە خۆڕا هەروەک کارگێک هەڵتۆقیبێم. من و نازێ دووسەری یەک کێشەی هەمیشەیی و هەتا هەتایین. هاوبەشین لەم کێشە و کایەدا. من لە دوێنێدا دەژیم، ئەویش لە سبەی مندا، من لەو دەدوێم و ئەو لە خۆی، نە ئەو خۆیەی من ناسیبووم، بەڵکوو ئەو خۆیەی کەدەیهەویست ئێستا بیناسم. من نەمدەتوانی واز لە ڕابردووم بێنم. زۆر لە کێشەکانی دوێنێی خۆم کۆڵ کێش کردبوون و لەگەڵ خۆم هێنابوومنە ئیمڕۆ کە چارەسەریان بکەم، یەکیان خودی نازێ بوو. من نازێم بە گیان و دڵ خۆش دەویست. نازێ بۆ من تامی ترێ ڕەشەی ڕەزی حەمە قالیلی هەبوو. تامی هەرمێ کڕووزەکەی، بەلالووکەکەی، تامی توودڕکی پەرژینی ڕەزەکانی دەدا، تامی هەنجیر و گێوژەکەی، تامی نانی حاجی لەگ لەگ. تامی خۆڵەکەی شێخ مەولانا، تامی لەتکە سێوەکانی مالی حاجی محەممەدی، بریشکە و گەزۆ، تامی گوێزە شاراوەکانی نێو سینگ و بەرۆکی بووک نازێ و لەرزینی زۆر خۆش و لە پڕی کادێنی ماله حاجی محەممەد لەکاتی خۆشارنەوەکەمان دەدا، بەڵام بۆ نازێ سبەییانی وازهێنان و لەبیر بردنەوەی ئەو کونەگورگەی تێیدا دەژیان، یانی وازهێنان لە برسییەتی و چارە ڕەشی و کڵفەتی کردن بۆ دووگرووبان یانی وازهێنان لە نازێی دوێنێ و منی ئەمڕۆ.

❊❊❊

# ٥٩

....... بەرلەوەی تەرمی کەریم بگاتە ناوچەی بارزان، چیرۆکی قارەمانەییەکەی ڕێگایەکی زۆرتری بڕیبوو و خۆی گەیاندبووە پانتایی خاکی کوردستانی ژێردەسەڵاتی «مەلا». لە زۆربەی بەرەکانی شەڕ هێزی پێشمەرگە لە سەرکەوتن دابوو، چیرۆکی لاوێکی کورد بە نێوی خڕناڵ کە وازی لە گیانی خۆی هێنا تا جەهەندەمێک بەرپا بکا بۆ هێزەکانی بەعس و بەکرێگیراوانی کە لە ژێر سێبەری ئەم ئاگرەدا دەیان پێشمەرگەی حاسێ بتوانن خۆیان نەتەنیا ڕزگار بکەن بگرە زەبرێکی گرچووبڕیش لە هێزی دوژمن بدەن و ناچار بە هەڵاتن و پاشەکەشەیان بکەن چیرۆکێک نەبوو کە زوو لەبیر بچێتەوە. هەر ڕۆژی کە تێدەپەڕی، شاخ و باڵێکی پتری لێدەنرا. ئەم چیرۆکە زۆر زوو سنووری بەزاند و لە شار و گوندەکانی تریشدا دەنگی دآیەوە. خڕناڵ ببوو بە قارەمانێکی نەتەوەیی. مەلا مستەفا ناردی لە دووی سەرکردە تا ڕووداوەکە لە زمانی ئەو ببیسێ، باقی بۆ هەموو شوێن و جێگایەک لەگەڵ سەرکردە بوو. وردە وردە بەشێک لە ڕووحی قارەمانەتی و لە خۆبردوویی کەریمیان بە باقیەوە چەسپاند. لە هەموو جێگەیەکەوە دەنگۆ کەوت کە دوولاوی کورد بە بەختکردنی گیانیان، توانیان بواری سەرکەوتنێکی قارەمانانە بۆ هێزی گەمارۆدراوی پێشمەرگە ساز بکەن، سەرکەوتنێکی ئەوەندە گەورە و بەشکۆ کە خوتخوتەی خستۆتە نێو دڵی بەعسییەکان، هێزی پێشمەرگە بە دوای فیداکاری ئەو دوو لاوە کوردە وەها هێزی دوژمنیان بە دەیان تۆپ و چەکی قورسەوە تێک شکاندووە کە تەنانەت نەیانتوانیوە ئاوڕ لە کوژراو و بریندارەکانیشیان بدەنەوە، ئەوەی لەگەڵ خۆیان هێنابوو، لە ترسی گیانیان بەجێیان هێشتووە.

لەو بەینەدا ڕوخسارێکی ئوستوورەیی و ئەفسانەیی‌یان دەدا بە کەریم کە چلۆن لە حاڵێک‌دا، لە هەرلاوە بارانی ئاگروگوللەی بەسەردا دەباری، بەبێ ترس‌خۆی دەگەیەنێتە نێو جەرگی هێزی بەعس و ئاگر لە هەموو شتێکیان بەردەدا، خەڵک دەیکوت: «گولله کاری لە خڕناڵ نەدەکرد.»

دەیانکوت: «کە وەسینگی دەکەوت، لەپشتی دەهاتە دەرودەسبەجێ برینەکەی چاک دەبۆوە.»

دەیانکوت: «دیتوومانە بۆ ئەوەی زراوی داگیرکەران بتۆقێنێ بە دەستی گوللەکانی دوژمنی دەگرتەوە.»

هێرش‌کەران کە لە دیتنی خڕناڵ بەو قەڵافەتە بچووکە و بەو هێزە ئاسمانییەی سەریان سوڕ مابوو. تا بێن و بزانن چ قەوماوە، لە سێ لاوە دەکەونە ژێر زەبری گورچووبڕی هێزی پێشمەرگە. بە داخەوە – ئەوە ئیتر قسەی من نییە قسەی خەڵکە- ئیتر هێزی بەعس کاریان بەپێشمەرگەکان نەدابوو بە هەموویان کەوتبوونە سەر خڕناڵ و لەتوپەتی دەکەن، بەختەوەرانە یەکێک لەو دوو لاوەمان زیندوو دەمێنێ، «باقی»مان زیندوو ماوە.

–لێرەڕا قسەی خۆمە نەک هی خەڵک – باقی بە قەرا کەریم نێوبانگی دەرکردبوو، چیرۆکیان بۆ ئەویش ساز کردبوو ببوو بەقارەمانێک تای نەبوو. یەک بۆی دروست کردبوو کەباقی دوای چوونی خڕناڵ – هەڵبەت لە بیر نەکەین ئەودەم هەموو کەس لە زمان سەرکردە کەریمی بە خڕناڵ دەناسی، تەنیا باقی دەیزانی کە سەرکردە ئەم نێوەی داوەتێ و نێوی ڕاستەقینەی خۆی کەریمە- بۆ ئاگر تێبەردانی ویشکەڵانەکە، دەچێتە یارمەتی خڕناڵ کە لەگەڵ تەرمی بێ‌گیانی خڕناڵ بەرەوڕوو دەبێ. ئەوە باقی بوو بۆ ئەوەی تۆڵەی ئاواڵەکەی لە بەعسییەکان بکاتەوە ویشکەڵانەکەی ئاگر تێبەردەدا و تەرمی خڕناڵ دەخاتە سەر شانی و لە سووتانی ڕزگار دەکا. تاقمێک دەیانکوت: «خڕناڵ و باقی بە یەکەوە چوون ئاور لە ویشکەڵانەکە بەردەن چون هێشتا نەگەیبوونە ویشکەڵانەکە خڕناڵ دەپێکرێ، ئەوە باقی بوو کە گیانی خۆی لە مەترسی هاویشتبوو و گڕی خستە گیانی هێزەکەی بەعس.»

ئەو قسانە کە بە گوێی باقی گەیشتەوە، لەپێش‌دا، ڕووداوەکانی هەر ئەو جۆرە کەڕووی دابوو دەگێڕاوە، بەڵام لە دواییدا پێی خۆش بوو دەورێکی بەرچاو لەم شانۆیەدا بدا بەخۆی. لە زۆر جێگە کە بەسەرهاتەکەی دەگێڕاوە، ئەگەر سەرکردە لەوێ نەبوایە، خۆی دەکردە قارەمانەکە و خڕناڵی دەکردە بەردەستی خۆی، کە تەنیا باروئەرکی ئەوی قورستر کردبوو و ئاخری گیانیشی لە بەر دەستوپێ‌سپیلکەیی تێداچووبوو، زۆر گوێی نەدەدا بە ڕێنوێنیەکانی ئەو!

دەیکوت: «خڕناڵ لە بەر ترسی لە ڕادەبەدەر و ساویلکەیی خۆی بە کوشت دا.»

گۆیا بە قسەی باقی نەکردبوو، هێندێک لاسار و سەربزێو بوو. بەڵام لە بەرانبەردا ئەوە باقی بوو لە حالێکدا تەرمی خڕناڵی بە کوڵ دەکێشێ. ویشکەڵانەکەشی ئاگر دابوو و گیانی دەیان کەسی پاراستبوو. وردە وردە باقی وەها چوو بوو لە پێستی تازەیەوە کە خۆی ناچار دەدیت هەر ڕۆژەی چیرۆکێکی تازە بۆخۆی ساز بکا کە جاری وابوو تەواو لەگەڵ چیرۆکەکەی ڕۆژی پێشتر جیاوازی هەبوو. لەم کایەدا باقی بە تەواوی لە خۆی گوڕابوو، باشترە بڵێین بە تەواوی خۆی دۆڕاندبوو. مەلا مستەفا کە چۆنیەتی ڕووداوەکەی لە زمان سەرکردە بیست، ئەمری کرد سەرکردە و چەند کەسێکی‌تر کە یەکیان، حەسەنی مامی کەریم بوو بە نهێنی بڕۆنە سەردەشت و چیرۆکی قارەمانەتی و مەردئازایەتی کەریم و هەروەها سەرەخۆشی مەلا مستەفا بە بنەماڵەکەی ڕابگەیەنین و تا ئەو جێگەیە کە لە دەستیان دێ دڵخۆشی دایک و بابی بدەنەوە کە توانیویانە وەها قارەمانێکی فیداکار و گیانباز پێبگەیەنن و پێشکێشی نەتەوەکەیان بکەن. باقی کە لەم ڕۆژانەدا بەڕاستی لە پێستی قارەمانێک‌دا لە هەموو شوێن و جێگەیەک ڕێز و حورمەتی دەدیت. پێی خۆش نەبوو بگەڕێتەوە، بەڵام دەستووری «مەلا» دەبوو جێ‌بەجی بکرێ، بە ناچار ملی نا، بەڵام لە دەروون‌دا وەها هەڵمسابوو کە پێی عەرزی نەدەگرت، خۆی دەدیت کەچلۆن لە سەردەشت هەموو کەس بە قامک ئیشارەی پێدەکەن و بە یەکتری دەناسێنن. خۆی لەنێو کۆڕی

لاوان‌دا دەدیت کە چلۆن گوێیان هەڵخستووە بۆ بەسەرهاتەکەی. بۆی دەگێڕانەوە کە چۆن لە کاتی پەڕینەوە لە سنوور هێندەی نەمابوو کە کەریم بە کوشتنیان بدا ئەگەر بوێری و ئازایەتی لە ڕادەبەدەری باقی نەبوایە. لەوانە بوو ئێستا لە تەبەقەی حەوتەمی ئاسمان بوایە! ئینجا تا دەگاتە شەڕگە کە دەیان نەقڵ و چیرۆکی ساز کردبوو کە لە هەموویان دا باقی قارەمان بوو و کەریم تەنیا بەردەستێکی بزۆز، واتا بە درێژایی ئەو ڕێگا سەخت و ئەستەمەی بڕیبوویان، دەیان جار باقی، کەریمی لەمەترسی گەلی جۆراجۆر و برسێتی و تاریکی و جڕوجانەوەران ڕزگار کردووە، تەنانەت گێڕابوویەوە کە جارێکیان کە شەکەت و هیلاک زۆریش برسی ڕێیان دەکەوێتە نێو دارستانێکەوە، کەریم لە ترسان و لە برسان لە پێ کەوتبوو، باقی خەریکی دڵدانەوەی بوو کە لەپڕ ورچێکی زەلامیان لێ وەدەر دەکەوێ و پەلاماریان دەدا. هەرچەند باقی، کەریم دەنگ دەدا کە زووکە، هەڵێ، بەڵام کەریم وەها ترسابوو کە لاقی لە دووی نەدەهات چی وای نامێنێ ورچە بگاتە سەر کەریم و لە ناوی بەرێ کە باقی لە پشتەوەڕا بۆ ورچەی دەچێ و بە بەردێکی گەورە، وەها لە پشتەسەری ورچە دەدا کە دوو هەنگاو ئەولاتر بەردەبێتەوە و دەمرێ!!. لەگەڵ تاو هەڵاتی ڕۆژانە باقی کە لە خەو ڕاست دەبۆوە چیرۆکێکی تازەی لە قارەمانەتی خۆی دەبردە ناو شەقام، گومان لەوە دانییە کە هەرچی خۆی زۆرتر هەڵدەکێشا بە هەمان ڕادە ناچار دەبوو کەریمی داکێشێ و بەرەوخوارتری بەرێ.

حەسەن بانەیی و سەرکردە و باقی شەودرەنگ ببوو کە گەیشتنە دەوروبەری سەردەشتێ. هێندێک لە دەرەوەی شار خۆیان مات دا، تا شەو شەوتر بێ. ئینجا وەڕێ کەوتن. باقی بەڵەدیان بوو، تا گەیشتنە بەردرگای ماڵی حاجی محەممەد. من ئەوێ شەوێم باش لەبیر ماوە. چونکە شەوی ئەوێ ڕۆژێ بوو کە ئێوارەکەی من و نازێ بۆ خۆشاردنەوەی خۆمان، لە کادێنی ماڵە حاجی محەممەد وەها بەیەکەوە نووسابووین کە ئێستاش کە شەودرەنگ ببوو، خەو نەیدەبردمەوە، هەر پێی دا هاتمەوە و خۆشییەک تەزوو تەزوو لەشمی دەپشکنی. ئەوێ شەوێ من خۆم لێ ون ببوو. لە

ئێوارەوە ببوومە کەسێکیتر، خۆم نەدەناسییەوە، ببوومە دووکوت کوتێکم بۆخۆم بووم و کوتێکی تریشم بۆ خۆمێکیتر! نەخۆم و نە خۆمەکەی ترم خەو نەیدەبردینەوە. هاتبوومە بەر پەنجەرە و چاوم لە ئاسمانی تاریکی شەو بڕیبوو کە پووڵەکە چن بوو. ئەوەی ئەستێرەی گەش بوو لە ئاسمان دا هەمووی ببوونە وێنەی نازی نازێ، کە چاوە جوانەکانیان لە من بڕیبوو، چاویان یەکدا بە دوو لێدادەگرتم هەر لەبەر ئەوەی نازێکانم جوانتر ببینم. چون نەمدەتوانی بەو تاریکییە چڵک و چەپەری مردووی سەرشووشەکان بسڕمەوە. بە ئەسپایی پەنجەرەی ژوورەکەم کردبۆوە و سەرم لێ وەدەر نابوو و لە جەغزی سێحراوی چاوی نازێیەکانمدا نوقم ببووم کە گوێم لێبوو، زۆر بە نەرمی لە درگایان دا، ئەوەندە بە نەرمی کە من بە ئاستەم گوێم لێبوو. ئەوەی وێنەی نازێ بوو. یەک جێ وەک مژ لە پڕ ڕەوینەوە خۆم مات کرد و چاوم لە درگا بڕی. هێندێک توندتر لە درگایان دا. لەو دالآنە باریکەی درگای کادێن و عەمباری ماڵە حاجی محەممەد بەرامبەر یەکتری ڕاوەستاون، دەنگی ئەحمەد یەکێ لە کوڕەکانی حاجی محەممەدم بە باشی گوێ لێبوو.

: «کێیە؟»

: «ئێرە ماڵی حاجی محەممەدی ئاسنگەرە؟»

: «بەڵێ، فەرموو کارتان بە کێیە؟»

: «درگاکە بکەنەوە. کارمان بە ئێوەیە، لێرە ناتوانم باسی لێبکەم.»

: «کاکی من! ئێستا لە نیوەشەو تێپەڕیوە. هەموو کەس خەوتووە باشتر نییە سبەی بێیەوە؟»

کاک ئەحمەد ڕاستی نەدەکوت، من نەخەوتبووم، ئاگام لە هەموو شتێک بوو. دەنگەکە کوتی: «پێم بڵێ بزانم تۆ ئەحمەدی؟»

: «لەبەرچی پرسیار دەکەی؟ بەڵێ بۆخۆمم»

هەمان دەنگ کوتی: «ڕۆڵەگیان! درگای بکەوە. من مامەحەسەنتم.» زووتر درگای بکەوە و بڕۆ بابت لە خەو هەستێنە. کارم پێیەتی زۆر گرینگە. بەڵام کوڕە مەهێڵە ژنەکان وەخەبەر بێن.»

ئەحمەد کە ئەوەی بیست زۆر بەپەلە نەفتیلەکەی لە دیواری دالانەکەی کردەوە و بە دەستیەوە گرت و بەرەو درگا ڕۆیی، کە وەژوور کەوتن من توانیم ڕوخساری باقی ببینم، پێم سەیر بوو دەیانکوت باقی و کەریم هەڵاتوون. خودا نەبێ کەس نازانێ لە کوێن، ئەی ئێستا بەو نیوە شەوە و بەبێ کەریم لەگەڵ ئەو دوو پیاوە نائاشنایە چ دەکا؟ بەو چرا نەفتیلەی بە دەست ئەحمەدەوە بوو ڕوخساری هەرتکیان بە باشی دەدیترا، دەتوانم بڵێم زۆرم خۆش لە قەڵافەت و بەژنوباڵای یەکیان هات، هەستێکی سەیر سەرنجی بۆ لای ئەو ڕادەکێشام، من پێشتر باسم کرد کە جارێکی مەلا برایمم دیتبوو، دەتکوت لەگەڵ ئەم پیاوە لە یەک هۆزن، ڕوخساری جۆرێک بوو ئەو هەستەی لە تۆدا بەدی دێنا کە تۆ پێشتر چاوت پێی کەوتووە، یان پێت خۆشە پێش‌تر چاوت پێی بکەوتبایە. هەرچەند ئەودەم هەستم دەکرد کە بێ و نەبێ ڕۆژێکی‌تر ئەو دیمەن و ڕۆخسارەم چاو پێدەکەوێتەوە. ئەو پیاوەی من باسم کرد نا، پیاوەکەی‌تریان ئەحمەدی لە ئامێز گرت بە گریانێکی کپەوە دەیدواند ئەحمەد بە نارەحەتی گەڕاوە نێو دالانەکە، هێندەی پێ‌نەچوو، تیشکی کزی چرای دیوە تایبەتییەکەی حاجی محەممەد زۆر بە لەچەری گۆشەیەکی بچووکی لە حەوشەی ڕووناک کرد. هەر ئەوەندە ڕووناک کە تۆ وەک شاهیدێک تێبگەی کە ئەوەی خەوە لە دیوەکەی حاج محەممەد تاراوە، من نازانم چۆن بوو بە پێچەوانەی هەمیشە وێرام بابم لە خەو هەستێنم و پێی بڵێم کە چم دیوە وچم بیستووە، هەرچەند بابم وەک هەمیشە خۆی تووڕە کرد و بەو نیوە شەوە دەستی کرد بە ئامۆژگاری کردنم، کەهیچ باش نییە خۆم لە کاری خەڵکی هەڵقوتێنم و ئەو کارەی من کردوومە نێوی فزوولییە و کردەوەیەکی ئینسانانە نییە و لەوە بەدوا دەبێ خۆی لێ هەڵبوێرم بەڵام تازە سەرنجی بابم بۆ مەبەستەکە خەوی لەچاوانی زڕاند. لەبەر خۆیەوە دەستی کرد بە لێکدانەوەی ئەوشتەی کە لای وابوو دەبێ ڕووی دابێ کەحاج محەممەد کە هەرگیز بە تۆپی ئاڵمانیش وەخەبەر نەدەهات لە جێگەوبانی جیا بکاتەوە. هەرچەند لە بەرانبەر بابمدا تەنیا من بووم کەوەک دارتێلی بەرق چەقیبووم و بۆ منیش وەک منداڵێک هەرگیز

نەدەگونجا کە ببمە بەردەنگی باس و خواسێکی وەها جیددی، سەرەڕای ئەمە دەتکوت تاریکی دیوەکەی منی گەورەتر لە تەمەنم نیشان دەدا کە ببوومە هاودەمی بابم.

: «تۆش پێت وانییە شتێک دەبێ قەومابێ کە بەم نیوە شەوە حاجی محەممەدیان لە خەو ڕاست کردۆتەوە و بە یەکەوە کەوتوونە سرت و خورت؟»

بەڵام ئەودەم پێم وابوو ڕووداوی زۆر گرینگ ئەوە بوو کە بابم منی دیتووە و ڕووی قسەی لەمنە، لەو کاتەدا ئەحمەد لەبەر پەنجەرەی دیوەکەی ئێمە کە لەسەرێ ڕا دەیڕوانییە نێو حەوشە، هەرای بابمی کرد.

: «میرزا تاهیر! میرزا تاهیر! گوێت لەدەنگمە؟ بەخەبەری؟»

بابم چووە بەر پەنجەرە.

: «ئەحمەد چ ڕووی داوە، کارت پێم بوو؟»

: «میرزا تاهیر! بابم عەرزت دەکا، ئەگەر دەتوانێ هەتا ئێرە وەرە.»

بابم کوتی: «باشە ئەحمەد! بە بابت بڵێ هەر ئێستا دێمە خزمەتی.»

بابم چوو، دەیگێڕاوە: «هەرگیز بە بیر و خەیاڵیشم دا نەدەهات کە من ڕۆژێک فرمێسک دەچاوی حاجی محەممەد دا ببینم.»

حەبەسابوو، دیار بوو چاوە سوورەکانی ئەحمەد، بەرلەوەی بابم بگاتە لای حاجی محەممەد زۆر ڕاستی لە لادرکاندبوو. شتێک ڕووی دابوو، حاجی محەممەد زمانی نەدەگەڕا، تەنیا، یەک وشە نەبێ لە زاری حاجی دەر نەدەهات.

: «پەکوو...... پەکوو.....پەکوو.....

حەسەن کە بابم لەڕووی ڕوخسارییەوە زانیبووی کەدەبێ برا چکۆڵەکەی حاجی محەممەد بێ. ڕووی لە بابم کردبوو.

: «میرزا تاهیر! من حەسەنی برای کاک حاجیم. لێت ناشارمەوە لە ڕێزی پێشمەرگەکانی مەلا مستەفا دام، من لێرە قاچاغم، بەنهێنی هاتوومەوە. لەگەڵ ئەو کاک فایەقە، بە داخ و کەسەرێکی گرانەوە قاسیدی هەواڵێکی ناخۆش و دڵتەزێن بووین بۆ کاکە حاجیم، پێم خۆشە تا ماوەیەک ئێوە چاوتان بە

سەر کاکمەوە بێ. ئێمە ناچارین هەرچی زووتر بگەڕێینەوە. مانەوەمان لێرە مەسلەحەت نییە.»

بابم کە پرسیاری کرد بۆ چ ڕووی داوە، من ئێستا نازانم چ باسە؟

ئەم جارەیان سەرکردە قسەی کردبوو و ئەوەی بە چاوی خۆی دیتبووی لە گەورەیەتی ڕووحی کەریم بە وردی هەمووی گێڕابووەوە. هیچ کەس ئەودەم نەیدەزانی کەچ گڕکانێک لە دەروونی حاجی محەممەد وەکار کەوتبوو، گڕکانێک کە پەشیمانی و کەمتەرخەمی لەحاند کەریم هێز و تینی زۆرتری دەدایە تا سنووری تەقینەوەی لە نەکاوی – سەرکردە گێڕابوویەوە کە ئەو کەریمە ژێرچەپۆکەیە – ئەڵبەت ژێرچەپۆکە وتەی منە نە سەرکردە-بە فیداکاری و گیان بەختکردنی خۆی توانیبووی گیانی دەیان پێشمەرگە لە مەرگ و نەمان ڕزگار بکا و نە تەنیا ڕزگارکردن بەڵکوو ڕێگەی بۆ سەرکەوتنێک خۆش کرد کە تا ئەوێ ڕۆژێ لە مێژووی خەباتی گەلەکەمان‌دا تۆمار نەکراوە. ئەوجار زۆر وردتر ئەوەی ڕووی دابوو، لەو کاتەوە کە تووشی ئەو دوو منداڵە هاتووە تا دوایی ڕووداوەکە و لەچ حاڵێک دا تەرمەکەی خڕناڵیان دۆزیوەتەوە و چۆنی خۆش لە کەریم هاتووە کە دەسبەجێ نێوی خڕناڵی لەسەر داناوە تا گاڵتەی دەگەڵ بکا و ئێستا لەودیو کەسێک نازانێ کەریم کێیە؟ بەڵام هەموو کەس دەزانێ خڕناڵ چ قارەمانێک بووە. ئەوەی سەرکردە لە کەریمی گێڕابۆوە بابی منیشی وەگریان خستبوو. بابم هەمیشە لەگەڵ کەریم زۆر باش دەجووڵاوە. ئەو کە دەیزانی هەموویان کەریم ئازار دەدەن، زۆری چاوەدێری دەکرد. قسەی خۆشی لەگەڵ دەکرد. سەرجەم زۆر ڕێزی بۆ دادەنا. هەروەک پیاوێکی گەورە سەیری دەکرد. هەر بۆیە کەریمیش بابی منی زۆر خۆش دەویست. هەمیشە ئەوە بۆ من پرسیارە: «ئاخۆ ئەودەم بابم پەی بە ڕووحی گەورەی کەریمی بردبوو وای ڕێز بۆ دادەنا؟»

نازانم و ناشزانم بۆچی تا ئەو دەم کە بابم زیندوو بوو ئەم پرسیارەم لێ نەکرد. هەڵبەت دوایی بۆخۆم زانیم، چون نازێ ڕووی منی بەرەو ژیان وەرگەڕاندبوو من زۆر گوێم بەو قسانە کە بۆنی مەرگ و نەمانی لێوە هاتبا

نەدەبزووت. بە هەرحاڵ ئەوەی کە وەبیری من بێ ئەوە بوو، کە بابم زۆر جار بە حاجی ڕادەسپارد کە لەگەڵ کەریم باشتر بجووڵێتەوە و خاتری بگرێ و لە منداڵەکانی تری هەڵنەبوێرێ ماڵم قەبرە، حاجی محەممەد زۆری حورمەتی بابم لەبەر بوو و قەدری لەلای زۆر بوو، هەرگیز نەبوو بابم داوایەکی هەبایە و لە قسەی دەرچووبا. لە ڕاستی‌دا تا حاجی‌ژن حاجی محەممەدی پڕپڕ نەکردبا، لەگەڵ کەریم خەراپ نەدەجووڵاوە، بەڵام بەو مەکروکورەی حاجی‌ژن هەیبوو بەو شارەزایی‌یەی لەسەر حاجی هەیبوو هەر کە دەستی پێ دەکرد حاجی محەممەدی لەپڕ دەکردە حاجییەکی بیانووگری، زمانپیسی، توورە لە کەریم، بابم کە چاوی بە حاجی کەوتبوو، دیبووی کە وەک ژوشک وێک هاتووە. لە زمان کەوتبوو. ئەو حاجییە بە شان و شەوکەت و هێز و باهۆیە لەپڕ توابۆوە. هەر بەقەرا کەریمی لێهاتبوو. کەریمێکی پەڕپووت و پیروکەنەفت، هەر دەتکوت پزدانێک بووە کە بە نووکە دەرزی قسەکانی سەرکردە تەقیبوو، چی لێ نەمابۆوە.

بە بابمیان ئەسپارد کە بۆ بەیانی باقی لەگەڵ خۆی بەرێ و بەدەست بابی بسپێرێ. سەرکردە دەسخەتی مەلا مستەفای دا بە حاجی کە دەوێدا سەرەخۆشی لە حاجی و بنەماڵەکەی کردبوو و هەر وەها نازناوی قارەمانی نەتەوەیی دابوو بە کەریم، حاجی محەممەد بە دەستی لەرزۆکەوە نووسراوەکەی «مەلا»ی لەسەر چاوی دانا. کە براکەی و سەرکردە ڕۆیشتن حاجی محەممەد دەیان جار نووسراوەکەی بە بابم خوێندبۆوە و لەپڕمەی گریانی دابوو. بابم هەستی کردبوو، بێتوئاوا بڕواتە پێش، تا بەیانی حاجی بە تەواوی دادەچۆڕێ و تەنیا کانیلەیەک ئاوی سوور و سوێر لە جیاتی حاجی بەجێ دەمێنێ.

: «حاجی ئاغا! بە ڕای من تۆ لە جیاتی ئەو شین و شەپۆڕە دەبێ شادی بکەی کوڕێکی وەها قارەمانت بووە.»

هەروەها پێی کوت ئێستا تۆ دەبێ بەخۆت بخوڕی کە کەریم جێی شانازی گەلەکەیەتی. حاجی سەری هەڵێنا و بە دەنگێکی لەرزۆکەوە کوتی: «میرزا تاهیر! ئەوانەی دەیان فەرمووی هەموو ڕاستە و قسەی تێدا نییە،

بەڵام کە وەبیرم دێتەوە بە قسەی ئەو پەیتارە، دێوەزمەی ژنم، لای خۆی دایکێتی، هیچ ئازارێک نەمابوو کە نەیدەم بەو بەستەزمانە. شتێک هەروەک ئێسک دێ و دەگەرووم ڕۆدەچێ، هەر وەختە بمخنکێنێ.»

بابم پێی دەڵێ:« حاجی ئاغا! تۆچ پێت خۆش بێ یان پێت ناخۆش بێ، چ ئازارت دابێتێ و چ خۆشیت دابێتێ، ئەو کوڕەی تۆ ئێستا شەهیدێکی قارەمانە خەڵک بێگومان بۆ پرسە و سەرەخۆشی دێنە لات، نابێ ئەوە لەبیر بکەی ئەگەر تۆ هەستی قارەمانەتیت لە ڕووح و ڕەوانی کەریم دا ساز نەکردبایە ڕەنگە ئێستاش ڕازی بوایە سەری داخا تا لە هەر لاوە وێی بکەوێ و سووکایەتی پێ بکرێ، بەڵام دیار بوو کە لە ژێر ئەم قەڵافەتە بچووکەی کە هەیبوو چ ڕووحێکی گەورە و مەزن شاردرابۆوە، خۆزگە بەخۆی، حاجی ئاغا! ئەو دیمەن و دنیایەی لە هەڕەتی لاوەتی خۆت لە بەرگی پاڵەوانێتی لە دووکان‌دا هەڵتواسیوە هەمیشە لەبەر چاوی کەریم بووە و بێگومان تۆ شوێنی خۆت لەسەری داناوە.

حاجی محەممەد لە وڵامی قسەی بابم دا تەنیا پیشێکی خواردبۆوە و کوتبووی: «وەی لەمن.... وەی لەمن.....وەی لە من!»

❊❊❊

# ٦٠

........ بەر لەوەی دوکتور بێتەوە ماڵ و ئاشت ببێتەوە لەگەڵ بەرنامەی ڕۆژانەی ژیانی و بە پەلە بەر لە هەموو شت خۆی بە حەمامدا بکا و ئەو کۆڵە ڕدێنەی هەمیشە ڕوخساری داپۆشیبوو و ئەو بیستوپێنج ڕۆژە پڕتر و زۆرتر لە هەمیشەی کردبوو، بدا بە دەست تیغێکی ناسێتی دوو سووسمار، ئەو ڕدێنەی کاوەیسی کردبوو بە دوکتور بەختیار، ئەو ڕدێنەی بۆ ماوەیەکی زۆر هێڵەکانی ڕوخساری کاوەیسی لەبەر چاوی سۆفیحەسەن ون کردبوو. سۆفی حەسەن توانیبووی، لە ماوەی ئەو چەند ساعەت تەنیایی و بێدەنگی و وەڕەزیەی خۆی، بگاتە سەر ئەو باوەڕەی میکێلئانژ کە دەیکوت: «لە نێو هەناوی هەر تاوەێرە بەردێکی گەورەدا پەیکەرێکی هونەری شاراوە هەیە کە هونەرمەند دەبێ کەشفی بکا و دایبتاشێ و لەناو زیندانی بەردەکە ڕزگاری بکا.»

سۆفی حەسەنیش ئەو گومانەی کە جار جار وەک مژێک لە نێوی خۆیدا دەیشاردەوە، دەڕەوێنێتەوە و هەر بەبێ ئەوەی بزانێ میکێڵئانژ کێ بووە کاوەیسێکی خوێنشیرینی ڕەزا سووکی لەبەر دڵان، کاوەیسەکەی جارانی خات زڵەخایە لە تاوێرە بەردەکەی جەستەی دوکتور دادەتاشێ. بۆخۆی لە بەرهەمی کارەکەی حەبەسابوو. ماندوو ببوو. دەتکوت لەدوای دەیان ساعەت ڕێگەی ئەستەم و ناخۆش بڕین، لە دوای گەلێ کەوتن و هەستانەوە لە کەندەڵان و بەردەڵان و قوڵکە و زەوی پڕدڕکوداڵ لەپڕ بەسەرکانییە ڕوونەکەی بەرتریفەی مانگەشەوی مامۆستا گۆران داکەوت. دەتکوت لە دوای دەیان جار هاتوچۆی لە خۆڕایی و شەکەت و ماندوو بوونی زۆر توانیویێتی وادەی، چاوپێکەوتن لەگەڵ خزمێکی گیراوی وەدەس بێنێ.

سۆفی حەسەن بەخۆی دەکوت:« کە دوکتور هاتەوە وەک جاران نالێم، بە قوربانت بم دوکتور گیان! بەخێر بێیەوە، بەڵکوو چاو لە چاوی دەبڕم، دەڵێم: «کاکە کاوەیس گیان! یاخودا بەخێر بێیەوە، لە پێش چاومە چ حاڵێک پەیدا دەکا، بۆ ماوەیەک دەحەبەسیٚ، ئینجا زەق زەق چاوم تێدەبڕیٚ و پێم دەڵیٚ: «ئەوەچت کوت سۆفی حەسەن؟ دا دووپاتی بکەوە.»

: «دەیکەمەوە.»

پرسیارم لێدەکا: «کاوەیس کێیە؟»

: «کاوەیس؟ کاوەیسە خوێنشیرینەی جاران، کوڕە بە ئەدەب و شەرم و حەیاکەی خات زڵەخای جیرانمان. یانی کاوەیس گیان، تۆ کاوەیسی ئەوان سەردەمان ناناسیٚوە؟ ئەودەم کاوەیس بزەی دیٚتیٚ، بزەیەکی شیرین تر لەجاران.»

: «سۆفی! هەرگیز بیرم نەدەکردەوە لە پاش ئەو هەموو ساڵە و ئەو هەموو ئاڵوگۆڕەی بەسەر ڕوخسارم دا هاتووە بمناسیەوە، ماشاڵڵا چ زەینێکی باشت هەیە سۆفی.»

بەڵام کە دوکتور گەڕاوە، قسە و باسەکەیان نەکەوتە سەر ئەو ڕێگایەی سۆفی حەسەن پێشتر تەختی کردبوو.

لە ڕاستیدا، ئەو وتوویژەی سۆفی حەسەن لە خەیاڵی خۆیدا لەگەڵ دوکتور کردبووی، تەنیا خێرەکەی گەڕاوە بۆ سۆفی، ئەویش ئەوە بوو کە بتوانیٚ ماوەی دە ساعەت خەڵوەت و تەنیایی لە ماڵێکی بیٚدەنگی بیٚ هەست و خوستی پیٚبەرێتە سەریٚ. دەنا هەرکە دوکتور وەژوور کەوت مۆڵەتی نەدا بە سۆفی حەسەن کە سڵاوەکەشی لیٚ وەپێش بخا.

: «سۆفی حەسەن! دەبیٚ بمبووری، ئەمڕۆ چاک وەڕەز بووی، کارێکی زۆرم بەسەردا مابۆوە، بە خۆم دەکوت زۆر باشە، شەویٚ کە دەچمەوە ماڵیٚ هاودەنگێکم هەیە، دەجا وا باشە. هەرچی کاری دوا کەوتووی هەمە جیٚ بە جێیان بکەم. بیٚ پشوودان خەریکیان بووم، ئێستاش هێندێکی ترت بە تەنیا بەجیٚ دەهێڵم، زۆر ماندووم و ئارەقە لەشی داگرتووم. پێویستە ئاوێک بە خۆم دابکەم، دەزانم زۆرت برسییە.»

سۆفی دڵنیای کرد کە زۆری برسی نییە.
دوکتور دەڵێ: «سۆفی! ئەگەر زەنگی درگایان لێدا، زەحمەتی کردنەوەکەی وەبەرخۆت بدە و ئەوەی لە دەرەوە ڕا بۆیان هێناوین بیبە ئاشپەزخانە، » هەروەها دوکتور بە دەم بزەوە کوتی: «سۆفی! باش دەزانم زۆرت قسە و باس پێیە، بە زگی تێرەوە، گوتن و بیستن خۆشە. دەنا کەسێک کە برسییە زوو شەویلکەی لە کار دەکەوێ و گوێگرەکەش هەر خەونووچکە دەیباتەوە.»
سۆفی حەسەن دەیویست هەر لەم کاتەدا، کایەکەی دەس پێبکا، هەر بۆیە زاری پڕکرد کە بڵێ: «بەسەر هەرتک چاوانم کاکە کاوەیسی بەڕێز»
دوکتور کە چاوەڕوانی هیچ وڵامێکی سۆفی نەبوو، ژوورەکەی بەجێ هێشتبوو. هیچ کەس نییە لە دنیادا کە شتێکی بۆ گوتن پێ نەبێ. هەواڵێک، نەقڵێک، بەسەرهاتێک، درۆیەک، بوختانێک، شێعرێک، وەسفێک، خەونێکی خۆش یان خەونێکی ناخۆش، تەوسێک، ڕازێک، پێهەڵاکوتن و تاریفکردنێک و....
بەڵام هەریەک لەو شتانە کڕیاری تایبەت بەخۆی دەوێ، کێشەی هەرە گەورەی مرۆڤ لەوەدایە کە هەرگیز کڕیار و فرۆشیار، ناکەونە لای یەک مەگین بەدەگمەن. ئەویش زۆر جاران بەهۆی وەزعی نالەبار و نادیاری کات و شوێن و یا خۆ تێهەڵقوتاندنی نەیارونەویستە و شتگەلی تر ئەو پێوەندییە لێک دەپچڕێ و پووچەڵ دەبێتەوە. هەمیشە وا وێدەچێ کە دەستێکی نهێنی و گاڵتەچی، دەستێکی بزۆز و سەرخۆش و بە کەیف و سەرمەست، دەستێکی کە بە درێژایی ژیانمان حەولمان داوە کە نەیبینین. ئەو گەمەو یارییانە پێک دێنێ. کەچی ئێمە بە خۆمانییەوە دلکێنین، هەڵەی باشی خۆمان بە باعیسی دەناسین، بێ دەسەڵاتی خۆمان، کەمتەرخەمی خۆمان، ساویلکەبوونی خومان، فام نەکردنی هەلومەرج و کات و زەمان و شوێن لە لایەن خۆمانەوە بە خەتابار دەناسین، بە دەنگی خۆشی گۆرانی بێژەکانمان دەیانکەینە گۆرانی و پێی سەرخۆش و سەرمەست دەبین و پێمان خۆشە پەیتا پەیتا پەردەی گوێمان بلەرێنێتەوە:

«هەر جوانێ بە دەس پیرێ ئەسیرە.»

یان: «ئەگەر تۆ خۆت ڕازی بی من گولەی دەرمانداو دەکەم.»

یان: «هەی ڕۆڵە! سەر دڵ خڕبی، باب مردوو بی. شەو درەنگە بۆ جیژوانێ»

یان: «گەر گولە لێی پرسی کێیە؟ بمشێلە و بڵێ بێحاڵە»

وە هەروەها: «ئەگەر بۆخۆت ڕازی بی دایکت بۆ من هیچ ناڵێ»

جار جارە مرۆڤ وا هەست دەکا لەبەر ئەوەی دوو کەس لەیەک دەبەسرێنەوە، تا دەربکەوێ ئەو دوو کەسە چەندە دەتوانن دوور لەیەک ڕاوەستابن، یان ڕاستییەکە لە عەینی یەکبوون و یەکێتی خۆیدا لە دەروونی هەرکەسێکدا دەتوانێ ڕەنگ و ڕوخساری ئەو کەسە بگرێ، واتا ڕاستەقینەیەکی نەگۆڕ و چەسپاو لە زەینی مرۆڤەکاندا دەبێتە هەزاران بە ڕواڵەت ڕاستی جیاواز لە یەکتر، ئەو کەسەی کەدەستە گاڵتە چییەکەی هەیە مەیلی لە فشە کردن زۆرە. دەبینی هۆمێر، ئەبوولعەلا موعەڕڕی، ڕوودەکی سەمەرقەندی، لوئیس خۆرخێ بۆرخێس کوێر دەکا تا بە کوێری جۆرێک ببینن کە چاوە ساغ و سەلیمەکان بەخۆیان دا بشکێنەوە و شەرمەزار بن لەو هەموو نەدیتنیان، هەر ئەو دەستە نهێنی و کایەکەرە لەپڕ کابرایەکی لەخۆ بێخەبەر لە نهۆمی نۆهەمی بورجێکەوە فڕێ دەداتە خوار بە بێ ئەوەی ئیزنی داڕووشانێکی بچووکی بداتێ، ساغ و سلامەت دەچێتەوە ماڵ و بە جەفەنگ و پێکەنین ڕووداوەکەی بۆ خاو و خێزانی دەگێڕێتەوە، لە حاڵێکدا چەند شەقام لەولاتر قوڕ بەسەرێکی زیت و وریا لەکاتی ڕۆیشتندا لە قوڵکەیەکی بچووک داوێ و تا قەبرستان ڕای ناگرێ و ئەو ڕاستییە دەسەلمێنێ کە مرۆڤ تەنیا دەورگێڕێکە و بەس.

سۆفی حەسەنێک بەبێ ترس لە لۆمەی لۆمەکەران لە سوورەچۆمێڕا دەنێرێتە تاران، بەبێ کەس وکار تا بەو چاوە کەمحوکم و کەم سۆمایانەی لە پشت کۆڵێک ڕدێنەوە کاوەیس بناسێتەوە. سۆفیحەسەن دەنێرێتە تاران تا بە هۆی ئەو، دوکتور بەختیار کەماڵی، کاوەیسێک لەنێو خۆیدا بدۆزێتەوە، دوکتور ئاڵوگۆڕێکی سەیری بەسەردا هاتبوو. ئەو پێنج ڕۆژەی سۆفی

حەسەن وەدرەنگی کەوتبوو، دوکتور لە خەیاڵی خۆشی خۆیدا، دەیان چیرۆکی نووسی بەڵام یەک بە دوای یەکدا، دڕبەدڕیکردن، ئەو لە ڕاستەقینەیەکی بێخەوش و پەتی دەگەڕا. ڕاستەقینەیەکی کە تەنانەت زەمان و کاتوشوێن و بگرە زەینی مرۆڤیش نەتوانێ ئاڵوگۆڕی بەسەردابێنێ. ئەو دەیویست یەکجێ خۆی لە هەرچی نیشانە و مۆری کاوەیسی پێوە نییە پاک بکاتەوە. بەڵام عەیبی کار لەوەدابوو، بەهۆی دووربوونی دەیان ساڵە لە ڕوخساری ڕاستەقینەی کاوەیس نە هەستەکانی کاوەیسی دەناسییەوە و نە ڕەنگ و ڕوخسار و ڕەوشت و ئاکار و نەترس و دڵەڕاوکەکانی ئەگەر هەیبایە و نەغیرەت وەجۆش هاتن و لەپڕ تەشتێک خوێنی سوور و گەش ڕژانە نێو شادەمارەکانی و گەرم گەرم داگیرسانی و ئینجا ئامادە بوون بۆ هەرشتێک. لەنێو ئاوێنە باڵانوێنەکەی نێوحەمام کە تەمومژ دایپۆشیبوو، دوکتوری هەروەک وجوودێکی مات و نادیار و بێ وجوود نیشان دەدا، تیغ بەدەستەوە، ڕوو بەم ئاوێنەیە کە تەنیا تارمایییەکی لێنیشان دەدا، ڕاوەستا. بە لەپی دەستی تەمی سەرئاوێنەکەی سڕی. ڕدێنی پیرتری کردبوو. بوو بە دوو کوت بە دوو کوتی بەرانبەر و یەک ئەندازە، بەڵام دوو کوتی دژ بە یەک و ناتەبا و ڕەبا، دوو کوت کە بەناچاری دەبوو هەمیشە حەق بەدەس یەکیانەوە بێ و کوتێکیان هەمیشە دەبوو سەرکوت بکرێ. وەک ڕەش و سپی، چون بۆ ئەوەی یەکیان وەبەر چاو بێ، ئەویتریان دەبوو وەبەر چاو نەیە، وەک ڕووناکایی و تاریکایی کە نەدەبوو هاوکات بە یەکەوە پەیدا بن، هەرچەند هیچ کام لەم دوو کوتەی کاوەیس و دوکتور بەختیار نەیاندەتوانی شوێنەواری ئەویتریان بە یەکجاری بسڕێتەوە بەڵام بەو حاڵەشەوە، تەنیا یەکیان مافی سەرهەڵدانیان هەبوو، بە ڕاستی کێیە ئەوەی هەڵدەبژێری؟ کاوەیس یا دوکتور بەختیار؟ یا فاتێ؟ یا سۆفی حەسەن؟ یا هەمان دەستی ئۆینبازی گاڵتە جاڕی فشەکەری بێکار؟

سۆفیحەسەن دەڵێ: «ئەگەر هاتو دەربارەی ئەو ژنە چارە ڕەشە خۆشی نەدیوە پرسیاری لێکردم، چ وڵامێکی بدەمەوە، بێگومان هەموو دووعا هەر لەبەر ئامینەکەیە، تازە تێدەگەم بۆچی دوکتور ئەوەندە بەم لاو

بەولای‌دا دەناردم. ئیمانم بەوە هەیە هیچ هەواڵێک لەلای گرینگ‌تر نیە لە باس و خەبەری فاتێ، چۆنی پێ بڵێم؛ کە براکانی فاتێ لەسەر تۆ و ئەو بوختانەی بۆیان هەڵبەستی چ بەڵایەکیان بەسەر فاتێ هێنا کە ئەگەر بەسەری ڕووت و پێی پێخواس خۆی لە مزگەوت نەکوتابا، بێ‌گومان ئێستا ئێسک و پروسکیشی نەدەما. بەڵام خۆ ئەو قوڕ بەسەرە نەیدەزانی مردنی ئەودەمی زۆر زۆر لە ژیانی دواتری خۆشترە.»

سۆفی هەودای خەیاڵەکانی هەڵبڕی، ببوورن بیرەوەرییەکانی. بەخۆی گوت: «ئەگەر سەبارەت بە فاتێ پرسیاری کرد» وا باشترە پێی بڵێم فاتێ لە مێژساڵە مردووە، دەڵێم لەسەر منداڵێ چووە یان دەڵێم بەزۆری بەمێردیان دا ئەویش لە داخان خۆی کوشت. نا...نا... دەڵێم لە فاتێ مەپرسە، لەدوای بێ‌سەروشوێن بوونی تۆ، فاتێ شێت بوو، ماوەیەک لەوێ ڕایانگرت و دواتر بردیانە شێت‌خانە، بەڵام ئەو قسانەی من برینە کۆنەکانی لێ بکولێنێتەوە و بیهەوێ سەروسوراغی بگرێ و ڕاستی بۆ دەرکەوێ بڵێی چەندە بە ناپیاوم بناسێ، لە پاش ئەو هەموو چاکەی کە دەرحەقی منی کردووە، نا... نا... من هەرگیز درۆی لەگەڵ ناکەم، مافی خۆیەتی هەموو شتێک بزانێ.»

کاوەیس، دوکتور بەختیاری وەبەرتیغ دابوو. چی لە وجوودی دوکتوردا نەهێشتبۆوە، دوکتور لەنێو تەمومژەکەدا ون ببوو. دەتکوت ئاوە و بە ئاوەڕۆکەدا ڕۆچووبووە خوارێ. کاوەیس، ڕدێن تاشراو و پاک و خاوێن هاتە لای سۆفی‌حەسەن، وەخت بوو هاوار بکا، خەون نەبوو ئەوەی بەدرێژایی ڕۆژ ویستبووی لەناو ڕوخساری ژێرڕدێن نێژراوی دوکتور دەربکێشێ و عەیانی بکا بە ئاشکرا لەبەرچاوی بوو، هەمان کاوەیسەکەی جاران، سۆفی حەسەن چاوی پڕ بوو لە فرمێسک.

گوتی: «کوێر بم خات زڵەخا، ئەگەر ئەوڕۆژەت بەچاوی خۆت دەدیت کە کاوەیسەکەت بۆتە چی؟»

کاوەیس بە دەنگێکی لەرزۆک و چاوی پڕ لە فرمێسک گوتی: «سۆفی‌حەسەن! هەر لە درگا وەژوور کەوتی زانیم کە منت ناسیوەتەوە،

هەر بۆیەش کوتم کاتی ئەوە هاتووە کە بەبێ دەمامک لەگەڵ یەکتر ڕووبەڕوو بین.» بۆلای سۆفیحەسەن چوو، یەکتریان دە ئامێز گرت، کاوەیس سەری خستە سەرشانی سۆفی لەپڕ کانی دڵی پڕی تەقییەوە و لە پڕمەی گریانیدا چ گریانێک؟ بێئامان و بێکۆتایی دەتکوت هێشتا بەشێک لە وجودی دوکتور بەختیار لە دەروونیدا مابووە کە دەیویست بە چاوانیدا دەریان بکا.

سۆفیش دەگریا، بەهەر جۆرێک بوو لەو حاڵەی هێنایە دەر، بەڵام هاتنە دەرێکی وا. نەبوو، ماوەیەکی پێیچوو تا کاوەیس هێندێک وەخۆ هاتەوە. چاوی سوور هەڵگەڕابوون و تەڕ بوون. ڕووی لە سۆفیحەسەن کرد.

: «زۆرم پرسیار هەیە حازری؟ دەڵێی جاریێ با نانەکەمان بخوێن»

سۆفیحەسەن ئەوەندەی برسی بوو نەیتوانی حازر بێ، لە دڵەخۆی دا گوتی: «بەبێ نووکی دەرزییەک لادان، ئەوەی هەیە بۆی دەگێڕمەوە، کاتی ئەوە هاتووە، فاتێ و کاوەیس، ئاگاداری بەسەرهاتی یەکتر ببن.»

سۆفیحەسەن لە سیمای کاوەیسدا شتێکی بەدی دەکرد کە هەرچی کردی بۆی نەچۆوە سەریەک....

***

## ٦١

...... به پێنج ژنان کەوتبوونە سەر حاجی‌ژن، بۆیان ڕانەدەوەستا. تەواوی دەموچاوی خۆی ڕنیبوو. سەروقژی خۆی هەموو دەرهێنابوو.

هەر شەوەکی ئەحمەد خەبەری کوژرانی کەریمی دابوو بە ڕەسووڵ، کوڕە گەورەکەی حاجی‌محەممەد کە دوو سێ گەڕەک ئەولاتر دەژیا: هەر ئەودەم کە لەگەڵ حاجی‌محەممەد نێوان ناخۆشی لێ پەیدا بوو، دەستی ژن و منداڵەکەی گرت و بۆ هەمیشە لە ماڵە بابی ڕۆیی، لە ڕاستی‌دا ئێمە ئەو بەشە خانووبەرەکەی حاجی محەممەدمان بەکرێ گرتبوو کە پێشتر ڕەسووڵ و ژن‌ومنداڵەکەی تێیدا بوون، ناڵبەندێکی زۆر چاک بوو. زۆر بە دەگمەن ئەگەر هەڵکەوتبا جێژناوجێژن سەرێکی لە ماڵە بابی هەڵێنابا، دەنا هەرگیز نە بۆخۆی و نە ژن و منداڵەکانی توخوونی ماڵە حاجی نەدەبوون. ئەحمە زۆر بە نهێنی ڕەسووڵی لە کوژرانی کەریم ئاگادار کرد. ڕەسووڵ نەیهێشت ژن و منداڵەکەی وەخەبەر بێ. چییان لەدەست دەهات؟ لە هات‌وهاوار کردن پتر. حاجی نەیدەتوانی لە مزگەوت پرسەی بۆ دابنێ. لەوانە بوو لە ماڵە خۆشیان کە بۆی دانیشتبان تووشی کێشە بووبان، ئاخر ئەودەم شەپکە زۆر توند بوو، کەڵ بە موو بەند بوو. بابم هەر وا لە دیوە تایبەتییەکەی حاجی محەممەد بوو. ئەودەمی تەواوی پرس‌وڕای حاجی محەممەد هەر بە بابم بوو. حاجی محەممەد هەمیشە ڕێزێکی تایبەتی بۆ بابم دادەنا، تا ئەو ڕادەیەی ئەگەر پێی گوتبا لە دینەکەت وەرگەڕێ، لە وانەبوو وەرگەڕابا. هەرکەس ویستبای حاجی ڕووی تێکا، دەبوو پێشتر بابمی دیتبا، ئەگەر بە قسەی حاج محەممەد بوایە. نە تەنیا کرێ‌خانووی لە بابم وەرنەدەگرت بەڵکوو بە خاووخێزانەوە بەخێویشی دەکردن. لەڕاستی‌دا بابم ڕاوێژکاری تایبەتی حاجی‌محەممەد بوو، لەجێی عەقڵی

حاجی دانیشتبوو، زۆربەی ئەو باس و خەبەر و لێکدانەوە و تەعبیرانەی هەموو ڕۆژێ حاجی محەممەد بە شانازیی‌یەوە بە گوێی وەستا محەممەد و کاک قادری خەیات و ئەوانی‌تری دەگەیاند هەر ئەو شتانە بوون کە شەوانە لە دانیشتن لەگەڵ بابم لە زمان ئەو دەیقۆستەوە و کاتی نووستن وەک قوتابییەکی زیرەک و دەرس‌خۆێن لەبەر خۆیەوە ئەوەندەی دووپات دەکردنەوە کە بەیانی کاکڵ و ناوەرۆکەکەی دەبوو بە بەشێک لەبیر و باوەڕ و بڕوای حاجی محەممەد. بەڵام ئەو وشانەی بابم کە زۆربەیان میرزایانە و کتێبی بوون هەمووی لەگەڵ دەسنوێژی بەیانان بە ئاوی جۆگەلەکەی سەر چاوەی سەردەشتێ دا دەکرد تا بڕۆن و تێکەڵ بە ئەبەدییەتێکی ئەو سەر نادیار بن.

مەرگی کەریم، حاجی‌محەممەدی وەگریان خستبوو. پێی عەیب بوو لە لای بابم بە دەنگ بگری، دەجا گریانەکەی بەوە گۆڕیبۆوە کە بە دەسرەیەکی زوو زوو دوو گۆمیلکەی خوێن بسڕێتەوە. بەڵام نەیتوانیبوو کڵاو لەسەری بابم بنێ و فریوی بدا. چونکە بۆخۆم گوێم لێبوو. بۆسبەی بابم بە دایکمی دەگوت: «زۆر نیگەرانی حاڵی حاجی محەممەدم. دەترسم تا بەیانی ئەوەندە داچۆڕێ هیچی لێ نەمێنێتەوە».

هەرچەند ئەو وڵامەی دایکم هەو نەبوو چون دەمزانی بۆخۆشی وەڵامەکەی خۆی پێ هەونییە:

«جا کوڕەکە – وای بابم بانگ دەکرد – حاجی محەممەد، کەریم ئەولادی بوو و ئەولادیش جەرگە، جەرگ.»

من ئەو قسەیەی دایکم بە دوو بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا پێ درۆ بوو، هەوەڵ لەبەر ئەو لێدان و ئازار و جنێو و سووکایەتی و زوڵمەی کە حاجی ژن و حاجی محەممەد کردبوویانە چارەنووسی کەریم و دووهەم ئەو قەوارە ڕەش‌وشینانەی دایکم بە هەڵقورینجاندن لە لەشی ئێمەی منداڵی دەکرد و دەمتوانی هەر ئەوێ‌دەم دوو قەوارەی زۆر گەورەی سەر باسک و ڕانمی بەگژ چاوەکانی داکەم. بەڵام هەوەڵ لەبەر ئەوەی بابم لەوێ بوو ئەوکارەم نەکرد و دووهەمیش لە ترسی قەوارەی سێهەم کەبێ هیچ شک و گومان هەرکە بابم پێی لە ماڵ نابادەر دەبوو بە مۆری دایکم لەسەر کاغەزی لەشم.

بابم گوتی: «حاجی ئاغا بە ڕای من چ بتهەوێ و چ نەتهەوێ خەڵک دێنە پرسە و سەرەخۆشی، ڕەنگە لە ماڵە خۆتان دانیشتن زۆر بە مەسڵەحەت نەبێ، دەزانم ژن هەموو ڕوو لێرە دەکەن زۆر قەرەباڵغ دەبێ. ماڵە کاک ڕەسووڵیش کە بچووک و تەنگەبەرە، ئەگەر بە قسەم بکەی ماڵی بابی بووکهەنار باشە، هەم جێگەورێگایان زۆر و فرەوانە و هەمیش زۆر لەبەر چاوان دانییە بە یانی دەتوانم بۆخۆم بە کاکی بووکهەنار بڵێم.»

ڕەسووڵ و ئەحمەدیش ئەو قسەیان پێ باش بوو.

بابم گوتی: «حاجی ئاغا جەنابت باشتر لە من دەزانی کە لەگەڵ موقەددەری خودا چ ناکرێ، هەرچەندە ئەو ئازایەتییە و قارەمانەتییەی کەریم نواندوویەتی، جێی شوکر و ڕێز لێنانە بەڵام ئێوە بەهەرحاڵ، ساحیب پرسە و سەرەخۆشییەکەن، ئەگەر بە قسەم دەکەی تاوێک بنوو با هێز و تاقەتێکت بۆ سبەی هەبێ.»

حاجی کە تائەودەم هەر بە دەسرە چاوی دەسڕی و سوور سووری هەڵگەڕاندبوو. خۆی چیدی بۆ ڕانەگیرا لەپڕ لە پرمەی گریانیدا. بەختەوەرانە دیوە تایبەتییەکەی حاجی بە لاوە بوو، نە حاجی ژن و نە بووکهەنار و نە تووبا و زارا و مینا و تەنانەت دایکم و خوشک و براکانی منیش هیچ کام لە خەو ڕاست نەبوونەوە. و حاجی توانی تێر تێر و پڕ بە دڵی بە دەنگ بگری کە گریا.

هەر ئەودەم ئەرکی ئاگادارکردنی ژنەکانی نێو ماڵ کەوتە سەر شانی دایکم یانی بابم بۆ بەیانی دەبوو بە دایکم بڵێ زۆر بە ئەسپایی و بەڕێوجێ حاجیژن و بووکهەنار ئاگادار بکا و بۆخۆشی چاوی بەسەر تووبا و زارا و میناوە بێ کە زۆری نەشێوێنن. من ئەودەم بە عەقڵی منداڵانەی خۆم تێروپڕ بەم بڕیارە پێکەنیم، ئاخر وایان دانابوو کە دایکێکی دڵڕەق و دڵبەرد دەبوو بە دایکێکی دڵڕەق و دڵبەردی تر بڵێ: «ڕەببی خەمی ئاخرت بێ، بۆخۆت سڵامەت بی، خودا سەبووریتان بداتێ لەگەڵ کاری خودا و موقەددەری وی چ ناکرێ، بۆخۆی پێیداوی و بۆخۆشی لێی ئەستاندوویەوە، خۆت نارەحەت مەکە، ئیشاڵڵا بەهەشتی خودای بە نەسیب دەبێ.»

منیش دەمزانی ئەگەر حاجی ژن لە شتێکی زۆر ناڕەحەت بێ، ئەو شتە هەرگیز ناتوانێ مردنی کەریمی کوڕی بێ. هەر ئەودەم کە گەرای کەریم لە نێو زگی حاجیژن دابوو و سەیدە لاڵە ئەو قسانەی پێ گوتبوو، هەر ئەودەم کەریم لەبەر دڵی حاجیژن مردبوو، من دڵنیام ئەو شتەی حاجی ژنی زۆر ئازار دەدا ئەوە بوو کە نەکا کەریم بەهەشتی خودای وەبەر بکەوێ!

خوێنەری بەڕێز سەرەڕای ئەوە کە دەزانم وەک نووسەرێک لە ڕادەبەدەر ڕووداری دەکەم زوو زوو هەودای خوێندنەوەت  هەڵدەپسێنم. چ بکەم چارم نییە تازە خۆشم بەشێک لە کەسایەتی ئەم ڕۆمانەم، ناتوانم ئەو جێگەیەی دەبێ بیروڕای خۆم بڵێم نەیڵیم.  دەمگوت لەنێو ئێوەی خوێنەری بەڕێز هەن کەسانێک کە پێیان خۆشە لە پەنایەکی بەربینگم پێبگرن و بڵێن: «ئەو درۆ زەلامانە چییە دەیکەی؟ لە کوێی ئەو دنیایەدا دایکێک وەک ئەو حاجیژنەی کە دەیناسێنی و وەگێرت کەوتووە هەیە؟

لە وڵامدا، بەر لەهەر شت با ئەوەتان بۆ ڕوون بکەمەوە، کە من سازم نەکردووە، بۆخۆی ببوو، خودا وەک تەواوی مرۆڤەکانی تر خوڵقاندوویەتی. دوامینی ئەوەش،[٦٤] من لە فەسڵەکانی پێشووشدا ئاماژەم بە هێندێک لەو دایکانە کردووە. بەڵێ هەن و زۆریش هەن، یانی ئێوە تا ئێستا نەتاندیوە یان نەتانبیستووە کە دایکێک منداڵەکەی خۆی فڕێ دابێ، نەتانخوێندۆتەوە کە دایکی وا هەبووە لەبەر خۆشڕابواردنی خۆی لەگەڵ کەڵەگایەکەی، منداڵەکەی خۆی زیندانی کردبێ؟ تا ئێستا بە گوێتان نەگەیوە کە دایکی وا هەبووە کە منداڵەکەی خۆی بە پارە فرۆشتووە. بۆ لێم تووڕە دەبن؟ سەرەڕای هەموو ئەو ڕاستیانە کە باسم کرد هەر لێرە دڵنیاشتان دەکەمەوە کە خودا ئەو بەهەشتەی خۆی کە خستبوویە ژێر پێی دایکان لە ژێر لاقیان دەریناکێشێتەوە تا بیخاتە ژێر پێی باوکەکان، قسەی خۆمان بێ. بابەکان کە دێتە سەریان زۆر لە دایکەکان بێ ڕەزاتر و بێ عاتیفەتر دەبن. هەڵبەت وای لەو ڕۆژە و لەو منداڵەی کە یەکێک لەو دایکانە، یەکێک لەو بابانەی تین دابێ.»

---

٦٤- دوامینی ئەوەش: دوای ئەوەش ئینجا.

نازانم بەیانی دایکم چۆنی هەواڵەکە دابوو بە ژنەکان کە هیچ هاتوهاوارێک بەرز نەبۆوە، تەنیا دەنگی بووکهەنارم گوێ لێبوو کە دەیکوت. «ئەی لاڵ بم کەریم، حەک بۆت نەمێنم، خۆشینەدیوەکە، ئەی بۆت کوێر بم ڕۆڵەگیان! بۆ وا بەبێ خوداحافیزی کۆچت کرد؟»

ئەوەندەشم گوێ لە دەنگی حاجیژن بوو کە بە تووڕەییەوە دەیگوت، «بووکهەنار! ئەو ئەدا و ئەتوارانە چییە؟ داتناوەتەوە. نەکا پێت وایە لەمن کە دایکی ئەوم زۆرتری بۆ بە پەرۆشی؟ هەموو ئەتۆ ئەو کوڕەت لەمن خراپ کرد، ئەوەندەی لەسەر وەجواب هاتی هەتا لە خشتەت برد. نەتهێشت بیعاملێنین. قەت بووە خەڵکینە منداڵی خۆت بێ و ئیختیاری عاملاندنی بە دەستەوەت نەبێ؟ خۆت خڕ کەوە بووکهەنار! دەنا دوایە بۆخۆت دەزانی چت بەسەر دێنم.»

: «ئامۆژن! تۆ چۆن شتی وا دەفەرمووی! کەی نەمهێشتووە تۆ کەریم بعاملێنی؟ کاتێک ئازاری دەکێشا. من تەنیا زگم پێی دەسووتا و بەس، ئەگینا کەی بە قسەی منت کردووە؟ ئێستاش خۆ ئەو بەستەزمانە لەنێوماندا نەماوە بۆ ڕووحی ئازار بدەین؟»

: «کچێ! عەیبێ بکە تۆ بۆ ئەوەندە لەسەر شتان دەڕۆی؟ هەستە زوو بچۆوە ماڵە بابت. پێیان بڵێ کە بڕیار وایە پیاوەکان لەوێ دانیشن، خۆشت لەوێ بمێنەوە و یارمەتی دایکت بدە، بۆ هاتنەوە پەلەت نەبێ تووبا و زارام لەبەر دەست دایە.»

بابم چووبووە ئیدارە مەرەخەسی وەربگرێ، ڕەسووڵ و ئەحمەد هەرتکیان بە پەلە وەدەر کەوتبوون، تەنیا حاجیمحەممەد لە دیوە تایبەتیەکەی خۆیدا مابۆوە. حاڵێکی سەیری پەیدا کردبوو. لەودەمەدا نەیدەزانی کە چی بە چییە. هەرگیز بە خەونیشیدا نەدەهات کە ڕۆژێک ببیستێ کەریم ئەو منداڵە ڕیوەڵە و هەڵنەداوەی، ئەو منداڵەی کە حاجی لەبەر قەڵافەتی پاڵەوانانەی خۆی پێی خۆش نەبوو بەو جەستە و قەڵافەتە نابووتەی وەبەر چاوی هیچ کەسێک بکەوێ. ئاوا بە غیرەت و فیداکار بێ ئاخر کەریم و ئەوەندە غیرەتە؟ کەریم و ئەوەندە گەورەیەتی ڕووح؟ کەریم و ئەو هەموو لێدان و ئازاردان و بێحورمەتی و جنێو و ڕووحێکی ئەوەندە بەرز و ئینسانی؟ حاجی بەخۆی دەکوت: «ناچێتە

مێشکمەوە، ئەقڵ نایبڕێ، هەڵەیەک هەر لە گۆڕێدا هەیە، ڕاستی مامۆستاکەی کێ بوو؟ خۆ دەرسی ئاسایی مەدرەسەی بۆ نەدەخوێندرا! هەرچەندە لە کاری ئاسنگەریدا گورج و توندوتۆڵ بوو بەڵام ئاسنگەری تەنیا مەچەکی پیاو ئەستوور دەکا، لەش و ئەندامەکانی قایم و پتەو دەکا. دەمارەکانی دەست و بازووی مرۆڤ وەدەر دەخا، بەڵام پێم وانییە ئەم کارە هەستی گیانبازی و مرۆڤدۆستی پێک بێنێ. بەڵێ پێشتر هەبوو کەسێکی ئاسنگەر، خۆ بەختکەر، کاوە، کاوەی ئاسنگەر، ئەویش هەر وەک خۆم ئاسنگەر بوو. دژ بە زوحاک ڕاپەڕی و خرۆشا بەڵام ئەویش لەپێش‌دا کە هەستا لە بەر خەڵکی ڕانەپەڕی، لەبەرخۆی بوو، لەبەر کوڕەکانی کە بڕیار وابوو دەرخواردی مارەکانی سەرشانی زوحاکی بدەن، من کە هەر هیچ. بەڵام کەریم لەبەر کێی بوو؟ خۆی هێشتا منداڵ بوو، تەواو هەڵێنەدابوو. نازانم بڵێم چی؟ نازانم ئەو کوڕە ئەم دەرسانەی لە لای کێ خوێندبوو، ئاخۆ لە ژیانی وەڕەز ببوو؟ یانی من ئەوەندەم لە گیانی خۆی وەڕەزکردبوو؟ ئەوە ڕاستە کە جار جارە – حاجی لێرە کە تەنیا بوو و نەیتوانی لەگەڵ خۆی درۆیە بکا وشەکانی گۆڕی- بە قسەی ئەو ژنەتیوە سەگسارەیە جنێوم پێدەدا. بەڵام پێم وابوو دایکی لەبەر عاملاندن و پەروەردەکردنی وا بە گژی دادێتەوە. خۆ ئەگەر بمزانیبایە خۆشی ناوێ هەرگیز – حاجی هەر لێرە ڕاوەستا، زانیی خەریکە بە درۆ خۆی فریو دەدا ئەویش وەک هەموو کەسی‌تر لەم کاتانەدا وازی لە تەواوکردنی قسەی هێنا- بیری چوو بۆ لای نووسراوەکەی «مەلا». لەو دەم ڕا کە حەسەنی برای دەسخەتەکەی «مەلا»ی دابوویە دەستی و بابم چەندین جاری بۆ خوێندبۆوە تاکوو توانی لەبەری بکا تا ئێستا کە بۆ هەلاتنی لەدەس درۆیەکی کە خەریک بوو خۆی پێ فریو بدا، ئەگەر ژمارەی خوێندنەوەی نووسراوەکەی «مەلا»ی ڕاگرتبا لەوانە بوو کە گوتبای سەد جارم خوێندۆتەوە، ڕاستی نەگوتبێ، چونکە بێ‌گومان زۆر زۆرتری دووپات کردبۆوە. بە تایبەت بە خوێندنەوەی ئەو ڕستەی کە مەلا نووسیبووی «برای بەڕێز و خۆشەویستم حاجی‌محەممەد» هەستێکی سەیر سەرتاپای لەشی حاجی دادەگرت. لەوەی کەریمی لەدەس دابوو بە ڕاستی لە خەم و پەژارە دابوو، بەڵام هەرکە وەبیر دەسخەتەکەی «مەلا» دەکەوت و ئەو

تاریفانەی کە لە حاجی کردبوو، هەروەک بابی قارەمانێکی نەتەوەیی، وردە وردە لە ڕادەی خەم و پەژارەکەی کەم دەبۆوە. کەم دەبۆوە، کەم دەبۆوە تاکوو خەمەکە دەبوو بە خۆشییەکی بچووک لەنێو دڵی حاجی محەممەددا. حاجی یارمەتیی ئەم خۆشییە بچووکەی دەدا تا گەورەتر و زۆرتر بێ، تا بگەشێتەوە و سەرهەڵدا و بێتە بزەیەکی شیرین لەسەر لێوەکانی حاجی: «بڵێی وەستا محەممەد و کاک قادر نووسراوەکەی «مەلا»ی ببینن چ حاڵێک پەیدابکەن؟ بیرۆکەیەک هەروەک برووسکە بە مێشکیدا داهات، «بڵێی کاک قادری خەیات پێی خۆش نەبوایە باقی لە جیات کەریم کوژرابا؟ بەڵام کوڕەکەی کاک قادر زیندوو گەڕاوەتەوە، کوڕەکەی وی خوێڕی بووە. دەتوانین بڵێ بۆخۆی خوێڕی بووە، کاک قادر ناتوانێ قارەمانێک بێ، بابی قارەمانێک بوون، بەچەشنێک یانی خۆشی قارەمانە. حاجی ئەوەندەشی دەزانی کە ئەو خۆشییە، خۆشییەکە، کە هەرگیز ناتوانێ لە لای هیچ کەسێک دەری ببڕێ و هەر لێرەدا حاجی بوو بە خاوەن ڕازێکی نهێنی، ڕازێکی کە تەنیا دەوێرێ جار جارە بە خۆی بڵێی بە مەرجێکی تەنیا بێ، پێی سەیر بوو، کە مەرگی کەریمی کوڕی ئەوەندەی پێوەندی لەگەڵ ئاوات و ویست و ئارەزووەکانی ئەو هەبوو. دەبوو کەریم نەمێنێ تا حاجی هەمان پاڵەوانی هەمیشەیی ناوخۆی بێ.

: «کچێ حاجیژن! بەخاتری خودا بەسە. خۆت کوشت بۆ وا دەکەی. دەبێ لەجیات ئەو شین و شەپۆڕەی دەیگێڕی شوکری خودای بکەی. ئەوەتا ئەو تاقە کوڕە جوانەی دەروێش ڕەحمان هەر دەتگوت یۆسفی میسرییە چۆن لە ناکاو خۆی هەڵاوەسی و تا دوو ڕۆژان کەس نەیزانی خۆی کوشتووە. بەس نییە کوڕەکەی تۆ قارەمانێکە، چ دایکێک هەیە کەپێی خۆش نەبێ کوڕی وەک کەریم نەچێ؟ وامەکە لە جیاتی تا دەتوانی فاتیحای بۆ بەرێ بکە. کوڕەکەی تۆ شەهیدە، نابێ لەبیر بکەی کە تۆ تازە دآیکی شەهیدی. بێشک خودا بەخاتری ئەو شەهیدە لە هەموو گوناحەکانی تۆش خۆش دەبێ، بەسە. با چیدیکە ئەو عالەمەش لەبەر تۆ وا قوڕ نەپێون، لەجیاتی دوو دۆعای بۆ بکەن، حاجیژن! باش دەزانم زگ سووتان چەند ناخۆشە! مرۆڤ بۆخۆی بمرێ خۆشترە تا ئەولادی، خۆم بەسەرم هاتووە، سەد بڕیا هیمنیش چارەنووسێکی وەک

کوڕەکەی تۆی دەبوو، کوڕەکەی من عەرز گرتی، قوتی دا. ئێستاش نازانین ماوە یان مردووە؟ ئەوە بیست ساڵە شەو و ڕۆژ چاوم لە  درگایە بڕیوە، هەر بەخۆم دەڵێم «ئەها هەر ئێستا لەم درگایە وەژوور دەکەوێ.» لە پڕ خات مەنیج کە ئەم قسانەی بۆ ژیرکردنەوەی حاجیژن دەکوت لە گابۆڕی دا. چ شینێکی گێڕا!! حاجیژن جار جارە لە بنەوە، چاوێکی لە بووکهەنار دەکرد. پێی ناخۆش بوو بە قسەی نەکردبوو لە ماڵە بابی نەمابۆوە. هەرچەند حاجیژن زۆر وەستایانە و بەجێ شین و شەپۆڕی دەگێڕا. بەڵام بوونی بووکهەنار لەوێ، جار جارە وەبیرشتێکی ناخۆشی دەهێناوە، شتێکی ناخۆش هەروەک بۆنێکی ناخۆش. بۆنێکی ناخۆش کە یەک دەم واز لە لووتت نەهێنێ. هەروەک ئەوە دەچوو کە کەلاکێکیان لەناو دەروونتدا ناشتبێ ئەویش کەلاکێکی بۆگەن، و چیت پێ دەگەڵ نەکرێ، بووکهەنار لەبەر چاوی حاجیژن ببوو بە ئاوێنەیەکی باڵانوێن، چەندەی پێخۆش بوو توانیبای ئەوەی بەردی دنیایە دەو ئاوێنەی گرتبا و ورد و خاشی کردبا. بەڵام هیچی پێ لەگەڵ نەدەکرا. حاجیژن تازە لە ئیختیاری دەرچووبوو. ببوو بە دایکی شەهید. کەریمی کوڕی گیانی خۆی بەخت کردبوو کە بتوانێ دەیان کەس لە مەرگ ڕزگار بکا، حاجیژن ڕێز و حورمەتی لەنێو ژنان سەد ئەوەندەی جاران چووبوە سەر. تەنیا ئەگەر ئەو دڕوویەی لە دڵی ڕۆچووبوو لێی گەڕابا. هەروا بەشین و لەخۆدان و سینگکوتان ڕووی لە بووکهەنار کرد و گوتی:

: «وەبیرت دێ بووکهەنار! سەدجار پێم دەگوتی ئەو کوڕەم ئەوەندە فیداکار و مرۆڤدۆستە ئەگەر خەڵکی داوای گیانیشی لێبکەن لێیان دریخ ناکا. دیتت ڕاستم دەگوت؟»

بووکهەنار کە چاوەڕوانی مردنی خۆی دەکرد نە ئەم پرسیارە بەبێ هیچ بیرکردنەوە و ڕاوەستانێک گوتی: «ئامۆژن هەرچی بفەرمووی هەروایە.»

حاجیژن توانی بۆ ساتێک ئەو دڕوویەی لەناو دڵی دەرکێشێ....

***

# ٦٢

....... گومان لەوە دانییە کە دوکتور پشتی سۆفی حەسەن عەمەل دەکا. ئەو جۆرەی وێدەچێ، سۆفی حەسەن پردێک بوو کە دەبوو ڕابردووی دوکتور بەختیار لە ئیمڕۆی کاوەیس پێوەند بداتەوە. بە پێچەوانەی من، ئەودەم لە سابڵاغ کە دووبارە چاوم بە ڕووی نازێ هەڵاتەوە، و بە تەواوی وازم لە ئیستێ و سبەی هێنابوو و هەر دەجەغزی ڕابردوودا دەسووڕامەوە بە چەشنێکی زەمان بۆ من تەنیا یەک شکڵی هەبوو ئەویش ڕابردوو بوو دوکتور بە تەواوی لە ڕابردووی دابڕابوو و تەنیا لە ئێسستا دا بیری لە سبەی دەکردەوە، ئەوە ئەرکی سۆفی حەسەن بوو کە دەبوو دەستی دوکتور بگرێ و بیباتە ئەو شوێنەی کە بەڕاستی دەبوو هەر لەوێش بێ.

ئەوەی منی هان داوە ئەو شتانە لێرەدا بنووسم، چەند مەبەستە، هەوەڵ هەرچەند هەمووومان بە پێی ئەم ڕۆمانە دەزانین دوکتور زۆر بە ئەزموون و بە تەجرەبەیە و شارەزاییەکی بێوێنەی لە عەمەل کردندا هەیە. بەڵام نابێ لە بیر بکەین، هەر عەمەلێک لە قاعیدە و ڕیسایەکی نادیاری سەربەخۆ پەیرەوی دەکا. واتا بە ئەزموونترین و شارەزاترین دوکتورەکانی جیهان لە کاتی عەمەل کردندا ناتوانن لە سەداسەد ئیدەعا بکەن سەرکەوتوو دەبن. هەرچەندە دەزانم ئەو هەموو حەول ودەول و زۆربڵێیەی سۆفی حەسەن لە زۆر جێگادا خوێنەریش وەڕەز دەکا و لەوانەیە بڵێن هەروەک ئەو دۆستەی من کە دەیکوت: پەککوو ئەو سۆفی حەسەنەش زۆری لێدەڵێ، کاکە ئەم هەموو کوتنەی ئەم کابرایە حەشوە، لە بایخی ڕۆمانەکە کەم دەکاتەوە.»

وێڕای وەباڵ کێشان بۆ ئەم ڕاستییە خۆ لە دەستی من نایە سۆفی حەسەنی بەدەست دوکتور بەکوشت بدەم  پێتان وایە لە خۆڕایی فاتێ زیاد لە هەموو جێگەیەکی پشتی دەیەشێ؟ یاکوو دوکتور بەختیار یان کاوەیس زیاد لە هەموو ئەندامانەی لەش خۆ لەخۆڕا ناچێ تەخەسووسی ئێسک واتا ئۆرتۆپێدی وەربگرێ. لە لایەکی تریشەوە نازانم ئەم هەڵەیە لەمن ڕووی داوە یان لە سۆفی حەسەن کە کێشەیەکە بۆ منی نووسەر ساز بووە. هەڵبەت نە لە عالەمی ڕۆمانەکەدا، خودا هەڵناگرێ تا ئێستا هیچ کام لە کەسایەتییەکانی ئەم ڕۆمانە بچووکترین گلەیییەکیان لە سۆفی حەسەن نەبووە. بە داخەوە ئەم کێشەیەم لەدەرەوەی ڕۆمانەکە بۆ سازبوو، ئەو دۆستەی کە بە ڕۆمانەکەدا هاتبۆوە دەیکوت: «ئەرێ بابە ئەم کابرایە کێیە؟ لە لایەکی ئەوەندە بەستزمان و فەقیر و دەستەوەستانە کە مێش لەبەر دەمی هەڵنافڕێ و لە لایەکی تریش، حازرە لەگەڵ سۆقراتی حەکیم شەڕەپارووی بکا؟ هەرچەند باش نییە ئەوەی بڵێم بەڵام دەیڵێم کە منیش لەگەڵ بۆچوونەکەی هاوڕێم، هەڵبەت گومان لەوە دانییە کە خەتایەکە لە لایەن منەوە ڕووی داوە. من بەپێی ویستی سۆفی حەسەن کە نەیدەویست هەرگیز خۆی ئاشکرا بکا، هەر ئەوەندەم باس لێکرد کە خۆی ئیزنی پێدام، بەڵام ئێستا کە وای لێهات هەرچەند دڵنیام کردبوو کە ڕازی ژیانی نادرکێنم، چارم نییە، ئەو سوێندەی بۆ سۆفی حەسەنم خواردبوو لە بیر دەکەم. لە پاشان کەفارەکەی بۆ دەدەم، چونکە چارەی هێندێک لە کەسایەتیی  ڕۆمانەکە لە کەسایەتی ئەو گرێ دراوە. کە وابوو با ئەوەش بڵێم بە پێچەوانەی قارەمان و کەسایەتی نووسەرانی تر کە گوێ لە مستی نووسەرەکەیانن. ئەوانەی ئەم ڕۆمانە وانین زۆر جار بۆخۆیان ڕوویان لە جێیەکی کردووە کە هەرگیز بە دڵی من نەبوو. بڕوام پێبکەن هەرگیز نەمدەویست ئەو ئامینە شەلە، تا ئەو ڕادەیە چەواشەکار بێ، ئەگەر بزانن چەندەم ئامۆژگاری کردووە، کەچی هەر ئەوەی بۆخۆی دەیویست ئەنجامی دەدا، هەروەها ئەگەر ئەو فاتێیەی وا ئێستا ماوەیەکی دوور و درێژە لە جێگادا کەوتووە بە قسەی منی کردبایە

نه بە قسەی براکانی، دەبوو ئیزن بدا کاوەیس زۆرتر لەگەڵی بدوێ و لێی دڵنیا بێ تا ئەو هەموو گێرە و کێشەی لێ نەکەوێتەوە. یان ئەگەر فاتێ بە قسەی منی کردبا، ڕێگایەکم بۆ دەدۆزییەوە کە بە لێدان و کوتانی براکانیشی مێردی بە حەمە ناحەز نەکردبا، هەر چەند ئەودەم کە مێردی بە حەمە ناحەز کرد پێی وابوو کاوەیس مردووە و ئەو مێردکردنەی وەک خۆ لەناو بردنێک دەدیت و هەروەها، نازێ. ئاغای «قاف». ئەو سۆفی حەسەنە، کە لە پێش‌دا زۆری تێدا شل‌وکوت بووم، کە کاکە! وەرە کەسایەتی ڕاستەقینەی خۆت بە خەڵکی بناسێنە. تاکەی دەتهەوێ خۆت لە خۆشت بشارییەوە؟ بۆ ئەوەندە خۆت ئازار دەدەی؟ من وەک نووسەر پرسیارم لێدەکرد ئاخر سۆفی حەسەن‌گیان! چۆن دڵت دێ بە حەلیمی خێزانت نەڵێی کێی؟ چۆن توانیت  پەسەند بکەی کە غەفووری خۆشەویستت، غەفووری جوانەمەرگت، نەزانێ بابی کێ بووە؟ مەگین ڕووداوەکە خەتای تۆ بوو. مەگین تۆ خەیانەتت پێکردبوو کە خۆت سزا دەداوە، مەگین تۆش یەکێ لەو کەسانە بووی کە قامکت پێوەنا کە پێشەوا قازی محەممەد دەبێ لە قەنارە بدرێ. تۆ کە زۆر لە نیزیکەوە دەتناسی، مەگین لەبیرت چۆتەوە ئەوێ شەوێ چەندە تۆ و چەند کەسی‌تر لێی دەپاڕانەوە کە شار چۆل بکا و وەدەر کەوێ. مەگین هەر خۆت پێت نەگوت: «قوربان وەرە بە قسەم بکە، هەر خەبات و ڕاپەڕینێک ڕابەرەکەی لە دەست بدا. تێک دەشکێ، ئەوانە بۆ متمانە نابن وەرە تا درەنگ نەبووە لەگەڵ بارزانی وەڕێ کەوە.»

مەگین لێت تووڕە نەبوو. توند بە گژتدا نەهاتەوە و نەیگوت: «تۆش مەلا حەسەن! تۆش ئاوا بیر دەکەیەوە. کە من دەبێ خەڵکەکەم بەجێ بهێڵم؟»

تۆ گەڕایەوە و پێت گوت: «قوربان دەترسم بەڵایەکت بەسەر بێنن.»

: «بەڵا لەوەی گەورەتر کە بەسەر میللەتەکەمان هاتووە؟ لەچی دەترسی؟ لە گیانی من؟»

سۆفی حەسەن مەگین ئەو شێعرەی حافزی بۆ نەخوێندییەوە.:

گفت آن یار کزو گشت سر دار بلند جرمش این بود که اسرار هویدا می‌کرد

دەڵێم: دەی کاکی من سۆفی حەسەن! تۆ بۆ لەخۆت و لە خەڵکی زیزی؟ خۆ دەتزانی لە دەورووبەرت چ دەگوزرێ. ئەوەندەی بزانم ئەودەم تۆ سۆفی حەسەن نەبووی، مەلا حەسەن بووی، بەهۆش، تێگەیشتوو خوێندەوار و قسەخۆش و دڵسۆز. سەرجەم بە قسەی یەکێ لە هاوڕێکانت، ئاردیبەهاروو. پێم دەگوت «مەلا حەسەن! ئەگەر لەبیرت بێ، پێت داگرتبوو کە هەر پێت بڵێین فەقی حەسەن، تا ئەودەم کە لەو کۆڕەی کە هەژار و چەند شاعیری تریشی لێبوو مەلا مستەفا چی پێگوتی؟ ئەگەر لەبیرت نەکردووە خۆت بیڵێ چیی گوت؟ چی؟ ناتهەوێ بیڵێی؟ زۆر باشە. من دەیڵێم، هەرکە قسەکانت تەواو بوو گوتی: «کاکە ئەوەی بەتۆ دەڵێن فەقێ حەسەن، زۆر لەخۆڕایی وا دەڵێ، ئەگەر تۆ مەلا نەبی منیش مەلانیم.»

پێی دەڵێم: «کاکە! تۆ لەچی نیگەرانی؟ تۆ کە لە جیهانی واقیع دادەبڕێی و دەچییە نێو جیهانێکی‌تر، ئیزنم بدەیە بەشێک لەم زانیارییانەی کە دەیزانی بدەمە دەست خوێنەرەکانم، با بزانن کە تۆ کێی؟ با کەسێک وابیر نەکاتەوە کە تۆ مرۆڤێکی مردەلۆخەی سوورەچۆمی، هەرکە پێت دەگاتە شاری تاران لەپڕ دەبێ بە مارسێل پرۆست و دەس دەکەی بە گێڕانەوە بە دوای گێڕانەوەدا لە کەسایەتی و ژیان و بەسەرهاتی خەڵکێکی مردوو لەنێوقالب و پێستی ویشک هەڵاتووی خۆیان‌دا، و بێخەبەر خەریکی ژیانی مردنیانن و تۆش وایان لێدەدوێی کە وەک پینەیەکی زەق بە ڕۆمانەکەی منەوە نووساوە و هیچ چارەم نییە بەدەر لەوەی کە حەقیان بدەمێ نارەزایەتی خۆیان دەرببڕن و بە ناچار هەر لێرەدا بڕیاری خۆمت لەگەڵ تێکدەدەم، هەرچەند دەزانم توورەکردنت بە قازانجم نییە چونکە لە پاشان زۆرم کار پێت دەبێ، بەڵام من تازە بڕیاری خۆم داوە و لێی پاشگەز نابمەوە. تا نەکەوتوویە ژێر چەقۆی دوکتور، من تیشک دەخەمە سەر گۆشەیەک لە ژیانی ڕابردووت. هیوادارم جارێ بە

گوێی حەلیم و خەڵکی سوورەچۆمیٚ نەگاتەوە دەنا نازانم چۆنت لەگەڵ دەجووڵێنەوە کاتێک تێبگەن نێزیکەی دەیان ساڵ لەو کەوڵەیدا کە بەسەر سەری خۆت کێشابوو فریوت داون.

پێی دەڵێم: «مەلا حەسەن! نامهەویٚ کە تۆ ئاکار و ڕەوشت و بیروباوەڕ و ڕاوێژی خۆت بگۆڕی هەرگیز، بەڵام خوێنەری وریا و شارەزای ئیمڕۆ پرسیاریان بۆ دێتە ئاراوە. هەر پرسیارێک لە زاتی خۆیدا نەقوستانێکە واتا ناتەواوێکە کە لە تەواوبوون دەگەڕیٚ. تەواوبوونی ئەو ناتەواوە پێوەندی هەیە بە وڵامەکەی تۆوە بەو کەسایەتییەی بۆخۆتت ساز کردووە، تۆ کە ناتوانی وڵامی هیچ کام لە پرسیارەکانی خوێنەرەکان بدەیەوە. هەر لەبەر ئەوەیە خۆم دەربارەی تۆ ئەوەندەی کە دەیزانم پێیان دەڵێم. دەزانم کە ناتوانم هەمووشتێکیان پیٚ بڵێم، نەتەنیا من. بەڵکوو هیچ نووسەرێکی تریش ناتوانیٚ، تەنانەت ڕێپین نەققاشی بە ناوبانگی ڕووس کە ماوەی چاردە ساڵ دەگەڵ کووڕێکی سواڵکەر ڕۆژوشەوی بردە سەر تا بتوانیٚ بەتێکەڵاوبوون لەگەڵی، تایبەتمەندییەکانی ڕووحی و ڕەوانی ئەو ناس بکا و لە ئەو وێنەی کە لێی دەکێشێتەوە نیشانی بدا. هەرچەندە کە لە کێشانەوەی وێنەکەیدا بە ڕاستی سەرکەوتوو بوو. بەڵام بە ڕاشکاوی دەڵێم لە ناسینی ڕووح و ڕەوانی کووڕە سواڵکەرەکەدا سەرکەوتوو نەبووە. چون هەروەکوو هیراکلیت دەڵیٚ هەرگیز هیچ مرۆڤیٚ ناتوانیٚ دوو جار لە چۆمیٚدا مەلەی بکا» بەڕای منیش هیچ مرۆڤێکیش ناتوانیٚ دوو جار یەککەس ببینیٚ، ڕێپین تەنیا کارێکی کە بە باشی توانی ئەنجامی بدا ئەوە بوو کە بەبیٚ ئەوەی عەینی خەیاڵی بیٚ، وازی لە چاردە ساڵ تەمەنی خۆی هێنا، ئەو تەنیا چرکەیەکی لە ژیانی کووڕێکی سواڵکەری بە چاردە ساڵ عومری خۆی کڕی، هەڵبەت لەبیر نەکەین لەم ئاڵوگۆڕەدا، شاکارێکی هونەریش خوڵقابوو کەئەویش بەشی مرۆڤ بوو کە لەو مامڵەدا وەچەنگی کەوت.

سۆفیحەسەن کە بە منداڵی بابی لە دەست دەدا. خاڵی دەستی دەگریٚ دەیبا لە سابڵاغ لە حوجرەی فەقێیان وەبەرخوێندنی دەنیٚ، لەو مامۆستا

تا ئەو مامۆستا شوێنێ نامێنێ کە لێی نەخوێندبێ، ڕەنگە سەبارەت بەم شتانەی دەیانڵێم لە سۆفیحەسەن پرسیار بکەن هەر سەر ڕاوەشێنێ، وەئەستۆی نەگرێ، بەڵام من ئەم زانیارییانەم سەردەمێک لە زمانی خۆی بیستبوو کە لە کۆمارەکەی مەهابادا بوو و زۆر لە پێشەوا نیزیک بوو. لە برای خۆی زۆرتری متمانە پێ دەکرد لە پێشەوا و چەند کەسی نیزیک بە پێشەوا بەدەر، کەس مەلا حەسەنی نەدەناسی. بەڵام دەوڵەت ئاگاداری بوو. یەکێ لەو کەسانەی دەوڵەت بە شوێنیوەی بوو مەلاحەسەن بوو. مەلا حەسەن ڕای لەسەر ئەوە بوو کە پێشەوا خۆی بە دەستەوە نەدا، ڕای لەسەر بەرگری کردن بوو. بەڵام هاودەنگی نەبوو. بە ئەمری پێشەوا لە شار وەدەرکەوت. ڕەگەڵ مەلا مستەفا و پێشمەرگەکانی دەکەوێ. لە تەواوی ئەو شەر و پێکدادانەی بارزانی دەگەڵ هێزەکەی ئێران کردی تێدابوو تا سنوور هەر لەگەڵ مەلامستەفا بوو. کە زانی مەلا مستەفا بە نیازە بۆلای یەکێتی سۆڤیەت بڕوا، ئیزنی لێ وەرگرت و ڕووی دەلای سەردەشت کرد بە هیوا بوو ئاودیو بێ. نەیدەتوانی هەرەس هێنانی کۆمارەکەی بەچاو ببینێ. تا دوایی هاتنی کارەساتی پێشەوا، هەروا بە بەرگی شوانی و نەناس لەم دێ بۆ ئەو دێ دەخولاوە، شەو و ڕۆژ خەریکی خوێنی دڵ خواردن بوو، ڕدێنێکی زۆری هێشتبۆوە، هەروەک شێتان، لەبەری بەیانەوە تا شەو دادەهات بەنێو دار و دەوەن و جەنگەڵ و لێڕەوار و ئەشکەوتان‌دا دەسووڕاوە. لە ژیانی وەڕەز ببوو، بەڵام ئیزنی خۆکوشتنی بە خۆی نەدەدا. ناچار لێبڕا بە چەشنێکی‌تر خۆی لەناو بەرێ، ڕۆژێکی لە پاش ئەوەی لەبەری بەیان تا درەنگی شەوان، لەسەر تاتە بەردێکی هەڵکورما و سەری بەرداوە و دوو ئەژنۆی بە دەستەوە گرت جلەوی ئەسپی سەرکێشی بیری ڕەها کرد و خۆی بە دەستی چۆن دەبێ و چ بکەم و ڕوو لە کوێ بنێم و.... ئەسپارد کە لەپڕ ئەوە بە بیری داهات کە وا باشترە لە قالب و چوارچێوەی خۆی بێتەدەر. کاتێ کۆمارێ نەماوە مەلاحەسەنێ بۆ بمێنێ؟ هەر ئەوە بوو کە مەلاحەسەن لەسەر تاتە بەردەکەی یەکجێ بوو بە سۆفی حەسەنی ئارام و بێدەنگ و بە

دڵودەروون، وەها چوو دەپێستی ئەو پیاوە سادە و ساویلکە و باشەی کە زۆر جاران ڕێی ماڵە کەسایەتی پێشووی خۆی پێنەدەزانییەوە. هەروەک پێشترزانیمان چەند جارێک کە لە لای سوورەچۆمێ تێپەڕ دەبێ تووشی هەمزاغا دەبێ و چۆن خۆی وەک مجێور دەناسێنێ بە پێشنیاری هەمزاغا دەبێتە مجێوری مزگەوتی سوورەچۆم. هەر لەودەمەوە تا ئێستا کە من پەردە لەسەر ڕابردووی هەڵدەدەمەوە، دڵنیام ئەگەر چارڵتون هۆستون یان کلارکگیبل و یان ئانتۆنی کۆئێن چووبا دەقاڵبی سۆفیحەسەن بە قەرا ئەو سەرکەوتوو نەدەبوو! بەڕاستی هیچ نیشانە و ئەسەرێک لە مەلاحەسەن دە سۆفی حەسەن‌دا نەدەدیترا. بەدەر لەوە جارجارە کە دەگەڵ کەسێکی خوێندوار دەکەوتە ئاخاوتن بە دەس خۆی نەبوو جۆرێک دەدوا کە کابرای لێی وەسەر شک دەگەڕا کە ئەوە سۆفی حەسەنە ئەم وتانەی لە زاری دێتەدەر؟ ئەو ماوەیە کە دەگەڵ دوکتور ڕاییوارد و ئەو وتوویژەی لەگەڵی دەیکرد، ئەو دۆستانەی منی کە بە کتێبەکەدا هاتبوونەوە وادار بە ڕەخنە لەمن کرد تا ئەو جێیەی من ناچار بووم سوێندێکی خۆم بکشێنم و ڕازی شاراوەی سۆفیحەسەن ئاشکرا بکەم و فەسڵێک لە خۆڕا بە کتێبەکەم زیاد بکەم کە هەم خوێنەر و هەم ئەو برادەرانە و هەم ئەو تایپیستە.... بگرە زۆر کەسی تریش تووشی زەحمەت بکەم. خوابکا لانی کەم ئەو دوو دۆستەی خۆم، هەر بە وەندەی لێم ڕازی بووبن.

***

## ٦٣

...... تازە هاتبووینەوە سابڵاغ، ئەودەمی بوو کە نازێم لێ ون ببوو، ڕۆژ نەبوو بە دەستێوە ئازار نەکێشم. فیکر و خەیاڵی نازێ دەڵێم. ئەودەم کە لە سەردەشت بە یەکەوە بووین نەمزانیبوو شتێک لەنێو چاوە جوانەکانی نازێ پەڕیوەتە نێو چاوەکانی من کە ببوو بە پەردەیەک و بەسەر چاوم کێشرا بە چەشنێکی ئیتر کەسێکی ترم بەدەر لەوی نەدەدیت. من نەمدەزانی نازێ منی تەلیسم کردووە، هەر نەمدەزانی تەلیسم چییە؟ زۆر دەرنگتر زانیم، دەمزانی بەڵایەکم بەسەر هاتووە بەڵام نەمدەزانی ناوی ئەو بەڵایە چییە؟

ماوەیەک بۆ میوانی چووبوومەماڵە خاڵم. بەڵام ئەوە درۆیە. وانەبوو. من لە ماڵە خۆمان ڕام کردبوو. نەخۆش ببووم. ئەوەندە نەخۆش و کەلەلا کە چەقۆم نەدەگەیشتێ. ڕاست وەک ئەو دەم کە پاش ونکردنی نازێ لە سەردەشت نەخۆش بووم. دوکتور ڕایسپاردبوو چم نەدەنێ. ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژێ پتر لە کزیم دەدا ئەو هەموو شەربەت و داوودەرمانە کە دەگەڕوویان دەکردم هیچ دەفریام نەدەهاتن، دیارە ئەو داوودەرمانە کە بە زگی برسی و زۆرتر خورێن دەرخواردیان دەدام دەبێ چی بەسەر نەختە ئینسانێکی وەک من بێنێ. وەها لەر و لاواز ببووم کە مەترسی لە خۆڕا شکانی ئێسکەکانم دەکرا. دوکتور قەدەغەی کردبوو کە بەدەر لە ئاشێکی کە بە ماستی دروست کرابێ چیتر نابێ بە گەرووی‌دا بچێتە خوار. ئێوە قازی بن من کە بە نەوسنی لەنێو خزم و تایفەش‌دا نێوبانگم دەرکردبوو دەبێ چم بە دەس ئەو نەخۆشییەوە چێشتبێ؟ ڕۆژێک بەیانی زوو کە لە خەو هەستام، دیتم کە لە گیانم تێر بووم. پێم خۆش بوو هەرچی زووترە بمرم، ئەوەندەم غیرەت نەبوو بەڵایەک بەسەر خۆم بێنم، داخڵێکم هەبوو هێندێک قەڕەپووڵم تێدا پاشەکەوت کردبوو، شکاندم، باوەڕم نەدەکرد توانیبێتم ئەوەندە پووڵ کۆ بکەمەوە، هەشت تمەن و نۆقڕانی تێدابوو. خستمە ناو گیرفانم. زستانێکی

سەخڵەت و ناخۆش بوو. خۆم بە باشی داپۆشی، هێندێک بەنێو شەقامەکانی شاردا خولامەوە. لای ساعەت یازدە بوو کە لە برسان خۆم دە کەبابخانەیەکی ڕۆکرد.

: «کاکە! بیَزەحمەت چوار کەباب و سێ نانم بۆ دانێ»

: «ڕۆڵە! دەیبەیەوە ماڵێ؟»

: «نا، لێرە دەیخۆم»

کابرای کەبابچی کە چاوی بە قەڵافەتی بچووکم کەوتبوو کوتی

: «مەگین کەسێکی تریش دێتە لات؟»

: «نا، کاکە! بەتەنیام.»

: «ڕۆڵەگیان چوار کەباب بەمنیش ناخورێ. بالەپێشدا دوودانەت بۆ بێنم ئەگەر تێر نەبووی دوودانەی دیکەشت بۆ دێنم.»

: «نا، کاکە! ئەتۆ! چواردانەکەم بۆ بێنە ئەگەر تێر بووم بێنان دەیانخۆم.»

کەباب ئەودەم دانەی چوارقران بوو زستان بوو دەنا دوو باینجانیشم لەگەڵ دەخوارد، لەبەر چاوی واق وڕماوی کابرای کەبابچی هەرچوار کەبابەکەم بە سێ نانەوە خوار و پیپسێکیشم بەسەر داکرد و هاوڕێ دەگەڵ پووڵی کەبابەکان چەند قرپی دەنگداریشم پێشکەش بە کەبابچییەکە کرد.

: «ڕۆڵە گیان! ئەگەر بە قسەم دەکەی بە بابت بڵێ بتباتە لای دوکتور پێم وایە بەچە خۆرەت دەزگی دایە، تۆ کە ئێستا بەقەرا گونەبەرانێکی ئاوا خۆش ئیشتیای. بە قەرا بەرانەکەت لێ بێ دەبێ چەندە بخۆی.» چونکە تێر ببووم هەرگوێم بە قسەی کابرای کەبابچی نەبزووت. ماڵ وێرانە لەکوێ دەیزانی مانگ و نیوێکە ئەوەی چەورایی و شیرنایی و گۆشت و مۆشتە لە گەرووم نەچۆتە خوار، ئەودەم ئەوەندەم ئەقڵ هەبوو کە بەخۆم بڵێم  کاتێک دەبێ بمرم. بۆ بە زگی تێروتەسەلەوە نەمرم. خۆ لە قەدیمەوە باوە ئەو کەسەی دەیانهەوێ ئێعدامی بکەن، پێشتر ئەو چێشتەی پێی خۆش بێ دەیدەنێ و بە زگی تێرەوە دەیبەن بۆ ئێعدام. من لام وایە کابرای تێر کەمتر هەست بە ژان دەکا. لە کەبابخانەکە هاتمە دەر. فیکر، فیکر دەیجا بچمە کوێ؟ تازە نەمدەویست بچمەوە ماڵی خۆمان تا لە برسان بمکوژن، لەخۆم پرسیار

دەکرد بچمە کوێ باشترە؟ باشتر نا، خۆشترە؟ ئەوەی خاڵ و مام و پوور و باپیرو کەس‌وکارم بوون هەموویانم لەبەر چاو ڕیز کرد. هیچیانم پەسەند نەکردن بەدەر لە خاڵێکم نەبێ، وەجاغ‌کوێر بوو. وەڕێ کەوتم بۆلای ماڵە ئەوان، ئەی خودایە چ شتێک لە تێری خۆشترە؟ ئەویش تێر بی بە کەباب. باوی هەنگاوم زۆر خۆش ببوون. چاوم حوکمی زۆرتر ببوون. گەرمایەک خزابووە نێو لەشم، تاقەتێکم هاتبووە بەر. لە زمان گەورەکانمەوە بە خاڵۆژنم دەگوت عەممە.

: «سەلام عەممە! دایکم زۆری لێ دەپرسی کوتی دەتوانی یەک دوو ڕۆژ لە لایان بمێنیەوە.»

: «یاخودا بەخێر بێی ڕۆڵە گیان! چاک چاکت کرد هاتی. هەربینا خاڵیشت پەیدا بۆوە.»

خوالێی‌خۆش‌بێ، خەڵکی سنە بوو، چۆن تووشی بە تووشی خاڵم هاتبوو؟ هەرگیز نەمپرسیوە، چوومە بن‌کورسی، خۆم تێ‌ئاخنی تا ملان. زگی تێر و گەرمای کورسی لە ئامێزی خەویان هاویشتم. وەها خرپ بۆی نووستبووم دڵیان نەهاتبوو لەخەوم هەستێنن، ئێرەیی‌یان پێی بردبووم بۆ ئەو خەوە خۆش و گیان‌بەخشەی لە ئامێزی گرتبووم. لای ئێوارێ لە خەو هەستام.

: «ڕۆڵە گیان! وا خۆش بۆی نووستبووی، نە من و نە خاڵت دڵمان نەهات بۆ نەهار لە خەوت هەستێنین، دەزانم برسیتە. ئەوە دەچم شتێکت بۆ دێنم.»

پێم نەکوت چاک چاکتان کرد وەخەبەرتان نەهێنام. چونکە تازە چوار کەبابی حەمەشەلم بە سێ‌نانی تەواو خواردبوو. زۆری نەخایاند قاپێک بەربەسێڵی پڕ لە گۆشتی بۆ هێنام. جاوەرە تێی‌بکوشە و بیخۆ. کابرای کەبابچی ڕاستی دەکوت، پێم وایە بەچە خۆرەم دەزگی دایە تێربوونم نەبوو، لێواری قاپەکەشم بە قامکی لێستەوە و لێواری قامکەکانیشم بە زمان.

: «ئەی خودایە گیان! تێربوون چەند خۆشە. من ئێستا باوەڕم بەوەی هێناوە کاتێک کە زگت تێرە بەشی زۆری کێشەکانی ژیانت چارەسەر کراوە!!!»

من که بۆ نەهار نەچووبوومەوە ماڵ گۆیا نیگەرانم ببوون!! و تەنانەت وەشوێنیشم کەوتبوون!! تازانیبوویان ڕووم لەکوێ کردووە، خوشک و براکەمیان بە شوێنمدا ناردبوو، بەڵام ڕەگەڵیان نەکەوتم، نەچوومەوە.

گوتم: «بە دایک و بابم بڵێن تازە نایەمەوە ئەوێ. دەبم بە کوڕی خاڵم.»

لەسەر تاقچەی دیوەکەی خاڵم چاوم بە چەند کتێبی قەدیمی کەوت. سێحراوی بوون. لە داویان کەوتم، ئەمیر ئەرسەلانی ناودار، مەلیک جەمشید و فەلەک ناز، مەلیک بەهمەن، حوسێنی کوردی شەبەستەری، هەزارویەک شەو، بوونە هاودەمم. کە شەودادەهات خاڵۆژنم  شەوچەلەی دادەنا و لەبن کورسی لەگەڵ خاڵم گوێیان ڕادەگرت بەو بەسەرهاتانەی بۆم دەخوێندنەوە، چ ڕۆژگارێکی خۆش بوو! بەڵام بە داخەوە هەروەک شێخی سەعدی دەیفەرموو: «دولت مستعجل بود» دایک و بابم کە زانیبوویان کفنم دڕیوە. بە کەڵەگایەتی لەپاش مانگێک ژیانی خۆش و بەختەوەرانە بردیانمەوە سەر پەت و سینگی هەوەڵم. بەڵام لەو یەک مانگەدا چەند شتم وەدەس هێنا. هەوەڵ شت ئەوە بوو ئەو دوکتورەی منیان بردبوو، لای و دەستووری دمبەستنی منی دابوو، ئەگەر وەک منیان لێکردبا، یانی ماوەیەکی دوورودرێژ چییان نەدابایە بیخوا، دەکەوتە حاڵی جاوێ و هەتا ڕۆژێکی لە ماڵ ڕای نەکردبا و چوار کەبابی حەمەشەلی بە سێ نانان نەخواردبا تا ئێستا حەوت کفنی دڕاندبوو. دووهەم بە پێچەوانەی ئەم وتە باوە کە دەڵێن هیچ کوێ نابێتە ماڵی خۆت، من دەڵێم هیچ کوێ نابێتە ماڵی خاڵت بە مەرجێکی وەجاغ کوێر بێ و ژنەکەشی سنەیی بێ. سێهەم، هیچ خۆشییەک لە جیهان دا بەقەرا ئەوە خۆش نییە کە بە زگێکی تێر لە ژێر کورسییەکی گەرم دا کتێبی مەلیک جەمشید و فەلەک ناز بخوێنییەوە و لێی فێری زۆرشتان ببی، هەروەک من کە بە خوێندنەوەی ئەو کتێبە زانیم تەلیسم چییە؟ زانیم ئیوا هەن بەو توانایەی هەیانە شازادەیەک یان کەسێک دەکەن بە بەرد و تەلیسمی دەکەن تا ئەو ڕۆژەی تەلیسمەکە باتڵ نەکرێتەوە هەروەک هەیکەلێکی بەردین لەجێی خۆیان دەمێننەوە، من ئەودەم تێگەیشتم کە نازێ منی تەلیسم کردبوو. دڵمی ئەستاندبوو، دیارە مرۆڤێک دڵی نەبێ دەبێتە هەیکەلێکی بەردین. من

نەمدەزانی بۆ گەورە نابم و هەڵنادەم، نازێ کە ڕۆیشتبوو و دڵی منی دەگەڵ خۆی  بردبوو مابوومەوە هەروەک بەردێکی بێهەست و نەست، من زۆر درەنگ بەوانەم زانی، ئەودەم زانیم کە نوقمی جیهانی بێخەبەری خۆم لە کوڵان لەگەڵ چەند ئاواڵم کێبەرکێی دار و هەلووکمان دەکرد کە لەپڕ هەلووکەکە وەپشتی کچێک کەوت تا لە پەنای ئەودا کچێکیتر چاو دەچاوم ببڕێ و بە من بڵێ «بێتەربیەت». هەر ئەوە بوو. ئەم ڕستەیە هەمان ڕەمزی باتڵکردنی تەلیسمەکەی من بوو. من هەر ئەودەم وەجووڵە کەوتم، وە نەشە کەوتم وە گەشە کەوتم. لە ماوەیەکی کورتی چەند مانگەدا بەقەرا چەند ساڵی خەڵکیتر هەڵمدا. من بە یەکجاری لە زیندانی تەلیسمەکەم ئازاد ببووم، بەڵام بە داخەوە ئێستا کە بەخۆم دەڵێم خۆزگە ڕەها  نەدەبووم، خۆزگە هەرگیز نەدەهاتە دەر، خۆزگە هەرگیز نەمدیتباوە، خۆزگە جارێکیتر ڕاوی نەدەکردمەوە، خۆزگە، خۆزگە، خۆزگە.

***

## ٦٤

وەرە! بەهارێکم گەیوەتێ لە نەکاوێ!
بەیانی دەستم دەداوە شینکی چەخماغ خواری گەروومار قۆنداخ
ڕووم دەکردەوە چیایێ مەغلۆوبێ داسنیان هەر بە بیانووی ڕاوێ
ئەمن تەقەم دەهاتەوە لە تفەنگێ، کزەم دەهاتەوە لە هەناوێ
هەلینگم دەداوە وەمدەزانی نێرییە کێوییە
نەمدەزانی کاکە سەیدەوانە، دەگەوزییەوە لە گۆمیلکە گۆمیلکەی خوێناوێ!
ئەوە بەهارێکم گەیوەتێ کاکینە! بەڵام بەهارێکی لەمن هاڵۆزە!
ئەمن بۆت بە چیایێ مەغڵووبێ داسنیان هەڵدەڵێم
ئەوە لە من شین دەبوون؛ هەڵاڵە و بەیبوون و قۆپەنی دە شەنگە بیزاییە
هەرامەتی دەگوڵە نەورۆزە
ئەوە عەبدولعەزیزی داسنی! دەک ڕەبی چاوی جاسووسێت کوێر بێ،
قامکی پەلەپیتکەت شکێ،
شەرت بێ بە شەرتی خودا و ڕەسووڵان،
چیایێ مەغڵووبێ داسنیان لە خۆم حەرام کەم
نەگەمەوە ڕاوی نێرییە بەلەبۆزە!
بەهارێکم گەیوەتی ئەرێ کاکە سەیدەوانە گیان!
ئەوە بەهارێکی لەمن چەند گەشە!
ئەمن بۆت بە چیایێ مەغڵووبێ داسنیان هەڵدەڵێم
ئەوە لەمن شین دەبوون؛ هەڵاڵە و بەیبوون و قۆپەنی دە شەنگە بیزایە
هەرامەتی دە گوڵە وەنەوشە
ئەوە عەبدولعەزیزی داسنی!

دەک ڕەبی، چاوی جاسووسێت کوێر بێ
قامکی پەلەپیتکەت شکێ
شەرت بێ چیایێ مەغلٖووبێ داسنیان لە خۆم حەرام کەم
نەچمەوە ڕاوی نێرییە دە بەلەڕەشە!
بەهارێکم گەیوەتێ ئەرێ کاکە سەیدەوانە گیان! بەهارێکی لەمن بە غلوورە!
ئەمن بۆت بە چیایێ مەغلٖووبێ داسنیان هەڵدەڵێم
لە من شین دەبوو؛ هەڵاڵە و بەیبوون و قۆپەنی دە شەنگە بیزایە
هەرامەتی دە گوڵە سوورە
ئەوە عەبدولعەزیزی داسنی! ڕەبی چاوی جاسووسێت کوێر بێ
قامکی پەلەپیتکەت شکێ
شەرت بێ چیایێ مەغلٖووبێ داسنیان لە خۆم حەرام کەم
نەگەمەوە ڕاوی دە نێری بەلەسوورە!
بەهارێکم گەیوەتێ ئەوە کاکە سەیدەوان گیان! بەهارێکی لەمن بە دژە دژی!
ئەمن بۆت بە چیایێ مەغلٖووبێ داسنیان هەڵدەڵێم
لەمن شین دەبوو؛ هەڵاڵە و بەیبوون و قۆپەنی دە شەنگەبیزایە
هەرامەتی دەگوڵی، دە لەگزی
ئەوە کێ دیوێتی هەر لە دەورەتی دە زمانان
هەتا دەوری ئاخیری دە زەمانی پیر و پێشینان
باب بە دەستی خۆی کوڕی خۆی بگوژی!؟
بەهارێکم گەیوەتێ کوڕە گەلی دە دۆستان و دەبرادەران!
ئەوە بەهارێکی لە من هاری!
ئەمن بۆت بە چیایێ مەغلٖووبێ داسنیان هەڵدەڵێم
لە من شین؛ دەبوو هەڵاڵە و بەیبوون و قۆپەنی دە شەنگە بیزایە
گوڵووکە دەگەڵ گوڵەماری
وەرە کاکی خۆم! ئەوە داعبای کێوی

پۆلیان دەبەست و تەگبیریان دەکرد، دەیانکوت،
ئەو ڕاوکەرەی ئەمە لێی دەترساین، کاکە سەیدەوانە
هەر دەیانشوتەوە هەر لە سەر تاتەشواری![٦٥]

لە نێو ئاسنگەرییەکەی حاجیمحەممەد، کاک قادری خەیات کوتی: «بەناشکوری نایڵێم. دڵخۆشییەکەی جارانیشمان نەماوە! چابوو لانی کەم بە خەبەر و باسی ئەودیوەوە سەرقاڵ ببووین.»

وەستا محەممەد بە حاجیمحەممەدی دەگوت: «حاجیئاغا بە سەرت من پێشتریش لە لات باسم کردووە، هەر لە ڕۆژی هەوەڵەوە دەمزانی پشت بە شای ئێران بەستن، هەڵەیەکی گەورەیە، بۆمتمانە نەدەبوو. دیتت چۆن لەپڕ پشتی «مەلا»ی بەردا. دیتت لەبەر قازانجی خۆی لە چ کاتێکی ناسکدا دەستی دەنێو دەستی بەعس نا؟»

حاجیمحەممەد دەتکوت هەر لەوێ نییە. نیگای کەم حوکمی چووبۆوە دوور و توانای گەڕانەوەی نەبوو. کاک قادری خەیات وەک ئەوەی کە وەستا محەممەد پرسیارەکەی لەو کردبێ کوتی: «گومان لەوە دانییە کە هەموو کەس لەم دنیایەدا وەدوای قازانج و خێری خۆی دەکەوێ. دیارە ئەوە شتێک نەبوو کە وەبەرچاوی «مەلا»ش نەکەوتبێ. بەڵام من دەڵێم خۆزگە «مەلا» دەستی لە شەڕ هەڵنەگرتبا، یان هەموو بە یەکجاری تێدا دەچووین و یان سەر دەکەوتین.»

حاجی محەممەد کە دەتگوت ڕێگایەکی زۆری بڕیبوو، پیشێکی خواردەوە و کوتی: «من دەبوو زۆرتر چاوم لە سەر کەریم بوایە، دەبوو زۆرتر ئاگاداریم لێکردبایە، ئەرکی هەموو بابێک بەر لە هەرشت پاراستنی گیانی منداڵەکانێتی لە مەترسی نەمان و فەوتان.»

هەرتکیان بە بیستنی ئەو قسەیە لە دووی باسەکەیان نەدا.

***

---

٦٥- دەنگی بەیتی سەیدەوان تۆمارکراو لەرووی دەنگی مەحمەڵ.

## ٦٥

...... هەوەڵین شاعیری نوێخوازی فارس کە شوێنێکی تایبەتی لەسەر من دانا، مێهدی ئەخەوان سالس بوو. بە ناز ناوی «م. امید». دەتوانم بە ڕاشکاوی بڵێم کەس ئەو شاعیرە مەزنەی بە من نەناساندبوو، خۆم بە هەڵکەوت تووشی هاتم و بوومە میوانی شەو و ڕۆژی شێعرەکانی، ئێستاش لەپاش تێپەڕبوونی نێزیک بە چل ساڵ دەتوانم بڵێم بەشێکی زۆری شێعرەکانی ئەو شاعیرەم هەر لەبەرن، «کتیبە»، «چاووشی»، «خوان هشتم»، «و آنگاه پس از تندر» و «روی جادەی نمناک»، ئەودەمی نەمدەزانی بۆچی ئەوەندە ئەو شێعرەی دواییم پێ خۆش بوو، ڕۆژ نەبوو دووسێ جار لەبەر نەیڵێمەوە، ئەخەوان سالس ئەم شێعرەی پێشکەش کردبوو بە سادق هیدایەت نووسەری بەناوبانگ، ئەودەم سادق هیدایەتم بە باشی نەدەناسی، لێرەولەوێ شتگەلێکم دەربارەی بیستبوو بەڵام بۆخۆییم نەخوێندبووە، «بوفکور»ەکەی دیانکوت زۆرشتی تێدایە، کاری هەر کەسێک نییە سەرە دەرەی لێ بکا. وێدەچوو ئەخەوان سالس لەو شێعرەیدا کە پێشکەش بە ڕووحی سادق هیدایەتی کردبوو سەیر لێی نزیک ببۆوە.

«اگر چە حالیا دیریست
کان بی کاروان کولی، از این دشت غبارآلودە کوچیدە است
و طرف دامن از این خاک آلودە برچیدەست
هنوز از خویش پرسم گاە
آە
چە می‌دیدست آن غمناک روی جادەی نمناک؟
سادق هیدایەت خۆی کوشت.

سادق هیدایەت دەیگوت: «لە ژیان دا جار جارە برینێ دەکەوێتە ڕووحی مرۆڤ کە لە تەنیایی‌دا وەک خۆرکە وردە وردە ڕووحی دەخوا و لەناوی دەبا.»

هیدایەت کە خۆی کوشت، دیار بوو نەیتوانیبوو ئەو کێشە دروونیانەی چارەسەر بکا، بە ڕای من مەلاحەسەن عاقڵانەتر جووڵابۆوە، مەلاحەسەنیش خۆی کوشت بەڵام نە بەشێوەی سادق هیدایەت. مەلاحەسەن نەهات خۆی بە یەکجاری لەسەر ڕووی زەوی بسڕێتەوە. بەڵکوو هات‌و لە دەروونی کەسێکی‌تردا بەنێوی سۆفی‌حەسەن خۆی ناشت. لە ڕاستی‌دا مەلا حەسەن لە خۆ کوشتنێکی سەمبولیک‌دا، خۆی و تەواوی ڕابردوو و بیرەوەرییەکان و حەز و خولیاو ئاوات و ئارەزووەکانی خستە ناو جانتایەک و تەنانەت ناوەکەی خۆشی خستە ناوی و لە ژێر خاکی دەروونی خۆی بۆ هەمیشە ناشتی. خۆزگە هیدایەتیش ئیزنی بەو خۆرکەی ناو ڕووحی خۆی نەدابا و هەروەک مەلا حەسەن کە بوو بە سوفی حەسەنی بەستەزمان و بێ هەست و خوستی، پابەستی ژن و منداڵ، ئەویش ببا بە سۆفی سادق. مجێوری مزگەوتێک لە یەکێ لە دێهاتی سەربەشاری تاران و دەستێکی بەسەر سەری ژن و منداڵەکانی دەکێشا. هەڵبەت بە مەرجێکی ژنەکەی سۆفی سادق وەک ژنی سۆفی حەسەن، واتا حەلیم نەبوایە کە منداڵدانی نەخۆش بوو و بە هەزار پیروچاک غەفوورێکی بوو. من دەپرسم دەی ئەگەر سادق هیدایەت وەک مەلا حەسەن خۆی لەناو بردبا، هەستی ئەم شێعرەی ئەخوان سالیس کە لە دەروونی‌دا پەنگی دەخواردەوە دەبوو چی بەسەر ئەم شاعیرە خۆشەویستەی من هێنابایە. و من ئەو هەموو شێر و ڕێوییەم هەر لەبەر ئەوەی هێناوە کە بڵێم: سەدخۆزگە سادق هیدایەت لەبری خۆ کوشتن چارەیەکی بۆ ئازارە ڕووحییەکانی دەدۆزییەوە و ئەم ڕێگایەی نەدەخستە بەر چاوی ئەو کەسانەی تووشی ئەم چەشنە ئازارە ڕووحییە بوون. ئەودەم منیش دەمتوانی پێ لە جێی پێی ئەو زاتە مەزنە دابنێم. بەڵام داخی گرانم، من ڕۆژانێکی زۆر بە ترس و دڵەڕاوکەوە، بەخۆ دزینەوە لە خۆم و دەوروبەرم. بە ئاوڕنەدانەوە لەوەی کە داخوا چیم بۆ دێتە پێش یان نایەتە پێش. لە

ڕۆژێکی هەینیدا، لەبەر چاوی واق وڕماوی خەڵکێک کە بێگومان ئەودەم هەموو باوەڕیان هێنابوو کە شێتێکی ئاوا خاوێن و کۆک و پۆشتە و بەویقاریان نەدیوە کە بەم چەشنە بکەوێتە نێو دڕک و داڵ و شریتێکی کوت کوت و پس پس کراو و ئاڵۆز، لەو دڕک و داڵە بکاتەوە و بە هەڵاتن ڕوو لە شار بکا. منیش بەش بە حاڵی خۆم جۆرێک لەو برینانەی کە سادق هیدایەت ئاماژەی پێکردوون کەوتۆتە ناو ڕووح و ڕەوانمەوە، لە هیچ شوێنێ هەدادانم نییە. حەجمینم لێ هەڵگیراوە، لەگەڵ هەموو کەس، تەنانەت لەگەڵ خاووخێزانیشم هەست بە نامۆیی دەکەم. کەس نازانێ لە دەروونی مندا چ هەنگامەیەکە. ئەوەم پێ ڕاستە کە دەڵێن کەس لە دەردی کەس خەبەردار نییە. بەڵام نازانم بۆ کەس ئەوە ناڵێ، کە زۆر جار هەیە کەس لە دەردی خۆشی خەبەردار نییە.

من ماوەی شەش مانگ بە شەو و ڕۆژ لەسەر هەست بووم. گوێم هەڵدەخست، کێشکم دەکێشا. لە پشت درگاکان خۆم مات دەکرد. دوو دەستم ڕوو بە ئاسمان بەرز دەکردەوە و لەبەر خودای دەپاڕامەوە کە کارێک، ڕووداوێک بێنێتە پێش کە ژن و منداڵەکانم بۆ ماوەیەکی لە ماڵ بڕۆنە دەر و بە تەنیام بێڵنەوە، هەر جارەی کە خودا دووعاکەی لێ قەبووڵ دەکردم، ئێستا بە تەواوی لە پێچی کۆڵانەکەمان ئاوا نەدەبوون کە بە پڕتاو خۆم دەژێرخان دەکوتا و دەچوومە زگ پاڵتۆ کۆنەکەم و ئەو شریتە ئاڵۆز و کوت کوت کراوەم لەسەر زەوی بڵاو دەکردەوە، چەسپ و مقەست و تیغ و قالبەکۆنی شریت و... هەموو شتێکی پێویستم، پێشتر لەوێ حەشار دابوو، شانسی و ئەڵڵابەختەکی ئەو لەتوکوتانەم بە یەکەوە دەنووساندەوە. ئەوە کاری من بوو، هەر جارەی کە چاوی ژن و منداڵەکانی خۆم دوور دەدیت. بە ڕاستی من لە چی دەگەڕام؟ یان باشتر بڵێم لەچی دەگەڕێم؟ دەزانم ئەو شریتە کوت کوت و پس پسە ئاڵۆزە، پێوەندی بە ڕووح و گیانمەوە هەبوو. شەوانە بیر کردنەوە لەو شریتە ببوو بە لای لاییەکی خۆش و ئارامکەرەوە کە دەخەوێکی خۆشی دەکردم. من بۆ ئەوە نەدەخەوتم تا ماندوویی لەشی شەکەت و داکوتراومی پێ بتارێنم. من شەوانە تەنیا لەبەر ئەوە دەنووم تا

خەون ببینم، خەونی خۆش، خەونی خۆشی خۆم، خەونی خۆشی ئەو، وە ئەو شریتە کە بۆتە بەشێک لە ڕووح و ئازارەکانی ڕووحم هی ئەوە نازانم نیازی من بوو یان دوعاکانی ئەو، کە جارێکیتر لەپاش ساڵانێکی دوورودرێژ کەوتینەوە سەر ڕێی یەکتر، وەک دوو ئاشنا یەکترمان دواند. بەڵام هەرکە لێی جیابوومەوە داگیرسامەوە، گڕم گرتەوە. ئەوەی بە درێژایی ئەم ساڵانە هەڵم بەستبوو، لێم هەڵوەشاوە، زۆر جاریتر بە ئانقەست چوومە سەر ڕێگای، هەستم دەکرد پێی ناخۆش نییە، جار جار یەکترمان بە دزی دەدیت. پرسیارێک ببوو بە چقڵ و دەنێو دڵم چەقیبوو، ژیان و گیانی من پێوەندی بە وڵامی ئەم پرسیارەوە هەبوو، هەر لەبەر ئەوە بوو کە من ئەوەندەی لێ پاڕابوومەوە تا ڕازی بوو، بیروباوەڕی خۆی دەربارەی من، دەربارەی ئەوینی من، بخاتە سەر ئەم شریتە کوت کوت و پس پس کراوە، ئەم بڕیارە، خۆی دە خۆی دا چەشنێک ئاشت بوونەوەمان بوو. چەشنێک لە یەک نیزیک بوونەوەی دووبارەمان، ئەو شوێنەی دامان نابوو یەکتری لێ ببینین هێندێک سەرتر لەو جێگەیە بوو کە وەک شێتان خەریک بووم ئەو شریتە ئاڵۆز و کوت کوتەم لێ کۆ دەکردەوە. دەمدیت کە خەڵک چۆنم چاو لێدەکەن. من تا ئەوێ هەڵاتبووم، من وەدوای «با» کەوتبووم لە حاڵێکدا بەشێک لەو «با»یەش لە دواوە پاڵی پێوە دەنام. تا ئەو دڕکوداڵ و چرپیوچاڵانە بەهانامەوە هاتن ئەو کوت کوت و پس پسی شریتەیان لە «چەنگ» با کە لێمی فڕاندبوو دەرکێشا. ئێستا دەڵێم هەموو خەتای من بوو، نەک ئەو، لە خۆڕا تووڕەم کرد. بە دەس خۆم نەبوو زۆری لێ داغدار بووم. ئازاری دابووم. وانەبوو کە نەمدەپەرست، نا بە هەموو وجوودمەوە دەمپەرست. کابەی من بوو. زۆری دەگەڵ ماندوو ببووم تا ڕازیم کرد ئەوەی دە دەروونیدا ڕای گرتووە و هەرگیز پێی نەگوتوم بۆم بخاتە سەر شریتێک. من خۆشم دەویست، ئێستاش هەر خۆشم دەوێ. دەتوانم بڵێم لە هەموو کەسم زۆرتر خۆش دەوێ، تەنانەت لە خۆشم زۆرتر. من چووبوومە لای کە ئەوانەی لە لا بدرکێنم. دەمەویست پێی بڵێم بە درێژایی ئەو ساڵانەی لێک هەڵبڕابووین ساتێک نەبووە کە بەبێ بیرکردنەوە

لە ئەو ڕامبواردبێ. من چووبووم کە پێی بڵێم چەندەم..... بەڵام نازانم بۆ وام نەکوت. لەجیاتیانی تووڕەم کرد. تووڕەی تووڕە، تەنیا بوو. بە ماشێنێکی مۆدێل باڵا هاتبوو. سەیر خۆی ڕازاندبۆوە. هاتبوو داخ لە سەر دڵم دابنێ و جارێکی تر.... نا.... وا ناڵێم. بیستوپێنج ساڵێک دەبوو لێک هەڵبڕابووین. ئەو ئاگاداری ئەوە نەبوو کە ئەو ماوەیەم چۆن تێپەڕاندووە و نە منیش دەمزانی ئەو چۆنی گوزەراندووە.

: «سڵاو، ئیزنم هەیە، چەند ساتێک کاتتان بگرم؟»

: «تکا دەکەم. فەرموون.»

درگای ماشێنەکەم کردەوە و چووم لە پەنای دانیشتم. ئاڵوگۆڕێکی سەیری بەسەردا هاتبوو هەر وەکوو من، بەدەر لە نیگای، کە هەمان نیگای ئاشنای ئەفسووناوی ڕابردوو بوو.

: «حاڵت چۆنە؟ چاکی؟ لە ژیانت ڕازی؟»

: «ئەی، بە هەر حاڵ. هەر دەبێ بیگوزەڕێنین. پیر بووین ئیتر، چارە چییە؟»

: «منداڵەکانت چۆنن؟»

: «باشن، بۆخۆیان خەریکن.»

: «ئەی خۆت چۆنی؟ باشی؟ تۆ چی؟ لە ژیانی خۆت ڕازی؟»

دەتکوت بەرمیلێک باڕووتم و چاوەڕوانی گڕی شەمچەیەک، من ئەو کەسەی ناو دەروونی خۆمم نەناسیبوو. هەرگیز چاوم پێی نەکەوتبوو، نازانم لە کوێی دەروونمدا خۆی حەشار دابوو، لەپڕ وەدەرکەوت، دەستی بەسەر دەمم داگرت و خۆی لەجیات من ڕووی کرد لە ئەو دەزانن لە کێ؟ دەبێ تا ئێستا زانیبێتان باسی کێ دەکەم، لەگەڵ کێ بڕیاری دیدارمان هەبوو. بەڵێ ڕاستی بۆ چوون، خۆی بوو، نازێ. نازێی هەمیشەی من. چووبووم بیبینم و شریتێکی لێ وەربگرم کەچی، ئەو ئابڕووبەرەیە، ئەو ناکەسە نائاشنایە. دەسی کرد بە کوتنی ئەو شتەی کە نەدەبوو پێی بڵێت، هەر باسی نەکەم باشترە، نازێ چاوی لە چاوم بڕیبوو. فرمێسک بە دوو لای ڕوومەتیدا

دەهاتە خوار. ئەی خودایە! من چەندە پابەستی ئەو نیگایەم!؟ شریتەکەی دەرێنا.

: «من، ئەوەی بە درێژایی ئەو ساڵانە، ئازاری دابووم لەسەر ئەو شریتە باسم کردبوو باسی زۆر شتی تریش، باسی عەلیلە و دایکم و تەنانەت هەواڵی قاڵەش، بەڵام ئێستا کە گوێم لە قسەکانت بوو وابزانم تازە بە کەڵکی تۆ نایە.»

زارم پڕ کرد کە بڵێم: «ئازیزەکەی هەموو دەموساتم، ئەوە من نەبووم ئەو قسانەم بە تۆ کوت، من ئێستاش تۆ دەپەرستم، من ئەو کەسە ناناسم، خۆشم نازانم کێیە و لە کوێ پەیدا بوو.»

کە نازێ بە تووڕەیی و گریانێکی کپ و بێدەنگ دەستی کرد بە کوت کوت کردنی شریتەکە، هەموو ئەو کارەی چەند چرکەی زیاتر نەخایاند. شووشەی پەنجەرەی ماشێنەکەی داکێشا و فرێی دایە دەرێ. من تەنیا ئەوەندە لە زارم هاتە دەر کە بڵێم: «نازێ بۆ وات لێکردم؟»

درگای ماشێنەکەم کردەوە کە کوت کوت و پس پس شریتەکە کۆ کەمەوە بەڵام «با» بە دەستییەوە گرتبوو دەیڕفاند. لە ماشێنەکە دابەزیم، بە هەڵاتن کەوتمە شوێنی ئەو شریتە ئاڵۆز و کوت وکوتە.

شەش مانگ نائارامی، شەش مانگ بێ قەراری، شەش مانگ خۆنەبوون، شەش مانگ، شەوڕۆژ درۆکردن تەنانەت لەگەڵ دارودیواریش. من لە چی دەگەڕێم؟ بە شوێن چیدا عەودالم؟ بۆ وازم بۆ لێ ناهێندرێ؟ بۆ هەر دەڵێی ژیان و حەیات و مەماتم بەم شریتە ئاڵۆز و کوت کوت و پس پسەوە بەستراوەتەوە؟ من دەزانم لەمەوبەدواوەش ئەم شریتە بەشێکی گرینگ لە ژیانی من پێک دێنێ. تازە من و ئەو شریتە چارەمان لێک نووسراوە هەروەک چۆن کۆتر بەشێکی گرینگ لە ژیانی کوترباز پێک دێنێ، وەک چۆن قومار بەشێکی گرینگ لە ژیانی قوماربازێک پێک دێنێ. هەر ئەو جۆرەی کە کۆترباز لە کاتی ڕۆیشتنی ئاسایشدا، ناتوانێ سەر هەڵنەهێنێ و لە ئاسماندا چاو لە کۆتر نەگێڕێ، منیش شەو و ڕۆژ چاوێکم هەر لە ژێرخانەکەمانە، ڕەنگە ئەگەر شتێک بگێڕمەوە لاتان سەیر بێ، دوێنێ لای ئێوارێ یەکێ لەو

دۆستانەی ماوەی چەند مانگێک دەبوو لێی بێخەبەر بووم. لەپڕ لێم وەژوور کەوت، پاکەتێکی گەورەی  بە دەستەوە بوو. لە پاش چاکوچۆنی دەڵێ:

: «ئەرێ فلانی! پرسیارێکت لێ بکەم. وڵامەکەم بەڕاستی دەدەیەوە، خۆ لێم تووڕە نابی؟

«لێی تووڕە نابم.»

: «دەمویست بڵێم من و تۆ لەمێژ ساڵە ئاواڵین. پێم خۆش بوو ئەگەر گیروگرفتێکت بۆ دێتە پێش منیش وەک برایەکی خۆت لەبیر نەکەی. پێم خۆشە ئەگەر لە دەستم هات یارمەتیت بدەم.»

: «بێگومان لە لای من وایە، ماوەیەک بوو بە دیارەوە نەبووی؟ لەمێژە لێت بێخەبەرم.»

: «جا کاکە! مەگین گێرەوکێشەی ڕۆژگار بۆ ساتێکیش دەست لە بەرۆکمان بەردەدا؟»

: «دەمهەویست بڵێم شتێکم بۆ هێناوییەوە، وا بزانم هی تۆیە. بەڵام وا باشترە پێشتر وڵامی پرسیارەکەم بدەیەوە.»

: «کام پرسیار؟ تۆ کە تا ئێستا چت نەپرسیوە.»

: «دەڵێم فلانی! بۆ خۆمانین. ئەرێ ئەتۆ! شێت نەبووی؟»

پێی دەڵێم: «کاکە! دەسخۆش، لە پاش چەند مانگ دووری و بێخەبەری لێم وەژوور کەوتووی کە پێم بڵێی شێت بووم.»

دەڵێ: «ئاخر نەتکوت لە پرسیارەکەت تووڕە نابم و وڵامەکەت دەدەمەوە؟»

خۆم دەبینمەوە، ڕاست دەکا، دەی ئەگەر بە ڕاستی شێت نەبووم بۆ ئەوەندەی لێ تووڕە بووم؟

: «بمبوورە، خۆشم نازانم، بۆ وا پێی ڕاچەنیم، ئێستا تو پێم بڵێ چۆنەئەم پرسیارەم لێدەکەی؟»

: «بآشە تۆ خۆت لەجێی من دانێ، ڕۆژێکی هەینی لای ئێوارێ بۆ پشوودان دەچییە دەرەوەی شار تا تاوێکی بحەسێیەوە. کاتێکی خۆش تێپەڕ دەکەی. لەپڕ دەبینی کە یەکێ لە ئاواڵە نیزیکەکانت، لەبەرگێکی جوان و

ڕازاوەدا، وەک ئەوەی خۆی بۆ شایی ساز کردبێ، دەڵێی بای سەرسەرە بە قەراغ جادەدا هەڵدێ. نە ئاگای لەو ماشێنانەیە کە بەرەو ڕووی دێن و نە ئاگاداری ئەو خەڵکەیە کە لە قەراغ جادەکە دانیشتوون و نە ئاگاداری تۆ کە دەنگی دەدەی. بۆ ساتێک دەحەبەسێ بە سەر سوورماوی، تۆ و دەیان کەسی تر کەچاوتان لێیەتی، دەیبینن کە چلۆن بەو جلوبەرگە ڕازاوە و کەوشی بریقەدار وەنێو درکوداڵ و چرپیوچاڵ کەوتووە و خەریکە شریتێکی ئاڵۆز و کوت کوت و پس پس لەو درکودالانە دەکاتەوە و دەیانخاتە نێو گیرفانی. نە ئاوڕ لە کەس دەداتەوە و نە دەبینێ کە ئەو خەڵکە چۆنیان چاو تێبڕیوە. من کە تۆم ئاوا بینی. هەوەڵین گومانی من ئەوە بوو کە بێونەبێ عەقڵت لەدەست داوە. باوەڕم پێبکە، دڵم بڕوای نەدەدا بێمە لات لەو ماوەیەدا. هەر لە دەرەوە چاوم لێ گێڕاوی، تا بەڵکوو لە شوێنێ بتبینم و پرسیارت لێبکەم، ئەو ئاکارە سەیروسەمەرەیە چ بوو دەتنواند. ئەم شریتە چی تێدا بوو وا شێتانە، بە بێ ترس لە زامداربوونی دەسوپلت لەو چقڵ و درکودالەت دەکردەوە؟ من ئەودەم ئەوەندە حەبەسابووم کە بە عەقڵم نەگەیشت لێت بێمە پێش و بڵێم برا بۆ وا دەکەی؟ تۆ وەڕێ کەوتبووی و بەرەوشار هەلینگت دەدا کە چوومە ئەو شوێنەی شریتەکەت لێ دەکردەوە. هیچ دەزانی ئەودەم ئەوەت لەبیر چووبوو؟»

زاری پاکەتەکەی نێو دەستی کردەوە چڵێکی گەورەی وشترخۆرکە لێ دەرکێشا کە کوتێکی درێژی شریت لێ هالابوو. دایە دەستم و کوتی: «شەش مانگە ئەوەم ڕاگرتووە، ئەگەر ئەو شریتە ئاڵۆز و پس پسانەی ئەوێ ڕۆژێ کۆت دەکردنەوە بە کەڵکت هاتبێ دەبێ ئەوەش بە کەلکت بێ. ئەوە کوتێک لە هەمان شریتە بابردەڵەکە بوو لە پشت ئەو بەردە گەورەی کە تۆ هەر ئاوڕت لێ نەداوە، لەو وشترخۆرکەیە هالابوو ئێستا فەرموو ئەو ئەمانەتییە وەرگرە. ئەگەر پێشت خۆش نییە هەرگیز پێم مەڵێ مەسەلەی ئەم شریتە کوت کوت و پس پسە و ڕاکردنی ئەوێ ڕۆژەی تۆ چی بوو؟»

بە ڕاستی هیچم بەدەستەوە نەبوو پێی بڵێم، ئەوەی من لێی دەگەڕام شتێک نەبوو بتوانم بە کەسێکی تری بڵێم بە ناچار باسی هەموو شتێکم

دەگەڵ کرد بەدەر لەوشتەی کە لێی پرسیبووم. شەش مانگی خایاند تا شریتەکەم ئامادە کرد کە بیخەمە ناو زەبتیسەوتەکە و گوێی دڵمی بۆ ڕادێرم. چاوەڕوانی لە ماڵ نەبوونێکی تری خاووخێزانم بووم، من نازانم ئەم کوتە شریتەی ئاواڵەکەم بۆی هێناوم کامە کەلێنی ژیانی بەتاڵی من پڕ دەکاتەوە. دەزانم کارێکی زۆرم لە پێش دایە. من بە هەر شێوەیەک بێ تەنانەت ئەگەر سەدان ئاواڵی تریشم هەر یەکەی بە چەپکێک دڕکەوە بێن بۆلام و کوتە شریتێکم بۆ بێنن ئەم شریتە هەر ساغ دەکەمەوە، بەشێکی زۆری ئەم ڕۆمانە بەم شریتەوە بەستراوەتەوە، من دەبێ جارێکی تر لەگەڵ نازێ ئاشت ببمەوە و ببینەوە بە دوو خۆشەویستەکەی جارانی سەردەشت، من ئەو ڕۆژانە چاوەڕوانی ئەوەم کە ببمە باپیر، ئەوەندەی کە دەزانم ئەوەیە کە نازێش هێندەی نەماوە ببێ بە دایەگەورە. سەرەڕای ئەوەی کە زۆرم لێ توورەیە. دەزانم کە دڵی هەر لەلامە. ئەودەم کە بە توورەییەوە شریتەکەی پس پس دەکرد و چاوی دەچاوم بڕیبوو، هەمان نازێم دەدیت، نازێی جارانم، نازێی ناوکادێنی ماڵە حاجیمحەممەد و چاڵە بەفرەکەی پشت گردی دارەتوو، هەمان کیژۆڵەیەکی هەلووکە کە وەپشتی ئاواڵەکەی کەوت و ئەو بە منی کوت «بێتەربیەت» من ئەو شریتە ساغ دەکەمەوە و دیسان وەشوێن نازێ دەکەومەوە. سەدان پرسیارم هەیە دەزانم وڵامەکانی تەنیا لە لای نازێ وەدەستم دەکەوێ. دەبێ لێی بپرسم. ئاخۆ کاوەیس سۆفیحەسەنی عەمەل کرد. ئاخۆ کاوەیس سۆفی حەسەنی ڕاسپاردووە کە فاتێی بەرێتە لای تا پشتی عەمەل بکا، ئاخو فاتێ کە کاوەیس دەبینێ دەیناسێتەوە، ئاخۆ عەلیلە بە دەست خەڵک لە زیندان ئازاد کرا؟ ئاخۆ کاوەیس جارێکی تر چاوی بە ئامینەشەل کەوتووە؟ نازێی من چی. بیستوپێنج ساڵ بێ من هەر وەکی منی ڕابواردووە؟ ئەمجۆرەی هەمیشە چاوەڕوانی بووم ئەویش وەک من بوو؟ ئەم شریتە بەم کوتە تازەوە ساغ دەکەمەوە ئەگەر هەزاران جار ناچار بم جێی کوتەکانی بگۆڕم، گوێی بۆ ڕادەدێرم، بەڵێ گوێی بۆ ڕادەدێرمەوە، دەستمایەی منە، من خۆم بەشێکم لە ڕۆمانێکیتر، دەبێ هەر بەم زووانە دەستی پێبکەم. من جارێکی تر بەخۆمدا دێمەوە. ئینجا وەشوێن نازێ

دەکەوم و لە هەر جێگەیەکی ئەم جیهانە بێ، نازێ دەدۆزمەوە، نازێی خۆم. نازێی جارانم، بەبێ نازێ، هەموو ئەو کەسانەی کە لەگەڵیان دەژیام و بیرم لێدەکردنەوە و خەمم لێدەخواردن و خۆشم دەویستن. لێم نادیار و ونن، هەرنین جیهان تەنیا یەک کەسی بۆ من تێدایە  ئەویش نازێیە.

«بڵێی هێمنیش لە نازێیەک نەگەڕابێ؟» گەڕاوە، من باش دەزانم ئەگینا هەرگیز ناڵەی جودایی بەرز نەدەبۆوە.

ئەی ئەوانەی قەت لەبیرم ناچنەوە     ئێستا بمبینن ئەرێ دەمناسنەوە

دەڵێم: نازێ گیان! هەر ئەو ڕۆژانەیە، کاڵەی ئاسن هەڵبەستم و بەشوێنتدا وەڕێ کەوم.

تا بمێنێ نووری چاو و هێزی     دێم و دێم و دێم و دێم و دێم ودێم
پێم     گەر گلاشم کوردەواری و ئێوە خۆش
دێم هەتا هەمبێ بڕست و
بیروهۆش

❊❊❊